
2
أسباب
نزول القرآن
(به كوردی)
به ده‌قه صه‌حیحه‌كان
منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com
به شێوه‌ی (143) وتاری ئاماده‌كراو
ئاماده‌كردنی
خدر حمد خه‌تی

# أَسْبَابُ نُزُولِ الْقُرْآنِ

# به كوردى

---

## بەشێوەی ١٤٣ وتاری ئامادەكراو

---

**بەرگی دووەم**

نووسینی
خدر حمد خەتی

چاپی یەكەم
٢٠٢٠

- **ناوی كتێب:** أَسْبَابُ نُزُولِ الْقُرْآنِ به كوردی
- **بابەت:** ئایینی
- **نووسینی :** خدر حمد خەتی
- **نەخشەسازی ناوەوە :** موحەمەد حوسێن خەتی
- **نەخشەسازی بەرگ:** محمد جبار
- **نــۆرەی چاپ :** یەكەم ـ ٢٠٢٠ - هەولێر
- **بـڵاوكراوەی :** كتێبخانەی حاجی قادری كۆیی
- **قەبارەی كتێب:** ١٧*٢٤ ـ ٥٤٤ لاپەڕ
- **شوێنی چاپ:** چاپخانەی جەنگەل ـ طهران
- **نرخی هەردوو بەرگ:** ١٨,٠٠٠

---

**لە بەڕێوبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ژمارەی سپاردنی ( ١٩٩ )ی ساڵی٢٠٢٠ دراوەتێ.**

---

# ناوەڕۆك

## وتاری ژماره (٦٥) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### سورەتی (مریم)

-ئەم سورەتە باسی  تەوحید ورۆژی دوایی دەکات.

-باسی چیرۆکی هەندێ لە پێغەمبەران دەکات و بەتایبەتی (زکریا) و کورەکەی (یحیی) لەتەمەنێکی گەورەی زکریاو ژنەکەشی نەزۆرك بوو، خوا ئەم مندالّی پێ بەخشین.

-باسی چیرۆکێکی عەجیب دەکات ئەوەیش لەدایك بوونی (عیسی) یە بەبێ باوکی.

-باسی چیرۆکی (ابراهیم) وباوکی دەکات.

سورەتی (مریم) سورەتێکی مەککی یە ، لە ریزبەندا ژمارە (١٩)یە ژمارەی ئایەتەکانی (٩٨) ئایەتە.

ئایا بۆچی ناونراوە سورەتی (مریم)؟ چونکە باسی (مریم)ی دایکی عیسا دەکات کە مندالّی دەبێ بێ باوك وەهەروەها (عیسی) قسەدەکات لە ناو پێشکە، بەراستی موعجیزەیەکی گەورەیە.

## ١- هۆی دابەزینی ئایەتی (٦٤) سورەتی (مریم)

﴿وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ ۖ لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ ۚ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ٦٤﴾ مريم

واتە: (ئیبن عەباس) ئەڵێ: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: ئەی جبریل! ئەوە بۆچی زۆر زۆر نایێت بۆ لامان ؟! جا بۆ وەڵامی ئەوە ئەم ئایەتە هات: بەفەرمانی پەروەردگارت نەبێ هەرگیز ئێمە دانابەزین دەسەڵاتی تەواو هەر بۆ خوایە، چونکە هەرچی ئێستا لە پێشمانە (واتە: رۆژی دوایی)، هەرچیش لە دوامانەوە رابووردووە واتە: کاروباری دونیا، وە ئەوەش کە لەونێوانەدایە هەربۆ خوایە، وە پەروەردگاریشت لە بیری نەکردوویت(رامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يَا جِبْرِيلُ مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تَزُورَنَا أَكْثَرَ مِمَّا تَزُورُنَا فَنَزَلَتْ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا إِلَى آخِرِ الْآيَةِ قَالَ كَانَ هَذَا الْجَوَابَ لِمُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رواه البخاري

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە خوا لەخوی وبابی رازی بێ دەڵێ : پێغەمبەر فەرمووی ئەی (جوبریل) بۆچی زوو زوو نایەتە لامان (واتە: بۆچی زوو زوو دانەبەزی ) جا خواش ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی ﴿وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ ۖ لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ ۚ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾ دەڵێ : ئەو ئایەتە وەلامێك بوو بۆ (محمد)

٢-( عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: أبطأ جِبْرِيلُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أربعين يومًا ثُمَّ نزل، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (مَا نَزَلَت حتى اشتقت إليك) فقال لَهُ جبريل: (أنا كنت إليك

أشوق ولكني مأمور) فأوحى الله إِلَي جبريل إِن قل لَهُ: وَمَا نَتَنَزَّلُ إلا بِأَمْرِ رَبِّكَ) الدر المنثور للسيوطي

واته: له عيكريمەوه هانووه دەڵێ: چل ڕۆژان جوبريل دانەزى ، دواى دابەزى پێغەمبەر پێ فەرموو (دانەبەزى تاكو غەريبيم كردى) جوبريليش گوتى : (منيش غـەريبى تـۆم كردبـوو، بەلاّم من فەرمان پێكراوم)

جا خوا وەحى نارد بۆ جوبريل كە بە پێغەمبەر بلێ (وَمَا نَتَنَزَّلُ إلا بِأَمْرِ رَبِّكَ) واتـە: ئێمـە بەفەرمانى خوا نەبێ دانابەزين .

٣-( عَنْ قَتَادَةَ (وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا) (مريم: ٦٤) قَالَ: هَذَا قَوْلُ جَبْرَائِيلَ، احْتَبَسَ جَبْرَائِيلُ فِي بَعْضِ الْوَحْيِ، فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا جِئْتَ حَتَّى اشْتَقْتُ إِلَيْكَ) فَقَالَ لَهُ جَبْرَائِيلُ: (وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا) (مريم: ٦) اخرجه الطبري في (جامع البيان)

## هەندێ شت هەیە نە پێغەمبەر دەزانی نە جوبریل:

عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ أَنَّ (رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الْبُلْدَانِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ؟ وَأَيُّ الْبُلْدَانِ أَبْغَضُ إِلَى اللَّهِ قَالَ: (لَا أَدْرِي حَتَّى أَسْأَلَ جِبْرِيلَ) فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ فَأَخْبَرَهُ أَنَّ أَحَبَّ الْبِقَاعِ إِلَى اللَّهِ الْمَسَاجِدُ، وَأَبْغَضَ الْبِلَادِ إِلَى اللَّهِ الْأَسْوَاقُ) ، رَوَاهُ أَحْمَدُ وَالْبَزَّارُ وَاللَّفْظُ لَهُ، وَأَبُو يَعْلَى وَالْحَاكِمُ وَقَالَ: صَحِيحُ الْإِسْنَادِ قال الالباني حسن صحيح

واته: لەجوبيرى كوڕى موتعيمەوه هاتووه دەڵێ : پياوێك گوتى : ئـەى پێغەمبـەرى خـوا ئايـا خۆشەويسـترين شـوێن لاى خـوا كامەيـە؟ وە ئايـا بـوغزێنراوترين شـوێن لاى خـوا كامەيە؟ پێغەمبەر فەرمووى نازانم تاكو پرسيار لە (جوبريل) دەكەم ، كاتێ جوبريل هاتـە لاى پرسيارى لێ كرد ، ئەوەيش وەلاّمى دايـەوە گـوتى : خۆشەويسـتيرين جێگـا لاى خـوا مزگەوتەكانن، وە بوغزينراوترين جێگا لاى خوا بازارەكانن.

## ٢- هۆی دابەزینی ئایەتی (٧٧تاکو ٨٠) سورەتی ) مریم

﴿أَفَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي كَفَرَ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالٗا وَوَلَدًا ٧٧ أَطَّلَعَ ٱلۡغَيۡبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحۡمَٰنِ عَهۡدٗا ٧٨ كَلَّاۚ سَنَكۡتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلۡعَذَابِ مَدّٗا ٧٩ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأۡتِينَا فَرۡدٗا ٨٠﴾ مريم

واتە: ئایا ئەو کەسەت دیوە بێ باوەڕ بوو بە نیشانە و ئایەتەکانی ئێمە وتی (لە ڕۆژی دواییشدا) ماڵ و کوڕم پێ دەدرێ.(٧٧) ئایا نهێنیەکان ئاگادارە یا بەڵێنی لە خوای میهرەبان وەرگرتووە.(٧٨) نەخێر (وا نیە) لەمەوپاش ئەوەی دەیڵێ دەینوسین (لە سەری) ماوەی سزای بۆ درێژ دەکەینەوە.(٧٩) ئەوی ئەو دەیڵێ (لەماڵ و منداڵ) بە میرات لێ ی وەردەگرینەوە (لە ڕۆژی دواییدا) بەتەنها دێتەوە لامان.(٨٠) (پوختەی تەفسیر)

(نَرِثُهُ)لێ وەردەر دەگیرێتەوە وبە تەنیا دێتەوە لامان

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ خَبَّابٍ قَالَ كُنْتُ رَجُلًا قَيْنًا وَكَانَ لِي عَلَى الْعَاصِ بْنِ وَائِلٍ دَيْنٌ فَأَتَيْتُهُ أَتَقَاضَاهُ فَقَالَ لِي لَا أَقْضِيكَ حَتَّى تَكْفُرَ بِمُحَمَّدٍ قَالَ قُلْتُ لَنْ أَكْفُرَ بِهِ حَتَّى تَمُوتَ ثُمَّ تُبْعَثَ قَالَ وَإِنِّي لَمَبْعُوثٌ مِنْ بَعْدِ الْمَوْتِ فَسَوْفَ أَقْضِيكَ إِذَا رَجَعْتُ إِلَى مَالٍ وَوَلَدٍ قَالَ فَنَزَلَتْ أَفَرَأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا أَطَّلَعَ الْغَيْبَ أَمْ اتَّخَذَ عِنْدَ الرَّحْمَنِ عَهْدًا كَلَّا سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُ مِنْ الْعَذَابِ مَدًّا وَنَرِثُهُ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ) متفق عليه (قينا) ئاسینگر

واتە: لە خەبباب‌ەوە هاتووە دەڵێ : من پیاوێکی ئاسینگەر بووم، وە عاسی کوڕی وائیل قەرزارم بوو ، چووم قەردەکەم بداتەوە ، گوتی قەردەکەت نادەمەوە تاکو کوفر بە (محمد) نەکەی ، منیش گوتم کوفر بە (محمد) ناکەم تاکو تۆ دەمری ودوایش زیندوو

دەکرێتەوە ، گوتی : کە زیندوکرامەوە وەر قەرزدەکەت دەدەمەوە ، ئەگەر گەرامەوە لای مال و مندالّم، جا خوا هەرەشی لێکردو ئەم ئایەتانەی بۆ دابەزاندوفەرمووی (أَفَرَأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا أَطَّلَعَ الْغَيْبَ أَمْ اتَّخَذَ عِنْدَ الرَّحْمَنِ عَهْدًا كَلَّا سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُ مِنْ الْعَذَابِ مَدًّا وَنَرِثُهُ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا) واتە: ئەوەی کوفر بەئایەتەکانی ئێمە دەکات ، ئەوەی دیلێ لەسەری دەنوسین و لەقیامەت بەتەنیا دەگەرێتەوە لای ئێمە.

٢-(قَالَ خَبَّابُ بْنُ الْأَرَتِّ: كُنْتُ قَيْنًا بِمَكَّةَ فَكُنْتُ أَعْمَلُ لِلْعَاصِ بْنِ وائل، فاجتمعت لي عليه دارهم، فجئت لأتقاضاها، فَقَالَ لِي: لَا أَقْضِيكَ حَتَّى تَكْفُرَ بِمُحَمَّدٍ، فَقُلْتُ: لَا أَكْفُرُ بِمُحَمَّدٍ حَتَّى تَمُوتَ ثُمَّ تُبْعَثَ، قَالَ: فَإِذَا بُعِثْتُ كَانَ لِي مَالٌ وَوَلَدٌ، قَالَ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (أَفَرَأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا) الآيات. وقال ابْنِ عَبَّاسٍ: إِنَّ رِجَالًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانُوا يَطْلُبُونَ (العاص بن وائل) بِدَيْنٍ، فَأَتَوْهُ يَتَقَاضُونَهُ، فَقَالَ: أَلَسْتُمْ تَزْعُمُونَ أَنَّ فِي الْجَنَّةِ ذَهَبًا وَفِضَّةً وَحَرِيرًا وَمِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ؟ قَالُوا: بَلَى، قَالَ: فَإِنَّ مَوْعِدَكُمُ الْآخِرَةُ فَوَاللَّهِ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا، وَلَأُوتَيَنَّ مِثْلَ كِتَابِكُمُ الَّذِي جِئْتُمْ بِهِ فَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلَهُ فِي الْقُرْآنِ فَقَالَ: (أَفَرَأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا – إِلَى قوله – وَيَأْتِينَا فَرْداً) اخرجه ابن كثير في تفسيره

واتە: خەبابی کوڕی ئەرس دەڵێ: لە مەککە ئاسیگەر بووم ، بۆ عاسی کوڕی وائل کارم دەکرد، چەند درهەمێك قەرزدارم بوو ، چووم بمداتەوە، گوتی نادەمەوە تاکو کوفر بە (محمد) نەکەی ، منیش ئەوەم بۆ پێغەمبەر باس کرد ، خواش ئەو ئایەتەی دابەزاند وفەرمووی (أَفَرَأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا.................)

وەهەروەها ئیبنو عەباس دەڵێ: هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر پارەیان لەسەر (العاص بن وائل) بوو ، ئەوانیش چوون قەرزەکە وەرگرنەوە ، پێی گوتن : ئایا ئێوە نالێن لە بەهەشت زێر وزیو وئاورشم و هەموو جۆرە میوەیەکی لێیە؟ ئەوانیش گوتیان بەلێ ، گوتی : منیش لە قیامەت دەتان دەمەوە با ئەوێ موعیدمان بێ، سوێند بەخوا مال

ومندال و کیتابەکەی وەکو ئێوە دێنم ، خواش هەرەشی لێکردو فەرمووی (أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِي كَفَرَ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ٧٧ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا ٧٨ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ٧٩ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ٨٠) مريم

## دەرسەکانی ئەم ئایەتە:

١- قەرزار ناچیتە بەهەشت تاکو قەرزەکەی بۆ نەدرێتەوە.

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ) ابن ماجه قال الالباني صحيح

٢-پێغەمبەر نوێژی لەسەر کەسانی قەرزار نەکردوە.

(عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، لَا يُصَلِّي عَلَى رَجُلٍ مَاتَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ، فَأُتِيَ بِمَيِّتٍ فَقَالَ: (أَعَلَيْهِ دَيْنٌ؟ ) فَقَالُوا: نَعَمْ دِينَارَانِ. فَقَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ)، فَقَالَ أَبُو قَتَادَةَ: هُمَا عَلَيَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَصَلَّى عَلَيْهِ، فَلَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ قَالَ: (أَنَا أَوْلَى بِكُلِّ مُؤْمِنٍ مِنْ نَفْسِهِ، فَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا فَعَلَيَّ وَمَنْ تَرَكَ مَالًا فَلِوَرَثَتِهِ) رواه ابن حبان قال الالباني صحيح

٣-گاڵتە کردن بە ئایەتەکانی خوا، مایەیی هەرەشەی خوا لەو کەسە.

*************************

# وتاری ژماره (٦٦) له هۆیه‌كانی دابه‌زینی قورئان

## سوره‌تی (الانبیاء)

سوره‌تێكی مه‌ككه‌یه ، له ریزبه‌ندا ژماره (٢١)ه وه ژماره‌ی ئایه‌ته‌كانی (١١٢) ئایه‌ته

ئایا بۆچی ناونراوه سوره‌تی (الانبیا)؟ چونكه باسی كۆمه‌لێك له پێغه‌مبه‌ران ده‌كات ، له جیهاد و بانگه‌واز و ئارامگرتنیان به‌رامبه‌ر گه‌له‌كه‌یان .

## ١- هۆی دابه‌زینی ئایه‌تی (١٠١+١٠٢) سوره‌تی (الانبیاء)

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ١٠١ لَا يَسۡمَعُونَ حَسِيسَهَا وَهُمۡ فِي مَا ٱشۡتَهَتۡ أَنفُسُهُمۡ خَٰلِدُونَ ١٠٢﴾ الانبياء

واته: بێگومان كه‌سانێك له پێشدا له لایه‌ن ئێمه‌وه به‌هۆی كاروكرده‌وه چاكه‌كانیانه‌وه، به‌ڵێنی پاشه ڕۆژی چاكتریان پێدرابوو. (أولئك عنها مبعدون) ئه‌وانه له‌و ئاگره دوور ڕاده‌گیردرێن و گه‌رماو ناره‌حه‌تیش ناچێژن(١٠١) ده‌نگی قرچه‌و بڵێسه‌ی دۆزه‌خ نابیستن به‌ڵكو ئه‌وانه له‌ناو نازو نیعمه‌تێكدان كه نه‌فسیان حه‌زی پێ ده‌كات، وه به هه‌تا هه‌تاییش له‌وێ ئه‌مێننه‌وه (١٠٢)(ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: آيَةٌ لَا يَسْأَلُنِي النَّاسُ عَنْهَا، لَا أَدْرِي أَعَرَفُوهَا فَلَمْ يَسْأَلُوا عَنْهَا، أَوْ جَهِلُوهَا فَلَا يَسْأَلُونَ عَنْهَا؟ قَالَ: وَمَا هِيَ؟ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: (إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنْتُمْ لَهَا وَارِدُونَ) شَقَّ عَلَى قريش، فقالوا: أيشتم آلِهَتَنَا؟ فَجَاءَ ابْنُ الزِّبَعْرَى فَقَالَ: مَا لَكُمْ؟ قَالُوا يَشْتُمُ آلِهَتَنَا، قَالَ: فَمَا قَالَ؟ قَالُوا: قَالَ: (إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنْتُمْ لَهَا وَارِدُونَ) قَالَ: ادْعُوهُ لِي، فَلَمَّا دُعِيَ النَّبِيُّ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – قَالَ: يَا مُحَمَّدُ هَذَا شَيْءٌ لِآلِهَتِنَا خاصَّةً أَوْ لِكُلِّ مَنْ عُبِدَ مِنْ دُونِ اللَّهِ؟ قَالَ: "لَا، بَلْ لِكُلِّ مَنْ عُبِدَ مِنْ دُونِ اللَّهِ، فَقَالَ ابْنُ الزِّبَعْرَى: خُصِمْتَ وَرَبِّ هَذِهِ الْبَنِيَّةِ – يَعْنِي الْكَعْبَةَ – أَلَسْتَ تَزْعُمُ أَنَّ الْمَلَائِكَةَ عِبَادٌ صَالِحُونَ وَأَنَّ عِيسَى عَبْدٌ صَالِحٌ وَأَنَّ عُزَيْرًا عَبْدٌ صَالِحٌ، قَالَ: (بَلَى)، قَالَ: فَهَذِهِ بَنُو مَلِيحٍ يَعْبُدُونَ الْمَلَائِكَةَ، وَهَذِهِ النَّصَارَى يَعْبُدُونَ عِيسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ، وَهَذِهِ الْيَهُودُ يَعْبُدُونَ عُزَيْرًا، قَالَ: فَصَاحَ أَهْلُ مَكَّةَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُمْ مِنَّا الْحُسْنَى) الْمَلَائِكَةُ وَعِيسَى وَعُزَيْرٌ عَلَيْهِمُ السَّلَامُ (أُولَئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ ) الواحدي في اسباب النزول و الإمام الطحاوي في مشكل الآثار

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: ئایەتێك هەیە خەڵكی پرسیاریان لێ نەكردوم ، نازانم بۆچی پرسیاریان نەكردوە ، ئایا دەزانن یان لێی بێ ئاگان بۆیە پرسیاری لێ ناكەن، گوتیان ئایا ئەو ئایەتە كامەیە؟ گوتی : كاتێ ئەو ئایەتەدابەزی (إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنْتُمْ لَهَا وَارِدُونَ) قورس بوو لەسەر قوریش ، گوتیان : ئەوە قورئان جوێن بە خواكانی ئێمە دەدات ، كوڕی ززبعەری هات گوتی : ئێوەچیتانە؟ گوتیان (محمد) جوێن بە خواكانمان دەدات، گوتی : چی دەڵێ؟ گوتیان : دەڵێ : (ئێوە و ئەوەی دەیپەرستن جگە لە خوا خوارکی دۆزەخن ، ئێوە حەتمەن بەسەر پردی سرات رادەبرێن) گوتی: بۆم بانگ بكەن، پێغەمبەریان بۆ بانگ كرد، و گوتی : ئەی (محمد) ئایا ئەوە شتێكە تایبەتە بەخواكانی ئێمە، یان بۆ شتێكە كە دەپەرسترێ جگە لەخوا؟ پێغەمبەر

فەرمووی : نەخێر بۆ هەموو پەرستراوێکە جگە لە خوا، (کوڕی الزِّبَعْرَى) گوتی : کێشەت پێداکرد بەخوا کەعبە، ئایا تۆ نالێی فریشتەکان بەندەی چاکەکارن ، وە (عیسی) بەندەیەکی صالیحە، و (عوزیر) بەندەیەکی صالیحە ، پێغەمبەر فەرمووی : بەڵێ ، کوڕی ززبعەری گوتی : ئەوە نەوەی (ملیح) فریشتەکان دەپەرستن، ئەوە گاورەکانن (عیسی) دەپەرستن سەلامی خوای لێ بێ، ئەوەش جوولەکەن (عوزیر) دەپەرستن ، دەڵێ : خەڵکی مەککە بەئاگای هێنا لە پێغەمبەر ، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند وفەرمووی (إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُمْ مِنَّا الْحُسْنَى) واتە: فریشتە وعیسی وعوزیرو سەلامی خوایان لێ بێ (أُولَئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ) واتە: ئاگر ئەوانە ناگرێتەوە ، چونکە پێیان ناخۆشە دەپەرسترێن .

## دەرسەکانی ئەم ئایەتە :

١–کەس بە هەڵەی کەس عازاب نادرێت

٢–پێغەمبەران و صالیحان نارازین حەڵکی پیان پەرستێ.

******************

# وتاری ژماره (٦٧) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (الحج) :

سورەتی (الحج) سورەتێکی مەدەنییە ، لە ریزبەندا ژمارە (٢٢) وە ژمارەی ئایەتەکانی (٧٨) ئایەتە.

-لەسەرتادا باسی مەشهەدی ڕۆژی قیامەت دەکات ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٞ ١ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ ٢﴾ الحج

واتە: ئەی خەڵکینە بترسن لە (سزای) پەروەردگارتان چونکە بەڕاستی بوومەلەرزەی قیامەت هەستان شتێکی زۆر گەورەیە، کارەساتێکی سامناکە.(١) لەو ڕۆژەدا ئێوە ئەو (بوومەلەرزە) دەبینن بێ ئاگا دەبێ (لەترسی ئەو ڕۆژە) هەموو ئافرەتێکی شیردەر (کاتێ مەمکی لە دەمی منداڵەکەیدایە) لە ئەو (منداڵە) ی شیری پێ داوە وە فڕێی دەدات و لەباری دەچێ هەموو دوو گیانێك (مێینەیەکی سك پڕ) سکەکەی (کۆرپەکەی)، خەڵکی دەبینی (وەك) سەرخۆشن بەڵام سەرخۆشیش نین بەڵکو سزای سەخت و بەتینی خوا (وای لێ) کردوون.(٢)

ئایا بۆچی ناونراوە سورەتی ( الحج)؟ چونکە باسی دەعوەت و بانگەوازی ابراهیم دەکات بۆ حەجی مالی خوا.

### -ئایا ئەم سورەتە لە کوێ دابەزیوە؟

عبدالله کوڕی عباس دەڵێ لە مەدینە دابەزیوە ، وە قەتادە دەڵێ لە مەدینە دابەزیوە جگە لەم (٤) ئایەت ئەوەیش ئەمانن ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٖ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلْقَى ٱلشَّيْطَٰنُ فِيٓ أُمْنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلْقِي ٱلشَّيْطَٰنُ ثُمَّ يُحْكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٥٢ لِّيَجْعَلَ مَا يُلْقِي ٱلشَّيْطَٰنُ فِتْنَةٗ لِّلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ

وَٱلۡقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمۡۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَفِي شِقَاقِۢ بَعِيدٖ٥٣ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤۡمِنُواْ بِهِۦ فَتُخۡبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمۡۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ٥٤ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي مِرۡيَةٖ مِّنۡهُ حَتَّىٰ تَأۡتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةً أَوۡ يَأۡتِيَهُمۡ عَذَابُ يَوۡمٍ عَقِيمٍ ٥٥)

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١-٢) سورەتی الحج

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيۡءٌ عَظِيمٞ ١ يَوۡمَ تَرَوۡنَهَا تَذۡهَلُ كُلُّ مُرۡضِعَةٍ عَمَّآ أَرۡضَعَتۡ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمۡلٍ حَمۡلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ ٢) الحج

واتە (ڕۆژە سەختەکانی قیامەت: خوا لەم سوورەتەدا مرۆڤ لەکات و ساتە سەختەکانی ڕۆژی سەڵا هوشیار دەکاتەوەو دەفەرموێ: بسم الله الرحمن الرحيم * يا أيها الناس اتقوا ربكم ئەی خەڵکینە ! بەردەوام لەپەروەردگارتان بترسن و خۆ بپارێزن لە خەشم و رکی ئەو ،فەرمانەکانی بەچاکی جێبەجێ بکەن، بەو جۆرە کە لەپێناسەی (تەقوا)دا لەلایەن یەکێ لەخوا ناسانەوە هاتووەو دەڵێت: نەچیتە جێگایەکەوە، خوا ڕێگری لێکردبیت، لە جێگایەکیشدا دەبێ ببی ، ببەونادیار نەبیت إن زلزلة الساعة شئ عظيم) چونکە بەڕاستی بوومەلەرزەو شۆکەی هاتنی ڕۆژی قیامەت و کاولبوونی دنیا، کارێکی زۆر سامناك و گەورەیە، وەك خوا خۆی لەسوورەتێکی تردا ئەفەرموێ: (إذا زلزلت الأرض زلزالها وأخرجت الأرض أثقالها ..) یان دەفەرموێ: (وحملت الأرض والجبال فدكتا دكة واحدة فيومئذ وقعت الواقعة ..)) ئیمامی (بوخاریی) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا لە (ئەبی سەعید)ـەوە دەڵێ: پێغەمبەر دەفەرموێ: (يقول الله تعالي يوم القيامة: يا آدمُ! فيقول: ربَّنا لبيك وسعديك، فنادي بصوت: إن الله يأمرك أن تُخْرِجَ من ذريتك بعثاً إلي النار، قال: يارب! وما بَعْثُ النار؟ قال: من كل ألْفٍ- أراه قال- تسعُمأةٍ وتسعةٌ وتسعون، فحينئذ تَضَعُ الحامِلُ حَمْلَها ويَشُبُّ الوَلَدُ وتري الناسَ سكارى وماهم بسكارى ولكن عذاب الله

شديد). بەكورتيى: لەنێو يەك هەزار كەس دا (٩٩٩) كەسيان بۆ نێو ئاگر ڕەوانە دەكرێن ، لە هەزار كەس تەنيا يەك كەس ڕەوانەی بەهەشت دەكرێ، بۆيە ئيتر لەترسانا دووگيان بەر ئەخاو، دايكى (شيردەر) بيرى بەلاى منداڵەكەيەوە ناميٚنيٚو خافلْ دەبێ.(١)،وەكو دەفەرمووێ( يوم ترونها تذهل كل مرضعة عما أرضعت) هەركە كارەساتى ئەو ڕۆژە پێشهات، ئەبينن هەر ژنێكى شيردەر منداڵە شيرەخۆرەكەی خۆی لەكاتى شير پێدانيدا فەرامۆش دەكاو لێی غافلْ ئەبێو لەباوەشى بەردەبێتەوە (وتضع كل ذات حمل حملها) وەرچى مێينەی دووگيان و زكپڕيشە، لەترس و لە هەيبەتا زكەكەی دادەنێو لەباريدەچێت وترى الناس سكارى و هەموو خەڵكيش وەك مەست و سەرخۆش دەبينێ وماهم بسكارى خۆ لەڕاستييدا مەست و سەرخۆش نين (ولكن عذاب الله شديد) بەڵكوسزای خوا زۆر توندوسەختە ، بۆيە ئاوا بيرو هۆشيان نەماوەو، وەك سەرخۆشيان لێ هاتووە.(٢)

### ئايا هۆی دابەزينى ئەم ئايەتە پيرۆزە چی بوو؟

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: يَا آدَمُ فَيَقُولُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ كُلُّهُ فِي يَدَيْكَ. قَالَ: أَخْرِجْ بَعْثَ النَّارِ. قَالَ: وَمَا بَعْثُ النَّارِ؟ قَالَ: مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَمِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ فَعِنْدَهُ يَشِيبُ الصَّغِيرُ (وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شديدٌ) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَأَيُّنَا ذَلِكَ الْوَاحِدُ؟ قَالَ: (أَبْشِرُوا فَإِنَّ مِنْكُمْ رَجُلًا وَمِنْ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ أَلْفٌ) ثُمَّ قَالَ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ أَرْجُو أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الْجَنَّةِ) فَكَبَّرْنَا. فَقَالَ: (أَرْجُو أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الْجَنَّةِ) فَكَبَّرْنَا فَقَالَ: (أَرْجُو أَنْ تَكُونُوا نِصْفَ أَهْلِ الْجَنَّةِ) فَكَبَّرْنَا قَالَ: (مَا أَنْتُمْ فِي النَّاسِ إِلَّا كَالشَّعْرَةِ السَّوْدَاءِ فِي جِلْدِ ثَوْرٍ أَبْيَضَ أَوْ كشعرة بَيْضَاءَ فِي جِلْدِ ثَوْرٍ أَسْوَدَ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتە: لەئەبی سەعیدی خودریەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی : لە ڕۆژی قیامەت خوا دەفەرمووێ : ئەی ئادەم ، ئادەم دەڵێ: بەڵێ لەخزمەتدام و ئامادەم و هەموو خێرێك بەدەستی تۆیە، خوا دەفەرمووی : بینەدەرێ ئەوانەی ئەهلی ئاگرن ، ئادەم دەڵێ : كێن وچەندن ڕەوانكراوانی ئاگر؟ خوا دەفەرمووی (لە (١٠٠٠) كەس (٩٩٩) بۆ ئاگر ، لەو ڕۆژدا منداڵ پیردەبێ ، (ئافرەتی دوو گیان منداڵی لەباردەچێ، و خەڵكی وەكو سەرخۆشە، بەڵام سەرخۆش نین ،چونكە عەزابی خوا زۆر بەهێزە) هاوەڵان گوتیان : ئەو یەكە كێیە؟ پێغەمبەر فەرمووی :موژدەتان لێ بێ (١) لە ئێوە و (١٠٠٠) لە یاجوج وماجوج ) دوای فەرمووی: (سوێند بەوەی گیانی (محمد)ی بەدەستە ئومێدەوارم ئێوە چوارەكەی ئەهلی بەهەشت بن ) ئەبو سەعید دەڵێ ئێمەش (الله اكبر)مان كرد لەخۆشیان ، ئەوجارە فەرمووی : (ئومێدەوارم ئێوە سێیەكی ئەهلی بەهەشت بن ) ئەبو سەعید دەڵێ ئێمەش (الله اكبر)مان كرد لەخۆشیان ، ئەجارەش فەرمووی : (ئومێدەوارم ئێوە نیوەی ئەهلی بەهەشت بن) دەڵێ ئێمەش (الله اكبر)مان كرد لەخۆشیان، فەرمووی : ئێوە لەناو خەڵكی وەك داوە موێكی ڕەشن لە گایەكی سپی.

٢-وفي رواية-( عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ فَتَفَاوَتَ بَيْنَ أَصْحَابِهِ فِي السَّيْرِ فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَوْتَهُ بِهَاتَيْنِ الْآيَتَيْنِ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ إِلَى قَوْلِهِ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ فَلَمَّا سَمِعَ ذَلِكَ أَصْحَابُهُ حَثُّوا الْمَطِيَّ وَعَرَفُوا أَنَّهُ عِنْدَ قَوْلٍ يَقُولُهُ فَقَالَ هَلْ تَدْرُونَ أَيُّ يَوْمٍ ذَلِكَ قَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ ذَاكَ يَوْمٌ يُنَادِي اللَّهُ فِيهِ آدَمَ فَيُنَادِيهِ رَبُّهُ فَيَقُولُ يَا آدَمُ ابْعَثْ بَعْثَ النَّارِ فَيَقُولُ يَا رَبِّ وَمَا بَعْثُ النَّارِ فَيَقُولُ مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعُ مِائَةٍ وَتِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ فِي النَّارِ وَوَاحِدٌ فِي الْجَنَّةِ فَيَئِسَ الْقَوْمُ حَتَّى مَا أَبَدَوْا بِضَاحِكَةٍ فَلَمَّا رَأَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الَّذِي بِأَصْحَابِهِ قَالَ اعْمَلُوا وَأَبْشِرُوا فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ إِنَّكُمْ لَمَعَ خَلِيقَتَيْنِ مَا كَانَتَا مَعَ شَيْءٍ إِلَّا كَثَّرَتَاهُ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَمَنْ مَاتَ مِنْ بَنِي آدَمَ وَبَنِي إِبْلِيسَ قَالَ فَسُرِّيَ عَنْ الْقَوْمِ

بَعْضُ الَّذِي يَجِدُونَ فَقَالَ اعْمَلُوا وَأَبْشِرُوا فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ مَا أَنْتُمْ فِي النَّاسِ إِلَّا كَالشَّامَةِ فِي جَنْبِ الْبَعِيرِ أَوْ كَالرَّقْمَةِ فِي ذِرَاعِ الدَّابَّةِ) رواه الترمذي واحمد

معاني الكلمات( (الرقمة) الخط والرقمتان في الحمار هما الأثران اللذان في باطن عضديه والغاية بيان قلة عدد المؤمنين بالنسبة إلى الكافرين وأنهم غاية في القلة) ، (لبيك) أنا ملازم طاعتك لزوما بعد لزوم. (سعديك) أي ساعدت طاعتك مساعدة بعد مساعدة وإسعادا بعد إسعاد. (بعث النار) حزبها وأهلها. (فعنده) أي عند قول الله تعالى لآدم عليه السلام. (سكارى) جمع سكران وهو الذي غطى أثر الشراب عقله أي هم أشبه بالسكارى من شدة الأهوال وليسوا سكارى حقيقة.

وفي رواية (عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: نَزَلَتْ (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ) (الحج: ١) عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَهُوَ فِي مَسِيرٍ لَهُ، فَرَفَعَ بِهَا صَوْتَهُ حَتَّى ثَابَ إِلَيْهِ أَصْحَابُهُ، ثُمَّ قَالَ: (أَتَدْرُونَ أَيُّ يَوْمٍ هَذَا؟ يَوْمَ يَقُولُ اللَّهُ جَلَّ وَعَلَا لِآدَمَ: يَا آدَمُ، قُمْ فَابْعَثْ بَعْثَ النَّارِ مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَ مِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ»، فَكَبُرَ ذَلِكَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (سَدِّدُوا، وَقَارِبُوا، وَأَبْشِرُوا، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا أَنْتُمْ فِي النَّاسِ إِلَّا كَالشَّامَةِ فِي جَنْبِ الْبَعِيرِ، أَوْ كَالرَّقْمَةِ فِي ذِرَاعِ الدَّابَّةِ، وَإِنَّ مَعَكُمْ لَخَلِيقَتَيْنِ مَا كَانَتَا مَعَ شَيْءٍ قَطُّ إِلَّا كَثَّرَتَاهُ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ وَمَنْ هَلَكَ مِنْ كَفَرَةِ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ) روان ابن حبان قال الالباني صحيح

معاني الكلمات: (الشامة:علامةٌ في البدن او نقطة في البدن ، ناقة سوداء) (الرقمة: الروضة ،حديقة، جانب الوادي ،او مجتمع مائه) (قاموس المعاني

## ئەم فەرمووده باسی قیامەت دەكات:

(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَخْرُجُ الدَّجَّالُ فَيَمْكُثُ أَرْبَعِينَ) لَا أَدْرِي أَرْبَعِينَ يَوْمًا أَوْ شَهْرًا أَوْ عَامًا (فَيَبْعَثُ اللَّهُ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ كَأَنَّهُ عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ فَيَطْلُبُهُ فَيُهْلِكُهُ ثُمَّ يَمْكُثُ فِي النَّاسِ سَبْعَ سِنِينَ لَيْسَ بَيْنَ اثْنَيْنِ عَدَاوَةٌ ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ رِيحًا بَارِدَةً مِنْ قِبَلِ الشَّامِ فَلَا يَبْقَى عَلَى وَجْهِ الْأَرْضِ أَحَدٌ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ أَوْ إِيمَانٍ إِلَّا قَبَضَتْهُ حَتَّى لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ دَخَلَ فِي كَبِدِ جَبَلٍ لَدَخَلَتْهُ عَلَيْهِ حَتَّى تَقْبِضَهُ) قَالَ: فَيَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ فِي خِفَّةِ الطَّيْرِ وَأَحْلَامِ السِّبَاعِ لَا يَعْرِفُونَ مَعْرُوفًا وَلَا يُنْكِرُونَ مُنْكَرًا فَيَتَمَثَّلُ لَهُمْ الشَّيْطَانُ فَيَقُولُ أَلَا تَسْتَجِيبُونَ؟ فَيَقُولُونَ: فَمَا تَأْمُرُنَا؟ فَيَأْمُرُهُمْ بِعِبَادَةِ الْأَوْثَانِ وَهُمْ فِي ذَلِكَ دَارٌّ رِزْقُهُمْ حَسَنٌ عَيْشُهُمْ ثُمَّ يُنْفَخُ فِي الصُّورِ فَلَا يَسْمَعُهُ أَحَدٌ إِلَّا أَصْغَى لِيتًا وَرَفَعَ لِيتًا قَالَ: وَأَوَّلُ مَنْ يَسْمَعُهُ رَجُلٌ يَلُوطُ حَوْضَ إِبِلِهِ فَيَصْعَقُ وَيَصْعَقُ النَّاسُ ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ مَطَرًا كَأَنَّهُ الطَّلُّ فَيَنْبُتُ مِنْهُ أَجْسَادُ النَّاسِ ثُمَّ يُنْفَخُ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ ثُمَّ يُقَالُ: يَا أَيُّهَا الناسُ هَلُمَّ إِلى ربِّكم وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مسؤولون. فَيُقَالُ: أَخْرِجُوا بَعْثَ النَّارِ. فَيُقَالُ: مِنْ كَمْ؟ كَمْ؟ فَيُقَالُ: مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَمِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ قَالَ: (فَذَلِكَ يَوْمَ يَجْعَلُ الْوِلْدَانَ شِيبًا وَذَلِكَ يَوْمَ يُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ) رَوَاهُ مُسْلِمٌ

واتە: لەعەبدولاّی كوڕی عەمرەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی : (دەجال دێت و (٤٠) دەمێنێتەوە، راوی دەڵێ جا نازانم چل رۆژە یان چل مانگە یان چل ساڵە( جا خوا (عیسی) كوڕی مەریم رەوانە دەكات وەكو عورووەی كوڕی مەسعودە ، داوای رووبەرووبونەوەی دەجال دەكات و لەناوی دەبات ، دوای لەناو خەڵكی دەمێنێتەوە (٧) ساڵان ، ئەوەند دادگەری دەكات تەنانەت لە نێوان دووكەسیش دوژمنایەتی نیە، دوای خوا بایەكی سارد هەڵدەكا لەشامەوە هەرچی لەسەر زەویە بەقەدر تۆزقاڵێك خێری لەدڵدایە ، یان ئیمانی لەدڵدایە بەم بایە دەمرێ، ئەگەر بچنە كونی چیاكانیش بایەكە دێتە ئەوەێ، جا خەڵكی خراپ دەمێنێتەوە چاكەوخراپە نازانن ، جا شەیتان خۆیان بۆ دەگۆڕێ پێیان دەڵێ : بۆچی وەڵام نادەنەوە : دەڵێن : بەچی فەرمانمان پێ دەكەی؟

ئەویش فەرمانیان پێ دەکات بە پەرستنی بتەکان، بەردەوام بەم شێوە ، دوای فـودەکرێ بە صور ، ئەوەی گوێی لێ بێ ..............وە یەکەم کەس کە گوێی لێ دەبێ ، پیاوێکە حەوزی وشـترەکەی سـواق دەدات ، بردبێتـەوە دوای ئـەو خـەڵکی بردەبنـەوە، دوای خـوا بارانێك دەنێرێ، پێـی شـین دەبێتـەوە لاشـەی خـەڵکی ، دوایـی دووبـارە فودەکرێتـەوە ، خەڵکی رادەوستن وچاوەڕوانی دەکەن، دوایی دەگوترێ: ئەی خەڵکینە بڕۆن بۆ لای خوای خۆتـان ، رایـانبگرن ئەوانـە بەرپرسـیارن، دەگـوترێ : دەریـانبێنن رەوانکـراوی ئـاگر ، دەگوترێ: لەچەندی؟ و چەند؟ دەگوترێ لە (١٠٠٠) کەس (٩٩٩) دەڵێ: (ئەوە ئەو رۆژەیە منداڵ پیردەبێ ) و ئەوە رۆژەیە لاق دەردەکەوێ (لیت: تقتریب بها)

## چەند فەرموودەیەك لەسەر گەورەیی ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ

١-( عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمَا تَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟ قَالَ: فَكَبَّرْنَا، ثُمَّ قَالَ: (أَمَا تَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟) قَالَ: فَكَبَّرْنَا، ثُمَّ قَالَ: (إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا شَطْرَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَسَأُخْبِرُكُمْ عَنْ ذَلِكَ، مَا الْمُسْلِمُونَ فِي الْكُفَّارِ إِلَّا كَشَعْرَةٍ بَيْضَاءَ فِي ثَوْرٍ أَسْوَدَ، أَوْ كَشَعْرَةٍ سَوْدَاءَ فِي ثَوْرٍ أَبْيَضَ) رواه مسلم

واتە: لە عەبدوڵاوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر پێمانی فەرموو: ئایا رازی نابن ئێوە چوارێکی ئەهلی بەهەشت بن، ئێمەش لە خۆشیان تەکبیرمان لێدا، دوای فەرمووی : ئایـا رازی نـابن ئێوە سێبەکی ئەهلی بەهەشت بن، ئێمەش لە خۆشـیان تـەکبیرمان لێدا_ دوای فـەرمووی: ئومێدەوارم ئێوە نیوەی ئەهلی بەهەشت بن، وە هەواڵتان بدەمێ بەوە، موسڵمانان لە نـاو کافران وەکو تاڵە موێکی سپی وایە لە گایـەکی رەش ، یـان وەکـو داوە مـوێکی سـپی لـە گایەکی رەش.

٢-( أَنْتُمْ تُتِمُّونَ سَبْعِينَ أُمَّةً أَنْتُمْ خَيْرُهَا وَأَكْرَمُهَا عَلَى اللَّهِ) (رواه احمدو الترمذي والبيهقي والحاكم) عَن معاوية بن حيدة. قال الالباني حسن

واته: ئیوه حەفتا هەمین ئوممەتن ، وه ئیوه چاكترین و بەرێزترینن لای خوا.

٣-( عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (أَهْلُ الْجَنَّةِ عِشْرُونَ وَمِائَةُ صَفٍّ، أُمَّتِي مِنْهَا ثَمَانُونَ صَفًّا، وَسَائِرُ الْأُمَمِ أَرْبَعُونَ صَفًّا) الطبراني في المعجم الاوسط قال الالباني صحيح في جامع الصغير

واته: پێغەمبەر فەرموویەتی : ئەهلی بەهەشت سەد و بیست ریزه، ئوممەتی من بەنیا هەشتا ریزه، بەهەموو ئوممەتانی دیكه چل ریزه.

**********************

## وتاری ژماره (٦٨) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١١) سورەتی الحج

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعْبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ ۖ فَإِنْ أَصَابَهُۥ خَيْرٌ ٱطْمَأَنَّ بِهِۦ ۖ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةَ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴿١١﴾ الحج

واته : هەندێك لە خەڵكی هەیە تەنها لە یەك حاڵەتدا خواپەرستی دەكات (ئەویش ئەو حاڵەتەیە كە دنیا بەدڵی ئەو بێت)، ئەگەر تووشی خێرو خۆشی بوو دڵی پێی خۆشە، خۆ ئەگەر تووشی تاقیكردنەوەیەك هات، سواری سەری خۆی دەبێت و هەڵدەگەڕێتەوە، ئا بەو حاڵەتەی دنیا و قیامەت لە دەست خۆی دەدات و زەرەرمەندی هەردوو لا یە و هەر ئەوەشە خەسارەتمەند و زەرەرمەندی ڕوون و ئاشكرا. ( تەفسیری ئاسان)

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ قَالَ كَانَ الرَّجُلُ يَقْدَمُ الْمَدِينَةَ فَإِنْ وَلَدَتْ امْرَأَتُهُ غُلَامًا وَنُتِجَتْ خَيْلُهُ قَالَ هَذَا دِينٌ صَالِحٌ وَإِنْ لَمْ تَلِدْ امْرَأَتُهُ وَلَمْ تُنْتَجْ خَيْلُهُ قَالَ هَذَا دِينُ سُوءٍ ) رواه البخاري

واتە: لەئیبنو عەباسەوە هاتووە خوا لە خۆی وبابی رازی بێ :ئایەتی (وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ) دەڵێ: پیاوانێك دەهاتنە مەدینە ئەگەر خێزانی منداڵی بوایە و ئەسپیشی زۆربوایە دەیگوت ئەوە ئایینێکی باشە ، ئەگەر خێزانی منداڵی نەبوایە وئەسپەکانی زاوەزێیان نەکردبایە، دەیگوت ئەوە ئاینێکی خراپە.

٢-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ ناس مِنَ الأعراب يَأْتُونَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيُسْلِمُونَ، فإذا رَجَعوا إِلَى بلادِهِم فَإِنْ وَجَدوا عَامَ غَيْثٍ وَعَامَ خِصْبٍ وَعَامَ وِلادٍ حَسَنٍ، قالوا: إِنَّ ديننا هَذَا صالحٌ فَتَمَسَّكُوا بِهِ، وإِنْ وَجَدوا عامَ جَدْبٍ وعامَ وِلادٍ سوء وعامَ قَحْطٍ، قالوا: مَا في ديننا هَذَا خيرٌ. فأنزل الله وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ ) اخرجه ابن ابي حاتم

واته: له ئیبنو عەباسەوە هاتووە خوا لێ رازی بێ دەڵێ: کەسانێك هەبوون لە عەرەبی بیابان نشین ، دەهاتنە لای پێغەمبەر و موسڵمان دەبوون ، کاتێ دەگەرانەوە بۆ وەڵاتی خۆیان ، ئەگەر ئەو ساڵە باران بارییایەو گیاوگۆڵ زۆربایە و منداڵی چاکیان بوایە ، دەیانگوت بەراستی ئایینێکی چاکە دەستی پێوە بگرن، وە ئەگەر ساڵێکی وشك ومنداڵی خراپ و قات وقری وگرانی بوایە ، دەیانگوت ئایینی ئێمە خێری پێوە نیە، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ) واتە: خەڵکی وا هەیە تەنها لە یەك حاڵەت خواپەرستی دەکات ، ئەویش بەدڵی ئەو بێ.

الحرف : للحب واتە بۆخۆشی کارەکە دەکات، خواپەرستی دەکات لەخۆشی بەلام خواپەرستی ناکات لە ناخۆشی)

## ٣-هۆی دابەزینی ئایەتی (١٩) سورەتی الحج

(هَٰذَانِ خَصۡمَانِ ٱخۡتَصَمُواْ فِي رَبِّهِمۡۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ قُطِّعَتۡ لَهُمۡ ثِيَابٞ مِّن نَّارٖ يُصَبُّ مِن فَوۡقِ رُءُوسِهِمُ ٱلۡحَمِيمُ ١٩) الحج

واتە: ئەمانە دوو کۆمەڵی دژ بەیەکن دەمەقاڵێ و کێشەیانە دەربارەی پەروەردگاریان جا ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون (لە ڕۆژی دوایی دا) پۆشاکیان بۆ دەبڕدرێت (پڕ بەبەریان) لە ئاگر بەسەریاندا دەڕژێنرێ ئاوی زۆر گەرم.(پوختەی تەفسیر)

١-(عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ أَنَا أَوَّلُ مَنْ يَجْثُو بَيْنَ يَدَيْ الرَّحْمَنِ لِلْخُصُومَةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ قَالَ قَيْسٌ وَفِيهِمْ نَزَلَتْ هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ قَالَ هُمْ الَّذِينَ بَارَزُوا يَوْمَ بَدْرٍ عَلِيٌّ وَحَمْزَةُ وَعُبَيْدَةُ وَشَيْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ وَعُتْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ وَالْوَلِيدُ بْنُ عُتْبَةَ ) رواه البخاري

واتە: لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە هـاتووە خـوا لێـی رازی بـێ دەڵـێ: مـن یەکـەم کەسـم رادەوەستم لەبەر دەستی خوا لە ڕۆژی قیامەت بۆ کێشمەکێش لەگەڵ کافران ، وە قـەیس دەڵێ: (هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ) دەربـارەی ئەوانـە دابـەزی ، دەڵـێ: ئەوانـە ئـەو کەسانە بوون کە لـە ڕۆژی (بـەدر) بـۆ یـەك هاتنـە میـدان کـە ئەمانـە بـوون (عَلِيٌّ وَحَمْزَةُ وَعُبَيْدَةُ وَشَيْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ وَعُتْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ وَالْوَلِيدُ بْنُ عُتْبَةَ)

معانی الکلمات (یجثو :رادەوەستی لەسەر پەنجان)

٢-(عَنْ قَيْسِ بْنِ عَبَّادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا ذَرٍّ يُقْسِمُ بِاللهِ ، إنَّ هَذِهِ الْآيَةَ (هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ) (الحج: ١٩) نَزَلَتْ فِي الَّذِينَ بَرَزُوا يَوْمَ بَدْرٍ الثَّلَاثَةِ ، وَالثَّلَاثَةِ حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ وَعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ وَعُبَيْدَةَ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ الْمُطَّلِبِ وَعُتْبَةَ وَشَيْبَةَ بْنُ رَبِيعَةَ، وَالْوَلِيدِ بْنِ عُتْبَةَ ) مشكل الآثار للطحاوي

## موبارەزە ( شمشێربـازی ) بەم شێوە بوو ڕۆژی بەدر:

٣-(فَذَكَرُوا قِصَّةَ بَدْرٍ وَفِيهَا: ثُمَّ خَرَجَ عُتْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ وَشَيْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ وَالْوَلِيدُ بْنُ عُتْبَةَ فَدَعَوْا إِلَى الْبِرَازِ ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ فِتْيَةٌ مِنَ الْأَنْصَارِ ثَلَاثَةٌ ، فَقَالُوا: مِمَّنْ أَنْتُمْ؟ قَالُوا: رَهْطٌ مِنَ الْأَنْصَارِ. قَالُوا: مَا بِنَا إِلَيْكُمْ حَاجَةٌ. ثُمَّ نَادَى مُنَادِيهِمْ: يَا مُحَمَّدُ أَخْرِجْ إِلَيْنَا أَكْفَاءَنَا مِنْ قَوْمِنَا. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قُمْ يَا حَمْزَةُ ، قُمْ يَا عَلِيُّ ، قُمْ يَا عُبَيْدَةُ . فَلَمَّا قَامُوا وَدَنَوْا مِنْهُمْ قَالُوا: مِمَّنْ أَنْتُمْ؟ قَالَ حَمْزَةُ: أَنَا حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ ، وَقَالَ عَلِيٌّ: أَنَا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ، وَقَالَ عُبَيْدَةُ: أَنَا عُبَيْدَةُ بْنُ الْحَارِثِ. فَقَالُوا: نَعَمْ أَكْفَاءٌ كِرَامٌ ، فَبَارَزَ عُبَيْدَةُ عُتْبَةَ فَاخْتَلَفَا ضَرْبَتَيْنِ كِلَاهُمَا أَثْبَتَ صَاحِبَهُ ، وَبَارَزَ حَمْزَةُ شَيْبَةَ فَقَتَلَهُ مَكَانَهُ ، وَبَارَزَ عَلِيٌّ الْوَلِيدَ فَقَتَلَهُ مَكَانَهُ ، ثُمَّ كَرَّا عَلَى عُتْبَةَ فَذَفَفَا عَلَيْهِ وَاحْتَمَلَا صَاحِبَهُمَا فَحَازُوهُ إِلَى الرَّحْلِ) رواه البيهقي

واتە: چیرۆکی (بەدر) بەم شێوەیە بوو ، (عوتبە کوڕی رەبیعە و شیبەی کوڕی رەبیعە و وەلیدی کوڕی عوتبە ) هاتنە دەر لەناو سوپا داوای موبارەزەیان کرد، لە تەرەف موسڵمانانیش سێ لە موسڵمانانی ئەنصار بۆیان هاتنە میدان ، گوتیان ئێوە کێن؟ گوتیان ئێمە کۆمەڵی ئەنصارین ، گوتیان ئێمە ئیشمەمان بە ئێوە نیە، وە یەکێ لەکافران بانگی کرد ئەی (محمد) با کەسانێك بێنە میدان لە قەومی خۆمان بن، جا پێغەمبەر فەرمووی : ئەی حەمزە هەڵسە، ئەی (علی) هەڵسە ، ئەی (عبیدە) هەڵسە، کاتێ هەڵسان ولێیان نزیك بونەوە، گوتیان : ئێوە کێن؟ حەمزە گوتی : من حەمزەی کوڕی عبدالموتەلیبم ، علیش گوتی : من علی کوڕی ئەبو تالیبم، عوبیدەش گوتی : من عوبیدەی کوڕی حارسم ، گوتیان: بەڵێ ئێستا هاوشانی خۆمانی بەرێزن، عوبیدە وعوتبە موبارەزەیان کرد، یەك و لێدانێکیان لەیەك دا، حەمزەو شەیبە کەوتنە بەرامبەری یەك ، حەمزە شیبەی کوشت، عەلیش وەلیدی کوشت ، دوای بە علی و حەمزە بۆ عوتبە چوون بە هەردووکیان کوشتیان، بەلأم عوبیدە بەسەختی بریندار بوو دوای شەهید بوو.

(مُبارَزة: زۆران بازی ، شمشێر بازی) فەرهەنگی سەرچاوە (كَرَّ عليه كَرًّا وكُرُوراً وتَكْراراً: عَطَفَ) قاموسط المیط

## شەری بەدری گەورە بەکورتی :

١-وشەی (بدر) ناوی بیرێکە پیاوێك لە هۆزی غەفار هەڵی کەندوە

٢-موسڵمان بۆ کاروان گرتن چوون، ئەو کاروانەی (٣٠-٤٠) کەس بوون.

(عن ابی ایوب الانصاری قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ بِالْمَدِينَةِ: إِنِّي أُخْبِرْتُ عَنْ عِيرِ أَبِي سُفْيَانَ أَنَّهَا مُقْبِلَةٌ، فَهَلْ لَكُمْ أَنْ نَخْرُجَ قِبَلَ هَذِهِ الْعِيرِ لَعَلَّ اللَّهَ يُغْنِمُنَاهَا؟ فَقُلْنَا: نَعَمْ فَخَرَجَ وَخَرَجْنَا، فَلَمَّا سِرْنَا يَوْمًا أَوْ يَوْمَيْنِ قَالَ لَنَا: مَا تَرَوْنَ فِي الْقَوْمِ، فَإِنَّهُمْ قَدْ أُخْبِرُوا بِمَخْرَجِكُمْ؟ فَقُلْنَا: لَا وَاللَّهِ مَا لَنَا طَاقَةٌ بِقِتَالِ الْقَوْمِ، وَلَكِنَّا أَرَدْنَا الْعِيرَ.ثُمَّ قَالَ: مَا تَرَوْنَ فِي

قِتَالِ الْقَوْمِ؟ فَقُلْنَا مثل ذَلِك.فَقَامَ الْمِقْدَاد بن عَمْرو [فَقَالَ] : إِذًا لَا نَقُولُ لَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ كَمَا قَالَ قَوْمُ مُوسَى لِمُوسَى: اذْهَبْ أَنْتَ وَرَبك فَقَاتلا إِنَّا هَا هُنَا قَاعِدُونَ.قَالَ: فَتَمَنَّيْنَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ لَوْ أَنَّا قُلْنَا مِثْلَ مَا قَالَ الْمِقْدَادُ، أَحَبُّ إِلَيْنَا مِنْ أَنْ يَكُونَ لَنَا مَالٌ عَظِيمٌ، فَأَنْزَلَ الله عزوجل عَلَى رَسُولِهِ: كَمَا أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنْ بَيْتِكَ،بِالْحَقِّ وَإِن فريقا من الْمُؤمِنِينَ لكارهون وَذكر تَمام الحَدِيث. روى ابْنُ مَرْدَوَيْهِ أَيْضًا، مِنْ طَرِيقِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَلْقَمَةَ بْنِ وَقَّاصٍ اللَّيْثِيِّ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى بَدْرٍ، حَتَّى إِذَا كَانَ بِالرَّوْحَاءِ خَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: "كَيْفَ تَرَوْنَ؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ بَلَغَنَا أَنَّهُمْ بِكَذَا وَكَذَا.قَالَ: ثُمَّ خَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: كَيْفَ تَرَوْنَ؟ فَقَالَ عُمَرُ مِثْلَ قَوْلِ أَبِي بَكْرٍ.ثُمَّ خَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: كَيْفَ تَرَوْنَ؟ فَقَالَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ: يَا رَسُول الله إيانا تُرِيدُ؟ فو الذى أَكْرَمَكَ وَأَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مَا سَلَكْتُهَا قَطُّ وَلَا لِي بِهَا عِلْمٌ، وَلَئِنْ سِرْتَ حَتَّى تَأْتِيَ بَرْكَ الْغِمَادِ مِنْ ذِي يَمَنٍ لَنَسِيرَنَّ مَعَكَ، وَلَا نَكُونُ كَالَّذِينِ قَالُوا لِمُوسَى: اذْهَبْ أَنْت وَرَبك فَقَاتلا إِنَّا هَا هُنَا قَاعِدُونَ.وَلَكِنِ اذْهَبْ أَنْتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلَا إِنَّا مَعَكُمْ متبعون) سيرة ابن كثير

٣-كاتێ كافران دەزانن مەترسی دروست دەبێ بۆ كاروان ، خۆیان ئامادە دەكەن بە(١٠٠٠) كەسیان دێت بۆ جەنگ ، ژمارەی موسڵمانان (٣١٩) كەس بوون

٤-پێغەمبەر (عبدالله كوڕی ئوم مكتوم) بەجێ هێشت بۆ ئیمامتی كردن، ئەبو لبابەش بۆ سەر سەرپەشتیاری مەدینە.

٥-ئەنجامەكانی شەر:

(حەفتا لە كافران كوژاو حەفتایان لێ بەدیل گیرا،دواتر دیلەكان بەپارەیان دەبێ هەر یەك (١٠) مندالّی موسڵمانان فێری خوێندەواری بكات

چواردە كەس لە هاوەلآن شەهید بوون)

*********************

# وتاری ژماره (٦٩) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٣١) سورەتی الحج

﴿حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيۡرَ مُشۡرِكِينَ بِهِۦۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخۡطَفُهُ ٱلطَّيۡرُ أَوۡ تَهۡوِي بِهِ ٱلرِّيحُ فِي مَكَانٖ سَحِيقٖ ٣١﴾ الحج

واتە: گەردن کەچ بن بۆ خوا (خۆتان لە هەموو بیرو باوەڕێکی لار دوور بگرن) هاوبەش بڕیاردەر مەبن بۆ خوا جا هەر کەس هاوبەش بۆ خوا دابنێ ئەوە وەك ئەوە وایە لە ئاسمان کەوتبێتە خوارەوە ئینجا باڵندە (لە هەوادا) بەپەلە بیفڕێنێ (پارچە پارچە بێت) یا بایەکی توند بیبات بۆ جێگایەکی زۆر دوور (چۆڵەوان) ی.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆز چی بوو؟

١-( عن أبي بكر الصديق قال: كان الناس يحجون وهم مشركون فكانوا يسمونهم حنفاء الحجاج، فنزلت حنفاء لله غير مشركين به) اخرجه ابن ابي حاتم في تفسيره

واتە: لەئەبوبەکری صدیقەوە هاتووە دەڵێ: خەڵکی حەجیان دەکرد و لەهەمان کاتدا موشریکیش بوون ، جا پێیان دەگوتن (حنفاء الحجاج) واتە: (حاجی ملکەچ کەر بۆ خوا) جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی ﴿حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيۡرَ مُشۡرِكِينَ بِهِۦ﴾ واتە: ملکەچکەر بۆ خوا تەنها ئەوانن کە هاوبەش بۆ خوا بڕیارنادەن.

٢-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ: حُنَفَاءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِ قَالَ: حجاجًا لله غير مشركين به، وذلك إنَّ الجاهلية كانوا يحجون مشركين فلما أظهر الله الإسلام قَالَ الله للمسلمين: حجوا الآن غير مشركين بالله) اجرجه ابن ابي حاتم في تفسيره

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٣٧ ) سورەتی الحج

﴿لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُحْسِنِينَ ٣٧﴾ الحج

واتە : هەرگیز ناگات بە خوا نە گۆشتی ئەو (قوربانی) انە نە خوێنیان بەڵام ئەوەی بە خوا دەگات تەقواو پارێزکاری ئێوەیە ئا بەوجۆرە ئەوماڵاتانەی بۆ ئێوە ڕام هێناوە بۆ ئەوەی خوا بە گەورە بگرن (یادی بکەن) لەسەر ئەوەی ڕێنموونی کردوون وە مژدە بدە بە چاکەکاران.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: كَانَ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ يَنْضَحُونَ الْبَيْتَ بِلُحُومِ الْإِبِلِ وَدِمَائِهَا، فَقَالَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَنَحْنُ أَحَقُّ أَنْ نَنْضَحَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (لَن يَنَالَ اللَّهَ لُحُومُهَا وَلاَ دِمَآؤُهَا وَلَكِنْ يَنَالُهُ التَّقْوَى منكم) (أخرجه ابن أبي حاتم)و (الدر المنثورللسيوطي)

واتە: لەئیبنو جوریجەوە هاتووە دەڵێ: خەڵکی زەمانی جاهیلی کەعبەیان دەرشاند بە گۆشت وخوێنی وشتر ، هاوەڵانی پێغەمبەر خوایان لێ رازی بێ گوتیان ئێمە لە پێشترین ماڵی خوا برشێنین بەگۆشت وخوێن ، جا خواش ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (لَن يَنَالَ اللَّهَ لُحُومُهَا وَلاَ دِمَآؤُهَا وَلَكِنْ يَنَالُهُ التَّقْوَى منكم) واتە: گۆشت وخوێن ناگاتە خوا بەڵکو تەقوای ئێوە دەگاتە خوا. (نضح البيت: ماڵی ئاو رشێن کرد)

٢-(قَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ: النُّصُبُ: لَيْسَتْ بِأَصْنَامٍ ، الصَّنَمُ يُصَوَّرُ وَيُنْقَشُ ، وَهَذِهِ حِجَارَةٌ تُنْصَبُ ثَلَاثُمِائَةٍ وَسِتُّونَ حَجَرًا ، مِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ: ثَلَاثُمِائَةٍ مِنْهَا لِخُزَاعَةَ. فَكَانُوا إِذَا ذَبَحُوا ، نَضَحُوا الدَّمَ عَلَى مَا أَقْبَلَ مِنَ الْبَيْتِ ، وَشَرَحُوا اللَّحْمَ وَجَعَلُوهُ عَلَى الْحِجَارَةِ ، فَقَالَ الْمُسْلِمُونَ: يَا

رَسُولَ اللَّهِ ، كَانَ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ يُعَظِّمُونَ الْبَيْتَ بِالدَّمِ ، فَنَحْنُ أَحَقُّ أَنْ نُعَظِّمَهُ. فَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَكْرَهْ ذَلِكَ ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (لَنْ يَنَالَ اللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَاؤُهَا) (الحج: ٣٧) وَمِمَّا يُحَقِّقُ قَوْلَ ابْنِ جُرَيْجٍ فِي أَنَّ الْأَنْصَابَ غَيْرُ الْأَصْنَامِ مَا) اخرجه الطبري في (جامع البيان) والدر المنثور للسيوطي

## پاداشتی قوربانی شەرعی :

(وَعَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا عَمِلَ ابْنُ آدَمَ مِنْ عَمَلٍ يَوْمَ النَّحْرِ أَحَبَّ إِلَى اللَّهِ مِنْ إِهْرَاقِ الدَّمِ وَإِنَّهُ لَيُؤْتَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِقُرُونِهَا وَأَشْعَارِهَا وَأَظْلَافِهَا وَإِنَّ الدَّمَ لَيَقَعُ مِنَ الله بمَكَانٍ قَبْلَ أَنْ يَقعَ بِالْأَرْضِ فَطِيبُوا بِهَا نَفْسًا) رَوَاهُ التِّرْمِذِيّ وَابْن مَاجَه قال الالباني صحيح

واتە: لە عائیشەی دایکی ئیمانداران هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی: ئادمیزاد هیچ کردەوەیەکی نەکردوە خۆشەویستربێ لەلای خوا لە خوێن رشتن وقوربانی لە چەژن ، کەسی قوربانی کەر ڕۆژی قیامەت دێ بە شاخەکان وموەکان وسمەکان هەموویانی بۆ دەبنە خێر ، پێش ئەوەی خوێنکە بگاتە سەر زەوی پاداشت لەی خوا جێگیر دەبێ، کەواتە دەروونی خۆتانی پێ خۆش بکەن وپاك بکەنەوە.

## ٣-هۆی دابەزینی ئایەتی (٣٩) سورەتی الحج

(أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ ٣٩) الحج

واتە : فەرمان بە جیهاد و تۆڵە کردنەوە: بڕیارو مۆڵەتی تۆلەکردنەوە دراوە بەرامبەر بەو ئیماندارانەی شەڕیان بەسەردا سەپێنراوە و جەنگیان لەگەڵکراوە – لەلایەن بێ بڕواکانەوە – چونکە ناهەقی و ستەمیان لێکراوە. (ئیبن عەبباس) ئەڵێت: ئەم ئایەتەی

(أڎن..) یەکەم ئایەتێك بوو لەرێدان بەجیهاد، گەلێ جار یاران و هاوەڵان بەسەر شکاویی و دەست شکاوی ئەهاتنە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).. ئەویش ئەیفەرموو: خۆتـان ڕابگرن، تا ئێستاش فەرمان بەجیهاد نەهاتووە، ئەوسا لەناچارییدا کۆچیان کرد ،پاشـان ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو مۆڵەتی جەنگیان پێدراو دڵنیاشی کردن کە هەمیشە لـەژێر حیمایەت و پارێزگاری خوادا دەبن بەڕاستی خواش بۆ کۆمەك و یارمەتیدانیان زۆر بەتواناو بەهێزە، چونکە ئەو بڕوادارانە سەرەڕای ئـەوەی ستەمی عەقیدەیان لێکراوە، لـەوڵات و ناوچەو خاك و نیشتمانیشیان دەرکراون، (ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(قَالَ الْمُفَسِّرُونَ: كَانَ مُشْرِكُو أَهْلِ مَكَّةَ يُؤْذُونَ أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – فَلَا يَزَالُونَ يَجِيئُونَ مِنْ بين مضروب ومجشوج، فَشَكَوْهُمْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – فَيَقُولُ لَهُمْ: (اصْبِرُوا فإني لم أؤمر بِالْقِتَالِ) حَتَّى هَاجَرَ رَسُولُ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الْآيَةَ ) الواحدي في اسباب النزول

واتە: توێژەرەوانی قورئـان دەڵـێن : موشـریکانی مەککە ئـازاری هـاوەڵانی پێغەمبـەریان دەدا، ئـەوانیش دەهاتنـە لای پێغەمبـەر بـە لێـدراوی وبرینـداری سـکاڵای حـاڵی خۆیـان دەکـرد، ئـەویش پێـی دەفـەرموون : ئـارام بگـرن مـن فـەرمانی جـەنگم پێنـەدراوە) تـاکو پێغەمبەر کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئەوجا خـوا ئـەم ئایەتـەی دابەزانـدو فـەرموو(أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ) واتـە : مۆڵـەت دراو بەوانـەی زوڵمیان لێ کراوە شەڕبکەن .

٢-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أَخْرَجَ أَهْلُ مَكَّةَ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، أَخْرَجُوا نَبِيَّهُمْ؛ لَيَهْلِكُنَّ . قَالَ: فَقَرَأَ: (أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ) (الحج: ٣٩) وَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ

رَضِيَ اللهُ عَنْهُ يَقْرَؤُهَا. قَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: فَعَلِمْتُ أَنَّهَا قِتَالٌ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَهِيَ أَوَّلُ آيَةٍ نَزَلَتْ فِي الْقِتَالِ) (أخرجه الترمذي والنسائي وأحمد وابن حبان والطبري والحاكم من طريق الأعمش به.وقال الترمذي والواحدي والصحيح المسند من اسباب النزول ولباب المنقول للسيوطي وصححه الحاكم، والألباني

واته: له ئیبنو عەباسەوە هاتووە خوا لە خۆی وبابی رازی بیٚ دەڵیٚ: خەڵکی مەککە پیٚغەمبەریان ناچار کرد بڕوات له مەککە ، ئەبوبەکر خوا لیٚ رازی بیٚ گوتی (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ،) پیٚغەمبەری خۆیان ودەرنا ، و بەهیلاك دەچن ، ئیبنو عەباس دەڵیٚ : ئەبوبەکر ئەم ئایەتەی خوێندەوە (أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ) ئیبنو عەباس ئایەتەکەی خوێندەوە و گوتی : ئەبوبەکر گوتی : زانیم ئەوە بۆ جەنگکردنە و ئیبنو عەباس دەڵیٚ : ئەوە یەکەمین ئایەتی جەنگە دابەزیوە.

**********************

## وتاری ژماره (٧٠) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### سورەتی (المومنؤن)

سورەتێکی مەککی یە ، لەریزبەندا ژمارە (٢٣)ە و ژمارەی ئایەتەکانی (١١٨)ئایەتە ، باسی چیرۆکی هەندێ لە پێغەمبەران دەکات و لە کۆتایدا باسی لەوە دەکات خەڵکی لە رۆژی قیامەت دەبنە بە دوو بەش ، بەشێك بۆ ئاگر و بەشێك بۆ دۆزەخ

–ئایا بۆچی ناونراوە (المومنون) ؟ چونکە باسی کۆمەڵێك سیفاتی ئیمانداران دەکات کە بەم سیفەتانە دەبنە میراتگری فیردەوس .

**–دە سیفەتی ئیمانداران :**

١-( قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ١ ) واتە: بەڕاستی باوەڕداران ڕزگار دەبن واتە سەر دەکەون.

٢-( ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ٢ ) واتە: ئەو کەسانەی کە لە نوێژەکانیاندا لەخوا ترسن (گەردن کەچن) بۆ خوا.

٣-( وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ٣ ) واتە: وە ئەوانەی لە شتی بێ هودە خۆیان دوور دەگرن.

٤-( وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ٤ ) واتە: وە ئەوانەی کە زەکاتی (سامانیان) دەردەکەن.

٥-( وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ ٥ ) واتە: وە ئەوانەی کە پارێزەری داوێنیانن (لە شەڕواڵ پیسی) ی.

٦-( إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ٦ فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ ٧ ) واتە: مەگەر بۆ خێزانی خۆیان یا بۆ کەنیزەکێك کە بوو بن

به خاوەنیان ئەوە بەڕاستی ئەوانە سەرزەنشت ناکرێن.(٦) ئینجا هەر کەسێ نیازی جگە لەو (دووجۆرە ئافرەتە) بکات (و ئارەزووی تێر بکات) ئەوسا ئەوانە دەست درێژی کەرن.

٧-﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَٰنَٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ رَٰعُونَ ٨ ﴾ واتە: وە ئەوانەی کە پارێزەری سپاردەو پەیمانەکانیانن.

٨-﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمۡ يُحَافِظُونَ ٩ ﴾ واتە: وە ئەوانەی کە بەردەوامن لەسەر نوێژەکانیان.

٩-﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ١٠ ﴾ واتە: هەر ئەوانەن میرات گران.

١٠-﴿ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡفِرۡدَوۡسَ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ١١ ﴾ واتە: ئەوانەی کەدەبنە خاوەن فیردەوس (بەهەشت) ئەوان لە بەهەشتدا دەمێننەوە بە هەمیشەیی.

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١٤) سورەتی المومنون

﴿ثُمَّ خَلَقۡنَا ٱلنُّطۡفَةَ عَلَقَةٗ فَخَلَقۡنَا ٱلۡعَلَقَةَ مُضۡغَةٗ فَخَلَقۡنَا ٱلۡمُضۡغَةَ عِظَٰمٗا فَكَسَوۡنَا ٱلۡعِظَٰمَ لَحۡمٗا ثُمَّ أَنشَأۡنَٰهُ خَلۡقًا ءَاخَرَۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ ١٤﴾ المومنون

واتە (دواتر نوتفەکەمان کرد بە خوێنی مەییو ئینجا خوێنە مەییوەکەشمان کرد بە پارچە گۆشتێکی جووواو ئینجا ئەویشمان کرد بە ئێسقان ئینجا بە گۆشت (پەیکەرە) ئێسکەکەمان داپۆشی پاشان ئەومان کرد بە دروست کراوێکی تر جا گەورە و پیرۆزە ئەو خوایەی کە چاکترینی بەدی هێنەرانە. (پوختەی تەفسیر)

﴿عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ – صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ –، وَهُوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ: ﴿إِنَّ خَلْقَ أَحَدِكُمْ يُجْمَعُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا نُطْفَةً، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَبْعَثُ اللَّهُ إِلَيْهِ مَلَكًا بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ: فَيَكْتُبُ عَمَلَهُ، وَأَجَلَهُ، وَرِزْقَهُ، وَشَقِيٌّ، أَوْ سَعِيدٌ، ثُمَّ يَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ فَوَالَّذِي لَا إِلَهَ غَيْرُهُ إِنَّ أَحَدَكُمْ يَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ، وَبَيْنَهَا إِلَّا ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ

أَهْلِ النَّارِ فَيَدْخُلُهَا. وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إِلَّا ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتـه: بێگومـان، هەریـەك لـەئێوە چـل ڕۆژ بەنوتفـەیی لەمنداڵدانی دایكیـدا دەمێنێتـەوە، دیسان چل ڕۆژی تر بەخوێنپارەیی، ئەوسا كەبووە گۆشتپارەش هەروا، واتـە: تـا ئەوسـێ قۆناغە (١٢٠) ڕۆژ دەبڕێ ، یادەڵێن: چوار مانگ دەچێ، ئەوجا خوای باڵادەست فریشتە دەنێـرێ و، فـوی پیادەكـاو، (ڕۆح) دەكـرێ بەبـەریا ! ئـیتر هەرلـەو كاتـەوە چـوار شـتی بۆدیاری دەكـرێ: ڕزق و ڕۆزی، تەمـەن و ئاكـامیی، كـارو كـردەوەی، چارەنووسـیی (بـەد بەختیی ،یان بەختیاریی)....................)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم رستە(فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ) لەم ئایەتەچی بوو؟

١-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَمَّا نزلتْ (وَلَقَد خلقنَا الإنسان من سلالة من طين) قَالَ عُمَرُ: فَتَبَارَكَ الله أحسنُ الْخَالِقِينَ فنزلتْ (فَتَبَارَكَ الله أحسنُ الْخَالِقِينَ) الدر المنثور والطبراني

واتە: لەعەبدوڵای كوڕی عەباسەوە هاتووە دەڵـێ: كـاتێ ئـەم ئایەتـە دابـەزی (وَلَقَد خلقنَا الإنسان من سلالة من طين.......) عومـەر گـوتی (فَتَبَارَكَ الله أحسنُ الْخَالِقِينَ)) لـە دوای قسەی عومەر ئەو رستە قورئانی یە دابەزی (فَتَبَارَكَ الله أحسنُ الْخَالِقِينَ)

– وفي روايه –عَن صَالح أبي الْخَلِيل قَالَ: نزلت هَذِه الْآيَة على النَّبِي صلى الله عَلَيْهِ وَسلم (وَلَقَد خلقنَا الإنسان من سلالة من طين) إِلَى قَوْله (ثمَّ أَنْشَأْنَاهُ خلقا آخر) قَالَ عمر (فَتَبَارَكَ الله أحسن الْخَالِقِينَ) فَقَالَ وَالَّذِي نَفسِي بِيَدِهِ إِنَّهَا خُتِمَتْ بِالَّذِي تَكَلَّمْتَ يَا عمر) الدر المنثور للسيوطي

وەبەم گێرانەوەش هاتووە :

( قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: وَافَقْتُ رَبِّي فِي أَرْبَعٍ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ صَلَّيْنَا خَلْفَ الْمَقَامِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى وَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوِ اتَّخَذْتَ عَلَى نِسَائِكَ حِجَابًا، فَإِنَّهُ يَدْخُلُ عَلَيْكَ الْبَرُّ وَالْفَاجِرُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتاعاً فَسْئَلُوهُنَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ وَقُلْتُ لأزواج النبي صلى اللّه عليه وسلم: لَتَنْتَهُنَّ أَوْ لَيُبَدِّلَنَّهُ اللَّهُ سُبْحَانَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ الْآيَةَ. وَنَزَلَتْ: وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ سُلَالَةٍ مِنْ طِينٍ إِلَى قَوْلِهِ تَعَالَى: ثُمَّ أَنْشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَقُلْتُ: (فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ. فَنَزَلَتْ) : فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ)
اخرجه الواحدي في اسباب النزول ولباب المنقول للسيوطي والدر المنثور

واتە: عومەری کوڕی خەتاب خوا لێ رازی دەڵێ: قسەی من لەگەڵ قسەی خوا تێکی کردەوە لە چوار شوێنان ، ١-گوتم ئەی نێرراوی خوا خۆزگە لەپاش مەقامی (ابراهیم) نوێژمان کردبایە ، خوا لەم بارەوە ئایەتی دابەزاندوفەرمووی (وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى) ٢-گوتم ئەی نێرراوی خوا خۆزگە پەردەت دەگرتەوە لەنێوان میوان و خێزانەکانت چونکە پیاوی چاك وخراپ دێنە ماڵەکەت ، خوا لەم بارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتاعاً فَسْئَلُوهُنَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ) ٣-گوتمە خێزانەکانی پێغەمبەر ئەگەر واز لە پێغەمبەر نەهێنن وداواکاری قورسی لێ بکەن، خوا لە جیاتی ئێوە ئافرەتی چاکتری بە قیسمەت دەکات، لەم بارەش خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ الْآيَةَ) ٤- کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی (وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ سُلَالَةٍ مِنْ طِينٍ إِلَى قَوْلِهِ تَعَالَى: ثُمَّ أَنْشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ) گوتم (فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ) لەدوو قسەی من خوا ئەم رستە قورئانیەی بۆ ئایەتەکە دابەزاندوفەرمووی (فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ) ئەمەش دەقی ئایەتەکە:

﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن طِينٖ ١٢ ثُمَّ جَعَلۡنَٰهُ نُطۡفَةٗ فِي قَرَارٖ مَّكِينٖ ١٣ ثُمَّ خَلَقۡنَا ٱلنُّطۡفَةَ عَلَقَةٗ فَخَلَقۡنَا ٱلۡعَلَقَةَ مُضۡغَةٗ فَخَلَقۡنَا ٱلۡمُضۡغَةَ عِظَٰمٗا فَكَسَوۡنَا ٱلۡعِظَٰمَ لَحۡمٗا ثُمَّ أَنشَأۡنَٰهُ خَلۡقًا ءَاخَرَۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ ١٤﴾ المؤمنون

**موعازی کوڕی جەبەل هەمان شتی لیٚ رودا :**

وفى روايه–( عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: أَمْلَى عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ سُلَالَةٍ مِنْ طِينٍ﴾ (المؤمنون: ١٢) إِلَى ﴿ثُمَّ أَنْشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ﴾ (المؤمنون: ١٤) ، فَقَالَ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ: فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ، فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ لَهُ مُعَاذٌ: مِمَّ ضَحِكْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ﴿بِهَا خُتِمَتْ﴾ ﴿فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ (المؤمنون: ١٤) المعجم الاوسط للطبراني

واتە: لە زیدەی کوری سابیتەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر ئەم ئایەتەی بۆ خوێندمەوە(وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ سُلَالَةٍ مِنْ طِينٍ) موعازی کوڕی جەبەل گوتی: (فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ) پێغەمبەر پێ کەنی، موعاز گوتی : ئەی نێرراوی خوا بە چی پێکەنی، فەرمووی : بەم شێوەی گوتت کۆتایی ئایەتەکە هاتووە

**ئایا مانای (فَتَبَارَكَ الله أحسن الْخَالِقِينَ) چییە ؟**

**وەڵام: ئەم دەقە هەیە**

( وَأخرج ابْن جرير عَن مُجَاهِد (فَتَبَارَكَ الله أحسن الْخَالِقِينَ) قَالَ: يَصنعونَ ويَصْنَعُ اللهُ وَاللهُ خيرُ الصانعين) الدر المنثور للسيوطي

**واتە:** لەموجاهیدەوە هاتووە دەڵی (فَتَبَارَكَ اللهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ) واتە: ئێوە شت دروست دەکەم ، خواش شت دروست دەکات چاکترین وجوانترین شت بەدیهێنەر خوایە.

پێغەمبەر لە دوعای سوجدە (فَتَبَارَكَ الله أحسن الْخَالِقِينَ) بەهارهێناوە

( عن علي قَالَ:كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا سَجَدَ قَالَ:

(اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وصوَّره فَأَحْسَنَ صُوَرَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ فتبارك اللهُ أَحْسَنُ الخَالِقين)رواه ابن حبان قال الالباني صحيح

## ئایا لەو شێوەی ئادەمی لەسەر دروستکراوە کەم کردوە؟

(خَلَقَ الله آدَمَ على صُورَتِهِ وطُولُهُ سِتُّونَ ذِراعاً ثُمَّ قالَ: اذْهَبْ فَسَلِّمْ على أُولَئِكَ النَّفَرِ وَهُمْ نَفَرٌ مِنَ المَلائِكَةِ جُلُوسٌ فاسْتَمِعْ مَا يُحَيُّونَكَ فإنَّها تَحِيَّتُكَ وتَحِيَّةُ ذُرِّيَتِكَ فَذَهَبَ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ فَقالُوا: السَّلامُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ الله فَزادُوهُ وَرَحْمَةُ الله فَكُلُّ مَنْ يَدْخُلُ الجَنَّةَ على صُورَةِ آدَمَ فِي طُولِهِ سِتُّونَ ذِرَاعاً فَلَمَ تَزَل الخَلْقُ تَنْقُصُ بَعْدَهُ حَتَّى الآن) رواه احمد والبيهقي قال الالباني صحيح في صحيح الجامع

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : خوا ئادەمی دروستکردوە لەسەر شێوەی خۆی( وتە: شێوەی ئادەم) درێژی (٦٠) گەز بوو ، دوای بەئادەم گوترا برۆ لای ئەو فریشتانە دانیشتوون سلاویان لێ بکە ، و گوێ بگرە بزانە بەچی سلاوت لێ دەکەن ئەوە سلاوی تۆ و نەوەکانتە، ئادەم چووە لایان گوتی (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ ) ئەوانیش گوتیان (السَّلامُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ الله) ئەوان رەحمەتیشیان بۆ زیاد کرد ، جا ئەوەی بچێتە بەهەشت لەسەر شێوەی ئادەم کە (٦٠) گەزە دەچێتە بەهەشت ، بەلام تاکو ئێستا کەم دەکات واتە: لە درێژی.

ئایا دروستە بلێین (قَبَّحَ اللَّهُ وَجْهَهُ) ؟

وەلام : نەخێر لەبەر ئەم دەقە

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ( لَا تَقُولُوا: قَبَّحَ اللَّهُ وَجْهَهُ) الادب المفرد قال الالبانى حسن

واتە: مەلێین خوا دەم وچاوی ناشیرین بکات

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٧٦ ) سورەتی المومنون

(وَلَقَدْ أَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ فَمَا ٱسْتَكَانُواْ لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ٧٦) المومنون

واتە : سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە ئەوانمان تووشی سزاو ئازار کرد (تاهۆش بکەنەوە) بەڵام ئەوان (لە بەرانبەر) پەروەردگاریان دا نەخۆیان بەکەم زانی (ملکەچ بوون بۆی) وە نە هاناو نزایان (بۆ خوا) دەبەن لەکاتی ناڕەحەتی دا.(٧٦)

لەئایەتی دوای ئەم ئایەتە دەفەرمووێ (حَتَّىٰٓ إِذَا فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا ذَا عَذَابٍ شَدِيدٍ إِذَا هُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ٧٧) واتە: (حتي إذا فتحنا عليهم بابا ذا عذاب شديد) تا کاتێ کە دەرگای سزایەکی توندو قورسیان لێدەکەینەوە إذاهم فيه مبلسون ئیتر هەموو تێیدا نائومێد دەبن، واتە: بە چەند جۆرە سزایەك تاقیمان کردنەوە، کەچی هەر کەڵکی نەبوو، تا سەرەنجام دووچاری سزای سەختی قیامەت دەبن، ئیتر لە هەموو دەرگایەکی خێرو چاکە بێ هیواو ناهومێد دەبن. لە (بوخاریی) و (موسلیم)دا هاتووە: کاتێ کە قورەیش نافەرمانی و، سەرپێچییان لە پێغەمبەرکرد (صلى الله عليه وسلم)، نزای شەڕی لێکردن و فەرمووی: (اللهم أَعِنِّي عليهم بِسَبْعٍ كَسَبْعِ يُوسُفَ) خوایە! بە حەوت ساڵی وشکە ساڵ(واتە:حەوت ساڵی بێبارانی وگرانی) وەك حەوت ساڵەکەی (یووسف) یارمەتیم بدەو سەرمخە بەسەریاندا، جاپاش دووچار بوونیان لەخواپاڕانەوە، بەڵام چونکە ڕاست بێژ نەبوون، خوا وەڵامی نەدانەوەو نەهات بەهانایانەوە.(ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: جَاءَ أَبُو سُفْيَانَ بْنُ حَرْبٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ أَنْشُدُكَ اللَّهَ وَالرَّحِمَ فَقَدْ أَكَلْنَا الْعِلْهِزَ - يَعْنِي الْوَبَرَ وَالدَّمَ - فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (وَلَقَدْ أَخَذْنَاهُمْ بِالْعَذَابِ، فَمَا اسْتَكَانُوا لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ). (المؤمنون: ٧٦)) رواه ابن حبان قال الالباني صحيح الاسناد وقال شعيب ارنووط حسن

واته: له ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ : ئەبو سوفیانی کوڕی حەرەب هاتە لای پێغەمبەر گوتی : ئەی (محمد) بیکە خاتری خوا و خزمایەتی بە هیلاك چووین ، جا خواش ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (وَلَقَدْ أَخَذْنَاهُمْ بِالْعَذَابِ، فَمَا اسْتَكَانُوا لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ) واتە: ئەوانمان توشی عەزاب کرد ، بەڵام ئەوان نەملکەچ دەبن ، نەهاوار بۆخوا دەکەن (ئەگەر ئەوان چاك بونایە خوا وەڵامی دەدانەوە) (ما اسْتَكَانُوا أَيْ مَا خَشَعُوا (وَمَا يَتَضَرَّعُونَ) أَيْ مَا دَعَوْا) مختصر تفسير ابن كثير (استكن: خَضَعَ وذَلَّ)

٢- وفي رواية ( قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لَمَّا أَتَى ثُمَامَةُ بْنُ أُثَالٍ الْحَنَفِيُّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ - صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - فَأَسْلَمَ وَهُوَ أَسِيرٌ فَخَلَّى سَبِيلَهُ، فَلَحِقَ بِالْيَمَامَةِ فَحَالَ بَيْنَ أَهْلِ مَكَّةَ وَبَيْنَ الميرة من يمامة وَأَخَذَ اللَّهُ تَعَالَى قُرَيْشًا بِسِنِي الْجَدْبِ حَتَّى أَكَلُوا الْعِلْهِزَ، فَجَاءَ أَبُو سُفْيَانَ إِلَى النَّبِيِّ - صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - فَقَالَ: أَنْشُدُكَ اللَّهَ وَالرَّحِمَ أَلَيْسَ تَزْعُمُ أَنَّكَ بُعِثْتَ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ؟ قَالَ: (بَلَى)، فَقَالَ: قَدْ قَتَلْتَ الْآبَاءَ بِالسَّيْفِ وَالْأَبْنَاءَ بِالْجُوعِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الْآيَةَ ) الواحدي ، قال الحميدان أسنده ابن جرير (٣٤/١٨) وأبو نعيم (فتح القدير: ٩٥/٣) والبيهقي في "الدلائل" (٨١/٤) من طريق علباء بن أحمر عن عكرمة عن ابن عباس رضي الله عنهما به، وإسناده جيد ، والصحيح المسند من اسباب النزول

*******************

# وتاری ژماره (٧١) له هۆیەكانی دابەزینی قورئان

## سوڕەتی (النور)

سوڕەتێكی مەدەنییە ، لەریزبەندا (٢٤)و ژمارەی ئایەتەكانی (٦٤)ئایەتە.

–باسی ئادابی كۆمەلاتی دەكات وەك چونیەتی چونە مالآن ، چاوگرتنەوە ، داوین پـاكی ، باسی هەندێ حدودی شەرعی دەكات ، وە باسی هەندێ خێزان و پاراستنی دەكات ،

بۆ نموونە: لەو ئادابانە چوونە مالآن :

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَاۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ٢٧ (النور:٢٧)

واتە: ئەی ئەو كەسانەی بڕواتان هێناوە مەچنە هیچ ماڵێك جگە لە ماڵەكانی خۆتـان هـەتا پرس دەكەن (بە خاوەنەكانیان) وە (دوای ئەوەی مۆلـەت دران) سـەلام بكـەن لـە خـاوەن ماڵەكە ئەوە چاكترە بۆتان بۆ ئەوەی پەند و ئامۆژگاری وەرگرن.

– عومەری كوڕی خەتاب نامەیەكی نوسی بۆ خەڵكی كوفە تێدا نوسـی ژنـەكانتان فێـری سورەتی (النور)بكەن .

–ئایـا بۆچـی نـاونراوە (النـور) ؟ چـونكە تێـدا هـاتووە خـوا نـور و رونـاك خـەرەوەی ئاسمانـەكان وزەوی یـە (ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ...... ٣٥) واتـە: خـوا ڕوونـاك بەخشی ئاسمانەكان و زەوی یە (بە خۆرو مانگەكان)

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٣) سورەتی النور

﴿ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ٣﴾ النور

واتە : پیاوی زیناکەر مارەی ناکات تەنها ئافرەتی زیناکەر و ئافرەتی موشریك نەبێ وە ئافرەتی زیناکەر مارەی ناکات پیاوی زیناکەر یا پیاوی موشریك نەبێ ئەو مارەکردن و شووکردن بە زیناکەرە یا ساغ کراوە لەسەر ئیمانداران.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عن عَمْرُو بْن شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: كَانَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: مَرْثَدُ بْنُ أَبِي مَرْثَدٍ، وَكَانَ رَجُلًا يَحْمِلُ الأَسْرَى مِنْ مَكَّةَ حَتَّى يَأْتِيَ بِهِمُ المَدِينَةَ، قَالَ: وَكَانَتْ امْرَأَةٌ بَغِيٌّ بِمَكَّةَ يُقَالُ لَهَا: عَنَاقٌ وَكَانَتْ صَدِيقَةً لَهُ، وَإِنَّهُ كَانَ وَعَدَ رَجُلًا مِنْ أُسَارَى مَكَّةَ يَحْمِلُهُ، قَالَ: فَجِئْتُ حَتَّى انْتَهَيْتُ إِلَى ظِلِّ حَائِطٍ مِنْ حَوَائِطِ مَكَّةَ فِي لَيْلَةٍ مُقْمِرَةٍ، قَالَ: فَجَاءَتْ عَنَاقٌ فَأَبْصَرَتْ سَوَادَ ظِلِّي بِجَنْبِ الحَائِطِ فَلَمَّا انْتَهَتْ إِلَيَّ عَرَفَتْ، فَقَالَتْ: مَرْثَدٌ؟ فَقُلْتُ: مَرْثَدٌ. فَقَالَتْ: مَرْحَبًا وَأَهْلًا هَلُمَّ فَبِتْ عِنْدَنَا اللَّيْلَةَ. قَالَ: قُلْتُ: يَا عَنَاقُ حَرَّمَ اللَّهُ الزِّنَا، قَالَتْ: يَا أَهْلَ الخِيَامِ، هَذَا الرَّجُلُ يَحْمِلُ أُسَرَاءَكُمْ، قَالَ: فَتَبِعَنِي ثَمَانِيَةٌ وَسَلَكْتُ الخَنْدَمَةَ فَانْتَهَيْتُ إِلَى كَهْفٍ أَوْ غَارٍ فَدَخَلْتُ، فَجَاءُوا حَتَّى قَامُوا عَلَى رَأْسِي فَبَالُوا فَظَلَّ بَوْلُهُمْ عَلَى رَأْسِي وَعَمَّاهُمُ اللَّهُ عَنِّي، قَالَ: ثُمَّ رَجَعُوا وَرَجَعْتُ إِلَى صَاحِبِي فَحَمَلْتُهُ وَكَانَ رَجُلًا ثَقِيلًا حَتَّى انْتَهَيْتُ إِلَى الإِذْخِرِ، فَفَكَكْتُ عَنْهُ أَكْبُلَهُ فَجَعَلْتُ أَحْمِلُهُ وَيُعْيِينِي حَتَّى قَدِمْتُ المَدِينَةَ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنْكِحُ عَنَاقًا؟ فَأَمْسَكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ شَيْئًا حَتَّى نَزَلَتْ الزَّانِي لَا يَنْكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا يَنْكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ،

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «يَا مَرْثَدُ الزَّانِي لَا يَنْكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا يَنْكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ، فَلَا تَنْكِحْهَا) رواه الترمذي والحاكم قال الالباني صحيح

واته: له عەمری کوڕی شوعەیبەوه ئەویش لەباوکیەوه ئەویش لـەباپیرەوه دەڵـێ: پیاوێك هەبوو ناوی (مەرسەدی کوڕی ئەبی مەرسەد) ئیشی ئەوه بوو دەچـوو دیلـەکانی مەککـەی دەگوازتــەوه بـۆ مەدینه(واتــه: ئــەو موسـڵمانانەی کـافران دەسـت بەسـەریان کردبـوون لەمەککه پێیان نەدەکرا کۆچ بکەن) دەڵێ : ئـافرەتێکیش هـەبوو لـە مەککـە داوێـن پـیس بوو، پێیان دەگوت (عەناق) دۆستی (مەرسەد) بوو ، جا مەرسـەد بـەڵێنی دابـووه دیلـەکێ مەککه بچێته قورتاری بکات وهـەڵیگرێ ، دەڵـێ : چـووم تـاکو گەیشـتمه بـن دیوارەکـانی مەککه له شەوێکی مانگه شەو، لەو کاتەدا (عەناق) هات سێبەرمی دیت، لەتەنیشت دیوار، که گەیشتەلام گوتی: تۆ مەرسەدی؟ گوتم مەرسـەدم ، گـوتی: سـڵاوت لـێ بـێ وەره ئـەو شەو لای ئێمه  رابوێره، ئەڵێ گوتم : ئەی (عەناق) خوا زینای حەرام کردوه، ئـەڵێ گـوتی : ئەی خەڵکینه ئەو پیاوه بەندەکراوەکانتان قورتار دەکات ، ئەڵێ : چـوار کـەس کەوتنـه دوام خۆم گەیانـده ئەشـکەوتێك وچـوومه ژوورەوه، هاتنـه سەرسـەرم ، میزیـان بەسـەردا کردم ، بـەلام خـوا چـاوی کـوێرکردن منیـان نـەبینی، دەڵـێ: گەرانـەوه منـیش گەرامـەوه بـرادەره بەندکراوەکـەم رزگـار بکـەم ، هـەڵمگرت و پیـاوێکی قـورس بـوو، گەیاندمـه نـاو گیاوچۆلی ، دەست وقاچم کردەوه ، گەیشتینه مەدینه، چـوومه خزمـەت پێغەمبـەر گـوتم ئەی نێرراوی خوا ئایا (عەناق) مارەبکەم؟ پێغەمبەر بـێ دەنـگ و وەڵامـی نەدایـەوه تـاکو ئـەم ئایەتـه دابـەزی و فـەرمووی (ٱلزَّانِـي لَا يَـنكِحُ إِلَّا زَانِيَـةً أَوۡ مُشۡـرِكَةً وَٱلزَّانِيَـةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوۡ مُشۡرِكٞۚ وَحُـرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَـى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٣) پێغەمبـەر فـەرمووی : ئەی (مەرسەد)

پیاوی زیناکەر تەنها ئافرەتی زیناکەر یاخود موشریك مارە دەکـات، ئـافرەتی زیناکـەریش تەنها پیاوی زیناکەر یاخود موشریك مارەی دەکات، (هاوسەرێتی پیاوان و ئافرەتانێـك کـه بەردەوامن لەسەر زینا)، ئەوه لەسەر ئیمانداران حەرامکراوه.(ئاسان)

٢-( عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، أَنَّ رَجُلًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ، اسْتَأْذَنَ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي امْرَأَةٍ، يُقَالُ لَهَا أُمُّ مَهْزولٍ كَانَتْ تُسَافِحُ، وَتَشْتَرِطُ أَنْ يُنْفِقَ عَلَيْهِ، وَأَنَّهُ اسْتَأْذَنَ فِيهَا نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَذَكَرَ لَهُ أَمْرَهَا فَقَرَأَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الزَّانِي لَا يَنْكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً) (النور: ٣) وَنَزَلَتْ: (الزَّانِيَةُ لَا يَنْكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ) (النور: ٣) رواه الحاكم في المستدرك وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ ووافقه الذهبي

واته: لەعەبدولآی کوڕی عەمرەوە هاتووە دەڵێ : پیاوێك لە موسڵمانان داوای مۆڵەتی کرد لە پێغەمبەر بۆ دۆستایەتی لەگەڵ ئافرەتێك (واتە: مارەی بکات) ناوی (أُمُّ مَهْزولٍ) بەمەرجەی مەسروفی پیاوەکە بکات ، ئیشەکەی بۆ پێغەمبەر باس کرد ، پێغەمبەریش ئەو ئایەتەی بۆ خوێندەوە(الزَّانِي لَا يَنْكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً) و ئەو ئایەتەش دابەزی (الزَّانِيَةُ لَا يَنْكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ)

٣-( قَالَ الْمُفَسِّرُونَ: قَدِمَ الْمُهَاجِرُونَ إِلَى الْمَدِينَةِ، وَفِيهِمْ فُقَرَاءُ لَيْسَتْ لَهُمْ أَمْوَالٌ، وَبِالْمَدِينَةِ نِسَاءٌ بَغَايَا مُسَافِحَاتٌ، يَكْرِينَ أَنْفُسَهُنَّ، وَهُنَّ يَوْمَئِذٍ أَخْصَبُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ فَرَغِبَ فِي كَسْبِهِنَّ نَاسٌ مِنْ فُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ، فَقَالُوا: لَوْ أَنَّا تَزَوَّجْنَا مِنْهُنَّ، فَعِشْنَا مَعَهُنَّ، إِلَى أَنْ يُغْنِيَنَا اللَّهُ تَعَالَى عنهن، فاستأذَنوا رسولَ اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم فِي ذَلِكَ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: وَحُرِّمَ فِيهَا نِكَاحُ الزَّانِيَةِ صِيَانَةً لِلْمُؤْمِنِينَ عَنْ ذَلِكَ)اخرجه الواحدي في اسباب النزول ، وعزاه في الدر

معاني الكلمات (سافح المراة: اقام معها من غير زواج شرعي)( الخِصْبُ : رغد العيش)

واتە: توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: کاتێ موهاجیر چوونە مەککە ، هەژاریان تیابوون ماڵیان نەبوو، لە مەدینەش چەند ئافرەتێکی داوین پیس هەبوون، لەخۆشی دەژیان وباری ژیانیان چاك بوو، هەندێ لە موهاجیرە هەژارەکان چاویان لەوە بوو ، گوتیان : ئەگەر ئێمە ئەوان مارەبکەبن و لەگەلیان بژین ، بۆ ئێمە باشە تاکو خوا دەرگایەکی خێرمان لێ دەکاتەوە پێویستیمان بەوان نابێ ، بۆ ئەو بابەتە داوای مۆڵەتیان لە پێغەمبەر کرد ، جا ئەو ئایەتە

## خوا دەفەرمويّت هەر نزيكى مەكەونەوە:

وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ٣٢) الاسراء

واتە: و نزيكى زيناش مەكەونـەوە بەڕاسـتى ئـەوە كردەوەيـەكى زۆر ناشرين و ڕێگەيـەكى پيس و خراپە.

## لەكاتى زينا ئيمان لەلاشەى مرۆڤ ديّتە دەر:

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَالتَّوْبَةُ مَعْرُوضَةٌ بَعْدُ) رواه مسلم

معاني الكلمات: والتوبة معروضة بعد) قد أجمع العلماء على قبول التوبة ما لم يغرغر وللتوبة ثلاثة أركان أن يقلع عن المعصية ويندم على فعلها ويعزم أن لا يعود إليها (لا يزني الزاني وهو مؤمن الخ) هذا الحديث مما اختلف العلماء في معناه فالقول الصحيح الذي قاله المحققون أن معناه لا يفعل هذه المعاصي وهو كامل الإيمان (نهبة) النهبة هي ما ينهبه (ذات شرف) معناه ذات قدر عظيم وقيل ذات استشراف يستشرف الناس لها ناظرين إليها رافعين أبصارهم)

پێغەمبەر دەفەرموێت : لە كـاتى زينـا و دزى و ئـارەق خواردنـەوە ئيمـان لاى ئـەو كەسـە نامێنى(هەندێ ئيمانى كاملّ نيە) ، بەلاّم تۆبەيان بۆ هەيە.

***************

# وتاری ژماره (٧٢) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٤) سورەتی النور

﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٤﴾ النور

واته : ئەوانەی کە بوختانی (زینا) دەکەن بۆ ئافرەتانی داوێن پاك لەپاشان چوار شایەت ناهێنن (لەسەر ڕاستی بوختانەکەیان) ئەوە هەشتا دار (شەلاق) یان لێ بدەن ئیتر هەرگیز شایەتیان لێ وەرمەگرن وە ئەوانە لە سنوور دەرچوون.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا﴾ (النور: ٤) قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، وَهُوَ سَيِّدُ الْأَنْصَارِ: أَهَكَذَا أُنْزِلَتْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ أَلَا تَسْمَعُونَ إِلَى مَا يَقُولُ سَيِّدُكُمْ؟ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، لَا تَلُمْهُ، فَإِنَّهُ رَجُلٌ غَيُورٌ، وَاللهِ مَا تَزَوَّجَ امْرَأَةً قَطُّ إِلَّا بِكْرًا، وَمَا طَلَّقَ امْرَأَةً لَهُ قَطُّ، فَاجْتَرَأَ رَجُلٌ مِنَّا عَلَى أَنْ يَتَزَوَّجَهَا مِنْ شِدَّةِ غَيْرَتِهِ، فَقَالَ سَعْدٌ: وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي لَأَعْلَمُ أَنَّهَا حَقٌّ، وَأَنَّهَا مِنَ اللهِ وَلَكِنِّي قَدْ تَعَجَّبْتُ أَنِّي لَوْ وَجَدْتُ لَكَاعًا قَدْ تَفَخَّذَهَا رَجُلٌ لَمْ يَكُنْ لِي أَنْ أَهِيجَهُ وَلَا أُحَرِّكَهُ، حَتَّى آتِيَ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ، فَوَاللهِ لَا آتِي بِهِمْ حَتَّى يَقْضِيَ حَاجَتَهُ، قَالَ: فَمَا لَبِثُوا إِلَّا يَسِيرًا، حَتَّى جَاءَ هِلَالُ بْنُ أُمَيَّةَ، وَهُوَ أَحَدُ الثَّلَاثَةِ الَّذِينَ تِيبَ عَلَيْهِمْ، فَجَاءَ مِنْ أَرْضِهِ عِشَاءً، فَوَجَدَ عِنْدَ أَهْلِهِ رَجُلًا، فَرَأَى بِعَيْنَيْهِ، وَسَمِعَ بِأُذُنَيْهِ، فَلَمْ يَهِجْهُ، حَتَّى أَصْبَحَ، فَغَدَا عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي جِئْتُ أَهْلِي عِشَاءً، فَوَجَدْتُ عِنْدَهَا رَجُلًا، فَرَأَيْتُ بِعَيْنَيَّ، وَسَمِعْتُ بِأُذُنَيَّ، فَكَرِهَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا جَاءَ بِهِ، وَاشْتَدَّ عَلَيْهِ، وَاجْتَمَعَتِ الْأَنْصَارُ، فَقَالُوا: قَدِ ابْتُلِينَا بِمَا قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، الْآنَ يَضْرِبُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هِلَالَ بْنَ أُمَيَّةَ، وَيُبْطِلُ شَهَادَتَهُ فِي الْمُسْلِمِينَ، فَقَالَ هِلَالٌ: وَاللهِ إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ يَجْعَلَ اللهُ لِي مِنْهَا مَخْرَجًا، فَقَالَ هِلَالٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي قَدْ أَرَى مَا اشْتَدَّ عَلَيْكَ مِمَّا جِئْتُ بِهِ، وَاللهُ يَعْلَمُ إِنِّي لَصَادِقٌ، فَوَاللهِ إِنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُرِيدُ أَنْ يَأْمُرَ بِضَرْبِهِ إِذْ نَزَلَ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْوَحْيُ، وَكَانَ إِذَا نَزَلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ عَرَفُوا ذَلِكَ فِي تَرَبُّدِ جِلْدِهِ يَعْنِي، فَأَمْسَكُوا عَنْهُ حَتَّى فَرَغَ مِنَ الوَحْيِ، فَنَزَلَتْ:

(وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنْفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ) (النور: ٦)

الْآيَةَ كُلَّها، فَسُرِّيَ عَنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: " أَبْشِرْ يَا هِلَالُ، فَقَدْ جَعَلَ اللهُ لَكَ فَرَجًا وَمَخْرَجًا فَقَالَ هِلَالٌ: قَدْ كُنْتُ أَرْجُو ذَاكَ مِنْ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَرْسِلُوا إِلَيْهَا فَأَرْسَلُوا إِلَيْهَا، فَجَاءَتْ، فَتَلَاهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَيْهِمَا، وَذَكَّرَهُمَا، وَأَخْبَرَهُمَا أَنَّ عَذَابَ الْآخِرَةِ أَشَدُّ مِنْ عَذَابِ الدُّنْيَا، فَقَالَ هِلَالٌ: وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ، لَقَدْ صَدَقْتُ عَلَيْهَا، فقالَتْ: كَذَبَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: " لَاعِنُوا بَيْنَهُمَا "، فَقِيلَ لِهِلَالٍ: اشْهَدْ، فَشَهِدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ، فَلَمَّا كَانَ فِي الْخَامِسَةِ، قِيلَ: يَا هِلَالُ، اتَّقِ اللهَ، فَإِنَّ عَذَابَ الدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ الْآخِرَةِ، وَإِنَّ هَذِهِ الْمُوجِبَةُ الَّتِي تُوجِبُ عَلَيْكَ الْعَذَابَ فَقَالَ: لَا وَاللهِ لَا يُعَذِّبُنِي اللهُ عَلَيْهَا، كَمَا لَمْ يَجْلِدْنِي عَلَيْهَا، فَشَهِدَ فِي الْخَامِسَةِ: أَنَّ لَعْنَةَ اللهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الكَاذِبِينَ، ثُمَّ قِيلَ لَهَا: اشْهَدِي أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللهِ: إِنَّهُ لَمِنَ الكَاذِبِينَ فَلَمَّا كَانَتِ الْخَامِسَةُ قِيلَ لَهَا: اتَّقِ اللهَ فَإِنَّ عَذَابَ الدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ الْآخِرَةِ، وَإِنَّ هَذِهِ الْمُوجِبَةُ الَّتِي تُوجِبُ عَلَيْكِ الْعَذَابَ، فَتَلَكَّأَتْ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَتْ: وَاللهِ لَا أَفْضَحُ قَوْمِي، فَشَهِدَتْ فِي الْخَامِسَةِ: أَنَّ غَضَبَ اللهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ، فَفَرَّقَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَهُمَا، وَقَضَى أَنْ لَا يُدْعَى وَلَدُهَا لِأَبٍ، وَلَا تُرْمَى هِيَ بِهِ وَلَا يُرْمَى وَلَدُهَا، وَمَنْ رَمَاهَا أَوْ رَمَى وَلَدَهَا، فَعَلَيْهِ الْحَدُّ، وَقَضَى أَنْ لَا بَيْتَ لَهَا

عَلَيْهِ، وَلَا قُوتَ مِنْ أَجْلِ أَنَّهُمَا يَتَفَرَّقَانِ مِنْ غَيْرِ طَلَاقٍ، وَلَا مُتَوَفًّى عَنْهَا، وَقَالَ: إِنْ جَاءَتْ بِهِ أُصَيْهِبَ، أُرَيْسِحَ، حَمْشَ السَّاقَيْنِ، فَهُوَ لِهِلَالٍ، وَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَوْرَقَ جَعْدًا، جُمَالِيًّا، خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ، سَابِغَ الْأَلْيَتَيْنِ، فَهُوَ لِلَّذِي رُمِيَتْ بِهِ " فَجَاءَتْ بِهِ أَوْرَقَ، جَعْدًا، جُمَالِيًّا، خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ، سَابِغَ الْأَلْيَتَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: " لَوْلَا الْأَيْمَانُ، لَكَانَ لِي وَلَهَا شَأْنٌ " قَالَ عِكْرِمَةُ: فَكَانَ بَعْدَ ذَلِكَ أَمِيرًا عَلَى مِصْرٍ، وَكَانَ يُدْعَى لِأُمِّهِ وَمَا يُدْعَى لِأَبٍ )رواه احمد قال شعيب ارنوؤط : حديث حسن، عباد بن منصور –وإن كان فيه ضعف من جهة حفظه– قد توبع على بعضه، وقد صرح بالسماع عند الطيالسي والطبري والبيهقي، وباقي رجاله ثقات.وأخرجه الطيالسي (٢٦٦٧) ، وأبو داود (٢٢٥٦) ، وأبو يعلى (٢٧٤٠) و (٢٧٤١) ، والطبري ١٨/٨٢–٨٣، والبيهقي ٧/٣٤٩ من طرق عن عباد بن منصور، بهذا الإسناد. وأخرجه بنحوه مختصراً البخاري (٤٧٤٧) ، وأبو داود (٢٢٥٤) ، والترمذي (٣١٧٩) ، وابن ماجه (٢٠٦٧) ، والبيهقي ٧/٣٩٣–٣٩٤ من طرق عن محمد بن بشار، عن ابن أبي عدي، عن هشام بن حسان، عن عكرمة، عن ابن عباس.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوەهاتووە دەڵێ : کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا) (النور: ٤) سەعدی کوڕی عوبادە سەرۆکی ئەنصارەکان گوتی: ئایا بەم شێوە دابەزیوە ئەی نێرراوی خوا؟

پێغەمبەر فەرمووی : ئەی کۆمەڵی ئەنصار گوێتان لێیە گەورەکەتان چی دەڵێ، گوتیان ئەی پێغەمبەر خوا گلەیی لێ مەکە لەسەر ناموس بەغیرەتە، سوێند بەخوا هیچ ژنێکی مارنەکردوە مەگەر کچ بێ، وە هەر ژنێکی تەلاق دابێ، کەس لە ئێمە جورئەتی ئەوەی نەکردوە مارەی بکاتەوە ،سەعد گوتی: سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا دەزانم ئەو شتێکی حەقە وە لایەن خواوە هاتووە، بەلأم سەرم لەوە سوڕماوە من کەسێك ببینم لەسەر خێزانم هیچ نەکەم تاکو دەچم چوار شایەت دێنم، سوێند بەخوا ناتوانم شایەت بێنم کابرا ئیشی خۆی تەواو دەکا، جا هیلالی کوڕی ئومییە هات کە یەکێ بوو لەو

سێکەسانەی خوا تۆبەی لێ قەبوول کرد بوو، پیاوێکی لەلای خێزانی دیتبوو بەچاوی خۆی ، وەبەگوێی خۆی گوێ لێ ببوو، هیچی نەکردبوو تاکو بەیانی ، بەیانی هاتە لای پێغەمبەر گوتی: ئەی نێرراوی خوا شەوێ چوومەوە لای خێزانم پیاوێکم لەسەر دیت ، بەچاوی خۆم وگوێم لێ بوون، پێغەمبەر پێ ناخۆش بوو و لەسەری قورس بوو، ئەنصار کۆبونەوە گوتیان : توشی ئەوە تاقیکردنەوەیە بووین کە(سەعدی کوڕی عوبادە) گوتی:

ئێستا پێغەمبەر لە (هیلال کوڕی ئومییە) دەدات چونکە (٤) شایەتی نیە، و شایەتیشی لێ وەرناگیرێ لە ناو موسڵمانان ، (هیلال) گوتی: ئومێدەوارم خوا دەرگایەکم لێ بکاتەوە ، (هیلال) گوتی: ئەی نێرراوی خوا دەبینم بەم هەواڵە نارحەتی، خوا دەزانێ من راست دەکەم ، سوێند بەخوا ، پێغەمبەرخوا دەیویست فەرمان بکات لە (هیلال) بدرێ ، وەحی بۆ پێغەمبەر دابەزی ، کە وەحی بۆ دادەبەزی پێستی دەگۆرا، وازیان لێ دەهێنا تاکو کۆتای بەوەحی دابەزین دەهات ، جا ئەو ئایەتە دابەزی وفەرمووی :( وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنْفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ) (النور: ٦) الْآيَةَ كُلَّها)

پێغەمبەر کەیف خۆش بوو ، و فەرمووی : موژدە ئەی (هیلال) خوا دەرگای خێری لێ کردیەوە، (هیلال) گوتی : ئەو ئومێدەم هەبوو بەخوا، پێغەمبەر فەرمووی : بنێرن بە دوای ئافرەتەکە، ناردیان و هات ، پێغەمبەر ئایەتەکەی بۆ سەر هەردووکیاندا خوێندوە ، وفەرمووی : بە هەردووکیان عەزابی قیامەت قورسترە، (هیلال) گوتی: والله راست دەکەم بەرامبەری ، ئافرەتەکە گوتی: درۆ دەکات ، پێغەمبەر فەرمووی : (لیعان) بکەن لە نێوانیان، گوتیان : هیلال بڵێ شایەتی دەدەم ، چوار جار شایەدی و سوێندی خوارد کەراست دەکات ، لە جار پێنجەم گوتیان : ئەی هیلال: لەخوا بترسێ ، عەزابی دونیا سووکترە لە هی قیامەت ئەو عەزابە واجب دەبێ بۆت ، گوتی والله خوا لەسەر ئەو شتە عەزابم نادات ، وەکو جلدەی نەکردم، لە پێنجەم جار شایەتی دا لەعنەتی خوای لێ بدات ئەگەر درۆ بکات، ئنجا بە ئافرەتە گوترا: چوار جار شایەدی بدە سوێند بخۆ بەخوا : ئەو واتە پیاوەکەت لە درۆزنانە ، لەکاتێ جار پێنجەم ، پێی گوترا: لەخوا بترسە عەزابی دونیا

سوکترە لە عەزابی قیامەت ، چونکە ئەگەر راست نەکەی ئەو عەزابەت لەسەر پێویست دەبێ رۆژی قیامەت ، تۆزێك راوەستا ، دوای گوتی: بەخوا قەومی خۆم سەرشۆر ناکەم ، لەجاری پێنجەم شایەدی دا، کە تورەیی خوای لەسەر بێ ئەگەر پیاوەکەی راست بکات، پێغەمبەری خوا لێکی جیاکردنەوە ، وەبریاری دا منداڵەکە بەناوی باوکی بانگ نەکرێ ، ژنەکەش بەوە تۆمەتبار نەکری و منداڵەکەش تۆمەتبار نەکرێ، هەرکەسێ تۆمەت بۆ ئەو ئافرەت و منداڵە بکات حەدی لێ دەردەکرێ، وەبریاری دا خانوی لەسەر پیاوەکەی نەبێ،وەقوتیشی لەسەر پیاوەکە نەبێ چونکەلێك جیابونەوە بەبێ، تەلاق.وە فەرمووی: ئەگەر ئافرەتەکە منداڵی بوو سۆر و سپی بوو، وران ولاقی باریك بوون ئەوە لە (هیلالە) بەلأم ئەگەر ئەسمەر و ئەندامەکانی ئەستور بوون و لاقەکانی قەڵەو بون ، ئەوە لەو کەسەیە،کە تۆمەتبارکراوە بە زینا، جا بەم شێوە لەدایك بوو واتە: قاچ قەڵەو ئەسمەر ، جا پێغەمبەر فەرمووی : ئەگەر ئەو سوێند خواردنە نەبوایە حەددم لێ دەردەکرد، دوای ئەم منداڵە بویە ئەمیری سوپای (مصر) بە ناوی دایکی بانگی دەکرا، نەك بەناوی بابی.

## ئەوەی ئافرەتی بێتاوان تۆمەتبار بکات خوا لەعنەتی لێ دەکات وسزای دەدات

(قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: (إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ) (النور: ٢٣). وَذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَذْفَهُنَّ فِي الْكَبَائِرِ، وَقَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي حَدِّهِمْ: (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ، ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ) (النور: ٤) السنن الكبرى للبيهقي

واتە: خوا گەورە فەرموویەتی : (إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ) (٢٣) النور) واتە: بێگومان ئەوانەی بوختانی زینا

دەکەن بۆ ئافرەتانی داوێن پاکی بێ ئاگای ئیماندار نەفرینیان لێکراوە لە دنیاو ئاخیرەت دا وە بۆیان هەیە سزای زۆر گەورە.

پێغەمبەر فەرموویەتی : تۆمەتبارکردنی ئافرەتی بێ تاوان لە گوناحە گەورەکانە، خوا سەبارەت بە سزای ئەوانە فەرموویەتی (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ، ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ) (النور: ٤)

واتە: ئەوانەی کە بوختانی (زینا) دەکەن بۆ ئافرەتانی داوێن پاك لەپاشان چوار شایەت ناهێنن (لەسەر ڕاستی بوختانەکەیان) ئەوە هەشتا دار (شەلاق) یان لێ بدەن ئیتر هەرگیز شایەتیان لێ وەرمەگرن وە ئەوانە لە سنوور دەرچوون.(پوختەی تەفسیر)

لەتەفسیری ئیبنو کەسیر بەم شێوە باسی کەسی تۆمەت دروست کەر دەکات

-(هَذِهِ الْآيَةُ الْكَرِيمَةُ فِيهَا بَيَانُ جَلْدِ الْقَاذِفِ لِلْمُحَصنَةِ وَهِيَ الْحُرَّةُ الْبَالِغَةُ الْعَفِيفَةُ، فَإِذَا كَانَ الْمَقْذُوفُ رَجُلًا فَكَذَلِكَ يُجْلَدُ قَاذِفُهُ أيضاً، وليس فيه نزاع بين العلماء، فإن أَقَامَ الْقَاذِفُ بَيِّنَةً عَلَى صِحَّةِ مَا قَالَهُ درأ عَنْهُ الْحَدُّ، وَلِهَذَا قَالَ تَعَالَى: (ثُمَّ لَمْ يَأْتُواْ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلاَ تَقْبَلُواْ لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ) فأوجب على القاذف إذا لم يقم البينة على صحة ما قال ثَلَاثَةَ أَحْكَامٍ: (أَحَدُهَا) أَنْ يُجْلَدَ ثَمَانِينَ جَلْدَةً، (الثاني) أن ترد شهادته أبداً، (الثَّالِثُ) أَنْ يَكُونَ فَاسِقًا لَيْسَ بِعَدْلٍ لَا عِنْدَ اللَّهِ وَلَا عِنْدَ النَّاسِ؛ ثُمَّ قَالَ تَعَالَى: (إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ مِن بَعْدِ ذَلِكَ وأصلحوا) الآية.

واختلف الْعُلَمَاءُ فِي هَذَا الِاسْتِثْنَاءِ؛ هَلْ يَعُودُ إِلَى الْجُمْلَةِ الْأَخِيرَةِ فَقَطْ، فَتَرْفَعُ التَّوْبَةُ الْفِسْقَ فَقَطْ، وَيَبْقَى مَرْدُودَ الشَّهَادَةِ دَائِمًا وَإِنْ تَابَ، أَوْ يَعُودُ إِلَى الْجُمْلَتَيْنِ الثَّانِيَةِ وَالثَّالِثَةِ؟ وَأَمَّا الْجَلْدُ فَقَدْ ذَهَبَ وَانْقَضَى سَوَاءٌ تَابَ أَوْ أَصَرَّ، وَلَا حُكْمَ لَهُ بَعْدَ ذَلِكَ، بلا خلاف. فذهب (مالك وأحمد والشافعي) إِلَى أَنَّهُ إِذَا تَابَ قُبِلَتْ شَهَادَتُهُ وَارْتَفَعَ عنه حكم الفسق (نقل هذا عن سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ سَيِّدُ التَّابِعِينَ وَجَمَاعَةٌ مِنَ السَّلَفِ أَيْضًا)، وَقَالَ الْإِمَامُ أَبُو حَنِيفَةَ: إِنَّمَا يَعُودُ الِاسْتِثْنَاءُ إِلَى الْجُمْلَةِ الْأَخِيرَةِ فَقَطْ فَيَرْتَفِعُ الفسق بالتوبة ويبقى مردود الشهادة أبداً (وبه

قال شُرَيحٌ وَإِبْـرَاهِيمُ النَّخَعِيُّ وَسَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ وَمَكْحُولٌ وغيرهم رَّضِيَ الله عَنْهُمْ)، وَقَالَ الشَّعْبِيُّ وَالضَّحَّاكُ: لَا تُقْبَلُ شَهَادَتُهُ وَإِنْ تاب إلاّ أن يتعرف على نفسه أنه قَدْ قَالَ الْبُهْتَانَ، فحينئذٍ تُقْبَلُ شَهَادَتُهُ، وَاللَّهُ أعلم ) تفسير ابن كثير

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٦-١٠ ) سورەتی النور

(وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٦ وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ٧ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ٨ وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٩ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ ١٠) النور

واتە : ئەوە (پیاوانەی) بوختان بۆ خێزانەکانیان دەکەن وە بێجگە لە خۆیان هیچ شایەتێکیان نی یە ئەوە شایەتی دانی هەریەك لەوانە (بەم جۆرەیە) کەچوار سوێند بەخوا بخوات کە بێگومان ئەو لە ڕاستگۆیانە کە دەڵێت خێزانەکەم بینیوە زینای کردووە.(٦) وە لە پێنجەم جاردا بڵێ نەفرینی خوای لەسەر ئەو بێ ئەگەر درۆزن بێ.(٧) ئەو ئافرەتەش (کە تاوان بار کراوە لە لایەن مێردەکەیەوە) سزای (زینای) لەسەر لادەبات بەمەی کە چوار جار سوێند بەخوا بخوات کە بێگومان مێردەکەی لە درۆزنانە واتە درۆ دەکات.(٨) وە لە پێنجەم جاردا (بڵێت) خەشمی خوای لەسەر بێ ئەگەر مێردەکەی لە ڕاست گۆیان بێت.(٩) وە ئەگەر بەهرە و بەزەیی خوا نەبوایە بەسەرتانەوە (هەر کام لەو پیاو و ئافرەتەی باسکرا درۆزن بن خوا دەری دەخست و سزای دەدا لە دنیادا) وە بێگومان خوا گێراکەری پەشیمانی و کار دروستە.(١٠)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ أَنَّ عُوَيْمِرًا أَتَى عَاصِمَ بْنَ عَدِيٍّ وَكَانَ سَيِّدَ بَنِي عَجْلَانَ فَقَالَ كَيْفَ تَقُولُونَ فِي رَجُلٍ وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلًا أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ أَمْ كَيْفَ يَصْنَعُ سَلْ لِي رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ فَأَتَى عَاصِمٌ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَكَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَسَائِلَ فَسَأَلَهُ عُوَيْمِرٌ فَقَالَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَرِهَ الْمَسَائِلَ وَعَابَهَا قَالَ عُوَيْمِرٌ وَاللَّهِ لَا أَنْتَهِي حَتَّى أَسْأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ فَجَاءَ عُوَيْمِرٌ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ رَجُلٌ وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلًا أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ أَمْ كَيْفَ يَصْنَعُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ أَنْزَلَ اللَّهُ الْقُرْآنَ فِيكَ وَفِي صَاحِبَتِكَ فَأَمَرَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْمُلَاعَنَةِ بِمَا سَمَّى اللَّهُ فِي كِتَابِهِ فَلَاعَنَهَا ثُمَّ قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ حَبَسْتُهَا فَقَدْ ظَلَمْتُهَا فَطَلَّقَهَا فَكَانَتْ سُنَّةً لِمَنْ كَانَ بَعْدَهُمَا فِي الْمُتَلَاعِنَيْنِ ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ انْظُرُوا فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَسْحَمَ أَدْعَجَ الْعَيْنَيْنِ عَظِيمَ الْأَلْيَتَيْنِ خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ فَلَا أَحْسِبُ عُوَيْمِرًا إِلَّا قَدْ صَدَقَ عَلَيْهَا وَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أُحَيْمِرَ كَأَنَّهُ وَحَرَةٌ فَلَا أَحْسِبُ عُوَيْمِرًا إِلَّا قَدْ كَذَبَ عَلَيْهَا فَجَاءَتْ بِهِ عَلَى النَّعْتِ الَّذِي نَعَتَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ تَصْدِيقِ عُوَيْمِرٍ فَكَانَ بَعْدُ يُنْسَبُ إِلَى أُمِّهِ ) رواه البخاري

معاني الكلمات: ((بالملاعنة) ملاعنة الرجل زوجته وسميت بذلك لقول الزوج في المرة الخامسة وعلي لعنة الله إن كنت كاذبا فيما رميتها به من الزنا. (حبستها) أمسكتها عندي وأبقيتها في عصمتي. (ظلمتها) لم أعاشرها بالمعروف ولم أوفها حقها كزوجة لأن نفسي تأنف من التمتع بها. (فكانت) الفرقة بينهما (سنة) حكما شرعيا يعمل به (أسحم) شديد السواد. (أدج) أكحل أو شديد سواد العينين. (عظيم الأليتين) ضخم العجز مثنى ألية. (خدلج الساقين) ساقاه ممتلئتان لحما. (أحيمر) تصغير أحمر أي شديد الشقرة. (وحرة) دويبة تترامى على اللحم والطعام فتفسده وهي من أنواع الوزغ – سام أبرص – شبهه بها لحمرتها وقصرها. (النعت) الوصف

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە هاتووە دەڵێ: (عوەیمیر) هاتە لای (عاصمی کوڕی عەدی) کە گەورەیی بەنی عەجلان بوو، گوتی: چی دەڵێن دەبارەی کەسێك ، کە کەسێك لەسەر خێزانی خۆی ببینێ ، ئایا دەگوژرێ یان چی لێ دەکرێ ؟ بۆم لە پێغەمبەر پرسیاربکەن، (عاصیم)یش چووە لای پێغەمبەر و پرسیاری لێ کرد ، پێغەمبەریش پێی ناخۆش بوو، (عوەیمیر) پرسیاری کردوە لە (عاصیم) ئەویش گوتی : پێغەمبەر ئەم پرسیاری پێناخۆشەبوو، وبەعەیبی دادنێ، (عوەیمیر) گوتی: سوێند بەخوا راناوەستم تاکو لە پێغەمبەر دەپرسم، چووە لای پێغەمبەر گوتی : ئەی نێرراوی خوا ئەگەر کەسێك پیاوێك لەسەر خێزانی خۆی ببینێ ئایا دەیکوژێ یان چی لێ دەکات، پێغەمبەر فەرمووی : خوا قورئانی بۆ تۆ و خێزانەکەت دابەزاندوە، فەرمانی کرد بەهەردووکیان  بە (مولاعەنە) کە خوا ئەو ناوەی لێ ناوە لە قورئان ، جا لیعانی کرد و گوتی : ئەی نێرراوی خوا ئەگەر خێزانەکەم بەند بکەم زوڵم دەکەم، تەلاقی داو بویە سووننەت بۆ پاش خۆیان لە (لیعان) دوای پێغەمبەر فەرمووی:  سەیر بکەن،ئەگەرمنداڵی بوو(رەش وچاورەش بوو، لاق ئەستوربوو ، ئەوە عوەمیر راست دەکات، بەڵام ئەگەر منداڵەکە سۆرکەلەکەبوو ئەوە عوەمیر درۆی کردوە، جا بەم شێوە لە دایك بوو کە پێغەمبەر وەسفی کرد عوەمیر راست دەرچوو، ئەم منداڵە داریە پاڵ دایکی (واتە: بەدایکی دەناسرا).

وفي رواية-(عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: إِنَّا لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ فِي الْمَسْجِدِ إِذْ جَاءَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَقَالَ: لَوْ أَنَّ رَجُلًا وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلًا، فَتَكَلَّمَ، جَلَدْتُمُوهُ، أَوْ قَتَلَ، قَتَلْتُمُوهُ، وَإِنْ سَكَتَ، سَكَتَ عَلَى غَيْظٍ، وَاللهِ لَأَسْأَلَنَّ عَنْهُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ أَتَى رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَسَأَلَهُ فَقَالَ: لَوْ أَنَّ رَجُلًا وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلًا فَتَكَلَّمَ، جَلَدْتُمُوهُ، أَوْ قَتَلَ، قَتَلْتُمُوهُ، أَوْ سَكَتَ، سَكَتَ عَلَى غَيْظٍ، فَقَالَ: (اللهُمَّ افْتَحْ وَجَعَلَ يَدْعُو)، فَنَزَلَتْ آيَةُ اللِّعَانِ: وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنْفُسُهُمْ هَذِهِ الْآيَاتُ، فَابْتُلِيَ بِهِ ذَلِكَ الرَّجُلُ مِنْ بَيْنِ النَّاسِ، فَجَاءَ هُوَ وَامْرَأَتُهُ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَتَلَاعَنَا فَشَهِدَ الرَّجُلُ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللهِ إِنَّهُ لَمِنِ الصَّادِقِينَ، ثُمَّ لَعَنَ الْخَامِسَةَ أَنَّ لَعْنَةَ اللهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ

الْكَاذِبِينَ، فَذَهَبَتْ لِتَلْعَنَ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَهْ، فَأَبَتْ، فَلَعَنَتْ، فَلَمَّا أَدْبَرَا، قَالَ) لَعَلَّهَا أَنْ تَجِيءَ بِهِ أَسْوَدَ جَعْدًا ، فَجَاءَتْ بِهِ أَسْوَدَ جَعْدًا) رواه مسلم

واته: له عەبدوڵاوه هاتووه دەڵێ: ئێمەی لە شەوی جومعە لەمزگەوت بووین ، پیاوێكی ئەنصار هاتە مزگەوت و گوتی: ئەگەر كەسێك پیاوێك لەسەر خێزانی خۆی دیت ، هات قسەی كرد ئایا ئێوە جەلدەی لێ دەدەن، یان ئەگەر كوشتی ، ئێوە دەیكوژنەوە ، یان ئەگەر بێ دەنگ بوو ، بەبێ دەنگی خەفت قوتبداتەوە، والله پرسیار دەكەم لە پێغەمبەری خوا، كاتێ بەیانی داهات ، هاتە لای پێغەمبەری خوا گوتی: ئەگەر كەسێك پیاوێكی بینی لەسەر خێزانی ، ئەگەر قسەی كرد وگوتی خێزانم زینای كردوه ئایا داری لێدەدەن یان ئەگەر كوشتی دەیكوژنەوە یان بێ دەنگ بوو ، بەبێ دەنگی هەر خەم بخوات ،و گوتی(خوایە دەرگایەك بكەوە ودوعای دەكرد) جا ئایەتی (اللعان) دابەزی (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنْفُسُهُمْ هَذِهِ الْآيَاتُ) ئەو پیاوە توشی ئەم تاقیكردنەوە بوو ، خۆی وخێزانی هاتنە لای پێغەمبەری خوا لیعانیان كرد ، پیاوەكە چوار شایەدی داو سوێندی خوارد بەخوا كە ئەو لەراستگۆیان ، دوایی لەعنەتی كرد لەجاری پێنجەم دەڵێ : لەعنەتی خوام لێ بێ ئەگەر درۆ بكەم، جا ژنەكە چوو تاكو ئەویش لیعان بكات، پێغەمبەر پێ فەرمووی : (مە، رەتی كردەوە، ئەویش لیعانی كرد وپشتی هەڵكرد ، فەرمووی : لەوانەیە منداڵێكی رەشی قژ لوولەی ببێ، جامنداڵێكی رەشی قژ لوولەی بوو.

**********************

# وتاری ژماره (٧٣) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١١-٢٢ ) سورەتی النور

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ ١١ لَّوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ ظَنَّ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمۡ خَيۡرٗا وَقَالُواْ هَٰذَآ إِفۡكٞ مُّبِينٞ ١٢ لَّوۡلَا جَآءُو عَلَيۡهِ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَۚ فَإِذۡ لَمۡ يَأۡتُواْ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُوْلَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ١٣ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ لَمَسَّكُمۡ فِي مَآ أَفَضۡتُمۡ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ١٤ إِذۡ تَلَقَّوۡنَهُۥ بِأَلۡسِنَتِكُمۡ وَتَقُولُونَ بِأَفۡوَاهِكُم مَّا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ وَتَحۡسَبُونَهُۥ هَيِّنٗا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٞ ١٥ وَلَوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ قُلۡتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٞ ١٦ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُواْ لِمِثۡلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١٧ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ١٨ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ١٩ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ٢٠ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ٢١ وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ٢٢﴾ النور

واته : بوختتان بۆ خاتوو عائیشه (خوا لێی رازی بێ): ئەوجا بۆ دیفاع و بەرگری لە ناموس و شەرەفی پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) لەسەریەك دە ئایەت ئەنێرێ و ئەفەرموێ: (إن الذین جاؤا بالإفك عصبة منکم ) بێگومان ئەوانەی کە ئەو درۆو بوختانە گەورەیان هەڵبەست، کۆمەڵێك بوون لە خۆتان (**لا تحسبوه شرا لکم** )وا مەزانن ئەو

روداوه بۆ ئێوه شەرو خراپه (بل هـو خـیر لکـم) بـەڵکو چـاك و خێـره بۆتـان ئێـوه بـەو
یاسـایه لـه ئاینـدەدا نامووسـی ملیۆنـەها موسـڵمان ئـەپارێزرێ و بـەرگری لـێ ئـەکرێ
کەوابوو زۆر چاکه بۆتان، چونکه لەلایەکەوه دوژمنایەتی بێ بڕواکانتان بـۆ دەرکـەوت کـه
تاچ ئەندازەیەك ئەیانەوێ ئابڕووی ئەو بنەماڵەو خێزانه پاکانه بەرن، شەرەفی ئەو بنەماڵانه
بشکێنن.. چاکه بۆتان، چونکه خوای گەوره بەدوای یەکدا(١٠) ئایەت دەنێرێ بـۆ دیفـاع
له نامووسی داوێن پاکان ( لکـل أمـرئ مـنهم مـا اکتسـب مـن الإثـم) بێگومـان هەریەکـەش
لەوانه چەند لەو گونـاهو تاوانـه بەشـداره بەشـێك تـاوانی تایبـەتی لـه ئەسـتۆی خۆیدایـه
واته: هەرکەسه چەنده کۆششی بۆ کردبێ به ئەندازەی ئـەوەش تۆڵـه وەرئـەگرێ ( والـذي
تـولي کـبره مـنهم) ئـەو کەسـەش کـه سـەرۆکایەتی بەشـێکی زۆری ئـەو تاوانەیـەی کـرد
(کوڕەکەی سەلول) (له عذاب عظیم) سزایەکی سـەخت و گـەورەی بـۆ هەیـه چـونکه هـەر
ئەوکاته (صەفوان) وشترەکەی لێ ئەخوڕی و، خـاتوو عائیشـەش لـەناو کەژاوەکـەدا بـوو،
کوڕەکـەی سـەلوول لـەناو خـەڵکێکی زۆردا وەسـتابوو و پرسـی ئەمـه کێیـه؟! وتیـان:
عائیشەی خێزانی پەیامبەره (صلی الله علیه وسلم) ، وتـی: ئەمـه سـوێندی بێـت بـەپاکی
نەگەڕاوەتەوه (١١)

-(وَقِيلَ: إِنَّ الَّذِي عَنَى اللَّهُ بِقَوْلِهِ: (إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ) جَمَاعَةٌ، مِنْهُمْ حَسَّانُ بْنُ ثَابِتٍ، وَمِسْطَحُ بْنُ أُثَاثَةَ، وَحَمْنَةُ بِنْتُ جَحْشٍ ) اخرجه الطبري في (جامع البيان)

واته: گوتراوه : ئەوەی خوا مەبەستینی لەم ئایەتدا (إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ)
واته : ئەوانەی بوختانیان هەڵبەست کۆمەلێك بوون له ئێوه.

کۆمـەلێك بـوون ، لەوانـه ١-( حَسَّانُ بْنُ ثَابِتٍ،) ٢- (وَمِسْطَحُ بْنُ أُثَاثَةَ) ٣-( حَمْنَةُ بِنْتُ جَحْشٍ)

وعبدالله كوڕی عەباس دەڵـێ :(قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: قَوْلُهُ: (جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ) . الْآيَةُ، الَّـذِينَ افْتَـرَوْا عَلَـى عَائِشَـةَ: عَبْـدُ اللَّـهِ بْـنُ أُبَـيٍّ، وَهُـوَ الَّـذِي تَـوَلَّى كِبْـرَهُ، وَحَسَّـانُ بْـنُ ثَابِـتٍ، وَمِسْطَحٌ، وَحَمْنَةُ بِنْتُ جَحْشٍ) اخرجه الطبري في (جامع البيان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ قَالَ لَهَا أَهْلُ الْإِفْكِ مَا قَالُوا فَبَرَّأَهَا اللَّهُ مِنْهُ قَالَ الزُّهْرِيُّ وَكُلُّهُمْ طَائِفَةً مِنْ حَدِيثِهَا وَبَعْضُهُمْ أَوْعَى مِنْ بَعْضٍ وَأَثْبَتُ لَهُ اقْتِصَاصًا وَقَدْ وَعَيْتُ عَنْ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ الْحَدِيثَ الَّذِي عَنْ عَائِشَةَ وَبَعْضُ حَدِيثِهِمْ يُصَدِّقُ بَعْضًا زَعَمُوا أَنَّ عَائِشَةَ قَالَتْ كَانَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ سَفَرًا أَقْرَعَ بَيْنَ أَزْوَاجِهِ فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا مَعَهُ فَأَقْرَعَ بَيْنَنَا فِي غَزَاةٍ غَزَاهَا فَخَرَجَ سَهْمِي فَخَرَجْتُ مَعَهُ بَعْدَ مَا أُنْزِلَ الْحِجَابُ فَأَنَا أُحْمَلُ فِي هَوْدَجٍ وَأُنْزَلُ فِيهِ فَسِرْنَا حَتَّى إِذَا فَرَغَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ غَزْوَتِهِ تِلْكَ وَقَفَلَ وَدَنَوْنَا مِنْ الْمَدِينَةِ آذَنَ لَيْلَةً بِالرَّحِيلِ فَقُمْتُ حِينَ آذَنُوا بِالرَّحِيلِ فَمَشَيْتُ حَتَّى جَاوَزْتُ الْجَيْشَ فَلَمَّا قَضَيْتُ شَأْنِي أَقْبَلْتُ إِلَى الرَّحْلِ فَلَمَسْتُ صَدْرِي فَإِذَا عِقْدٌ لِي مِنْ جَزْعِ أَظْفَارٍ قَدْ انْقَطَعَ فَرَجَعْتُ فَالْتَمَسْتُ عِقْدِي فَحَبَسَنِي ابْتِغَاؤُهُ فَأَقْبَلَ الَّذِينَ يَرْحَلُونَ لِي فَاحْتَمَلُوا هَوْدَجِي فَرَحَلُوهُ عَلَى بَعِيرِي

الَّذِي كُنْتُ أَرْكَبُ وَهُمْ يَحْسِبُونَ أَنِّي فِيهِ وَكَانَ النِّسَاءُ إِذْ ذَاكَ خِفَافًا لَمْ يَثْقُلْنَ وَلَمْ يَغْشَهُنَّ اللَّحْمُ وَإِنَّمَا يَأْكُلْنَ الْعُلْقَةَ مِنْ الطَّعَامِ فَلَمْ يَسْتَنْكِرْ الْقَوْمُ حِينَ رَفَعُوهُ ثِقَلَ الْهَوْدَجِ فَاحْتَمَلُوهُ وَكُنْتُ جَارِيَةً حَدِيثَةَ السِّنِّ فَبَعَثُوا الْجَمَلَ وَسَارُوا فَوَجَدْتُ عِقْدِي بَعْدَ مَا اسْتَمَرَّ الْجَيْشُ فَجِئْتُ مَنْزِلَهُمْ وَلَيْسَ فِيهِ أَحَدٌ فَأَمَمْتُ مَنْزِلِي الَّذِي كُنْتُ بِهِ فَظَنَنْتُ أَنَّهُمْ سَيَفْقِدُونَنِي فَيَرْجِعُونَ إِلَيَّ فَبَيْنَا أَنَا جَالِسَةٌ غَلَبَتْنِي عَيْنَايَ فَنِمْتُ وَكَانَ صَفْوَانُ بْنُ الْمُعَطَّلِ السُّلَمِيُّ ثُمَّ الذَّكْوَانِيُّ مِنْ وَرَاءِ الْجَيْشِ فَأَصْبَحَ عِنْدَ مَنْزِلِي فَرَأَى سَوَادَ إِنْسَانٍ نَائِمٍ فَأَتَانِي وَكَانَ يَرَانِي قَبْلَ الْحِجَابِ فَاسْتَيْقَظْتُ بِاسْتِرْجَاعِهِ حِينَ أَنَاخَ رَاحِلَتَهُ فَوَطِئَ يَدَهَا فَرَكِبْتُهَا فَانْطَلَقَ يَقُودُ بِي الرَّاحِلَةَ حَتَّى

أَتَيْنَا الْجَيْشَ بَعْدَ مَا نَزَلُوا مُعَرِّسِينَ فِي نَحْرِ الظَّهِيرَةِ فَهَلَكَ مَنْ هَلَكَ وَكَانَ الَّذِي تَوَلَّى الْإِفْكَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ فَاشْتَكَيْتُ بِهَا شَهْرًا وَالنَّاسُ يُفِيضُونَ مِنْ قَوْلِ أَصْحَابِ الْإِفْكِ وَيَرِيبُنِي فِي وَجَعِي أَنِّي لَا أَرَى مِنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اللُّطْفَ

الَّذِي كُنْتُ أَرَى مِنْهُ حِينَ أَمْرَضُ إِنَّمَا يَدْخُلُ فَيُسَلِّمُ ثُمَّ يَقُولُ كَيْفَ تِيكُمْ لَا أَشْعُرُ بِشَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ حَتَّى نَقَهْتُ فَخَرَجْتُ أَنَا وَأُمُّ مِسْطَحٍ قِبَلَ الْمَنَاصِعِ مُتَبَرَّزُنَا لَا نَخْرُجُ إِلَّا لَيْلًا إِلَى لَيْلٍ وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ نَتَّخِذَ الْكُنُفَ قَرِيبًا مِنْ بُيُوتِنَا وَأَمْرُنَا أَمْرُ الْعَرَبِ الْأُوَلِ فِي الْبَرِّيَّةِ أَوْ فِي التَّنَزُّهِ فَأَقْبَلْتُ أَنَا وَأُمُّ مِسْطَحٍ بِنْتُ أَبِي رُهْمٍ نَمْشِي فَعَثَرَتْ فِي مِرْطِهَا فَقَالَتْ تَعِسَ مِسْطَحٌ فَقُلْتُ لَهَا بِئْسَ مَا قُلْتِ أَتَسُبِّينَ رَجُلًا شَهِدَ بَدْرًا فَقَالَتْ يَا هَنْتَاهْ أَلَمْ تَسْمَعِي مَا قَالُوا فَأَخْبَرَتْنِي بِقَوْلِ أَهْلِ الْإِفْكِ فَازْدَدْتُ مَرَضًا عَلَى مَرَضِي فَلَمَّا رَجَعْتُ إِلَى بَيْتِي دَخَلَ عَلَيَّ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَلَّمَ فَقَالَ كَيْفَ تِيكُمْ فَقُلْتُ ائْذَنْ لِي إِلَى أَبَوَيَّ قَالَتْ وَأَنَا حِينَئِذٍ أُرِيدُ أَنْ أَسْتَيْقِنَ الْخَبَرَ مِنْ قِبَلِهِمَا فَأَذِنَ لِي رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَتَيْتُ أَبَوَيَّ فَقُلْتُ لِأُمِّي مَا يَتَحَدَّثُ بِهِ النَّاسُ فَقَالَتْ يَا بُنَيَّةُ هَوِّنِي عَلَى نَفْسِكِ الشَّأْنَ فَوَاللَّهِ لَقَلَّمَا كَانَتْ امْرَأَةٌ قَطُّ وَضِيئَةٌ عِنْدَ رَجُلٍ يُحِبُّهَا وَلَهَا ضَرَائِرُ إِلَّا أَكْثَرْنَ عَلَيْهَا فَقُلْتُ سُبْحَانَ اللَّهِ وَلَقَدْ يَتَحَدَّثُ النَّاسُ بِهَذَا قَالَتْ فَبِتُّ تِلْكَ اللَّيْلَةَ حَتَّى أَصْبَحْتُ لَا يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ وَلَا أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ ثُمَّ أَصْبَحْتُ فَدَعَا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ وَأُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ حِينَ اسْتَلْبَثَ الْوَحْيُ يَسْتَشِيرُهُمَا فِي فِرَاقِ أَهْلِهِ فَأَمَّا أُسَامَةُ فَأَشَارَ عَلَيْهِ بِالَّذِي يَعْلَمُ فِي نَفْسِهِ مِنْ الْوُدِّ لَهُمْ فَقَالَ أُسَامَةُ أَهْلُكَ يَا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَا نَعْلَمُ وَاللَّهِ إِلَّا خَيْرًا وَأَمَّا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ فَقَالَ يَا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يُضَيِّقْ اللَّهُ عَلَيْكَ وَالنِّسَاءُ سِوَاهَا كَثِيرٌ وَسَلْ الْجَارِيَةَ تَصْدُقْكَ

فَدَعَا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَرِيرَةَ فَقَالَ يَا بَرِيرَةُ هَلْ رَأَيْتِ فِيهَا شَيْئًا يَرِيبُكِ فَقَالَتْ بَرِيرَةُ لَا وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ إِنْ رَأَيْتُ مِنْهَا أَمْرًا أَغْمِصُهُ عَلَيْهَا قَطُّ أَكْثَرَ مِنْ أَنَّهَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ تَنَامُ عَنْ الْعَجِينِ فَتَأْتِي الدَّاجِنُ فَتَأْكُلُهُ فَقَامَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ يَوْمِهِ فَاسْتَعْذَرَ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ ابْنِ سَلُولَ فَقَالَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ يَعْذُرُنِي

مِنْ رَجُلٍ بَلَغَنِي أَذَاهُ فِي أَهْلِي فَوَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ عَلَى أَهْلِي إِلَّا خَيْرًا وَقَدْ ذَكَرُوا رَجُلًا مَا عَلِمْتُ عَلَيْهِ إِلَّا خَيْرًا وَمَا كَانَ يَدْخُلُ عَلَى أَهْلِي إِلَّا مَعِي فَقَامَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ فَقَالَ يَا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَا وَاللَّهِ أَعْذُرُكَ مِنْهُ إِنْ كَانَ مِنْ الْأَوْسِ ضَرَبْنَا عُنُقَهُ وَإِنْ كَانَ مِنْ إِخْوَانِنَا مِنْ الْخَزْرَجِ أَمَرْتَنَا فَفَعَلْنَا فِيهِ أَمْرَكَ فَقَامَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ وَهُوَ سَيِّدُ الْخَزْرَجِ وَكَانَ قَبْلَ ذَلِكَ رَجُلًا صَالِحًا وَلَكِنْ احْتَمَلَتْهُ الْحَمِيَّةُ فَقَالَ كَذَبْتَ لَعَمْرُ اللَّهِ لَا تَقْتُلُهُ وَلَا تَقْدِرُ عَلَى ذَلِكَ فَقَامَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ فَقَالَ كَذَبْتَ لَعَمْرُ اللَّهِ وَاللَّهِ لَنَقْتُلَنَّهُ فَإِنَّكَ مُنَافِقٌ تُجَادِلُ عَنْ الْمُنَافِقِينَ فَثَارَ الْحَيَّانِ الْأَوْسُ وَالْخَزْرَجُ حَتَّى هَمُّوا وَرَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَنَزَلَ فَخَفَّضَهُمْ حَتَّى سَكَتُوا وَسَكَتَ وَبَكَيْتُ يَوْمِي لَا يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ وَلَا أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ فَأَصْبَحَ عِنْدِي أَبَوَايَ وَقَدْ بَكَيْتُ لَيْلَتَيْنِ وَيَوْمًا حَتَّى أَظُنُّ أَنَّ الْبُكَاءَ فَالِقٌ كَبِدِي قَالَتْ فَبَيْنَا هُمَا جَالِسَانِ عِنْدِي وَأَنَا أَبْكِي إِذْ اسْتَأْذَنَتْ امْرَأَةٌ مِنْ الْأَنْصَارِ فَأَذِنْتُ لَهَا فَجَلَسَتْ تَبْكِي مَعِي فَبَيْنَا نَحْنُ كَذَلِكَ إِذْ دَخَلَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَلَسَ وَلَمْ يَجْلِسْ عِنْدِي مِنْ يَوْمِ قِيلَ فِيَّ مَا قِيلَ قَبْلَهَا وَقَدْ مَكَثَ شَهْرًا لَا يُوحَى إِلَيْهِ فِي شَأْنِي شَيْءٌ قَالَتْ فَتَشَهَّدَ ثُمَّ قَالَ يَا عَائِشَةُ فَإِنَّهُ بَلَغَنِي عَنْكِ كَذَا وَكَذَا فَإِنْ كُنْتِ بَرِيئَةً فَسَيُبَرِّئُكِ اللَّهُ وَإِنْ كُنْتِ أَلْمَمْتِ بِذَنْبٍ فَاسْتَغْفِرِي اللَّهَ وَتُوبِي إِلَيْهِ فَإِنَّ الْعَبْدَ إِذَا اعْتَرَفَ بِذَنْبِهِ ثُمَّ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ فَلَمَّا قَضَى رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَقَالَتَهُ قَلَصَ دَمْعِي حَتَّى مَا أُحِسُّ مِنْهُ قَطْرَةً وَقُلْتُ لِأَبِي أَجِبْ عَنِّي رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

قَالَ وَاللَّهِ مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لِرَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ لِأُمِّي أَجِيبِي عَنِّي رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيمَا قَالَ قَالَتْ وَاللَّهِ مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لِرَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ وَأَنَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ لَا أَقْرَأُ كَثِيرًا مِنْ الْقُرْآنِ فَقُلْتُ إِنِّي وَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُ أَنَّكُمْ سَمِعْتُمْ مَا يَتَحَدَّثُ بِهِ النَّاسُ وَوَقَرَ فِي أَنْفُسِكُمْ وَصَدَّقْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ قُلْتُ لَكُمْ إِنِّي بَرِيئَةٌ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنِّي لَبَرِيئَةٌ لَا تُصَدِّقُونِي بِذَلِكَ وَلَئِنْ اعْتَرَفْتُ لَكُمْ بِأَمْرٍ وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَنِّي بَرِيئَةٌ لَتُصَدِّقُنِّي وَاللَّهِ مَا أَجِدُ لِي وَلَكُمْ مَثَلًا إِلَّا أَبَا يُوسُفَ إِذْ قَالَ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ ثُمَّ تَحَوَّلْتُ عَلَى فِرَاشِي وَأَنَا أَرْجُو أَنْ يُبَرِّئَنِي اللَّهُ وَلَكِنْ وَاللَّهِ مَا ظَنَنْتُ أَنْ يُنْزِلَ فِي شَأْنِي وَحْيًا

وَلأَنَا أَحْقَرُ فِي نَفْسِي مِنْ أَنْ يُتَكَلَّمَ بِالْقُرْآنِ فِي أَمْرِي وَلَكِنِّي كُنْتُ أَرْجُو أَنْ يَرَى رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي النَّوْمِ رُؤْيَا يُبَرِّئُنِي اللَّهُ فَوَاللَّهِ مَا رَامَ مَجْلِسَهُ وَلَا خَرَجَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْبَيْتِ حَتَّى أُنْزِلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ فَأَخَذَهُ مَا كَانَ يَأْخُذُهُ مِنْ الْبُرَحَاءِ حَتَّى إِنَّهُ لَيَتَحَدَّرُ مِنْهُ مِثْلُ الْجُمَانِ مِنْ الْعَرَقِ فِي يَوْمٍ شَاتٍ فَلَمَّا سُرِّيَ عَنْ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَضْحَكُ فَكَانَ أَوَّلَ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بِهَا أَنْ قَالَ لِي يَا عَائِشَةُ احْمَدِي اللَّهَ فَقَدْ بَرَّأَكِ اللَّهُ فَقَالَتْ لِي أُمِّي قُومِي إِلَى رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ لَا وَاللَّهِ لَا أَقُومُ إِلَيْهِ وَلَا أَحْمَدُ إِلَّا اللَّهَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى( إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ )

الْآيَاتِ فَلَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ هَذَا فِي بَرَاءَتِي قَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَكَانَ يُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحِ بْنِ أُثَاثَةَ لِقَرَابَتِهِ مِنْهُ وَاللَّهِ لَا أُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحٍ شَيْئًا أَبَدًا بَعْدَ مَا قَالَ لِعَائِشَةَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (وَلَا يَأْتَلِ أُولُو الْفَضْلِ مِنْكُمْ وَالسَّعَةِ أَنْ يُؤْتُوا إِلَى قَوْلِهِ غَفُورٌ رَحِيمٌ ) فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ بَلَى وَاللَّهِ إِنِّي لَأُحِبُّ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لِي فَرَجَعَ إِلَى مِسْطَحٍ الَّذِي كَانَ يُجْرِي عَلَيْهِ وَكَانَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْأَلُ زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ عَنْ أَمْرِي فَقَالَ يَا زَيْنَبُ مَا عَلِمْتِ مَا رَأَيْتِ فَقَالَتْ يَا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحْمِي سَمْعِي وَبَصَرِي وَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ عَلَيْهَا إِلَّا خَيْرًا قَالَتْ وَهِيَ الَّتِي كَانَتْ تُسَامِينِي فَعَصَمَهَا اللَّهُ بِالْوَرَعِ ) متفق عليه

واته: له عائیشەی خێزانی پێغەمبەرەوە هاتووە دەڵێ : کاتێ پێیان گوت بوختانیان بۆ کردووی و خواش دیفاعی لێ کرد وپاکی دەرخست، عائیشە: دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر سەفەری کردبایە قورعەی دەکرد لە نێوان خێزانەکانی ، ئەو جارە من دەرچووم، پاش ئەوەی ئایەتی حیجاب دابەزی، من لەناو کەژاو هەڵدەگیرام ودادەنرام، ڕۆیشتین تاکو پێغەمبەر لەم جەنگدا تەواو بوو، و نزیك بوینەوە لە مەدینە، شەو فەرمانکرا بە ڕۆیشتن ، منیش ڕۆیشتم بۆ پێویستی سەرئاو تاکو لە سوپا دوورکەوتمەوە کاتێ ئیشم تەواو بوو ، ڕووم کردەوە کاروان و دەستم لە سینگمدا دبینم مەوانکەم بساوە، گەرامەوە جێگای سەرئاو وملوانکەم دۆزیەوە، ئەوانەی کەژاوەی منیان لەسەر وشتر باردەکرد ، وایان زانی من لەناو کەژاوەکەم وباریان کردبووە سەر پشتی وشتر، ئافرەتانیش ئەو کات سووك بوون

و قورس نەبوون ، هەستیان پێ نەکردبوو کەسی تیا نیە ومنیش ئەو کات کەم تەمەن بووم ، کە گەرامەوە جێگای سوپا دەبینم کەسی لێ نەماوە، لەدڵی خۆمدا گوتم ئێستا دەگەرێنەوە لام چونکە منیان بزرکردوە.

دانیشتم خەوم هات وخەوتم ، (صەفوانی کوڕی موعەتەل) لە دوای جیش بوو (عادەت وابوو کەسێك لە ئاخیری سوپا دمایەوە بزانێ کێ بە جێماوەو چی هەیە) دەبینێ رەشایەتی مرۆڤ دیارە و خەوتووە، کەدێت دەبینێ خەوتووم ودەماناسێ ، پێش ئایەتی حیجاب منی دیتبوو، گوتی: (انا لله وانا الیه راجعون) ئاگاداری کردمەوە سواری وشتری کردم تاکو گەیشتینەوە سوپا لەو شوێنەی لێ دابەزی بوون کەسەرەتای روناکی رۆژ بوو ، جا تیاچوو ئەوەی تیاچوو ، ئەوەی بوختانەکەی بەرێوەدەبرد (عبدالله کوڕی ئەبی سەلول) ، کە گەراینەوە مەدینە مانگێك نەخۆش بووم ، خەڵکیش هەواڵەکەیان بلاوکردوە لەدەمی بوختان چیان، لە نەخۆشی منیش کەوتنە گومان، منیش وەکو جاران سۆزم لە پێغەمبەر نەئەبینی بەرامبەرم ، وەمن هەستم بە هیچ نەدەکرد، تاکو تۆزێك چاکتر بووم ، لەگەڵ دایکی (میستەح) چووینە سەر ئاو ، پێش ئەوەی سەرشۆك دروست بکرێت ، رۆیشتین هەڵخلیسکام (دایکی میستەح) گوتی :

لەناو چێ (میستەح) منیش گوتم قسەیەکەی خراپت کرد، ئایا جوێن بەکەسێ دەدەیت کە بەشداری شەڕی بەدری کردوە، گوتی: ئایا نازانی چی دەڵێن ، ئنجا هەواڵی پیدام و قسەی بوختان چیانی بۆ باس کردم و نەخۆشیەکەم زیاتر بوو بۆ سەرنەخۆشیم، کاتێ گەرامەوەماڵەوە پێغەمبەر هاتە ژوورەوە سەلامی کرد و گوتی: ئەحوالتان چۆنە؟ گوتم ئایا مۆڵەتم دەدی بچمەوە لای دایك وباوکم ، وە دەمویست لەم هەواڵە ئاگاداربم لە دایك وباوکم ، پێغەمبەریش مۆڵەتی دام، چوومە لای دایك وباوکم ، گوتمە دایکم خەڵکی چی دەڵێن ، گوتی : لەسەر خۆبە کەم وایە ئافرەتێك هەوێی هەبێ و مێردەکەی خۆشی بوێ ، مەگەر شتی بۆ دروست کراوە، گوتم (سبحان الله) خەڵکی ئەو قسە دەکەن ،

دەڵێ : ئەو شەوە مامەوە تاكو بەیانی فرمێسك لەچاوم وشك نەبوو ، خەوم لێ نەكەوت ، بەیانیم كردوە، پێغەمبەر بانگی (علی كوڕی ئەبی تالیب وئوسامەی كوڕی زەیدەكرد) ڕاوێژی پێكردن بۆ تەلاق دانی خێزانی ، ئەو كات وەحی دانەدەبەزی ، ئوسامە گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا والله جگە لە خێر نەمان زانیوە لە خێزانی تۆ، بەلآم (علی ) گوتی: ئەی نێرراوی خوا لەسەر خۆت تەنگ مەكە ئافرەت زۆرە جگە لەئافرەتەكانی خۆت، پرسیاربكە لە جاریەكەت راستت پێ دەڵێ ، پێغەمبەر بانگی (بەریرەی) كرد وفەرمووی : ئەی (بەریرە) ئایا هیچت لە خێزانی من بینیوە جێگای گومان بێ ، (بەریرە) گوتی:

سوێند بەوەی تۆی بەحەق ناردوە هیچ شتێكم لێ نەبینیوە ، تەنها ئەوەندە نەبێ كەم تەمەنە جاری وایە لەسەر هەویر خەوی لێ دەكەوێ و مالآت دێت هەویرەكە دەخوا، پێغەمبەر ئەو ڕۆژە هەڵساو داوای یارمەتی كرد لەخەڵك دەربارەی (عەبدولآی كوڕی ئوبەی كوڕی سەلول) پێغەمبەر فەرمووی: ئەم پیاوە ئازارم دەدات دەربارەی خێزانم والله جگە لە چاكە لە خێزانی خۆم نەبیستوە، وەباسی پیاوێك دەكەن ئەویش جگە لە خێر هیچمان لێ نەزانیوە، وە كەس نەهاتۆتە ماڵم لەگەڵ من نەبێ، (سەعدی كوڕی موعان) هەڵساو گوتی :

ئەی پێغەمبەری خوا من هاوكاریت دەكەم بۆ ئەو ئەگەر لە تیرەی (ئەوس) بوایە لەگەردەنمان دەدا، ئەگەر لەخەزرەجی براكانمانە فەرمانمان پێ بكەی جێ بەجێ دەكەین فەرمانەكەت، (سەعدی كوڕی عوبادە) كە گەورەیی (خەزرەج) پێش ئەوە پیاوێكی صالح بوو هەڵساو بەلآم گەرمی جاهیلی گرتی ، گوتی : درۆت كرد نایكوژن و ئەوەش ناتوانن ، (ئوسیدی كوڕی حوزیر) هەڵساو گوتی: درۆت كرد ...

دەیكوژین تۆش مونافیقی دیفاع لە مونافیقان دەكەی ، هەردوو تیرەی ئەوس و خەزرەج لەگەڵ یەك تێك چوون ، پێغەمبەریش لەسەر مینبەر هیواشی كردنەوە تاكو بێ دەنگ بوون ، ئەو ڕۆژە گریام و خەوم لێ نەكەوت، دایك وباوكم لەلا بوون و دوو شەو ڕۆژێك گریام ، تاكو گومانم برد گریان جەرگم لەت دەكات، دەڵێ: دایك وباكم لەلابوون ئافرەتێكی

ئەنصار داوای مۆڵەتی کرد ، مۆڵەتم داو دانیشت و لەگەڵ من دەگریا، ئێمە بەم شێوەماینەوە ، کاتێك پێغەمبەر هاتە ژوورێ دانیشت بەلاّم لەلای من دانەنیشت، لەو رۆژە، ئەوەی گوترا دەربارەی من گۆترا، مانگێك وەحی نەهاتبوو بۆ پێغەمبەر دەربارەی من ، (فَتَشَهَّدَ)شایەتی دە فەرمووی : ئەی عائیشە دەربارەی تۆ واو واوم پێگەیوە، ئەگەر تۆ بەری بی خوا بەرائەتت دەکا، ئەگەر تاوانت هەیە و گوناحت کردوە تۆبە بکەو بگەرێوە لای خوا، ئەگەر بەندە دانی نا بە تاوانەکەی خوا تۆبەکەی لیّ قەبووڵ دەکا.

کاتێ پێغەمبەر قسەکەی تەواو کرد فرمێسك لەچاوم نەماو هەستم کرد دڵۆپێك لەچاوم نەما ، گوتم باوکم لە جیاتی من وەلاّمی پێغەمبەری خوا بدەرەوە، گوتی : سوێند بەخوا نازانم چی بڵێم بە پێغەمبەر ، گوتمە دایکم لە جیاتی من وەلاّمی پێغەمبەر بدەرەوە، دایکم گوتی: سوێند بەخوا نازانم چی بڵێم بە پێغەمبەری خوا، منیش کچێکی کەم تەمەن بووم زۆر قورئانم نەدەزانی ، گوتم سوێند بەخوا دەزانم ئێوە قسەی خەڵك لە دڵتان جێگیر بوو وبڕوا دەکەن، ئەگەر بڵێم من بەریم خوا دەزانیّ من بەریم لەو تاوانە ، بەلاّم پێم بڕوا ناکەن، ئەگەر ئیعتراف بکەم بەشتێك کەبەریم لیّ ، ئێوە بڕوام پیّ دەکەن، سوێند بەخوا هیچ شتێك نابینم نموونەی پیّ بینمەوە بۆخۆم وئێوە جگە لەوەی کە باوکی (یوسف) گوتی : ئارام گرتن جوانەو خوا یارمەتی دەرە لەسەر ئەوەی ئێوە دەیڵێن ، دوای خۆم وەرگێرا سەر جێگای خۆم چاوەروان بووم خوا دیفاعم لیّ بکات، بەلاّم نەمدەزانی وەحی دەرباری من دادەبەزی ، من گوتم لەوانەیە پێغەمبەر خەونێك ببینیّ خوا بەرائەتی من بکا لەو خەونە، سوێند بەخوا کەس لەو مجلسە هەڵنەستا لەخانەوادی ئێمە تاکو وەحی بۆ پێغەمبەر دابەزی ، ئەو حاڵەتەی بەسەرداهات کاتیّ وەحی بۆ دەهات کە ئارەقی دەکرد لە رۆژی زستان، کاتیّ دڵخۆشی بە پێغەمبەرەوە دیار بوو و پێکەنی ، یەکەم قسە کە کردی ، فەرمووی : ئەی عائیشە سوپاسی خوا بکە خوا پاکی تۆی دەرخست ، دایکم گوتی : هەستە بۆ پێغەمبەری خوا، گوتم واللە بۆی هەڵناستم و سوپاسی کەس ناکەم جگە لە خوا ، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ) جا

کاتێ خوا قورئانی دابەزاندو پاکیەتی من دەرخست، ئەبوبەکر خوا لێ رازی بێ گوتی: سوێند بەخوا هیچی دیکە هاوکاری (میستەح ی کوڕی ئوساسە) ناکەم ، خزمی بوو لەبەر هەژاری یارمەتی دەدا، مادام لەو قسەوبوختانە بەشدارە دەربارەی عائیشە، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (وَلَا يَأْتَلِ أُولُو الْفَضْلِ مِنْكُمْ وَالسَّعَةِ أَنْ يُؤْتُوا إِلَى قَوْلِهِ غَفُورٌ رَحِيمٌ ) جا ئەبوبەکر گوتی : بەڵێ حەز دەکەم خوا لێم خۆش بێ ، جا پەشیمان بویەوە دەربارەی هاوکاری میستەح، وە پێغەمبەری خوا پرسیاری لە (زینەبی کچی جەحش ) کرد دەربارەی ئەم بوختانە ، فەرمووی : ئەی (زینب) چی دەزانی و چیت بینیوە، ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا چاو گوێی خۆم دەپارێزم ، والله هیچم لە عائیشە نەزانیوە جگە لە چاکە ، ئەو تاکە مونافیسم بوو لە نزیکی لە پێغەمبەر ، بەلام خوا پاراستی بەهۆی تەقواکەی.

دەرسەکانی ئەم ئایەتانە:

١-زمان کارەساتە.

٢-بوختان خێزان لە پاڵ یەك هەڵدەوشێنێتەوە.

٣-خۆمان بپارێزین لە زۆر شت

*********************

# وتاری ژماره (٧٤) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١٦) سورەتی النور

﴿وَلَوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ قُلۡتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٞ ١٦﴾

واته : بۆچی کاتێ گوێتان لەو بۆختانەوەبوو نەتانگوت: ئێمە بۆمان نییە ئەم قسەیە بکەین ئەبوایە (سبحان الله)تان بکردایەو، سەرتان سورِ بمایە لەو درۆو بوختانەو بتانوتایە: ئەمە تۆمەت و بوهتانێکی زۆرناقولاو گەورەیە ! بۆ هاوسەری پەیامبەر (صلى الله عليه وسلم) کراوە.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(١- عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطَبَ النَّاسَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَقَالَ مَا تُشِيرُونَ عَلَيَّ فِي قَوْمٍ يَسُبُّونَ أَهْلِي مَا عَلِمْتُ عَلَيْهِمْ مِنْ سُوءٍ قَطُّ وَعَنْ عُرْوَةَ قَالَ لَمَّا أُخْبِرَتْ عَائِشَةُ بِالْأَمْرِ قَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أَنْطَلِقَ إِلَى أَهْلِي فَأَذِنَ لَهَا وَأَرْسَلَ مَعَهَا الْغُلَامَ وَقَالَ رَجُلٌ مِنْ الْأَنْصَارِ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لَنَا أَنْ نَتَكَلَّمَ بِهَذَا سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ) صحيح البخاري

واته: لەعائیشەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر وتاری بۆ خەڵکی داو سوپاسی خوا کرد ،فەرمووی راوێژتان چییە بۆم ، کە کەسانێك هەن جوێن بەخانەوادەم دەدەن (واتە:بوختان) ، وەمنیش هەرگیز خراپەم لێ نەزانیون ، عوروە دەڵێ: کاتێ هەواڵی ئەم بوختانە درایە عائیشە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتم دەدەی بچمەوە ماڵی باوکم ،

ئەویش مۆڵەتیدا، غولامێکی لەگەڵ نارد ، پیاوێکی ئەنصار گوتی : (سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لَنَا أَنْ نَتَكَلَّمَ بِهَذَا سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ) واتە: پاکی بۆ خوا ئێمە بۆمان نیە، قسە لەوبارەوە بکەین بەراستی ئەوە بوختانێکی گەورەیە بۆ عائیشە هەڵدەبەستن .

ئایا ئەوەی گوتی (سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ) کێ بوو؟

وەڵام : ناوی ئەو پیاوەی کە ئەم هەڵویستەی جوانەی هەبوو ناوی (ابو ایوب خالد کوڕی زەید)بوو

(رجل) هو أبو أيوب خالد بن زيد رضي الله عنه. (سبحانك) ننزهك عن أن تفعل زوجة نبيك وخاتم رسلك الفاحشة. (بهذا) بالذي تكلم به الناس وخاضوا فيه من الاتهام بالفاحشة. (بهتان) كذب بالغ النهاية يبهت من يسمعه ويدهشه. وقد أنزل الله عز وجل قوله هذا قرآنا يتلى في سورة النور)

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٣) سورەتی النور

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْغَٰفِلَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأٓخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ٢٣﴾ النور

واتە : بوختان کردن بۆ ژنانی خاوەن باوەڕی بێ ئاگا: جا دوای باس کردنی ڕووداوەکەی (ئیفك) دێتە سەر باسی ئەوانەی وا بوختان بۆ ژنانی موسڵمان و داوێن پاك ئەکەن بەگشتیی و، خاتوو (عائیشە) بەتایبەتیی، بۆیە ئەفەرموێ: بێگومان ئەوانەی بوختان بە ژنانی داوێن پاکی و بێ خەبەری بروادار دەکەن لەدوارۆژیشدا نەفرینیان لێکراوە لەگەڵ ئەوەشدا سزایەکی گەورەشیان بۆ ئامادەکراوە (ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: (إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ) (النور: ٢٣) قَالَ: (نَزَلَتْ فِي عَائِشَةَ خَاصَّةً) رواه الحاكم وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ) ووافقه الذهبي

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبێرەوە هاتووە دەڵێ : ئیبنو عەباس خوا لەخۆی وبابی ڕازی بێ دەڵێ ئایەتی (إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ) بۆ عائیشە بەتایبەتی دابەزی ، بەلام قورئان گشتیە هەموو کەسێ دەگرێتەوە کە بوختان بکات.

-(وَعَنْهَا قَالَتْ: إِنَّ النَّاسَ كَانُوا يَتَحَرَّوْنَ بِهَدَايَاهُمْ يَوْمَ عَائِشَةَ يَبْتَغُونَ بِذَلِكَ مَرْضَاةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَقَالَتْ: إِنَّ نِسَاءِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كُنَّ حِزْبَيْنِ: فَحِزْبٌ فِيهِ عَائِشَةُ وَحَفْصَةُ وَصَفِيَّةُ وَسَوْدَةُ وَالْحِزْبُ الْآخَرُ أُمُّ سَلَمَةَ وَسَائِرُ نِسَاءِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَلَّمَ حِزْبُ أُمِّ سَلَمَةَ فَقُلْنَ لَهَا: كَلِّمِي رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُكَلِّمُ النَّاسَ فَيَقُولُ: مَنْ أَرَادَ أَنْ يُهْدِيَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلْيُهْدِهِ إِلَيْهِ حَيْثُ كَانَ. فَكَلَّمَتْهُ فَقَالَ لَهَا: (لَا تُؤْذِينِي فِي عَائِشَةَ فَإِنَّ الْوَحْيَ لَمْ يَأْتِنِي وَأَنَا فِي ثَوْبِ امْرَأَةٍ إِلَّا عَائِشَةَ) . قَالَتْ: أَتُوب إِلَى الله من ذَاك يَا رَسُولَ اللَّهِ ثُمَّ إِنَّهُنَّ دَعَوْنَ فَاطِمَةَ فَأَرْسَلْنَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَلَّمَتْهُ فَقَالَ: (يَا بُنَيَّةُ أَلَا تُحِبِّينَ مَا أُحِبُّ؟) قَالَتْ: بَلَى. قَالَ: (فَأَحِبِّي هَذِهِ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتە: لە عائیشەوە هاتووە دەڵێ : خەڵکی دەگەران دیاریان بۆ پێغەمبەر دەهێنا تاکو پێغەمبەر لەخۆیان ڕازی بکەن ، لەڕۆژی عائیشە (واتە: ئەو کاتەی خوا دیفاعی لە عائیشە کرد وئایەتی دابەزاند) عائیشە دەڵێ : لەو کات خێزانەکانی پێغەمبەر دوو پۆڵ بوون دەربارەی من ، پۆلێك بریتی بوون لە(عائیشە و حەفحە و صەفیەو سوودە) وە پۆلێکی دیکە بریتی بوون لە(ئوم سەلەمەو هەموو خێزانەکانی دیکە) تاقمی ئومە سەلەمە دەیانگوتە عائیشە خەڵکی چی دەڵێنە پێغەمبەر تۆش وابلێ ، (مَنْ أَرَادَ أَنْ يُهْدِيَ إِلَى

رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلْيُهْدِهِ إِلَيْهِ حَيْثُ كَانَ) قسەی لەگەڵ پێغەمبەر کرد ، ئەویش پێ فەرموو( ئازارم مەدە دەربارەی عائیشە وەحیم بۆ نەهاتووە لەهیچ ماڵێك مەگەر لە ماڵی عائیشە نەبێ ) ئەویش گوتی : تۆبە دەکەم بۆ لای خوا لەو شتە ئەی نێرراوی خوا، دوایی خێزانەکانی ناردیانە لای فاتیمەی کچی پێغەمبەر ، پێ فەرموو : ئەی کچی خۆم ئایا حەزناکەی کەسێکت خۆش بوی کە منی خۆشم دەوێ ، گوتی: بەڵێ ، فەرمووی : دە ئەوەت خۆش بوی (واتە: عائیشە)

## ئایا جیاوازی چییە لەنێوان عائیشەو خێزانەکانی دیکەی پێغەمبەر

١-(عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (كَمُلَ مِنَ الرِّجَالِ كَثِيرٌ وَلَمْ يَكْمُلْ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا آسِيَةُ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ، وَمَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ، وَخَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ، وَإِنَّ فَضْلَ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ) أخرجه الشيخان.

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : پیاوی کامڵ زۆرە لەناو پیاوان ، بەڵام ئافرەتی تەواو کەمن تەنها ئەوان نەبێ (آسِيَةُ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ، وَمَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ، وَخَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ) وە فەزل وگەورەیی عائیشە بەسەر ئافرەتانەوە وەکو فەزلی تەشریب بەسەر شێوەکان .

٢-( عَنْ عَائِشَةَ - رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا - قَالَتْ: إِنَّ مِنْ نِعَمِ اللَّهِ عَلَيَّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ تُوُفِّيَ فِي بَيْتِي وَفِي يَوْمِي وَبَيْنَ سَحْرِي وَنَحْرِي، وَإِنَّ اللَّهَ جَمَعَ بَيْنَ رِيقِي وَرِيقِهِ عِنْدَ مَوْتِهِ، دَخَلَ عَلَيَّ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ وَبِيَدِهِ سِوَاكٌ وَأَنَا مُسْنِدَةٌ رَسُولِ اللَّهِ ، فَرَأَيْتُهُ يَنْظُرُ إِلَيْهِ، وَعَرَفْتُ أَنَّهُ يُحِبُّ السِّوَاكَ، فَقُلْتُ: آخُذُهُ لَكَ؟ فَأَشَارَ بِرَأْسِهِ أَنْ نَعَمْ فَتَنَاوَلْتُهُ، فَاشْتَدَّ عَلَيْهِ، وَقُلْتُ: أُلَيِّنُهُ لَكَ؟ فَأَشَارَ بِرَأْسِهِ أَنْ نَعَمْ، فَلَيَّنْتُهُ، فَأَمَرَّهُ وَبَيْنَ يَدَيْهِ رَكْوَةٌ فِيهَا مَاءٌ، فَجَعَلَ يُدْخِلُ يَدَيْهِ فِي الْمَاءِ فَيَمْسَحُ بِهِمَا وَجْهَهُ، وَيَقُولُ: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، إِنَّ لِلْمَوْتِ سَكَرَاتٍ) ، ثُمَّ نَصَبَ يَدَيْهِ، فَجَعَلَ يَقُولُ: (فِي الرَّفِيقِ الْأَعْلَى) . حَتَّى قُبِضَ وَمَالَتْ يَدُهُ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ

**واته** : عائیشه دەڵێ : له نیعمەتەكانی خوا لەسەر من ئەوەیە پێغەمبەری خوا وەفاتی كرد له ژوورەكەی من و ، له ڕۆژی نۆبەی من و ، لەسەر سینگی من و ، وە تفی دەمی من لەگەڵ تفی دەمی موبارەكی پێغەمبەر تێكەڵ بوو لەكاتی مردنیدا ، چونكه لە كاتی سەرەمەرگیدا (عبدالرحمن كوڕی ابوبكر) هاته ژوورەوە سیواكی له دەست دابوو ، منیش پاڵپشت بووم بۆ پێغەمبەر و خۆی بەمن راگرتبوو ، چاوی لە سیواكی عبدالرحمن كرد ، منیش گوتم بۆت وەربگرم به ئاماژه فەرمووی بەڵێ ، وەرمگرد بەدەمی خۆم بۆم تەڕ كرد لەدەمی وەردا ، تەشته ئاوێكی له كن بوو دەستەكانی لەناو دەنا و دەم وچاوی خۆی پێ مەسح دەكرد و ، دەیفەرموو (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، إِنَّ لِلْمَوْتِ سَكَرَاتٍ) واته هیچ پەرستراوێك نیه شایستەی پەرستن بێ جگه له (الله) بەراستی گیان كێشان ئازارو نارەحەتی هەیه ، دوای دەستەكانی بەرزكردوە دەیفەرموو (فِي الرَّفِيقِ الْأَعْلَى) دوایی روحی دەرچوو ، و پەنچەی هاته خوارەوە .

٣-( عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: فِيَّ سَبْعُ خِصَالٍ لَيْسَتْ فِي أَحَدٍ مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: تَزَوَّجَنِي النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِكْرًا، وَلَمْ يَتَزَوَّجْ أَحَدًا مِنْ نِسَائِهِ بِكْرًا غَيْرِي، وَنَزَلَ جِبْرِيلُ إِلَيْهِ بِصُورَتِي قَبْلَ أَنْ يَتَزَوَّجَنِي، وَلَمْ يُنْزِلْ صُورَةَ أَحَدٍ مِنْ نِسَائِهِ غَيْرِي، وَرَأَيْتُ جِبْرِيلَ وَلَمْ يَرَهُ أَحَدٌ مِنْ أَزْوَاجِهِ غَيْرِي، وَكُنْتُ مِنْ أَحِبِّهِنَّ إِلَيْهِ نَفْسًا وَوَالِدًا، وَكَانَ جِبْرِيلُ يَنْزِلُ عَلَيْهِ بِالْوَحْيِ وَأَنَا مَعَهُ فِي شِعَارِهِ، وَلَمْ يَكُنْ يَأْتِيهِ وَهُوَ مَعَ أَحَدٍ مِنْ أَزْوَاجِهِ غَيْرِي، وَنَزَلَ فِيَّ آيَاتٌ مِنَ الْقُرْآنِ كَادَ يَهْلِكُ فِيهَا فِئَامٌ مِنَ النَّاسِ، وَمَاتَ فِي يَوْمِي وَلَيْلَتِي وَبَيْنَ سَحْرِي وَنَحْرِي) الكتاب: الآثار ، المؤلف: أبو يوسف الأنصاري

واته: له عائیشەی دایكی ئیمانداران هاتووه دەڵێ: حەوت خەسلەت لەمندا هەن، لە هیچ خێزانێكی پێغەمبەر كۆنەبۆتەوه . ١- منی مارەكرد بەكچی جگه لەمن هیچی دیكەی بە كچی مارەنەكردوه، ٢- پێش ئەوەی مارەبكرێم جوبریل وێنەی منی پیشانی پێغەمبەرداوه. ٣-جوبریلم دیت هیچ ئافرەتێك له خێزانەكانی نەیبینیوه. ٤-من لەهەموو كەس زیاتر خۆشویستووه. ٥-پێغەمبەر لەگەڵم بوو لەكن من بووه وەحی بۆ دابەزیوه

٦٠-چەند ئایەتێك لە قورئان دەربارەی من دابەزین ٧-لە سەرەی من و لەشەوڕۆژی من لەسەر سینگی من پێغەمبەر وەفاتی کرد.

٤-( عَنْ عَمْرِو بْنِ العَاصِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اسْتَعْمَلَهُ عَلَى جَيْشِ ذَاتِ السَّلَاسِلِ قَالَ: فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: (عَائِشَةُ). قُلْتُ: مِنَ الرِّجَالِ؟ قَالَ: (أَبُوهَا) اخرجه الترمذي قال هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ قال الالباني صحيح

واتە: لە عەمری کوڕی عاسەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەری خوا کردمیە سەرکردە لەسەر سوپا و مەفرەزەی (ذَات السَّلَاسِلِ) دەڵێ چوومە لای پێغەمبەر گوتم : ئەی نێرراوی خوا خۆشەویسترین کەس لای تۆ کێیە؟ فەرمووی : (عائیشە) ، گوتم : مەبەستم لە پیاوان بوو؟ فەرمووی : (باوکی عائیشە) .

٥-وفي رواية (عَنْ أَبِي عُثْمَانَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ عَمْرَو بْنَ الْعَاصِ عَلَى جَيْشِ ذَاتِ السُّلَاسِلِ قَالَ فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ أَيُّ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ عَائِشَةُ قُلْتُ مِنْ الرِّجَالِ قَالَ أَبُوهَا قُلْتُ ثُمَّ مَنْ قَالَ عُمَرُ فَعَدَّ رِجَالًا فَسَكَتُّ مَخَافَةَ أَنْ يَجْعَلَنِي فِي آخِرِهِمْ ) رواه البخاري

### ٣-هۆی دابەزینی ئایەتی (٣٠) سوڕەتی النور

(قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ وَيَحْفَظُواْ فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ٣٠) النور

واتە : ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بەپیاوانی بڕوادار بڵێ: چاو بنووقێنن لەئاستی ژنانی نامەحرەمدا واتە لەئاستی ئەوانەی وا ئەتوانن مارەیان بکەن چونکە لە چاو داخستندا دەرگای هەموو خراپەیەك دائەخرێت. (ئەحمد شەوقیی) چەندە جوان ئەڵێت: (نظرة فابتسامة فسلام ، فكلام فموعد فلقاء) وە داوێن و عەورەتی خۆیان بپارێزن

بێگومان ئەوە باشترە بۆیان بێگومان خوا بەو هەموو ئاکارانەیان بـە ئاگایـە   دیـارە ئەمـە هەڕەشەیەکی سەختە لەوانەی سنووری خوا ئەشکێنن.(ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عن علي رضي الله عنه قال: مَرَّ رجلٌ على عهدِ رسولِ الله صلى الله عليه وسلم في طريقٍ مِنْ طرقات المدينةِ، فنظرَ إلى امرأةٍ ونظرتْ إليه فوسوسَ لهما الشيطانُ، أنه لم ينظر أحدهما إلى الآخر إلاَّ إعجاباً به، فبينما الرجلُ يمشي إلى جَنْبِ حائطٍ وهو ينظر إليها إذ استقبَلَهُ الحائطُ فَشَقَّ أَنفه، فقال واللهِ لا أَغْسِلُ الدَّمَ حتى آتي رسولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم فَأُعَلِمَهُ أمري فأتاهُ فَقَصَّ عليه قصَّتَهُ، فقال النبي صلى الله عليه وسلم: هذا عُقوبَةُ ذَنْبِكَ ، فأَنَزَلَ اللهُ: (قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ) الآية."ابن مردويه) كنز العمال في سنن الأقوال والأفعال  وذكره السيوطي في در المنثور

واتە: لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە هاتووە دەڵێ: لە زەمانی پێغەمبەر پیاوێك بە ڕێگایەك لە ڕێگاکانی مەدینەدا ڕۆیشت ، سەیری ئافرەتێکی کرد، ئافرەتەکەش سەیری ئەوەی کرد ، شەیتان وەسوسەی خستە دڵی هەردووکیان ، هەردووکیان بەم سەیرکردنە بەیەکدی سەرسام بوون ، پیاوەکە دەڕۆیشت بە تەنیشت دیوارەوە تەماشای ئافرەتەکەی دەکرد، لەناوکاو خۆی لە دیواردا و لوتی شەق بوو، گوتی : واللە خوێنەکەی ناشۆم تاکو دەچمە خزمەت پێغەمبەر ، ئەم کارەی پێ دەڵێم ، جا هات و چیرۆکەکەی بۆ گێرایەوە ، پێغەمبەر فەرمووی : ئەوە سزای گوناحەکەت بووە، جا ئەو ئایەتە دابەزی وفەرمووی (قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ) واتە: ئەی (محمد) بە ئیمانداران بڵێ : لە چاوی خۆیان بگرنەوە ، وە داوێنی خۆیان بپارێزن.

-( قال الشاعر: كُلُّ المَهَالِكِ مَبْدَاهَا مِنَ النَظَر ... وَمُعْظَمُ النَّارِ مِنْ مُسْتَصْغَرِ الشَّرَر

واته: شاعیر دەڵێ: هەموو گوناحە لەناو بەرەکان سەرەتا لە ڕوانین دەست پێ دەکات، وە زۆربەی ئاگرەکان لە بروشکی بچوکەوە دەست پێ دەکات.

-( يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّ الصَّوْمَ لَهُ وِجَاءٌ ) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ وَمُسْلِمٌ

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : ئەی کۆمەڵی گەنجان هەرکەسێ دەتوانی ژن بێنی ، با ژن بهێنی ، چونکە هاوسەرگیری چاودەگرێتەوە ، دامێن دەپارێزێ ، ئەگەر کەسێك توانای زەواجی نەبوو ، با بەرۆژووبێ ، چونکە ڕۆژوو مرۆڤ دەخەسێنێ.

**********************

# وتاری ژماره (٧٥) له هۆیەكانی دابەزینی قورئان

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٣٣ ) سورەتی النور

﴿وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ ۚ وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ٣٣﴾ النور

واته : وه دەبێ ئەوانەی كه توانای (ئەركی) ژن هێنانیان نیه پاكژ خۆیان ڕاگرن هەتا خوا به بەهره (و ڕۆزی) خۆی بێ نیازیان دەكات وه ئەوانەی داوای نوسراو دەكەن (بۆ كڕینەوەی خۆیان) له بەندەو كەنیزەكەكانتان ئەوه نوسراویان لەگەڵدا بنوسن (بۆ كڕینەوەو ئازاد بوونی خۆیان) ئەگەر خێرتان لەواندا بەدی دەكرد (كه بریتی یه له توانای دانی ئەو پارەی ئەبێ بیدات به خاوەنەكەی بۆ ئازاد بوونی) وه لەو ماڵەی كه خوا به ئێوەی داوه پێیان بدەن وه كەنیزەكەكانتان زۆر لێ مەكەن (ناچاریان مەكەن) لەسەر زینا كردن ئەگەر ئەیانویست داوێن پاك بن تا ماڵ و سامانی ژیانی دنیاتان دەست كەوێت جا هەركەس ناچاریان بكات (زۆریان لێ بكات) ئینجا بەڕاستی خوا دوا ئەو زۆر لێ كردنەیان لێبووردەی میهرەبانه (بەو كەنیزەكانه كه به زۆر زینایان پێ كرا) (پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ جَابِرٍ أَنَّ جَارِيَةً لِعَبْدِ اللهِ بْنِ أُبَيٍّ ابْنِ سَلُولَ يُقَالُ لَهَا: مُسَيْكَةُ، وَأُخْرَى يُقَالُ لَهَا: أُمَيْمَةُ، فَكَانَ يُكْرِهُهُمَا عَلَى الزِّنَا، فَشَكَتَا ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَنْزَلَ اللهُ: (وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ) (النور: ٣٣) رواه مسلم

واتە: لە جابیرەوە هاتووە دەڵێ: جاریەکی عەبدوڵای کوڕی ئوبەی هەبوو ناوی (موسیکە) بوو ، یەکیدیکەشی هەبوو ناوی (ئومیمە) بوو ، جا زۆری لێ دەکردن زینا بکەن ، ئەوانیش سکاڵایان بردە لای پێغەمبەر ، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ) واتە: کەنیزەکانتان ناچار مەکەن تاکو زینا بکەن.

٢-( عَنِ السُّدِّيِّ وَلا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ قَالَ: أُنْزِلَتْ فِي عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ ابْنِ سَلُولَ رَأْسِ الْمُنَافِقِينَ، كَانَتْ لَهُ جَارِيَةٌ تُدْعَى مُعَاذَةَ، فَكَانَ إِذَا نَزَلَ بِهِ ضَيْفٌ أَرْسَلَهَا إِلَيْهِ لِيُوَاقِعَهَا إِرَادَةَ الثَّوْبِ مِنْهُ وَالْكَرَامَةِ لَهُ، فَأَقْبَلَتْ الْجَارِيَةُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ، فَشَكَتْ ذَلِكَ إِلَيْهِ، فَذَكَرَهُ أَبُو بَكْرٍ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَمَرَهُ بِقَبْضِهَا، فَصَاحَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ: مَنْ يَعْذِرُنَا مِنْ مُحَمَّدٍ يَغْلِبُنَا عَلَى مَمْلُوكِينَا فَأَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِمْ هَذَا) اخرجه ابن ابي حاتم

واتە:لە سوددیەوە هاتووە دەڵێ: ئایەتی (وَلا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ) دابەزیوە دەبارەی (عبدالله کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول) سەرۆکی مونافیقان ، جاریەکی هەبوو ناوی (موعازە) بوو ، کاتێ میوانی دەهات بەدوایدا دەنارد تاکو زینای لەگەڵ بکەن ، ئەوە بۆ ڕێزی میوان بوو ، جاریەکە گەیشتە ئەبوبەکر سکاڵای کرد لەو کارەی خۆی کە بە زۆر پێ دەکرێ، ئەبوبەکریش بۆ پێغەمبەر باسکرد، ئەویش داوای کرد بیکرێتەوە، (عبدالله کوڕی ئوبەی) هاواری کرد گوتی : کێ هاوکاریم دەکات (محمد) بەسەرماندا زاڵ دەبێ بە کۆیلەکانمان. جا خوا دەرباریان ئەم ئایەتەی دابەزاند.

## پارەی ئەم ئیشە حەرامە

( عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَمَهْرِ الْبَغِيِّ، وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ ومسلم

واتە: لە ئەبی مەسعودی ئەنصاریەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەری خوا رێگری کردوە لە وەرگرتنی پارەی سەگ و کرێی زینا و کرێی فاڵچی (واتە: پاریان بدرێتێ بۆ شت زانین ).

معاني الكلمات ((ثمن الكلب) بيعه وأخذ ثمنه. (مهر البغي) ما تأخذه الزانية على زناها وقد كانوا في الجاهلية يكرهون إماءهم على الزنا والاكتساب به فأنكر الإسلام ذلك ونهى عنه قال الله تعالى {ولا تكرهوا فتياتكم على البغاء إن أردن تحصنا لتبتغوا عرض الحياة الدنيا}. / النور ٣٣ /. فتياتكم إمائكم. تحصنا تعففا. (حلوان الكاهن) ما يعكى الكاهن أجرته على كهانته وأصل الحلوان في اللغة العطية والكاهن هو الذي يدعي علم ما يحدث في المستقبل ويخبر عنه)

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٥٣ ) سورەتی النور

﴿وَأَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّ ۖ قُل لَّا تُقْسِمُواْ ۖ طَاعَةٌ مَّعْرُوفَةٌ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ٥٣﴾ النور

واتە : دووڕووەکان سوێندیان دەخوارد بەخوا بە ئەوپەڕی سوێند خواردنیان کە ئەگەر فەرمانیان پێ بدەیت (بە دەرچوون بۆ غەزا) بێگومان دەردەچن بڵێ: سوێند مەخۆن ملکەچی و گوێڕایەڵی ئێوە زانراوە (قسەتان پێچەوانەی کردارتانە) بەڕاستی خوا ئاگادارە بەو کردەوانەی دەیکەن.(ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

عَن ابْن عَبَّاس قَالَ: أَتَى قوم النَّبِي صلى الله عَلَيْهِ وَسلم فَقَالُوا: يَا رَسُول الله لَو أمرتنا أَن نخرج من أَمْوَالنَا لخرجنا فَأنْزل الله (وأقسموا بِاللَّه جهد أَيْمَانهم) الدر المنثور

وفي رواية–(وَأخرج ابْن أبي حَاتِم عَن مقَاتل فِي قَوْله (وأقسموا بِاللَّه جهد أَيْمَانهم لَئِن أَمرتهم ليخرجن) قَالَ: ذَلِك من شَأْن الْجِهَاد (قل لَا تقسموا) قَالَ: يَأْمُرهُم أَن لَا يحلفوا على شَيْء (طَاعَة مَعْرُوفَة) قَالَ: أَمرهم أَن يكون مِنْهُم طَاعَة للنَّبِي صلى الله عَلَيْهِ وَسلم من غير أَن يقسموا) الدرالمنثور

## بەلام سەیری هەڵوێستی موسڵمان بکە لەم دەقدا:

(عَنْ أَنَسٍ (أَنَّ النَّبِيَّ – صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – شَاوَرَ حِينَ بَلَغَهُ إِقْبَالُ أَبِي سُفْيَانَ، فَتَكَلَّمَ أَبُو بَكْرٍ فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ تَكَلَّمَ عُمَرُ فَأَعْرَضَ عَنْهُ، فَقَامَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ فَقَالَ: إِيَّانَا تُرِيدُ يَارَسُولَ اللَّهِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَمَرْتَنَا أَنْ نُخِيضَهَا الْبَحْرَ لَأَخَضْنَاهَا، وَلَوْ أَمَرْتَنَا أَنْ نَضْرِبَ أَكْبَادَهَا إِلَى بِرْكِ الْغِمَادِ لَفَعَلْنَا، قَالَ: فَنَدَبَ رَسُولُ اللَّهِ – صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – النَّاسَ فَانْطَلَقُوا) رَوَاهُ أَحْمَدُ وَمُسْلِمٌ

واتە: پێغەمبەر راوێژی کرد بە هاوەڵان کاتێ هەواڵی پێگەیشت کاروانی ئەبو سوفیان لە رێگایە، ئەبوبەکر قسەی کرد ، پێغەمبەر پشتی تێکرد ، دوای عومەر قسەی کرد پشتی تێکرد (واتە: مەبەستی ئەوان نەبوو) دوای سەعدی کوڕی عوبادە هەڵساو گوتی: مەبەستت ئێمەیە ئەی پێغەمبەری خوا ، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر فەرمانمان پێ بکەی خۆمان لە دەریا بدەین ، خۆمانی لێی دەدەین، وە ئەگەر فەرمان بکەی بچینە ئەو سەری (هجر).دەچین،. پێغەمبەر بەرەو رووی دوژمن چوو ، جا خەڵکیش دەرچوون بۆ جەنگ.

وفي رواية-( عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَاوَرَ حِينَ بَلَغَهُ إِقْبَالُ أَبِي سُفْيَانَ، قَالَ: فَتَكَلَّمَ أَبُو بَكْرٍ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ تَكَلَّمَ عُمَرُ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، فَقَامَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، فَقَالَ: إِيَّانَا تُرِيدُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ أَمَرْتَنَا أَنْ نُخِيضَهَا الْبَحْرَ لَأَخَضْنَاهَا، وَلَوْ أَمَرْتَنَا أَنْ نَضْرِبَ أَكْبَادَهَا إِلَى بَرْكِ الْغِمَادِ لَفَعَلْنَا، قَالَ: فَنَدَبَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّاسَ، فَانْطَلَقُوا حَتَّى نَزَلُوا بَدْرًا، وَوَرَدَتْ عَلَيْهِمْ رَوَايَا قُرَيْشٍ، وَفِيهِمْ غُلَامٌ أَسْوَدُ لِبَنِي الْحَجَّاجِ، فَأَخَذُوهُ، فَكَانَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْأَلُونَهُ عَنْ أَبِي سُفْيَانَ، وَأَصْحَابِهِ، فَيَقُولُ: مَا لِي عِلْمٌ بِأَبِي سُفْيَانَ، وَلَكِنْ هَذَا أَبُو جَهْلٍ، وَعُتْبَةُ، وَشَيْبَةُ، وَأُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ، فَإِذَا قَالَ ذَلِكَ ضَرَبُوهُ، فَقَالَ: نَعَمْ، أَنَا أُخْبِرُكُمْ، هَذَا أَبُو سُفْيَانَ، فَإِذَا تَرَكُوهُ فَسَأَلُوهُ، فَقَالَ مَا لِي بِأَبِي سُفْيَانَ عِلْمٌ، وَلَكِنْ هَذَا أَبُو جَهْلٍ، وَعُتْبَةُ، وَشَيْبَةُ، وَأُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ، فِي النَّاسِ، فَإِذَا قَالَ هَذَا أَيْضًا ضَرَبُوهُ، وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَائِمٌ يُصَلِّي، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ انْصَرَفَ، قَالَ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَتَضْرِبُوهُ إِذَا صَدَقَكُمْ، وَتَتْرُكُوهُ إِذَا كَذَبَكُمْ)، قَالَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هَذَا مَصْرَعُ فُلَانٍ)، قَالَ: وَيَضَعُ يَدَهُ عَلَى الْأَرْضِ (هَاهُنَا، هَاهُنَا)، قَالَ: فَمَا مَاطَ أَحَدُهُمْ عَنْ مَوْضِعِ يَدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) رواه مسلم

واتە: پێغەمبەر راوێژی کرد بە هاوەڵان کاتێ هەواڵی پێگەیشت کاروانی ئەبو سوفیان لە رێگایە، ئەبوبەکر قسەی کرد ، پێغەمبەر پشتی تێکرد ، دوای عومەر قسەی کرد پشتی تێکرد (واتە: مەبەستی ئەوان نەبوو) دوای سەعدی کوڕی عوبادە هەڵساو گوتی: مەبەستت ئێمەیە ئەی پێغەمبەری خوا ، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر فەرمانمان پێ بکەی خۆمان لە دەریا بدەین ، خۆمان لێی دەدەین، وە ئەگەر فەرمان بکەی. بچینە ئەو سەری دونیا دەچین، جاپێغەمبەر بۆ جەنگەکە چوو ، جا خەڵکیش لەگەڵی دەرچوون تاکو گەیشتنە (بدر) ، هەندێ چادێری قوریش هاتن لەناویاندا خزمتکارێکی بەنی حەجاج هەبوو ، موسڵمانان گرتیان ، هاوەڵان پرسیاریان لێ کرد دەربارەی ئەبو سوفیان ، گوتی: هیچ نازانم دەربارەی ئەبو سوفیان ، بەلام (أَبُو جَهْلٍ، وَعُتْبَةُ، وَشَيْبَةُ، وَأُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ،) ئەوەتەن لەگەڵ ئەو سوپایەدان ، کە ئەوەی گوت لێیاندا،

گوتی: بەڵێ من هەواڵتان پێدەدەم ، ئەبو سوفیان لەگەڵ سوپادایە ، وازیان لێ هێنا ، گوتیان کوا ئەبوسوفیان ، گوتی : هیچ نازانم دەربارەی ئەبو سوفیان ، بەلاّم ئەوان (أَبُو جَهْلٍ، وَعُتْبَةُ، وَشَيْبَةُ، وَأُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ) لەو سوپایدانە، کە ئەوەی دەگوتەوە لێیان دەدا، لەو کاتدا پێغەمبەر نوێژی دەکرد ، کە ئەوەی بینی نوێژی تەواوکرد ، فەرمووی : سوێندم بەوەی گیانی من بەدەستە کە راستی دەگوت لێتان دەدا، کە درۆی دەکرد وازتان لێ دەهێنا) دەڵێ : پێغەمبەر فەرمووی : ئەو شوێنە جێگای کوژرانی فلانە کەسە، دەستی خۆی لەسەر زەوی دادەنا ، هیچ کەس لەو شوێنەی پێغەمبەر دیاری کردبوو لای نەدا(واتە: لە هەمان شوێن کوژرا، ئەوەش یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر)

********************

## وتاری ژماره (٧٦) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### ١-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٥٥ ) سورەتی النور

﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا ٱسۡتَخۡلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمۡ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرۡتَضَىٰ لَهُمۡ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعۡدِ خَوۡفِهِمۡ أَمۡنًاۚ يَعۡبُدُونَنِي لَا يُشۡرِكُونَ بِي شَيۡـٔٗاۚ وَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٥٥﴾ النور

واته : خوا بەڵێنی داوە بەو کەسانەتان کە باوەڕیان هێناوە وە کردەوەی چاکەکانیان کردووە کە بێگومان دەیانکاتە جێ نشینی (خەڵکی تر) لە زەوی دا هەروەك ئەوانی (ئیماندارانی) پێش ئەمانی کردە جێ نشین وە ئاینەکەیان بۆ دەچەسپێنێ ئەو (ئاینە) ی کە خوا پێی ڕازی بووە بۆیان وە ترس و بیمیان بۆ دەگۆڕێ بە ئاسایش و ئارامی (لەو کاتەدا ئیتر) هەر من دەپەرستن و هیچ هاوبەشیەکم بۆ بڕیار نادەن وە هەر کەس بێ بڕوا بێ دوا ئەوە (بەدی هاتنی بەڵێنەکان) ئەوە بەڕاستی هەر ئەوانەن دەرچوو لە ڕێگەی خوا.(پوختەی تەفسیر)

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابُهُ الْمَدِينَةَ وَآوَتْهُمُ الْأَنْصَارُ رَمَتْهُمُ الْعَرَبُ عَنْ قَوْسٍ وَاحِدَةٍ كَانُوا لَا يَبِيتُونَ إِلَّا بِالسِّلَاحِ وَلَا يُصْبِحُونَ إِلَّا فِيهِ، فَقَالُوا: تَرَوْنَ أَنَّا نَعِيشُ حَتَّى نَبِيتَ آمِنَيْنِ مُطْمَئِنِّيْنِ لَا نَخَافُ إِلَّا اللَّهَ؟ فَنَزَلَتْ: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ

أَمْنًا) (النور: ٥٥) إِلَى (وَمَنْ كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ) (النور: ٥٥) يَعْنِي بِالنِّعْمَةِ (فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ) رواه الحاكم في المستدرك وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخْرِجَاهُ ووافقه الذهبي والصحيح المسند من اسباب النزول

واته: لەئوبەی کوڕی کەعبەوە هاتووە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر و هاوەڵانی هاتنە مەدینە، وە ئەنصار باوەشیان بۆ کردنەوە، و عەرەب لە هەموو لایەك بۆیان هاتنە میدان، شەو نەدەمانەوە بە چەك نەبوایە، ڕۆژیان دەكردەوە هەر بە چەكەوە، گوتیان :ئایا ئێمە بەچاوی خۆمان دەبینن ژیان بگوزەرێنین، و شەوانیش بەرینە سەر بە ئەمن و ئاسایشەوە ناترسین جگە لە خوا؟ جا خوا ئەم ئایەتەی بۆ دابەزاندوفەرمووی (وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا) تاكو دەگاتە (وَمَنْ كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ) واتە: كوفر كردنە بەو نیعمەتە (فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ)

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی (٦١) سورەتی النور

(لَّيۡسَ عَلَى ٱلۡأَعۡمَىٰ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡأَعۡرَجِ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرِيضِ حَرَجٞ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ أَن تَأۡكُلُواْ مِنۢ بُيُوتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أُمَّهَٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ إِخۡوَٰنِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَعۡمَٰمِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ عَمَّٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَخۡوَٰلِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمۡ أَوۡ مَا مَلَكۡتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ أَوۡ صَدِيقِكُمۡۚ لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَأۡكُلُواْ جَمِيعًا أَوۡ أَشۡتَاتٗاۚ فَإِذَا دَخَلۡتُم بُيُوتٗا فَسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ تَحِيَّةٗ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةٗ طَيِّبَةٗۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ٦١) النور

واتە : كوێر گوناهی لەسەر نی یە و شەل گوناهی لەسەر نی یە هەروەها نەخۆش گوناهی لەسەر نی یە (ئەم جۆرە كەسانە گوناە نی یە بۆیان نان خواردن لەگەڵ كەسانی ساغدا) وە بۆ ئێوەش گوناە نی یە كە لە ماڵەكانی خۆتان نان بخۆن (ماڵی منداڵ و خێزانەكانتان

هەر بەماڵی خۆتان دادەنرێ) یا (نان بخۆن لە) ماڵی باوکتان یا ماڵی دایکتان یا ماڵی براکانتان یا ماڵی خوشکەکانتان یا ماڵی مامەکانتان یا ماڵە پورەکانتان (خوشکانی باوك) یا ماڵی خاڵەکانتان یا ماڵی پورەکانتان (خوشکانی دایك) یا ئەو ماڵانەی کە کلیلەکانیان بە ئێوەیە یا ماڵی برادەر و هاوڕێتان هیچ گوناهتان لەسەر نی یە بە کۆمەڵ یا بە تەنیا نان بخۆن جا کاتێ چوونە (هەر ماڵێك لە) ماڵان ئەوە سەلام لە یەکتر بکەن (لەوانەی کە وەك خۆتان وان) بەسەلام کردنێك لەلایەن خواوە (هاتووە) سەلامێکی جوان و چاك و پاك ئا بەو شێوە خوا ڕوونی دەکاتەوە ئایەتەکانی بۆ ئێوە بەڵکو ئەقڵتان بخەنە کارو بیر بکەنەوە.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عن عائشة قالت كان المسلمون يرغبون في النفير مع رسول الله صلى الله عليه وعلى آله وسلم فيدفعون مفاتيحهم إلى ضمناهم ويقولون لهم قد أحللنا لكم أن تأكلوا ما أحببتم فكانوا يقولون إنه لا يحل لنا أنهم أذنوا من غير طيب نفس فأنزل الله عز وجل (لَيْسَ عَلَى الْأَعْمَى حَرَجٌ وَلا عَلَى الْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلا عَلَى أَنْفُسِكُمْ أَنْ تَأْكُلُوا مِنْ بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ آبَائِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَاتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَانِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَاتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَعْمَامِكُمْ أَوْ بُيُوتِ عَمَّاتِكُمْ) إلى قوله (أَوْ مَا مَلَكْتُمْ مَفَاتِحَهُ) قال البزار لا نعلمه رواه عن الزهري إلا صالح.قال الحافظ الهيثمي في المجمع ج٧ ص٨٤ رواه البزار ورجاله رجال الصحيح.وقال السيوطي في لباب النقول سنده صحيح) والصحيح المسند من اسباب النزول

واتە: لە عائیشەی دایکی ئیمانداران هاتووە دەڵێ: خەڵکی حەزیان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەر بچنە جەنگ و جیهاد ، کلیلی ماڵی خۆیان تەسلیمی دۆستەکانیان دەکرد وپێیان دەگوتن گەردەنتان ئازاد بێت شت بخۆن ، ئەوانیش دەیانگوت بۆمان حەلاڵ نیە، دەیانگوت : مۆڵەتیان داوە بەلاّم بەدڵ نیە ، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزندوفەرمووی (لَيْسَ

عَلَى الْأَعْمَى حَرَجٌ وَلا عَلَى الْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلا عَلَى أَنْفُسِكُمْ أَنْ تَأْكُلُوا مِنْ بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ آبَائِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَاتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَانِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَاتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَعْمَامِكُمْ أَوْ بُيُوتِ عَمَّاتِكُمْ) إلى قوله (أَوْ مَا مَلَكْتُمْ مَفَاتِحَهُ)

٢-(عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ فِي قَوْلِ اللَّهِ: لَيْسَ عَلَى الأَعْمَى حَرَجٌ وَذَلِكَ لَمَّا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ قَالَتِ الأَنْصَارُ: مَا بِالْمَدِينَةِ مَالٌ أَعَزَّ مِنَ الطَّعَامِ. كَانُوا يَتَحَرَّجُونَ أَنْ يَأْكُلُوا مَعَ الأَعْمَى يَقُولُونَ: إِنَّهُ لَا يُبْصِرُ مَوْضِعَ الطَّعَامِ، وَكَانُوا يَتَحَرَّجُونَ الأَكْلَ مَعَ الأَعْرَجِ يَقُولُونَ: الصَّحِيحُ يَسْبِقُهُ إِلَى الْمَكَانِ وَلا يَسْتَطِيعُ أَنْ يُزَاحِمَ، وَيَتَحَرَّجُونَ الأَكْلَ مَعَ الْمَرِيضِ يَقُولُونَ لَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَأْكُلَ مِثْلَ الصَّحِيحِ، وَكَانُوا يَتَحَرَّجُونَ أَنْ يَأْكُلُوا فِي بُيُوتِ أَقْرِبَائِهِمْ فَنَزَلَتْ: لَيْسَ عَلَى الأَعْمَى حَرَجٌ يَعْنِي فِي الأَكْلِ مَعَ الأَعْمَى حَرَجٌ أَعْرَجُ وَلا مَرِيضٌ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّمَا كَانَ بِهِمُ التَّقَذُّرُ وَالتَّقَزُّزُ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: قَالُوا الْمَرِيضُ لَا يَسْتَوْفِي الطَّعَامَ كَمَا يَسْتَوْفِي الصَّحِيحُ وَالأَعْرَجُ الْمُنْحَبِسُ لَا يَسْتَطِيعُ الْمُزَاحَمَةَ عَلَى الطَّعَامِ وَالأَعْمَى لَا يُبْصِرُ الطَّعَامَ) اخرجه ابن ابي حاتم

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبێرەوە هاتووە دەڵێ: دەربارەی قسەی خوا (لَيْسَ عَلَى الأَعْمَى حَرَجٌ) دەڵێ کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ) ئەنصار گوتیان : هیچ لە مەدینە لە خواردن بەڕێزتر نیە، پێیان سەغلەت بوو نان لەگەڵ کوێران بخۆن ، دەیانگوت ئەو شوێنی خواردن نابینێ ، وە پێیان سەغلەت بوو لەگەڵ شەل نان بخۆن دەیانگوت لەش ساغ پێشی ئەو دەگاتە شوێنەکە ، وە پێیان سەغلەت بوو نان بخۆن لەگەڵ نەخۆش ، دەیانگوت چونکە ناتوانێ وەکو ساغ بخوات، وە پێیان سەغلەت بوو بخۆن لە ماڵی خزمەکانیان ، جا ئەم ئایەتە دابەزی (لَيْسَ عَلَى الأَعْمَى حَرَجٌ)

٣-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: فِي الرَّجُلِ يَشْتَرِي مِنَ الرَّجُلِ الثَّوْبَ ، فَيَقُولُ: (إِنْ رَضِيتَهُ أَخَذْتَهُ ، وَإِلَّا رَدَدْتَهُ وَرَدَدْتَ مَعَهُ دِرْهَمًا) قَالَ: هُوَ الَّذِي قَالَ اللَّهُ: (لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ)

(النساء: ٢٩) وَقَالَ آخَرُونَ: بَلْ نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ بِالنَّهْيِ عَنْ أَنْ يَأْكُلَ بَعْضُهُمْ طَعَامَ بَعْضٍ إِلَّا بِشِرَاءٍ ، فَأَمَّا قِرًى فَإِنَّهُ كَانَ مَحْظُورًا بِهَذِهِ الْآيَةِ ، حَتَّى نُسِخَ ذَلِكَ بِقَوْلِهِ فِي سُورَةِ النُّورِ: (لَيْسَ عَلَى الْأَعْمَى حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى أَنْفُسِكُمْ أَنْ تَأْكُلُوا مِنْ بُيُوتِكُمْ) (النور: ٦١) الْآيَةُ) اخرجه الطبري في (جامع البيان

٤-(عَنْ مَعْمَرٍ، قَالَ: قُلْتُ لِلزُّهْرِيِّ، فِي قَوْلِهِ: (لَيْسَ عَلَى الْأَعْمَى حَرَجٌ) (النور: ٦١) مَا بَالُ الْأَعْمَى ذُكِرَ هَاهُنَا وَالْأَعْرَجُ وَالْمَرِيضُ؟ فَقَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ " أَنَّ الْمُسْلِمِينَ كَانُوا إِذَا غَزَوْا خَلَّفُوا زَمْنَاهُمْ، وَكَانُوا يَدْفَعُونَ إِلَيْهِمْ مَفَاتِيحَ أَبْوَابِهِمْ يَقُولُونَ: قَدْ أَحْلَلْنَا لَكُمْ أَنْ تَأْكُلُوا مِمَّا فِي بُيُوتِنَا وَكَانُوا يَتَحَرَّجُونَ مِنْ ذَلِكَ ، يَقُولُونَ: لَا نَدْخُلُهَا وَهِيَ غُيَّبٌ. فَأُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ رُخْصَةً لَهُمْ) اخرجه الطبري في جامع البيان

٥-(قال ابن المسيب: (كان المسلمون إذا خرجوا إلى الغزو مع النبي – صلى الله عليه وسلم – وضعوا مفاتيح بيوتهم عند الأعمى والمريض والأعرج وعند أقاربهم، ويأذنون لهم أن يأكلوا من بيوتهم فكانوا يتحرجون من ذلك ويقولون: نخشى ألا تكون أنفسهم بذلك طيبة، فنزلت الآية رخصة لهم) الفجر الساطع على الصحيح الجامع

واته: ئیبنو موسیبەوە هاتوو دەڵێ: موسڵمانان ئەگەر چوبانە جەنگ لەگەڵ پێغەمبەری خودا ، کلیلی ماڵی خۆیان لەلای (کوێر و نەخۆش و شەلەکان ) دادەنا ، وە موڵەتیان دەدان لە ماڵیان بخۆن ، ئەوانە دەترسان هیچیان نەدەخوارد ، دەیانگوت : دەترسین نەوەك بەدڵ پێیان خۆش نەبێ ،جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند وەکو مۆڵەت بۆیان.

********************

# وتاری ژماره (٧٧) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (الفرقان)

سورەتی (الفرقان) سورەتێکی مەککی یە ، له ریزبەندا ژماره (٢٥)ە و ژمارەی ئایەتەکانی (٧٧)وە چیرۆکی (عقبة کوری ابي معيط )کە زۆر نەمابوو موسڵمان بێ ، بەلأم برادەری خراپ کە(ئوبەی کوری خلف)ە پەشیمانی کردوە قورئان ناوی دەبا بە زاڵم ،

– له کۆتایدا باسی سیفاتی بەندە چاکەکانی خوا (عبادالرحمن) دەکات .

–ئایا بۆچی ناونراوە (الفرقان)؟ چونکه حەق و ناحەق و تاریکی وروناکی و ئیمان وکوفر لێك جیادەکاتەوە

### ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٧-٢٩) سورەتی الفرقان

وَيَوۡمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلٗا ٢٧ يَٰوَيۡلَتَىٰ لَيۡتَنِي لَمۡ أَتَّخِذۡ فُلَانًا خَلِيلٗا ٢٨ لَّقَدۡ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكۡرِ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَنِيۗ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِلۡإِنسَٰنِ خَذُولٗا ٢٩) الفرقان

واته : وه ڕۆژێکه که ستەمکار قەپ دەکات بە هەر دوو دەستی خۆیدا و دەڵێ کاشکای لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێگای ڕاستم بگرتایەتە بەر.(٢٧) ئای تیاچوون بۆ من خۆزگە فلأن کەسم نەکردایە بە هاوەڵ و خۆشەویستی خۆم.(٢٨) بەڕاستی ئەو (کەسەی کردم بە هاوەڵ) منی لە قورئان وێڵ کرد دوای ئەوەی قورئانم پێ گەیشت (و باوەڕم پێ هێنا) وە شەیتان هەمیشە پشت تێکەرو پشت بەردەرە بۆ ئادەمیزاد.(٢٩)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنِ السُّدِّيِّ: وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلا قَالَ نَزَلَتْ فِي عُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ كَانَ قَدْ غَشِيَ مَجْلِسَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهَمَّ أَنْ يُسْلِمَ فَلَقِيَهُ أُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ فَقَالَ: يَا عُقْبَةُ بَلَغَنِي أَنَّكَ قَدْ صَبَوْتَ فَتَبِعْتَ مُحَمَّدًا فَقَالَ: فَعَلْتُ، قَالَ: فَوَجْهِي مِنْ وَجْهِكِ حَرَامٌ حَتَّى تَأْتِيَهُ فَتَتْفُلَ فِي وَجْهِهِ وَتَتَبَرَّأَ مِنْهُ فَيَعْلَمَ قَوْمُكَ أَنَّكَ عَدُوٌّ لِمَنْ عَادَاهُمْ وَفَرَّقَ عَلَيْهِمْ جَمَاعَتَهُمْ فَأَطَاعَهُ فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَتَفَلَ فِي وَجْهِهِ وتبرأ منه فَاشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِيهِ يُخْبِرُ بِمَا هُوَ صَائِرٌ إِلَيهِ مِنَ النَّدَامَةِ وَتَبَرُّئِهِ مِنْ خَلِيلِهِ أُمَيَّةَ بْنِ خَلَفٍ فَقَالَ: وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلا وَالسَّبِيلُ: الطَّاعَةُ) اخرجه ابن ابي حاتم في تفسيره

واتە: لە سوودییەوە هاتووە دەڵێ: ئەو ئایەتە(وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلا) دابەزیوە دەربارەی (عُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ) کە لە مەجلیسی پێغەمبەر بوو ، نیازی وابوو موسڵمان بێ، بەڵام (ئومیەی کوڕی خەلەف) پێگەیشت گوتی : ئەی عوقبە هەواڵم پێگەیشتووە تۆ کە بە دوای (محمد) کەوتی ، گوتی : وامکردوە ، گوتی: ڕووم لە ڕووی تۆ حەرام بێ ، تاکو نەچی تف بەر رووی (محمد) دانەکەی و بەرائەتی لێ نەکەی ، وە قەومەکەت بزانن تۆ دوژمنی ئەو کەسەی کە دوژمنایەتی ئەوان دەکات ، ئەویش بە گوێی کرد ، چووە لای پێغەمبەر تفی بەر رووی موبارەکی پێغەمبەردا کرد و بەرائەتی لێ کرد ، ئەو شتە لەسەر دڵی پێغەمبەر زۆر قورس بوو، خواش ئایەتی دابەزاند ، تێدا هەواڵی پێدا ، ڕۆژێك دێت بەرائەتی لەو برادەرەی دەکات کە (ئوبەی کوڕی خەلەفە) جا خوا فەرمووی (وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلا وَالسَّبِيلُ: الطَّاعَةُ)

٢-( عَنْ مِقْسَمٍ، فِي قَوْلِهِ: (وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلًا) (الفرقان: ٢٧) قَالَ: اجْتَمَعَ عُقْبَةُ بْنُ أَبِي مُعَيْطٍ وَأُبَيُّ بْنُ خَلَفٍ، وَكَانَا خَلِيلَيْنِ، فَقَالَ

أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: بَلَغَنِي أَنَّكَ أَتَيْتَ مُحَمَّدًا فَاسْتَمَعْتَ مِنْهُ، وَاللَّهِ لَا أَرْضَى عَنْكَ حَتَّى تَتْفُلَ فِي وَجْهِهِ وَتُكَذِّبُهُ، فَلَمْ يُسَلِّطْهُ اللَّهُ عَلَى ذَلِكَ، فَقُتِلَ عُقْبَةُ يَوْمَ بَدْرٍ صَبْرًا. وَأَمَّا أُبَيُّ بْنُ خَلَفٍ فَقَتَلَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدِهِ يَوْمَ أُحُدٍ فِي الْقِتَالِ، وَهُمَا اللَّذَانِ أَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِمَا: (وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ، يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلًا) (الفرقان: ٢٧) اخرجه الطبري في جامع البيان والالباني في صحيح السيرة النبوية وابن هشام

واته: لـه ميقسـيمەوه هـاتووه دەڵـێ: ئايـەتی (وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلًا) (الفرقان: ٢٧)) (عُقْبَةُ بْنُ أَبِي مُعَيْطٍ وَأُبَيُّ بْنُ خَلَفٍ) كۆبونـەو کەهەر دووکیان دوو برادەر بوون ، یەکیان بـەوی دیکـەیان گـوت ، بیسـتومە چـوویتە لای (محمد) و گوێت لـێ گرتـووە ، سـوێند بـەخوا لێـت رازی نـابم تـاکو تـف بـە دەم وچـاوی دانەکەی وبەدرۆی نەخەیتەوە، خوا زاڵی نەکرد بەسەردا (عُقْبَةُ) لە رۆژی بـەدر کـوژرا ، وە (أُبَيُّ بْنُ خَلَفٍ) ش لە جـەنگی ئوحـد بـە دەسـتی پێغەمبـەر کـوژرا. ئـەو دووانـە ئایـەتیان دەربارە دابەزی (وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ، يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلًا))

٣-( (أُبَيُّ بْنُ خَلَفٍ وَعُقْبَةُ بْنُ أَبِي مُعَيْطٍ، وَمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِمَا) :

وَأُبَيُّ بْنُ خَلَفِ بْنِ وَهْبِ بْنِ حُذَافَةَ بْنِ جُمَحَ، وَعُقْبَةُ بْنُ أَبِي مُعَيْطٍ، وَكَانَا مُتَصَافِيَيْنِ، حَسَّنَا مَا بَيْنَهُمَا. فَكَانَ عُقْبَةُ قَدْ جَلَسَ إلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَسَمِعَ مِنْهُ، فَبَلَغَ ذَلِكَ أُبَيًّا، فَأَتَى عُقْبَةَ فَقَالَ (لَهُ) : أَلَمْ يَبْلُغْنِي أَنَّكَ جَالَسْتَ مُحَمَّدًا وَسَمِعْتَ مِنْهُ! وَجْهِي مِنْ وَجْهِكَ حَرَامٌ أَنْ أُكَلِّمَكَ- وَاسْتَغْلَظَ مِنْ الْيَمِينِ- إنْ أَنْتَ جَلَسْتَ إلَيْهِ أَوْ سَمِعْتَ مِنْهُ، أَوْ لَمْ تَأْتِهِ فَتَتْفُلَ فِي وَجْهِهِ. فَفَعَلَ ذَلِكَ عَدُوُّ اللَّهِ عُقْبَةُ بْنُ أَبِي مُعَيْطٍ لَعَنَهُ اللَّهُ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِمَا: وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ على يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلًا ٢٥: ٢٧ ... إلَى قَوْلِهِ تَعَالَى: لِلْإِنْسانِ خَذُولًا ٢٥: ٢٩) سيرة ابن هشام

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی (٣٢) سورەتی الفرقان

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ وَٰحِدَةٗۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا ٣٢﴾ الفرقان

واتە : وە ئەوانەی بێ بڕوا بوون دەیان وت بۆچی (موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) هەموو قورئانی بەیەك جار بۆ دانەبەزێنراوە ئا بەو جۆرە (دامان بەزاندووە) بۆ ئەوەی دڵی تۆ (ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بەو قورئانە دامەزراوو بەهێز بکەین وە (بەو بۆنەیەوە) ئایەتانی خۆمم بۆ ناردن بەرە بەرە.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ الْمُشْرِكُونَ: إن كَانَ مُحَمَّدٌ كَمَا يزْعُمُ نَبيّاً فَلِمَ يُعَذِّبُهُ رَبُّهُ، أَلا ينزل عَلَيْهِ الْقُرْآنَ جملَةً وَاحِدَةً يَنْزِلُ عَلَيْهِ الْآيَةَ والآيتينِ وَالسورَةَ ،فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى نَبِيِّهِ جَوَّابُ مَا قَالُوا: وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً ) إِلَى (وأضل سَبِيلا) الدرالمنثور ولباب المنقول للسيوطي

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: موشریکان گوتیان : ئەگەر (محمد) وادەزانێ پێغەمبەر بۆچی خواکەی ئازاری دەدات ، بۆچی قورئانی بە یەکجار بۆ دانابەزێنێ ، بۆچی ئایەتێك یان دوو ئایەتە یان سورەتێك دادەبەزێنێ ، جا خوا بۆ پێغەمبەرەکەی دابەزاند بۆ وەڵامی موشریکان فەرمووی ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ وَٰحِدَةٗۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا٣٢ وَلَا يَأۡتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ وَأَحۡسَنَ تَفۡسِيرًا ٣٣ ٱلَّذِينَ يُحۡشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُوْلَٰٓئِكَ شَرّٞ مَّكَانٗا وَأَضَلُّ سَبِيلٗا ٣٤

٢-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: (إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ) (القدر: ١) قَالَ: أُنْزِلَ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، وَكَانَ بِمَوْقِعِ النُّجُومِ، وَكَانَ اللَّهُ يُنَزِّلُهُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْضَهُ فِي أَثَرِ بَعْضٍ، قَالَ: وَقَالُوا: (لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً كَذَلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا) (الفرقان: ٣٢ ) رواه الحاكم في المستدرك وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِهِمَا، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ ووافقه الذهبي

واته: له ئیبنو عه‌باسه‌وه هاتووه خوا له‌خۆی وبابی رازی بێ دەڵێ: فه‌رمایشتی خوا (إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ) ده‌ڵێ: قورئان هه‌موو به یه‌ك جار دابه‌زیوه بۆ ئاسمانی دونیا ، له شوێنه‌كانی ئه‌ستێره ، وه‌خوا بۆ سه‌ر پێغه‌ره‌كه‌ی په‌یتا په‌یتای ده‌ناردە خواره‌وه ، كافرانیش ده‌یانگوت (لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً كَذَلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا)

٣-(عن ابن عباس، في قوله: (إنا أنزلناه في ليلة القدر) (القدر: ١) قال: (أنزل القرآن جملة واحدة حتى، وضع في بيت العزة في السماء الدنيا، ونزله جبريل عليه السلام على محمد صلى الله عليه وسلم بجواب كلام في السماء الدنيا، ونزله جبريل عليه السلام على محمد صلى الله عليه وسلم بجواب كلام العباد، وأعمالهم) المعجم الكبير للطبراني والبيهقي في شعب الايمان

٤-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ: إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ قَالَ: أُنْزِلَ الْقُرْآنُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ جُمْلَةً وَاحِدَةً مِنَ الذِّكْرِ الَّذِي عِنْدَ رَبِّ الْعِزَّةِ حَتَّى وُضِعَ فِي بَيْتِ الْعِزَّةِ فِي السَّمَاءِ الدُّنْيَا، ثُمَّ جَعَلَ جِبْرِيلَ يَنْزِلُ عَلَى مُحَمَّدٍ بِحِرَاءَ بِجَوَابِ كَلامِ الْعِبَادِ وَأَعَمَالِهِمْ) ابن ابي حاتم

٥-(قال ابن عباس وغيره: أنزل الله القرآن جملة واحدة من اللوح المحفوظ إلى بيت العزَّة من السماء الدنيا، ثم نزل مفصلاً بحسب الوقائع في ثلاث وعشرين سنة) تطريز رياض الصالحين

-(قوله تعالى: (إِنَّا أَنزَلْنَاهُ) ، أي: القرآن، (فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ) ، أي: الفضل والشرف، وهي ليلة يقدِّر الله فيها أمر السنَّة في عباده وبلاده إلى السنة المقبلة.

قيل للحسين بن الفضل: أليس قد قدَّر لله المقادير قبل أن يخلق السموات والأرض؟ قال: نعم، قيل: فما معنى ليلة القدر؟ قال: سَوْقُ المقادير التي خلقها إلى المواقيت تنفيذ القضاء المقدَّر)تطريز رياض الصالحين

## ٣-هۆی دابەزینی ئایەتی (٤٣) سورەتی الفرقان

(أَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا ٤٣) الفرقان

واتە : ئایا نابینیت ئەو کەسەی کە ئارەزووی خۆی کردۆتە خوای خۆی (شوێن نەفسی بەدکردار کەوتووە) ئایا تۆ دەتوانیت ئەوانە بپارێزیت لە لادان و سەرکەشی؟! (یاخود سنوورێکیان بۆ دابنێیت؟ خەمت نەبێ بۆ کوێ دەچن؟). (ئاسان)

١-( قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: كَانَ الرَّجُلُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ يَعْبُدُ الْحَجَرَ الْأَبْيَضَ زَمَانًا فَإِذَا رَأَى غَيْرَهُ أَحْسَنَ مِنْهُ عَبَدَ الثاني وترك الأول) تفسير ابن كثير

واتە: ئیبنو عەباس دەڵێ: لە زەمانی جاهیلی خەڵکی بەردێکی سپی دەپەرست ، بەلاّم ئەگەر بەردێکی چاکتری بینیبایە دووەمی دەپەرست ، وازی لە یەکەم دەهێنا

٢-( عن سعيد ين جبير قال : كانت قريش تعبد الحجر حينا من الدهر فإذا وجدوا ما هو أحسن منه طرحوا الأول وعبدوا الآخر فنزلت ( أفرأيت من اتخذ إلهه هواه ) لباب المنقول للسيوطي.

دەرسەکانی ئەم ئایەتە:

١–شت بە پێی ئارەزوو نەکەی ، بەڵکو بە پێ شەریعەت بکەین.

٢–بەزۆری نەفس فەرمان بەخراپە دەکات ، مەگەر خوا رەحم بکات.

٣–نەفس دەکرێت سێ جۆر (١–نەفسی ئارام ٢– نەفسی لۆمەکراو ٣– نەفسی فەرمانکەر بە خراپە)

*******************

# وتاری ژماره (٧٨) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (القصص)

سـورەتی (القصـص) سـورەتێکی مـەککی یـە ، لـە ریزبەنـدا ژمـارە (٢٨) و ژمـارەی ئایەتەکانی (٨٨)ئایەتە

–وەباسی چیرۆکی قارون دەکات ، کە لەبەر مەغروری خوا لەناوی برد.

–ئایا بۆچی ناونراوە (القصص)؟ چونکە بەدرێژی باسی چیرۆکی لە دایك بـوونی (موسـی) دەکات تاکو هاتنی پەیام بۆی .

-باسی ئەوە دەکات ئاخیرەت بۆ ئەو کەسانەیە کە نە فەسادی دەکەن ، نـە خۆیـان بـەزل دەزانن وەفەرموویەتی (تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ٨٣)

واتە: ئەو ماڵی دوا ڕۆژە (بەهەشت) دەیدەین بەو کەسانەی نە بەرزی و خۆ بەزل زانی یان دەوێت لەزەوی دا نە دەست درێژی و خراپەکاری وە سەرئەنجامی چاك بۆ خۆ پارێزانە.

باسی ئەوەدەکات دونیا تێك دەچیٚ و هەموو شتیٚ لە ناو دەچـیٚ تـەنها خـوا دەمـێنیٚ وەك فەموویەتی (كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ ۚ لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ٨٨)

واتە: جگە لە خـوا هـەموو شـتێك لـەناو دەچـیٚ جگـە لـەزاتی خـوا بڕیـارو حـوکم تایبـەتی خوایەو تەنها بۆ لای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە.

–لە کۆتایدا باسی رێگای بەختەوەری دەکات کە بریتییە لە ئیمان .

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٥١-٥٤) سورەتی القصص

﴿وَلَقَدۡ وَصَّلۡنَا لَهُمُ ٱلۡقَوۡلَ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ٥١ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤۡمِنُونَ ٥٢ وَإِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلِهِۦ مُسۡلِمِينَ ٥٣ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡتَوۡنَ أَجۡرَهُم مَّرَّتَيۡنِ بِمَا صَبَرُواْ وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٥٤﴾ القصص

واتە : سوێند بەخوا (ئایەتەکانی) قورئانمان بەشوێن یەکدا بۆ ناردن تا پەند وەرگرن و بیر بکەنەوە.(٥١) ئەو کەسانەی لە پێشدا کتێبی ئاسمانیمان پێ دابوون ئەوانە بڕوا دێنن بە قورئان.(٥٢) وە کاتێ (قورئان) بخوێنرێتەوە بەسەریاندا دەڵێن باوەڕمان پێ هێناوە بێگومان ئەم (قورئانە) ڕاستەو لەلایەن پەروەردگارمانەوە هاتووە بەڕاستی ئێمە لە پێش (هاتنی) قورئان دا موسوڵمان بووین. (٥٣) ئەوانە دووجار پاداشتیان پێ دەدرێ لەبەر ئەوەی خۆیان گرت و بەئارام بوون بەچاکە بەرگری خراپە دەکەن وە لەو ڕزق و ڕۆزی یەی پێمان داون دەبەخشن. (٥٤)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ، قَالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ فِي عَشَرَةٍ أَنَا أَحَدُهُمْ ﴿وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ الْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ (القصص: ٥١) الطبري في (جامع البيان) والطبراني

واتە: لە ریفاعەی قوریزی هاتووە دەڵێ: ئەم ئایەتە دابەزیوە بۆ دەکەس من یەکێ بووم لەوان ، وەك فەرموویەتی ﴿وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ الْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ واتە: سوێند بەخوا (ئایەتەکانی) قورئانمان بەشوێن یەکدا بۆ ناردن تا پەند وەرگرن و بیر بکەنەوە

٢-( أخرج ابن جرير والطبراني عن رفاعة القرظي قال نزلت ولقد وصلنا لهم القول في عشرة أنا أحدهم) لباب المنقول للسيوطي

٣-( وأخرج ابن جرير عن علي بن رفاعة قال خرج عشرة رهط من أهل الكتاب منهم رفاعة يعني أباه إلى النبي صلى الله عليه وسلم فآمنوا فأوذوا فنزلت الذين آتيناهم الكتاب الآية) لباب المنقول للسيوطي

٤-( وَأخرج الْبُخَارِيّ فِي تَارِيخه وَابْن الْمُنْذر عَن عَليّ بن رِفَاعَة رَضِي الله عَنهُ قَالَ: كَانَ أبي من الَّذين آمنُوا بِالنَّبِيِّ صلى الله عَلَيْهِ وَسلم من أهل الْكتاب وَكَانُوا عشرَة فَلَمَّا جاؤا جعل النَّاس يستهزئون بهم وَيضْحَكُونَ مِنْهُم فَأنْزل الله (أُولَئِكَ يُؤْتونَ أجرهم مرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا) الدر المنثور

عائيشه خوا لێ رازی بێ ئەم رووداوە دەگێڕیتەوە دەربارەی ئەم پیاوە

( عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةُ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ: إِنِّي كُنْتُ عِنْدَ رِفَاعَةَ فَطَلَّقَنِي فَبَتَّ طَلَاقِي فَتَزَوَّجْتُ بَعْدَهُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزُّبَيْرِ وَمَا مَعَهُ إِلَّا مِثْلُ هُدْبَةِ الثَّوْبِ فَقَالَ: (أَتُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ؟) قَالَتْ: نَعَمْ قَالَ: (لَا حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ وَيَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ ) مُتَّفق عَلَيْهِ

واتە: لەعائیشەی دایکی ئیمانداران وخێزانی پێغەمبەر هاتووە دەڵێ : خێزانی (ریفاعەی قوریزی ) هاتە لای پێغەمبەر گوتی: من خێزانی ریفاعە بووم ، تەلاقی دام ، ماوەی عیدەم تەواو بوو ، لەپاشان مێردم کردوە بە (عبدالرحمن کوڕی زوبیر) بەلاّم هیچی پێ ناکرێ لە کاری سەرجێی ، پێغەمبەر فەرمووی : دەتەوێ بگەرێتەوە لای (ریفاعە)؟ گوتی: بەڵێ ، فەرمووی نەخێر تاکو هەردوکتان چێژ لە یەك وەرنەگرن نابێ.

وفي رواية (أَنَّ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ جَاءَتْ امْرَأَةُ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا جَالِسَةٌ وَعِنْدَهُ أَبُو بَكْرٍ فَقَالَتْ يَا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنِّي كُنْتُ تَحْتَ رِفَاعَةَ فَطَلَّقَنِي فَبَتَّ طَلَاقِي فَتَزَوَّجْتُ بَعْدَهُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزُّبَيْرِ وَإِنَّهُ وَاللَّهِ مَا مَعَهُ يَا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَّا مِثْلُ هَذِهِ الْهُدْبَةِ وَأَخَذَتْ هُدْبَةً مِنْ جِلْبَابِهَا فَسَمِعَ خَالِدُ بْنُ سَعِيدٍ قَوْلَهَا وَهُوَ بِالْبَابِ لَمْ يُؤْذَنْ لَهُ قَالَتْ فَقَالَ خَالِدٌ يَا أَبَا بَكْرٍ أَلَا تَنْهَى

هَذِهِ عَمَّا تَجْهَرُ بِهِ عِنْدَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَا وَاللَّهِ مَا يَزِيدُ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى التَّبَسُّمِ فَقَالَ لَهَا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ لَا حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ وَتَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ فَصَارَ سُنَّةً بَعْدُ) صحيح البخاري

-(وَعَنْ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: (سُئِلَ نَبِيُّ اللَّهِ – صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – عَنْ الرَّجُلِ يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ ثَلَاثًا وَيَتَزَوَّجُهَا آخَرُ فَيُغْلِقُ الْبَابَ وَيُرْخِي السِّتْرَ ثُمَّ يُطَلِّقُهَا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، هَلْ تَحِلُّ لِلْأَوَّلِ؟ قَالَ: لَا، حَتَّى يَذُوقَ الْعُسَيْلَةَ) رَوَاهُ أَحْمَدُ وَالنَّسَائِيُّ وَقَالَ: قَالَ: (لَا تَحِلُّ لِلْأَوَّلِ حَتَّى يُجَامِعَهَا الْآخَرُ)

-(عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ – صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – قَالَ: (الْعُسَيْلَةُ هِيَ الْجِمَاعُ) رَوَاهُ أَحْمَدُ وَالنَّسَائِيُّ

-(رِفَاعَةُ بْنُ سَمَوْأَلٍ الْقُرَظِيّ) وَقِيلَ اسْمُ أَبِيهِ أَيْضًا رِفَاعَةُ مِنْ بَنِي قُرَيْظَةَ رُوِيَ عَنْهُ أَنَّهُ قَالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ (وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ الْقَوْلَ) (القصص: ٥١) الْآيَةَ فِي عَشَرَةٍ أَنَا أَحَدُهُمْ، وَهُوَ الَّذِي طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلَاثًا فِي عَهْدِ النَّبِيِّ – صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – فَتَزَوَّجَهَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الزُّبَيْرِ وَلَهُ ذِكْرٌ بِهَذِهِ الْقِصَّةِ فِي كِتَابِ الطَّلَاقِ.

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٥٦ ) سورەتی القصص

﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَآءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ٥٦﴾ القصص

واتە : بەڕاستی (ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) تۆ ناتوانی ئەو کەسەی خۆشت بوێ ڕێنموونی بکەیت بەڵام خوا هەرکەسی بوێ هیدایەتی دەدات و ئەو (خوایە) زاناترە بەوانەی ڕێنموونی وەرگرن.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيِّبِ، عَنْ أَبِيهِ ، قَالَ: لَمَّا حَضَرَتْ أَبَا طَالِبٍ الْوَفَاةُ جَاءَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَوَجَدَ عِنْدَهُ أَبَا جَهْلٍ، وَعَبْدَ اللهِ بْنَ أَبِي أُمَيَّةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا عَمِّ، قُلْ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، كَلِمَةً أَشْهَدُ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللهِ ، فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي أُمَيَّةَ: يَا أَبَا طَالِبٍ، أَتَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ؟ فَلَمْ يَزَلْ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعْرِضُهَا عَلَيْهِ، وَيُعِيدُ لَهُ تِلْكَ الْمَقَالَةَ حَتَّى قَالَ أَبُو طَالِبٍ آخِرَ مَا كَلَّمَهُمْ: هُوَ عَلَى مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَأَبَى أَنْ يَقُولَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمَا وَاللهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ مَا لَمْ أُنْهَ عَنْكَ)، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: (مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَى مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ) (التوبة: ١١٣)، وَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى فِي أَبِي طَالِبٍ، فَقَالَ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ) رواه مسلم

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسیبەوە ئەویش لەبابی کە هەواڵی پێداوە : کاتێ ئەبو تالیب لەسەرە مەرگ بوو ، پێغەمبەر چووە لای دەبینی ئەبو جەهلی کوڕی هیشام وعەبدوڵای

کوڕی ئەبی ئومەییەی کوڕی موغیرە لەلای ئەوەن ، پێغەمبەر فەرموویە ئەبی تالیب ئەی مامە بڵێ (لا الـه الا الله) ئەو وشەیە بەڵگەیە بۆم شاهیدیت بۆ دەدەم لەلای خوا، ئەبوجەهل و عەبدوڵای کوڕی ئەبی ئومەییە گوتیان ئەی ئەبو تالیب واز لە ئایینی عبدالموتەلیب دەهێنیٚ ، پێغەمبەر بەردەوام ئەو قسەی بۆ دەخستە روو ، ئەوانیش سەردانیان دەکرد قسەی خۆیان پیٚ دەگوت، تاکو ئەبو تالیب دوایـن قسەی ئەبو بمری لەسەر ئایینی عبدالموتەلیب ، رەفزی کرد بڵیٚ (لا اله الاالله) پێغەمبەر فەرمووی : سوێند بەخوا داوای لێبووردنی بۆ لەخوا دەکەم تا ڕێم لیٚ نەگیری، جا خوا ئایەتی دابەزاندوفەرمووی (مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرْبَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ) واتە: ڕەواو شایستە نی یە بۆ پێغەمبەر و باوەڕداران کە داوای لێبووردن بکەن بۆ هاوبەش پەیداکەران با خزمی نزیکیشیان بن لە پاش ئەوەی کە بۆیان دەرکەوتووە کە بێگومان ئەو (هاوبەش دانەرانە) هاوەڵ و یێڕی دۆزەخن. وەخوا دەربارە (ابو تالیب) ئەم ئایەتەی دابەزاند وفەرمووی (إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ)

وفي رواية–( عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِعَمِّهِ: قُلْ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، أَشْهَدُ لَكَ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ ، قَالَ: لَوْلَا أَنْ تُعَيِّرَنِي قُرَيْشٌ، يَقُولُونَ: إِنَّمَا حَمَلَهُ عَلَى ذَلِكَ الْجَزَعُ لَأَقْرَرْتُ بِهَا عَيْنَكَ، فَأَنْزَلَ اللهُ: (إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ) (القصص: ٥٦) رواه مسلم

واتە: ئەبو هوریرە دەڵیٚ ، پێغەمبەر فەرمووی : بە مامی بڵیٚ: (لا الـه الا الله) من لە ڕۆژی قیامەت شایەدیت بۆ دەدەم لە لای خوا، ئەویش گوتی: لەبەر ئەوەی نەبیٚ قوریش لۆمەم دەکەن ، دەڵێن لە ترسی مردن وایگوت ، ئەوە ئەو قسەم دەکرد تاکو دڵی تۆی پیٚ خۆش بکەم.

## دەرسەکانی ئەم ئایەتە :

١–لە قیامەت ئەگەر ئینسان ئیمانی نەبێ شەفاعەت و خزمایەتی دادی نادات

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْغُلُول فَعَظَّمَهُ ثُمَّ قَالَ: لِيَحْذَرْ أَحَدُكُمْ أَنْ يَجِيءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِبَعِيرٍ عَلَى عُنُقِهِ، فَيَقُولَ: يَا مُحَمَّدُ أَغِثْنِي ، فَأَقُولَ: إِنِّي لَا أُغْنِي عَنْكَ شَيْئًا ، إِنِّي قَدْ بَلَّغْتُ ، وَيَجِيءُ رَجُلٌ عَلَى عُنُقِهِ فَرَسٌ لَهُ حَمْحَمَةٌ ، فَيَقُولُ: يَا مُحَمَّدُ أَغِثْنِي ، فَأَقُولُ: إِنِّي لَا أُغْنِي عَنْكَ شَيْئًا إِنِّي قَدْ بَلَّغْتُ ، وَيَجِيءُ الرَّجُلُ عَلَى عُنُقِهِ رِقَاعٌ فَيَقُولُ: يَا مُحَمَّدُ أَغِثْنِي ، فَأَقُولُ: لَا أُغْنِي عَنْكَ شَيْئًا قَدْ بَلَّغْتُ) السنن الكبرى للبيهقي

٢–لە قیامەت خەڵکی لەبەر یەکتر رادەکەن . (کوڕ و باب، ژن ومێرد، کەس وکار..........)

(فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ ٣٣ يَوۡمَ يَفِرُّ ٱلۡمَرۡءُ مِنۡ أَخِيهِ ٣٤ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ٣٥ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ٣٦ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ يَوۡمَئِذٖ شَأۡنٞ يُغۡنِيهِ ٣٧ ) عبس

وپێغەمبەر فەرموویەتی

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ أُنْزِلَ عَلَيْهِ (وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ) (الشعراء: ٢١٤)، قَالَ: يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ اشْتَرُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ اللَّهِ، لَا أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، يَا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، لَا أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، يَا عَبَّاسُ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، لَا أُغْنِي عَنْكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، يَا صَفِيَّةُ عَمَّةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، لَا أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، يَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ، سَلِينِي مَا شِئْتِ، لَا أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا) رواه النسائي قال الالباني صحيح

*********************

## وتاری ژماره (٧٩) له هۆیەكانی دابەزینی قورئان

### ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٨٣) سورەتی القصص

(تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ٨٣) القصص

واتە : ئەو ماڵی دوا ڕۆژە (بەهەشت) دەیدەین بەو كەسانەی نە بەرزی و خۆ بەزل زانی یان دەوێت لەزەوی دا نە دەست درێژی و خراپەكاری وە سەرئەنجامی چاك بۆ خۆ پارێزانە.

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( وأخرج ابن عساكر (عن علي رضي الله عنه أنه كان يمشي في الأسواق وحده وهو وال، يرشد الضال، ويَنْشُد الضال، ويعين الضعيف، ويمر بالبيّاع والبقّال فيفتح عليه القرآن ويقرأ (تلك الدار الآخرة نجعلها للذين لا يريدون علوا في الأرض ولا فساد) (سورة القصص، الآية: ٨٣) ويقول: نزلت هذه الآية في أهل العدل والتواضع من الولاة وأهل القدرة على سائر الناس) الدر المنثور للسيوطي

واتە: لە (علی) یەوە هاتووە خوا لێ ڕازی بێ، كە بەناو بازاردا دەرۆیشت بەتەنیا، كاتێ والی بوو ، ڕێگای پیشانی بزبوو دەدا ، یارمەتی بێ هێزی دەدا، و بەلای فرۆشیارو سەوزەفرۆشاندا تێدەپەری و ئەم ئایەتەی خوێندەوە (تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ) وە دەیگوت : ئەم ئایەتە

دابـەزیوە دەربـارەی خـەڵکی (دادپـەروەرو خۆبەکـەم زان لـە دەسـتەڵاتداران و کەسـانی بەتوانا بەسەر گشت خەڵکیدا.

وفي رواية–(عَنْ زَاذَانَ قَالَ: رَأَيْتُ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ يُمْسِكُ الشُّسُوعَ بِيَدِهِ، يَمُرُّ فِي الْأَسْوَاقِ فَيُنَاوِلُ الرَّجُلَ الشِّسْعَ، وَيُرْشِدُ الضَّالَّ، وَيُعِينُ الْحَمَّالَ عَلَى الْحَمُولَةِ، وَهُوَ يَقْرَأُ هَذِهِ الْآيَةَ (تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ) (القصص: ٨٣) ، ثُمَّ يَقُولُ: هَذِهِ الْآيَةُ أُنْزِلَتْ فِي الْوُلَاةِ وَذَوِي الْقُدْرَةِ مِنَ النَّاسِ) فضائل الصحابة لاحمد بن حنبل

((الشِّسْعُ) وَاحِدُ (شُسُوعِ) النَّعْلِ الَّذِي تُشَدُّ إِلَى زِمَامِهَا. وَ (الشَّاسِعُ) وَ (الشَّسُوعُ) بِالْفَتْحِ الْبَعِيدُ) مختار الصحاح

–(عَنْ عُثْمَانَ بْنِ زَائِدَةَ، قَالَ: رَأَيْتُ فِي النَّوْمِ كَأَنِّي أُدْخِلْتُ الْجَنَّةَ فَإِذَا سُفْيَانُ يَطِيرُ مِنْ شَجَرَةٍ إِلَى شَجَرَةٍ وَهُوَ يَقُولُ: (تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ) (القصص: ٨٣) حلية الأولياء وطبقات الأصفياء ، ابو نعيم

واتە: لە عوسمانی کوڕی زائیـدەوە هـاتووە دەڵـێ: لەخەومـدا بینـیم بردمیانـە بەهەشـت ، لەوێ گەیشتم بە (سوفیان) لەدارێك بـۆ دارێـك دەفـری ئـەم ئایەتـەی دەخوێنـدەوە (تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ)

## عومەر لە سەرە مەرگدا ئەم ئایەتە دەخوێنێ:

(حَدَّثَنِي مُغِيرَةُ بْنُ حَكِيمٍ قَالَ: قَالَتْ لِي فَاطِمَةُ: كُنْتُ أَسْمَعُ عُمَرَ فِي مَرَضِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ يَقُولُ: (اللَّهُمَّ، أَخْفِ عَلَيْهِمْ مَوْتِي وَلَوْ سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ) ، قَالَتْ: فَقُلْتُ لَهُ يَوْمًا: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، أَلَا أَخْرُجُ عَنْكَ عَسَى أَنْ تُغْفِيَ شَيْئًا، فَإِنَّكَ لَمْ تَنَمْ، قَالَتْ: فَخَرَجْتُ عَنْهُ إِلَى جَنْبِ الْبَيْتِ الَّذِي هُوَ فِيهِ، قَالَتْ: فَجَعَلْتُ أَسْمَعُهُ يَقُولُ: (تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا

يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ) (القصص: ٨٣) يُرَدِّدُهَا مِرَارًا، ثُمَّ أَطْرَقَ فَلَبِثَ طَوِيلًا لَا أَسْمَعُ لَهُ صَوْتًا، فَقُلْتُ لِوَصِيفٍ لَهُ كَانَ يَخْدُمُهُ: وَيْحَكَ انْظُرْ، فَلَمَّا دَخَلَ صَاحَ، قَالَتْ: فَدَخَلْتُ عَلَيْهِ، فَوَجَدْتُهُ مَيِّتًا، قَدْ أَقْبَلَ بِوَجْهِهِ عَلَى الْقِبْلَةِ، وَوَضَعَ إِحْدَى يَدَيْهِ عَلَى فِيهِ، وَالْأُخْرَى عَلَى عَيْنِهِ) الكتاب: الزهد والرقائق لابن المبارك

واتە: لە موغیرەی کوڕی حەکیمەوە هاتووە دەڵێ: فاتیمە پێی گوتم ، گوێم لە (عمر) بوو لە نەخۆشی سەرەمەرگدا ، دەیگوت : خوایە مردنم ماوەیەك کەس نەزانێ ، ئەگەر کاتێکی کەمێکیش بێ لە ڕۆژ) فاتیمە دەڵێ : ڕۆژێك پێم گوت : ئەی فەرمانرەوای ئیمانداران ، ئایا بۆ نەچمە دەرەوە بەڵکو تۆزێك ئاگات لەخۆت ببرێ چونکە نەخەوتی، ئەڵێ چوومە دەرەوە لەتەنیشت ئەو ژوورەی ئەو تێدا بوو وەستام و گوێم لێ گرت ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە (تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ) چەند جارێك دووبارەی دەکردەوە ، دوای بێدەنگ بوو ، گوتمە (وەصیفی) خزمتکاری ماڵ ویران بڕۆ بزانە چی بەسەرهاتووە ، چووە ژوورەوە هاواری کرد ، کە چوومە ژوورەوە بینیم وەفاتی کردوە ، ڕووی لە قیبلە کردوە ، دەستێکی لەسەر زارو دەستێکی لەسەر چاوی بوو .

## چەند دەقێك لەسەر خۆبەزل زانین:

١- (عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ، عَنِ النَّبِيِّ . صلى الله عليه وسلم . ، قَالَ (لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنَ كِبْرٍ . فَقَالَ رَجُلٌ: إِنَّ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ ثَوْبُهُ حَسَنًا وَنَعْلُهُ حَسَنًا. قَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ. الْكِبْرُ بَطَرُ الْحَقِّ وَغَمْطُ النَّاس) . رَوَاهُ مُسلم

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : ناچێتە بەهەشت ئەوەی بە ئەندازەی یەك گەردیلە خۆبەزل زانینی لە دڵدا بێ ، پیاوێك گوتی: ئەگەر کەسێك پێڵاو و جل وبەرگی جوان بێ ئەوەش

خۆبەزل زانینە، پێغەمبەر فەرمووی : نەخێر خوا جوانە و شتی جوانی پـیٚ خۆشـە، بـەڵکو خۆبەزل زانین : ئەوەیە بە حەق رازی نەبی و بە چاوی سووک سەیری خەڵکی بکەی.

٢-( عَن سَلمَة بن الْأَكْوَع أَنَّ رَجُلًا أَكَلَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِشِمَالِهِ فَقَالَ: (كُلْ بِيَمِينِكَ) قَالَ: لاأستطيع. قَالَ (لَا اسْتَطَعْتَ) . مَا مَنَعَهُ إِلَّا الْكِبْرُ قا ل: فَمَا رَفعهَا إِلَى فِيهِ) رَوَاهُ مُسلم

٣-(وقال تعالى: (وَلا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحاً إِنَّكَ لَنْ تَخْرِقَ الْأَرْضَ وَلَنْ تَبْلُغَ الْجِبَالَ طُولاً) (الاسراء: ٣٧) .

٤-وقال تعالى: (وَلا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحاً إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ) (لقمان: ١٨) . ومعنى (وَلا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ) أي: تميلُه وتعرضُ به عن الناس تكبراً عليهم (والمرح): التبختُر.

٥-وقال تعالى: (إِنَّ قَارُونَ كَانَ مِنْ قَوْمِ مُوسَى فَبَغَى عَلَيْهِمْ وَآتَيْنَاهُ مِنَ الْكُنُوزِ مَا إِنَّ مَفَاتِحَهُ لَتَنُوءُ بِالْعُصْبَةِ أُولِي الْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُ قَوْمُهُ لا تَفْرَحْ إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ الْفَرِحِينَ) (القصص: ٧٦) إلى قوله تعالى: (فَخَسَفْنَا بِهِ وَبِدَارِهِ الْأَرْضَ) (القصص: ٨١) الآيات)

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٨٨ ) سورەتی القصص

(وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ۘ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ ۚ لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ٨٨) القصص

واتە : وە لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی تر مەپەرستە هیچ پەرستراوێکی (ڕاست) نی یە جگە لە خوا هەموو شتێك لەناو دەچیٚ جگە لـەزاتی خـوا بڕیـارو حـوکم تایبـەتی خوایـەو تەنها بۆ لای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عن عبدالله بن عباس في قوله (كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۖ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ٥٧) قال لما نزلت قيل : يارسول الله فما بال الملائكة ؟ فنزلت (كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ) الدر المنثور للسيوطي

واتە: لە عەبدولاَی کوڕی عەباسەوە هاتووە دەربارەی فەرمایشتی خوا (كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۖ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ) دەڵێ کاتێ دابەزی ، گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئایا فریشتەکان وەزعیان چی بەسەردێ؟ لە وەلاَمدا ئەم ئایەتە دابەزی خوا فەرمووی (كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ)

## هیچ کەس نامێنێ جگە لە خوا:

-( كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ٢٦ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ٢٧) الرحمن

-( وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِي ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ١٤٤) ال عمران

واتە: موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) تەنها پێغەمبەرێکە (نەمر نی یە) بێگومان لەپێش ئەو پێغەمبەرانی تر ڕابوردون جا ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژرا دەگەڕێنەوە بۆ دواوەی خۆتان(پاشگەز دەبنەوە) هەر کەس هەڵگەڕێتەوە بۆ دواوەی خۆی(بت پەرستی) ئەوە هەرگیز (ئەو کەسە) هیچ زیانێك ناگەیەنێت بەخوا وە بەزوویی خوا پاداشتی سوپاس گوزاران دەداتەوە.

-( إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ٣٠) الزمر

واتە: ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) بەڕاستی تۆ دەمری و ئەوانیش دەمرن.

یەکەم : ئەوەی نەفسە دەمرێ (كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِ)

دووەم : ئەوەی لەسەر زەوی نەفس و شتەکانی دیکە (كُلُّ مَنۡ عَلَيۡهَا فَانٖ)

سێیەم : ئەوەی لە بۆنەوەرە هەمووی دەفەوتێ (كُلُّ شَيۡءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجۡهَهُۥ)

*****************

# وتاری ژماره (٨٠) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (العنكبوت)

سورەتی (العنكبوت) سورەتێکی مەککەیی یە ، لە ریزبەندا ژمارە (٢٩)یە و ژمارەی ئایەتەکانی (٦٩) ئایەتە .

–لەسەرەتادا باسی ئەوە دەکات موسڵمان توشی تاقیکردنەوە دەبێت ، وەك فەرموویەتی : ﴿أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ٢ وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٣﴾ العنكبوت

واتە: ئایا خەڵك وا دەزانن کە وازیان لێ دەهێنرێ ئەگەر بڵێن بڕوامان هێناوە ئیتر ئەوان تاقی ناکرێنەوە.(٢) سوێند بەخوا بێگومان کەسانی پێش ئەوانمان تاقی کردەوە (ئەمانیش تاقی دەکەینەوە) ئینجا بێگومان خوا ئەو کەسانەی ڕاستیان کرد دیاری دەکات درۆزنەکانیش دیاری دەکات واتە دەناسرێن.(٣)

نموونە لە تاقیکردنەوە : ( ئیمامی (بوخاریی) لە (خەبباب)ەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسێبەری کەعبەدا عەبایەکەی خۆی لەژێر سەرنابوو، ئێمەش سکاڵامان بردە لای و گوتمان: بۆ داوای یارمەتی و پشتیوانیمان بۆ ناکەی ئەی پێغەمبەر؟! بۆ هاوارمان نابەیتە لای خوا؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموودەیەکی بۆیان فەرموو، ئەمە بڕێکیەتی: (لقد كان من قبلكم ..) واتە: بێشك بەر لەئێوە هیوا هەبوو دەهێنراو چاڵێکی بۆهەڵدەکنراو توور ئەدرایە نێوی، پاشان بە شەقەمشار هەر لەسەرییەوە بۆ خوارەوە دەکرا بە دوولەتەوەو، بەشانەی ئاسن جەستەو لاشەی دادەهێنراو هەرچی گۆشت و ئێسکی هەبوو لێیدەکرایەوە، کەچی هەر لەئایینەکەی وەرنەدەگەڕا ! بەخوا سوێند، ئەم ئایینە وا سەردەکەوێت کە سوار لە (سەنعا)وە بۆ

(حەزرەمەوت) بڕوا لە خوا نەبێ لەکەس نەترسێت، یـان مەگـەر ترسـی گـورگی هـەبێ کـە لەمەڕەکانی بدات، بەڵام ئێوە پەلەدەکەن )

– وە هەروەها ئەو مانایەش کە لێرەدا مەبەستە لەچەند ئایەتێکی تـردا روون کراوەتـەوە، وەك دەفەرموێت :

﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُواْ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ٢١٤﴾ البقره

واتە: ئایا واتان زانییوە کە دەچنە بەهەشت کەچی هێشتا نەهاتۆتە ڕێتان ئەوەی تووشـی ئەوانە بوون کە لە پێش ئێوەدا تێپەڕین(کە لە ڕێـی خـوادا) دووچـاری سـەختی و زەرەر و زیان بوون وە زۆر بـە توندی تـەکان دران بـەڕەنگێك کـە پێغەمبـەر و ئەوانـەی کـەبڕوایان هێنابوو لەگەڵیدا دەیان وت سەرکەوتنی خوا کـەی دێـت ئاگـادار بـن و دڵنیـابن بـە ڕاسـتی سەرکەوتنی خوا نزیکە.(پوختەی تەفسیر)

–باسی ئەوە دەکات (ابـراهیم) علیـە السـلام هـەموو شـێوازەکاتی بانگـەوازی گرتـە بـەر ، سـەرەنجام گوتیـان : بیکـوژن یـان بیسـوتێنن و خوایـەکانی خۆتـان سـەربخەن، وەك فەرموویەتی :

﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ٢٤﴾ العنكبوت

واتە: ئینجا وەڵامی گەلەکەی ئەو (ئیبراهیم) تەنها ئەوە بوو کە وتیان (ئیبراهیم) بکوژن یا بیسوتێنن خواش ئەوی ڕزگار کرد لەو ئاگرە بێگومان لەو (ڕزگار کردنی ئیبراهیم) دا چەند نیشانەو بەڵگە هەیە بۆ کەسانێ باوەڕ دەهێنن.(پوختەی تەفسیر)

–ئایـا بۆچـی نـاونراوە (العنکبـوت ) جالجالۆکـە؟ چـونکە خـوا نموونـە بـەم ژیانـدارە دەهێنێتـەوە بـۆ بـت پەرسـتەکان وەك فەرموویـەتی ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ

أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا ۖ وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٤١)

واتە: وێنەی کەسانێ کە بێجگە لە خوا پەرستراوانێك بۆ خۆیان دادەنێن وەکو جاڵجاڵۆکە وایە کە ماڵێکی (بۆ خۆی) ڕەخساندووە کە بەڕاستی لاوازترین ماڵ ماڵی جاڵجاڵۆکەیە ئەگەر بزانن.(پوختەی تەفسیر)

–لەکۆتایدا باسی ئەوە دەکات خوا لەگەڵ چاکەکارانداێە، وەك فەرموویەتی (وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ٦٩) العنکبوت

واتە: وە کەسانێ کە لە پێناو ڕەزامەندی ئێمەدا تێکۆشانیان کردووە بەڕاستی ڕێنموونیان دەکەین بۆ ڕێبازەکانی خۆمان وە بێگومان خوا لەگەڵ چاکان دایە.

**١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٨) سورەتی العنکبوت**

(وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَآ ۚ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ٨) القصص

واتە : وە فەرمانمان داوە بە ئادەمی کە چاکە لەگەڵ دایك و باوکی دا بکات وە ئەگەر (دایك و باوکت) هەوڵیان لەگەڵ دای بۆ ئەوەی کە هاوبەشم بۆ بڕیار بدەی کە هیچ زانیارییەکت نی یە دەربارەی ئەوە بە گوێیان مەکە تەنها بۆ لای منە گەڕانەوەتان (لە دوا ڕۆژدا) ئەوسا هەواڵتان دەدەمێ بەو کردەوانەی دەتانکرد.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: ( نَزَلَتْ فِيَّ أَرْبَعُ آيَاتٍ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ تَعَالَى: كَانَتْ أُمِّي حَلَفَتْ أَنْ لَا تَأْكُلَ وَلَا تَشْرَبَ حَتَّى أُفَارِقَ مُحَمَّدًا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَى أَنْ تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا) (لقمان: ١٥) . وَالثَّانِيَةُ: أَنِّي كُنْتُ أَخَذْتُ سَيْفًا أَعْجَبَنِي، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَبْ لِي هَذَا، فَنَزَلَتْ: (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَنْفَالِ قُلِ الأَنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ) (الأنفال: ١) . وَالثَّالِثَةُ: أَنِّي مَرِضْتُ فَأَتَانِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَقْسِمَ مَالِي، أَفَأُوصِي بِالنِّصْفِ؟ فَقَالَ: (لَا) ، فَقُلْتُ: الثُّلُثُ؟ فَسَكَتَ، فَكَانَ الثُّلُثُ بَعْدَهُ جَائِزًا. وَالرَّابِعَةُ: إِنِّي شَرِبْتُ الْخَمْرَ مَعَ قَوْمٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَضَرَبَ رَجُلٌ مِنْهُمْ أَنْفِي بِلَحْيِ جَمَلٍ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَنْزَلَ عَزَّ وَجَلَّ تَحْرِيمَ الْخَمْرِ) الادب المفرد.

(معاني الكلمات: (بِلَحْيِ جَمَلٍ) أي: بأحد لحي رأس جمل)

واتە: لە سەعدی کوڕی وەقاسەوە هاتووە دەڵێ چوار ئایەت دەربارەی من دابەزیون لە کیتابی خوا یەکەم : دایکم سویندی خوارد ، خواردن و خواردنەوە لە خۆی حەرام بکات تاکو واز لە (محمد) دێنم خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند (وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَى أَنْ تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفاً) دووەم : لەشەڕ شمشێرێکم گرت پێم جوان بوو ، گوتم ئەی نێرراوی خوا ئەم شمشێرەم پێ ببەخشە، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنْفَالِ) سێیەم : نەخۆش کەوتم پێغەمبەر هاتە سەردانم گوتم ئەی نێرراوی خوا دەمەوێ ماڵی خۆم دابەش بکەم ، ئایا نیوەی ماڵم بکەمە وەصیەت، فەرمووی نەخێر ، گوتم ئەدی سێیەکی بێ دەنگ بوو ، جا پاش ئەم سێیەك دروست بوو، چوارەم: ئارەقم خواردەوە کەسێکی ئەنصاری لە لوتی دام برینداربوو ، چوومە لای پێغەمبەر ، جا ئایەتی حەرام بوونی ئارەق دابەزی.

وفي رواية–(عَنْ سَعْدٍ، قَالَ: نَزَلَتْ فِي أَرْبَعِ آيَاتٍ ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ قَالَ: وَصَنَعَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ طَعَامًا فَدَعَانَا فَشَرِبْنَا الْخَمْرَ قَبْلَ أَنْ تُحَرَّمَ حَتَّى انْتَشَيْنَا فَتَفَاخَرْنَا ، فَقَالَتِ الْأَنْصَارُ: نَحْنُ أَفْضَلُ ، وَقَالَتْ قُرَيْشٌ: نَحْنُ أَفْضَلُ ، فَأَخَذَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ لَحْيَ جَزُورٍ فَضَرَبَ بِهِ أَنْفَ سَعْدٍ فَفَزَرَهُ ، وَكَانَ أَنْفُ سَعْدٍ مَفْزُورًا ، فَنَزَلَتْ آيَةُ الْخَمْرِ: (إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ) (المائدة: ٩٠) ، إِلَى قَوْلِهِ: (فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ) (المائدة: ٩١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ

## دەرسەکانی ئەم ئایەتە:

١–دایك وباوك گەورەن ، بەلاّم هەر چەندە گەورەبن نابیّ لە گوناح و شیرك بە قسەیان بکریّ

٢–ئەوەی دایك وبابی ماوە فورسەتە با چاکەیان لەگەلّ بکات.

٣–ئەوەی دایك وباوکی نەماوە، با خێرو صەدەقەیان بۆ بکات ، و چاکە لەگەلّ خزم و دۆستان ئەوان بکات.

********************

# وتاری ژماره (٨١) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سوڕەتی (الروم)

سـوڕەتی (الـروم) سـوڕەتێکی مەککـەیی یـە ، لـە ریزبەنـدا ژمـارە (٣٠)یـە وە ژمـارەی ئایەتەکانی (٦٠) ئایەتە.

–باسی ڕووداوێکی غەیبی دەکات کە بریتیە لە سەرکەوتنی ڕۆمەکان بەسەر فارسەکان

–ئایا بۆچی ناونراوە (الروم) ؟ چونکە باسی ئەم موعجیزە قورئانیە دەکات ، کـە بەڵگـەی ڕاستی قورئانە.

### ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١-٦) سوڕەتی الروم

﴿الٓمٓ ١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ٣ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ٥ وَعۡدَ ٱللَّهِۖ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٦﴾ الروم

واتــە : بــە(ئــەلیف،لام،میم) دەخوێنرێتــەوە. ئــەم پیتانــەی لەســەرەتای هەنــدێ لــە سورەتەکانی قورئاندا هاتوون تەنها خوای گەورە دەزانێت مەبەستی پێیـان چـی یـە ئەمـە ڕاسـترین تەفسـیرە بـۆ ئـەم پیتانـە (١) ڕۆم شـکێنران و ژێرکـەوتن (فـارس زاڵ بـوو) بـە سەریاندا.(٢) لە نزیك ترین خاکیان (لە مەککەوە یا لە وڵاتی فارسەوە) وە ڕۆمـەکان دوای تێشکانیان لە داهاتوودا سەر دەکەون (بەسەر فارسەکان) دا.(٣) لەماوەی چـەند ساڵێکدا (لە نێوان سێ تا نۆ ساڵ) هەموو کاروبار تەنها بە دەست خوایـە لـە پـێش (سـەرکەوتن) و لەدوا (سەرکەوتن) وە لەو ڕۆژەدا (ڕۆمەکان سەردەکەون) ئیمانداران دڵخۆش دەبن.(٤) بە

سەرخستنی خوا (بۆ ڕۆمەکان) خوا هەر کەسی بوێ سەری دەخات وە هەر ئەو زاڵی میهرەبانە.(٥) ئەوە بەڵێنی خوایە (کە ڕۆمەکان سەربخات) خوایش پێچەوانەی بەڵێنی خۆی ناکات بەڵام زۆربەی خەڵك نازانن.(٦) ( پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ كَانَ الْمُسْلِمُونَ يُحِبُّونَ أَنْ تَظْهَرَ الرُّومُ عَلَى فَارِسَ لِأَنَّهُمْ أَهْلُ كِتَابٍ وَكَانَ الْمُشْرِكُونَ يُحِبُّونَ أَنْ تَظْهَرَ فَارِسُ عَلَى الرُّومِ لِأَنَّهُمْ أَهْلُ أَوْثَانٍ فَذَكَرَ ذَلِكَ الْمُسْلِمُونَ لِأَبِي بَكْرٍ فَذَكَرَ أَبُو بَكْرٍ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَا إِنَّهُمْ سَيَهْزِمُونَ فَذَكَرَ ذَلِكَ أَبُو بَكْرٍ لَهُمْ فَقَالُوا اجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ أَجَلًا فَإِنْ ظَهَرُوا كَانَ لَكَ كَذَا وَكَذَا وَإِنْ ظَهَرْنَا كَانَ لَنَا كَذَا وَكَذَا فَجَعَلَ بَيْنَهُمْ أَجَلًا خَمْسَ سِنِينَ فَلَمْ يَظْهَرُوا فَذَكَرَ ذَلِكَ أَبُو بَكْرٍ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ أَلَا جَعَلْتَهُ أُرَاهُ قَالَ دُونَ الْعَشْرِ قَالَ وَقَالَ سَعِيدٌ الْبِضْعُ مَا دُونَ الْعَشْرِ قَالَ فَظَهَرَتْ الرُّومُ بَعْدَ ذَلِكَ فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى الم غُلِبَتْ الرُّومُ فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ فِي بِضْعِ سِنِينَ قَالَ فَغُلِبَتْ الرُّومُ بَعْدُ ثُمَّ غَلَبَتْ بَعْدُ قَالَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ بِنَصْرِ اللَّهِ قَالَ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ بِنَصْرِ اللَّهِ ( احمد ) ٢٧٧٠قال الشيخ شعيب الأرناؤوط : إسناده صحيح على شرط الشيخين

واتە:لە ئیبنو عەباسەوە هاتوو دەڵێ: موسڵمانان حەزیان دەکرد ڕۆمەکان سەرکەون بەسەر فارسەکاندا ، چونکە ئەهلی کیتاب بوون ، وە موشریکان حەزیان دەکرد فارسەکان سەرکەون بەسەر رۆمەکان ، چونکە ئەهلی بت پەرست بوون ، موسڵمانان ئەوەیان بۆ ئەبوبەکر باسکرد ، ئەبوبەکریش ئەوەی بۆ پێغەمبەر باس کرد، پێغەمبەریش فەرمووی : ئەوان بیگومان دەشکێن ، ئەبوبەکریش ئەوەی بۆ موشریکان باس کرد، ئەوانیش گوتیان: وەرە با ماوەیەك دیاری بکەین لە نێوان خۆمان ، ئەگەر ئەوان سەرکەوتن ئەو شتە وئەو

شته بۆ تۆ، ئەگەر ئێمە سەرکەوتین ئەو شتە و ئەو شتە بدەنە ئێمە ، ماوەی (٥) سالْ دیاری کرا، سەرنەکەوتن ئەبوبەکر بە پێغەمبەری گوت : سەرنەکەوتن ، فەرمووی : بۆچی زیاترت دانەنا، دەڵێ : لەخوار (١٠) سالْ ، دەڵێ : سەعید دەڵێ: واتە : کەمتر لە (١٠) دەڵێ: لەپاشان رۆمەکان سەرکەوتن ، ئەوەیە فەرمایشتی خوا(الم ، غُلِبَتْ الرُّومُ فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ فِي بِضْعِ سِنِينَ قَالَ فَغُلِبَتْ الرُّومُ بَعْدُ ثُمَّ غَلَبَتْ بَعْدُ قَالَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ بِنَصْرِ اللَّهِ قَالَ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ بِنَصْرِ اللَّهِ)

٢-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ الْمُسْلِمُونَ يُحِبُّونَ أَنْ تَظْهَرَ الرُّومُ عَلَى فَارِسَ لِأَنَّهُمْ أَهْلُ الْكِتَابِ، وَكَانَ الْمُشْرِكُونَ يُحِبُّونَ أَنْ تَظْهَرَ فَارِسُ عَلَى الرُّومِ لِأَنَّهُمْ أَهْلُ أَوْثَانٍ فَذَكَرَ ذَلِكَ الْمُسْلِمُونَ لِأَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، فَذَكَرَ ذَلِكَ أَبُو بَكْرٍ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمَا إِنَّهُمْ سَيَهْزِمُونَ) فَذَكَرَ أَبُو بَكْرٍ لَهُمْ ذَلِكَ فَقَالُوا: اجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ أَجَلًا، فَإِنْ ظَهَرُوا كَانَ لَكَ كَذَا وَكَذَا، وَإِنْ ظَهَرْنَا كَانَ لَنَا كَذَا وَكَذَا، فَجَعَلَ بَيْنَهُمْ أَجَلَ خَمْسِ سِنِينَ فَلَمْ يَظْهَرُوا فَذَكَرَ ذَلِكَ أَبُو بَكْرٍ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: (أَلَا جَعَلْتَهُ، أُرَاهُ) قَالَ: دُونَ الْعَشَرَةِ. قَالَ: فَظَهَرَتِ الرُّومُ بَعْدَ ذَلِكَ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى (الم غُلِبَتِ الرُّومُ فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ) (الروم: ٢) قَالَ: فَغُلِبَتِ الرُّومُ، ثُمَّ غَلَبَتْ بَعْدُ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمَنْ بَعْدُ، وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ بِنَصْرِ اللَّهِ قَالَ سُفْيَانُ: وَسَمِعْتُ أَنَّهُمُ ظَهَرُوا يَوْمَ بَدْرٍ) رواه الحاكم وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ وَلَمْ يُخْرِجَاهُ) ووافقه الذهبي

واتە:..........سوفیان دەڵێ: گوێم لێ بووە ئەوانە رۆمەکان سەرکەوتن لە رۆژی (بەدر) وەك چۆن موسلْمان سەرکەوتن لە رۆژی بەدر

٣-(قَالَ الْمُفَسِّرُونَ: بَعَثَ كِسْرَى جَيْشًا إِلَى الرُّومِ وَاسْتَعْمَلَ عَلَيْهِمْ رَجُلًا يُسَمَّى شَهْرَيَرَازَ، فَسَارَ إِلَى الرُّومِ بِأَهْلِ فَارِسَ وَظَهَرَ عَلَيْهِمْ، فَقَتَلَهُمْ وَخَرَّبَ مَدَائِنَهُمْ وَقَطَّعَ زَيْتُونَهُمْ، وَقَدْ كَانَ قَيْصَرُ بَعَثَ رَجُلًا يُدْعَى يُحَنَّسَ فَالْتَقَى مَعَ شَهْرَيَرَازَ بِأَذْرِعَاتٍ وَبُصْرَى وَهِيَ أَدْنَى الشَّامِ إِلَى أَرْضِ الْعَرَبِ، فَغَلَبَ فَارِسُ الرُّومَ، وَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ - صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - وَأَصْحَابَهُ بِمَكَّةَ،

فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ، وَكَانَ النَّبِيُّ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – يَكْرَهُ أَنْ يَظْهَرَ الْأُمِّيُّونَ مِنَ الْمَجُوسِ عَلَى أَهْلِ الْكِتَابِ مِنَ الرُّومِ، وفرح الكفار وشتموا، فَلَقُوا أَصْحَابَ النَّبِيِّ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – فَقَالُوا: إِنَّكُمْ أَهْلُ كِتَابٍ وَالنَّصَارَى أَهْلُ كِتَابٍ وَنَحْنُ أُمِّيُّونَ، وَقَدْ ظَهَرَ إِخْوَانُنَا مِنْ أَهْلِ فَارِسَ عَلَى إِخْوَانِكُمْ مِنَ الرُّومِ، وَإِنَّكُمْ إِنْ قَاتَلْتُمُونَا لَنَظْهَرَنَّ عَلَيْكُمْ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (غُلِبَتِ الرُّومُ فِي أَدْنَى الْأَرْضِ) إِلَى آخِرِ الْآيَاتِ الواحدي في اسباب النزول

واتـه: توێـژەرەوانی قورئـان دەڵـێن: کیسـرا سـوپایەکی نـارد بـۆ ڕۆم ، وپیـاوێکی کـردە سەرکردە بەناوی (شەهرەیەرازە) گەیشتە ڕۆمەکان و بەسەراندا سـەرکەوت، و کوشـتنی و شارەکانی کاول کردن، و درختە زیتونەکانی ئەوانی بڕین، وە (قەیسەریش) پیاوێکی نارد بـەناوی (یوحەننـەس) گەیشـتەوە (شـەهرەیەرازە) بـۆ ئـەوەی تۆڵـەی لـێ بکاتـەوە، لـە (بِأَذْرِعَاتٍ وَبُصْرَى) کـە دەکەوێتـە خـواروی (شـام) بـۆ زەوی عـەرەب ، فارسـەکان سەرکەوتنەوە بەسـەر ڕۆمـەکان، ئـەو هەواڵـە گەیشـتەوە پێغەمبـەرو هـاوەڵانی لـە (مکـە) پێیان ناخۆش بوو، پێغەمبەر پێ ناخۆش بـوو نەخوێنـدەوارە ئاگرپەرستـەکان سـەرکەون بەسەر ئەهلی کیتـاب لـە ڕۆمـەکان، کافرەکـانیش دڵ خـۆش بـوون و جوێنیـان دەدا ، کـە دەگەیشـتنە موسـڵمان دەیـانگوت ئێـوە ئـەهلی کیتـابن ڕۆمـەکانیش ئـەهلی کیتـابن ، نەخوێنـدەوارین (واتـە: خـاوەن پـەیام نـین) براکانمـان لـە فارسـەکان سـەرکەوتن بەسـەر براکـانی ئێـوە لـە ڕۆمـەکان، ئەگـەر ئێـوەش لەگـەڵ ئێمـە شـەربکەن ، بەسـەرتاندا سەردەکەوین ، جا خواش ئەم ئایەتـەی دابەزاندوفـەرمووی (غُلِبَتِ الرُّومُ فِي أَدْنَى الْأَرْضِ) تاکو کۆتایی ئایەتەکان.

٤–( عَنْ نِيَارِ بْنِ مُكْرَمٍ الأَسْلَمِيِّ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ (الم غُلِبَتِ الرُّومُ فِي أَدْنَى الأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ فِي بِضْعِ سِنِينَ) (الروم: ٢) فَكَانَتْ فَارِسُ يَوْمَ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ قَاهِرِينَ لِلرُّومِ، وَكَانَ الْمُسْلِمُونَ يُحِبُّونَ ظُهُورَ الرُّومِ عَلَيْهِمْ لِأَنَّهُمْ وَإِيَّاهُمْ أَهْلُ كِتَابٍ، وَفِي ذَلِكَ قَوْلُ اللَّهِ تَعَالَى: (وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ بِنَصْرِ اللَّهِ يَنْصُرُ مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ) (الروم: ٤) فَكَانَتْ قُرَيْشٌ تُحِبُّ ظُهُورَ فَارِسَ لِأَنَّهُمْ وَإِيَّاهُمْ لَيْسُوا بِأَهْلِ كِتَابٍ وَلَا إِيمَانٍ بِبَعْثٍ، فَلَمَّا أَنْزَلَ

اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الآيَةَ، خَرَجَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ يَصِيحُ فِي نَوَاحِي مَكَّةَ (الم غُلِبَتِ الرُّومُ فِي أَدْنَى الأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ فِي بِضْعِ سِنِينَ) (الروم: ١) قَالَ نَاسٌ مِنْ قُرَيْشٍ لِأَبِي بَكْرٍ: فَذَلِكَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ، زَعَمَ صَاحِبُكَ أَنَّ الرُّومَ سَتَغْلِبُ فَارِسَ فِي بِضْعِ سِنِينَ، أَفَلَا نُرَاهِنُكَ عَلَى ذَلِكَ، قَالَ: بَلَى، وَذَلِكَ قَبْلَ تَحْرِيمِ الرِّهَانِ، فَارْتَهَنَ أَبُو بَكْرٍ وَالْمُشْرِكُونَ وَتَوَاضَعُوا الرِّهَانَ، وَقَالُوا لِأَبِي بَكْرٍ: كَمْ تَجْعَلُ الْبِضْعُ ثَلَاثُ سِنِينَ إِلَى تِسْعِ سِنِينَ، فَسَمِّ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ وَسَطًا تَنْتَهِي إِلَيْهِ، قَالَ: فَسَمَّوْا بَيْنَهُمْ سِتَّ سِنِينَ، قَالَ: فَمَضَتِ السِّتُّ سِنِينَ قَبْلَ أَنْ يَظْهَرُوا، فَأَخَذَ الْمُشْرِكُونَ رَهْنَ أَبِي بَكْرٍ، فَلَمَّا دَخَلَتِ السَّنَةُ السَّابِعَةُ ظَهَرَتِ الرُّومُ عَلَى فَارِسَ، فَعَابَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى أَبِي بَكْرٍ تَسْمِيَةَ سِتِّ سِنِينَ، لِأَنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَالَ فِي بِضْعِ سِنِينَ، قَالَ: وَأَسْلَمَ عِنْدَ ذَلِكَ نَاسٌ كَثِيرٌ) رواه الترمذي قال الالباني حسن

واته: ...كاتێ ئەم ئایەتە دابەزی ئەبوبەكر مەرجی كرد لەگەڵ موشریكان كە هێشتا مەرج حەرام نەكرابوو، لەسەر شەس ساڵان رێكەوتن ، پاش شەش ساڵان رۆمەكان سەرنەكەوتن موشریكان رەهنەكەیان وەرگرت لە ئەبوبەكر ، موسڵمانان رەخنەیان گرت لە ئەبوبەكر بۆچی شەش ساڵەت داناوە چونكە خوا فەرموویەتی (بضع سنین) واتە لە سێ تاكو نۆ ، جا لە ساڵی حەوتەم رۆمەكان سەركەوتن بەهۆی ئەم موعجیزە خەڵكێكی زۆر موسڵمان بوو.

*********************

# وتاری ژماره (٨٢) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی ( لقمان )

-سورەتێکی مەککی یه ، له ریزبەندی سورەتەکان ژماره (٣١)ە، ژمارەی ئایەتەکانی (٣٤) ئایەتە

-لەسەرەتادا خوا باسی موعجیزەی قورئان دەکات، که بۆ پێغەمبەری ناردوه،وبه نەمری دەمێنێتەوه هەتا هەتایی.

-باسی توانای بێ سنوری خوا دەکات له دروستکراوەکانی و بە موشریکان ئەڵێ ئایا جگه لەخوا کێ ئەتوانێ ئەو شتانه دروست بکات ، وەك فەرموویەتی :( هَٰذَا خَلْقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ١١ ) لقمان

واته: ئەمه (باسکرا) دروست کراوی خوایه دەی نیشانم بدەن ئەوانه (بت و پەرستراوانه) ی بێجگه له خودان چییان دروست کردووه (هیچیان دروست نەکردووه) بەڵکو ستەمکاران له گومڕایی یەکی ئاشکرادان.

-لەکۆتایدا باسی مەشهەدی قیامەت دەکات که کەس فریای کەس ناکەوێ، لەگەڵ پێنج شتی غەیبی که خوا نەبێ کەس نازانی ، وەك دەفەرموێ

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْ وَٱخْشَوْاْ يَوْمًا لَّا يَجْزِي وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ٣٣ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌۢ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ٣٤) لقمان

واته: ئەی ئادەمی خۆ بپارێزن له (تۆڵەی) پەروەردگارتان لەو ڕۆژەش بترسن هیچ باوکێ تاوانی ڕۆڵەکەی هەڵناگرێ و هیچ ڕۆڵەیەکیش شتێك له تاوانی باوکی هەڵناگرێ بێگومان

بەلێنی خوا حەق و ڕاستە کەواتە با ژیانی دنیا هەڵتان نەخەڵەتێنێ وە با شەیتانی فریودەر بە (بیانوی بەزەیی و لێبوردنی) خوا نەتان خەڵەتێنێ.(٣٣) هەر خوا زانای گشت باو بارانێکە: ئینجا خوا باسی پێنج شت ئەکات کەتەنها هەر خۆی ئەیانزانێ: ١- بەڕاستی زانیاریی هاتنی ڕۆژی قیامەت هەرلای خوایە، جگە لەو هیچ کەسێك نازانێ قیامەت کەی دێت، وەك لەجێگای تردا دەفەرموێ: (لا يجليها لوقتها إلا هو) تەنها ئەویش باران ئەبارێنی لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا، کەسێکی تر ناتوانێ باران ببارێنێ. ٣- ئەویش ئەزانێ چی لە مندالّدانەکاندایە، واتە: هەر لەوکاتەوە کەهێمان ئاوە، خوا خۆی دەزانێ چییە: کوڕە یان کچ، بەختیارو سەرفرازە، یان لاسارو بەدبەختە، بەژن و باڵای کورتە، یا..هتد. ٤- هیچ کەسێك - نە چاکەکار و نەخراپەکار- سەد لەسەد نازانێت سبەینێ چی دەکا لەچاك و لەخراپ. ٥- هیچ کەسیش نازانێ لە کام سەرزەویی ئەمرێ، واتە: کام جێگا دەبێتە گۆڕو ئارامگای، هەرچەند لەوانەیە هەوڵیش درابێ بۆ زانینی ئەمە! چونکە هەر خوایە زانا و بەئاگایە بەتەواوی ڕووداوەکان و گشت نهێنی و ئاشکرایەکیشی لایەکسانە. (وعنده مفاتح الغيب لا يعلمها إلا هو ..)(٣٤)

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٦) سورەتی لقمان

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ٦﴾ لقمان

واتە: لە نێو خەڵکدا هەیە، وتەی بێهودە: شانامەی عەجەم ، یان هەر فیکرەیەکی ڕووخێنەر، لە توی کتێبیکدا، یان لەناو (سیدی)یەکدا دەکڕێ، یان بۆ خۆی دەینووسی و، بۆ چەواشەکردنی خەڵك بڵاوی دەکاتەوە. (لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ )مانایەکی بەربڵاوو فراوانی هەیە، چونکە هەموو جۆرە وتەیەك، ئادەمیی سەرقاڵ بکاو بەرەو گومڕایی ڕایکێشێت، ئیتر گۆرانی و ئاوازی ئارەزوو بزوێن بێت، یا هەر وتەیەکی بێهوودە، ئەمانە هەموو

دەگرێتەوە. گوتراوە ئەم ئایەتەش سەبارەت بە (نەزری كوڕی حارس) دابەزی، چونكە دەچوو ئافرەتی گۆرانی بێژی دەهێنا و، كاتێ بیستبای فلآنێك دەیەوێت موسڵمان ببێت، خێرا دەچوو دەستی دەگرت و دەیبرد بۆلای ژنە گۆرانی بێژەكە و پێ دەگوت: دەسا هەر ئێستا پێكێ شەرابی بۆ تێكەو بەئارەزووی خۆیشی گورانیی بۆ بلێ، پاشان پێی دەگوت: ئەمە لەو نوێژو ڕۆژووەی مووحەممەد بۆ ئێوەی هێناوە باشترە! هەر ئەوبوو دەچوو شانامەو ئەو جۆرە كتێبانەی دەكڕی بەمەبەستی گومڕاكردنی خەڵكی و دەیوت: ئەگەر(موحوممەد) داستانی (عاد) و (سەموود)بۆ ئێوە باس دەكا، منیش داستانی (ڕۆستەم) و (ئەسفەندیار) و پاشاكانی ئێرانتان بۆ باس دەكەم. (**مختصر تفسير الطبري**)، و (أسباب النزول للسيوطي). (ليضل عن سبيل الله) تاخەڵكی لەڕێگەی خوا چەواشە و گومڕا بكات، مەبەستی ئەوەیەكە مەردم سەرگەرم بكات بەگۆرانیی ڕابوواردنەوە. بەڵێ.. هەر گۆرانییەك ئارەزوو بورو وژێنێی و بەرەو فەسادو بێ ڕەوشتی مرۆڤ هەڵنێت، وەك گۆڕانی بەبەژن و باڵای ئافرەتانداو جوان كردنی عارەق و.. هتد ئەوە یەك دەنگی زانایان هەیە لەسەر قەدەغەو حەرامێتی.. دەشڵێن مۆسیقایەكیش لە گەڵ ئەوانەدابێ حوكمی هەروایە. ئەوكارەش لەڕووی نەفامیی و، نەزانینەوە دەكا. واتە: بێ ئەوە گوێ بداو بزانێ بەمەترسی كارەكەی وە ئایەتەكانی قورئانیش دەكاتە گاڵتە جاڕی خۆی ئەوانە ئەو كارانە دەكەن سزایەكی ئابڕووبەریان بۆ هەیە پرسیار كرا لە (ئیبن مەسعوود) لە تەفسیری ئەم ئایەتە: (**ومن الناس من يشتري لهو الحديث**) گوتی: (**الغناء، والله الذي لا إله إلا هو** (**يرددها ثلاثا**) (رامان)

## ئايا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

( عَن ابْن عَبَّاس رَضِي الله عَنْهُمَا فِي قَوْله (وَمن النَّاس من يَشْتَرِي لَهو الحَدِيث) قَالَ: أنزلت فِي النَّضر بن الْحَارِث) الدر المنثور للسيوطي

واتە: ئەم ئایەتە دەربارەی نەزری کوڕی حاریس دابەزیوە.

١-( عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَا تَبِيعُوا الْقَيْنَاتِ وَلَا تَشْتَرُوهُنَّ وَلَا تُعَلِّمُوهُنَّ وَثَمَنُهُنَّ حَرَامٌ وَفِي مِثْلِ هَذَا نَزَلَتْ: (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لهْوَ الحَديثِ) رَوَاهُ أَحْمَدُ وَالتِّرْمِذِيُّ وَابْنُ مَاجَهْ قال الالباني حسن

واتە: لە ئەبو ئومامەی باهیلیەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی : گۆرانی بێژان مەکڕن و مەفرۆشن، وەفێری گۆرانیان مەکەن، پارەکەیان حەرامە) وەهەر لەبەر ئەوە ئەو ئایەتە دابەزیوە (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لهْوَ الحَديثِ)

٢-( قَالَ إِبْرَاهِيمُ: (الْغِنَاءُ يُنْبِتُ النِّفَاقَ فِي الْقَلْبِ). قَالَ: وَقَالَ مُجَاهِدٌ: (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ) (لقمان: ٦): (الْغِنَاءُ) مصنف ابن ابي شيبة

واتە: ئیبراهیم دەڵێ: گۆرانی دوو رووی دەروێنێ لە دڵدا) دەڵێ : موجاهید گوتویەتی : (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ)) گۆرانییە.

٣-( عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ) (لقمان: ٦) قَالَ: هُوَ وَاللَّهِ الْغِنَاءُ) السنن الصغير للبيهقي

واتە: لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە هاتووە خوا لێ رازی بێ دەڵێ: (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ) سوێند بەخوا مەبەستی گۆرانی یە.

٤-( عَن مُجَاهِد (وَالَّذين لَا يشْهدُونَ الزُّور) قَالَ: مجَالِس الْغناء) الدر المنثور للسوطي

٥-( عَن ابْن مَسْعُود رَضِي الله عَنهُ قَالَ: الْغناء ينْبت النِّفَاق فِي الْقلب كَمَا ينْبت المَاء الزَّرْع وَالذكر ينْبت الإِيمان فِي الْقلب كَمَا ينْبت المَاء الزَّرْع) الدر المنثور

واتە: ئیبنو مەسعود گوتویەتی : گۆرانی نیقاق دەروێنێ لە دڵدا وەك چۆن ئاو كشتوكاڵ شین دەكات ، وەهەروەها زیكر و یادی خوا ئیمان دەڕوێنێ وەك چۆن ئاو كشتوكاڵ دەروێنێ.

٦-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ) (لقمان: ٦) ، قَالَ: الْغِنَاءُ وَأَشْبَاهُهُ) الادب المفرد قال الالباني صحيح

واتە: ئیبنو عەباس دەڵێ: ئەم ئایەتە لەگەڵ گۆرانی یەتی .

زانایان دەڵێن : گۆرانی لەبەر سێ شت حەرام ١- كوفریان تێدایە ، ٢- شەهوەت دەجولێنێ ٣-دوو رووی دەروێنێ لە دڵ

پێشەوا شافعی دەڵێ: ئەوەی خۆی بەم كارە خەریك بكات (واتە: گۆرانی ) ، سپلەیەو گەوەندەیە و بەشێكیشە لە گەوادی

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی (١٣) سورەتی لقمان

(......إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ١٣) لقمان

واتە: ئەی (موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) باسی ئەو كاتە بكە كە لوقمان بە كوڕەكەی وت كە ئامۆژگاری دەكرد (ووتی) ئەی كوڕە شیرینەكەم هاوبەش بۆ خوا دامەنێ چونكە بەڕاستی هاوبەش دانان بۆ خوا ستەمێكی زۆر گەورەیە.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ شَقَّ ذَلِكَ عَلَى أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَالُوا أَيُّنَا لَمْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْسَ كَمَا تَظُنُّونَ إِنَّمَا هُوَ كَمَا قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ) رواه البخاري

واتە: عەبدولای کوڕی مەسعودەوە هاتووە خوا لێ ڕازی بێ: دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی (ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ ٨٢ الانعام) واتە: ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە و ستەم و هاوەڵگەریان تێکەڵ بە ئیمانەکەیان نەکردووە، ئاسوودەیی و هێمنی هەر بۆ ئەوانەیە، هەر ئەوانەش ڕێنموومایی کراون.) جا ئەوە لەسەر هاوەڵان قورس بوو ، گوتیان جا کێ هەیە زوڵمی لە خۆی نەکردبێ، پێغەمبەر فەرمووی : وانیە کە ئێوە تێدەگەن، بەڵکو ئەوەیە کە لوقمان بە کورەکەی گوت : ئەی رۆلەکەم هاوەڵ بۆ خوا بریارمەدە چونکە هاوەڵ بۆ خوا بریاردان زوڵمێکی گەورەیە.

## دەرسەکانی ئەم ئایەتە:

١-پێویستە بزانین شیرك تاوانێکی زۆر گەورەیە

٢-سێ جۆر شیرك هەیە : ١- شیرکی گەورە ٢- شیرکی بچوك ٣- شیرەك بزر.

دەبێ ئاگاداربین لە بابەنی شیرك ، بەتایبەتی سوێند خواردن بە غەیری خوا ، هەیە دەڵێ بەشەرفم یان بە قەبری فلانە کەس یان بە برایەتیمان ، ........) بزانن پێغەمبەر چی دەفەرموێ:

(مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللَّهِ فَقَدْ كَفَرَ وَأَشْرَكَ) رواه احمد و الترمذي والحاكم قال الالباني صحيح

واتە: ئەوەی سوێند بە جگە لە خوا بخوات کوفری کردوە یان شیرکی کردوە.

*****************

# وتاری ژماره (٨٣) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١٤-١٥) سورەتی لقمان

﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِي عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِي وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَيَّ ٱلْمَصِيرُ ١٤ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِي ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ۚ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ١٥﴾ لقمان

واتە : وە فەرمانمان داوە بە ئادەمی (بە چاکی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ) دایك و باوکی دا، دایکی هەڵی ئەگرێ بە دووگیانی (پێ ی لاواز دەبێ) لاوازی لە دوای لاوازی و بڕینەوەی لە شیر لە (دوا تەمەنی) دوو ساڵیەوە (وە فەرمانمان بە ئادەمی دا) کە سوپاس گوزاری من (خوا) و باوك و دایکت بکە تەنها بۆ لای منە گەڕانەوەتان.(١٤) وە ئەگەر (باوك و دایکت) ئەوپەڕی هەوڵیان دا لەگەڵت بۆ ئەوەی شتێ بکەیت بە هاوبەشی من کە هیچ زانیاری یەکت پێی نی یە ئەوە گوێڕایەڵیان مەکە بەڵام لە دنیادا زۆر بەچاکی هاوڕێ یەتیان بکە و شوێن ڕێگای کەسێك بکەوە کە بە دڵسۆزی گەڕاوەتەوە بۆ لای من (لەدوا ڕۆژدا) گەڕانەوەتان تەنها بۆ لای منە ئینجا هەواڵتان دەدەمێ بەو کردەوانەی کە کردووتانە.(١٥)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عن مُصْعَب بْن سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ نَزَلَتْ فِيهِ آيَاتٌ مِنَ الْقُرْآنِ قَالَ: حَلَفَتْ أُمُّ سَعْدٍ أَنْ لَا تُكَلِّمَهُ أَبَدًا حَتَّى يَكْفُرَ بِدِينِهِ، وَلَا تَأْكُلَ وَلَا تَشْرَبَ، قَالَتْ: زَعَمْتَ أَنَّ اللهَ وَصَّاكَ بِوَالِدَيْكَ، وَأَنَا أُمُّكَ، وَأَنَا آمُرُكَ بِهَذَا. قَالَ: مَكَثَتْ ثَلَاثًا حَتَّى غُشِيَ عَلَيْهَا مِنَ الْجَهْدِ، فَقَامَ ابْنٌ لَهَا يُقَالُ لَهُ عُمَارَةُ، فَسَقَاهَا، فَجَعَلَتْ تَدْعُو عَلَى سَعْدٍ، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي الْقُرْآنِ هَذِهِ الْآيَةَ: (وَوَصَّيْنَا الْإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَى أَنْ تُشْرِكَ بِي) وَفِيهَا (وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا) (لقمان: ١٥) قَالَ: وَأَصَابَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَنِيمَةً عَظِيمَةً، فَإِذَا فِيهَا سَيْفٌ فَأَخَذْتُهُ، فَأَتَيْتُ بِهِ الرَّسُولَ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْتُ: نَفِّلْنِي هَذَا السَّيْفَ، فَأَنَا مَنْ قَدْ عَلِمْتَ حَالَهُ، فَقَالَ: (رُدُّهُ مِنْ حَيْثُ أَخَذْتَهُ) فَانْطَلَقْتُ، حَتَّى إِذَا أَرَدْتُ أَنْ أُلْقِيَهُ فِي الْقَبَضِ لَامَتْنِي نَفْسِي، فَرَجَعْتُ إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: أَعْطِنِيهِ، قَالَ فَشَدَّ لِي صَوْتَهُ ( رُدُّهُ مِنْ حَيْثُ أَخَذْتَهُ) قَالَ فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنْفَالِ) (الأنفال: ١) قَالَ: وَمَرِضْتُ فَأَرْسَلْتُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَتَانِي، فَقُلْتُ: دَعْنِي أَقْسِمْ مَالِي حَيْثُ شِئْتُ، قَالَ فَأَبَى، قُلْتُ: فَالنِّصْفَ، قَالَ فَأَبَى، قُلْتُ: فَالثُّلُثَ، قَالَ فَسَكَتَ، فَكَانَ، بَعْدُ الثُّلُثُ جَائِزًا. قَالَ: وَأَتَيْتُ عَلَى نَفَرٍ مِنَ الْأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرِينَ، فَقَالُوا: تَعَالَ نُطْعِمْكَ وَنَسْقِكَ خَمْرًا، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ تُحَرَّمَ الْخَمْرُ، قَالَ فَأَتَيْتُهُمْ فِي حَشٍّ - وَالْحَشُّ الْبُسْتَانُ - فَإِذَا رَأْسُ جَزُورٍ مَشْوِيٌّ عِنْدَهُمْ، وَزِقٌّ مِنْ خَمْرٍ. قَالَ فَأَكَلْتُ وَشَرِبْتُ مَعَهُمْ، قَالَ فَذَكَرْتُ الْأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِرِينَ عِنْدَهُمْ. فَقُلْتُ: الْمُهَاجِرُونَ خَيْرٌ مِنَ الْأَنْصَارِ. قَالَ فَأَخَذَ رَجُلٌ أَحَدَ لَحْيَيِ الرَّأْسِ فَضَرَبَنِي، بِهِ فَجَرَحَ بِأَنْفِي فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَخْبَرْتُهُ فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ فِيَّ - يَعْنِي نَفْسَهُ - شَأْنَ الْخَمْرِ: (إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ) (المائدة: ٩٠) رواه مسلم

واتە: لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە هاتووە دەڵێ چەند ئایەتێك دەربارەی من دابەزیون لە قورئان لەوانە دایکم (واتە: دایکی سەعد) سوێندی خوارد نەبخوا ونەبخواتەوە

تاكو سەعد لە ئایینی ئیسلام پاشگەزنەبێتەوە ، وە گوتیە سەعد ئەدی ئایینی تۆ نالێ لەگەڵ دایكی باوك باش بە ، من دایكی تۆم فەرمانت پێ دەكەم ، سێ رۆژان مایەوە هیچی نەخوارد لە هۆش خۆی چوو ، سەعد برایەكی هەبوو ناوی عەمارە ئاوی دایە دایكی و دایكیشی دوعای لە سەعد دەكرد، ئەڵێ خواش ئەم ئایەتەی دەربارەی من دابەزاند (وَوَصَّيْنَا الْإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَى أَنْ تُشْرِكَ بِي) وَفِيهَا (وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا) (لقمان: ١٥) واتە: وە فەرمانمان داوە بە ئادەمی (بە چاكی هەڵس و كەوت كردن لەگەڵ) دایك و باوكی دا، دایكی هەڵی ئەگرێ بە دووگیانی (پێ ی لاواز دەبێ) لاوازی لە دوای لاوازی و برینەوەی لە شیر لە (دوا تەمەنی) دوو ساڵیەوە (وە فەرمانمان بە ئادەمی دا) كە سوپاس گوزاری من (خوا) و باوك و دایكت بكە تەنها بۆ لای منە گەڕانەوەتان.(١٤) وە ئەگەر (باوك و دایكت) ئەوپەڕی هەوڵیان دا لەگەڵت بۆ ئەوەی شتێ بكەیت بە هاوبەشی من كە هیچ زانیاری یەكت پێی نی یە ئەوە گوێڕایەڵییان مەكە بەڵام لە دنیادا زۆر بەچاكی هاوڕێ یەتیان بكە و شوێن ڕێگای كەسێك بكەوە كە بە دڵسۆزی گەڕاوەتەوە بۆ لای من (لەدوا ڕۆژدا) گەڕانەوەتان تەنها بۆ لای منە ئینجا هەواڵتان دەدەمێ بەو كردەوانەی كە كردووتانە.(١٥)

ئایەتی دووەم : پیغەمبەر جارێك دەستكەوتی زۆر دەست كەوتبوو لە جەنگێك ، منیش شمشرێكم گرتبوو ، چوومە لای پێغەمبەر گوتم ئەم شمشێرەم بدەرێ، ئەویش فەرمووی لە كوێت هێناوە لە جێگای خۆی دانێوە (واتە لەناو دەستكەوتەكان) ویستم داینێمەوە بەڵام دووبارە پێم لە نەفسی خۆم نا داوام كردەوە ، ئەوجارە بە دەنگی بەرز فەرمووی لە جێگای خۆی داینێوە ، جا ئەو ئایەتەم بۆ دابەزی و فەرمووی (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنْفَالِ) (الأنفال: ١) واتە: ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) پرسیارت لێ دەكەن سەبارەت بە دەستكەوتەكان(ی جەنگی بەدر) تۆش بڵێ: ئەو دەستكەوتانە هەر بۆ خواو پێغەمبەرن(صلی الله علیه وسلم) كەواتە خۆتان بپارێزن و لە خوا بترسن وە پەیوەندی نێوان خۆتان چاك بكەنەوە و گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەكەی بن ئەگەر ئێوە بڕوادارن.

وه ئایـەتی سـێیەم : کـاتێ نـەخۆش بـووم نـاردم بـە دوای پێغەمبـەر کـە بەکـەیفی خـۆم هەڵسوکەوت لە ماڵەکەم دا بکەم ، قەدەغەی کردم ، گوتم نیوەی دەکـەم خێـر قەدەغـەی کردم ، گوتم سێەکی بێ دەنگ بوو ، جا لەپاشان سێیەکی ماڵ دروست بـوو ، وەهـەروەها ڕۆژێك چوومە لای ئەنصارو موهاجیرەکان ، گوتیان فەرموو خـواردن و ئـارەق بخـۆ پـێش حەرام بوون ، لەناو بیسـتانێك بـووین ، منـیش لەگـەڵیان خـواردم و خواردمـەوە ، منـیش باسی ئەنصار و موهاجیرم کرد لەلایان و گوتم موهاجیر باشـترن لـە ئەنصـار ، پیاوێك لـە لوتی دام و برینداری کرد و منیش چـوومە لای پێغەمبـەر خـواش ئـەم ئایەتـەی دابەزانـدو فەرمووی (إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ) (المائدة: ٩٠) واتە : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بێگومان ئارەق و قومار و ئەو بەردانەی کـە کـراون بـە بت و ئەو پارچە دارانەی( کە بەکارئەهێنرێن بۆ دیاری کردنی بەش و چـارەنووس) ئەوانـە پیسن و لە کردەوەی شەیتانن کەواتە دوور کەونەوە لێ ی تا ڕزگاربن.

## چیرۆکێك لەم بارەوە: لە فەرموودەکانی پێغەمبەر

(لَمْ يَتَكَلَّمْ في المَهْدِ إلاَّ ثَلاثَةٌ : عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ ، وَصَاحِبُ جُرَيْجٍ ، وَكَانَ جُرَيْجٌ رَجُلاً عَابِداً ، فَاتَّخَذَ صَوْمَعَةً فَكَانَ فِيهَا ، فَأَتَتْهُ أُمُّهُ وَهُوَ يُصَلِّي ، فَقَالَتْ : يَا جُرَيْجُ ، فَقَالَ : يَا رَبِّ أُمِّي وَصَلاتِي فَأَقْبَلَ عَلَى صَلاتِهِ فَانْصَرَفَتْ . فَلَمَّا كَانَ مِنَ الغَدِ أتَتْهُ وَهُوَ يُصَلِّي ، فَقَالَتْ : يَا جُرَيْجُ ، فَقَالَ : أيْ رَبِّ أمِّي وَصَلاتِي ، فَأقْبَلَ عَلَى صَلاتِهِ ، فَلَمَّا كَانَ مِنْ الغَدِ أتَتْهُ وَهُوَ يُصَلِّي ، فَقَالَتْ : يَا جُرَيْجُ ، فَقَالَ : أيْ رَبِّ أمِّي وَصَلاتِي ، فَأقْبَلَ عَلَى صَلاَتِهِ ، فَقَالَتْ : اللَّهُمَّ لاَ تُمِتْهُ حَتَّى يَنْظُرَ إلَى وُجُوهِ المُومِسَاتِ . فَتَذَاكَرَ بَنُو إسْرائِيل جُرَيْجاً وَعِبَادَتَهُ ، وَكَانَتِ امْرَأةٌ بَغِيٌّ يُتَمَثَّلُ بحُسْنِهَا ، فَقَالَتْ : إنْ شِئْتُمْ لأَفْتِنَنَّهُ ، فَتَعَرَّضَتْ لَهُ ، فَلَمْ يَلْتَفِتْ إلَيْهَا ، فَأتَتْ رَاعِياً كَانَ يَأوِي إلَى صَوْمَعَتِهِ ، فَأَمْكَنَتْهُ مِنْ نَفْسِهَا فَوقَعَ عَلَيْهَا ، فَحَمَلَتْ ، فَلَمَّا وَلَدَتْ ، قَالَتْ : هُوَ مِنْ جُريج ، فَأتَوْهُ فَاسْتَنْزَلُوهُ وَهَدَمُوا صَوْمَعَتَهُ ، وَجَعَلُوا يَضْرِبُونَهُ ، فَقَالَ : مَا

شَأنُكُمْ ؟ قَالُوا : زَنَيْتَ بهذِهِ البَغِيِّ فَوَلَدَتْ مِنْكَ . قَالَ : أيْنَ الصَّبيُّ ؟ فَجَاؤُوا بِهِ فَقَالَ : دَعُوني حَتَّى أصَلِّي ، فَصَلَّى فَلَمَّا انْصَرفَ أتَى الصَّبيَّ فَطَعنَ في بَطْنِهِ ، وَقالَ : يَا غُلامُ مَنْ أبُوكَ ؟ قَالَ : فُلانٌ الرَّاعِي ، فَأَقْبَلُوا عَلَى جُرَيْجٍ (في رواية اخر)( فَأَقْبَلُوا عَلَى جُرَيْجٍ يُقَبِّلُونَهُ وَيَتَمَسَّحُونَ بِهِ وَقَالُوا نَبْنِي لَكَ صَوْمَعَتَكَ مِنْ ذَهَبٍ. قَالَ لاَ أَعِيدُوهَا مِنْ طِينٍ كَمَا كَانَتْ) رواه البخاري ومسلم

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : کەس لەناو پێشکە قسەی نەکردوە تەنها (٣) کەس نەبێ، ١–عیسای کوڕی مەریەم ٢–جورەیج : جورەیج پیاوێکی خواپەرست بوو، لە پەرستگایەك خواپەرستی دەکرد، دایکی هات بۆ سەردانی لەو کاتە لەناونوێژدا بوو، بانگی کرد گوتی: جوریج ، ئەویش گوتی: خودایە (دایکم و نوێژم) نوێژەکەی نەبڕی ، دایکی ڕۆیشت ، بەیانی دووبارە چوە لای کوڕەکەی ، دیسان لە ناو نوێژدا بوو ، بانگی کرد جوریج ، گوتی: خودایە (دایکم و نوێژم) نوێژی هەلبژاردو وەلآمی نەدایەوە ، بۆجاری سێیەم هەمان شتی دووبارکردوە،دایکی دوعای لێ کرد گوتی(خوا نەمرێ تاکو توشی رووی ئافرەتێکی خراپ دەبێ) بەنی ئیسرائیل باسی خواپەرستی جوریجیان دەکرد دەنگی دابویەوە، ئافرەتێکی زیناکەر هەبوو ، گوتیە ناحەزانی جوریج ئەگەر حەز دەکەن ، توشی زینای دەکەم ، هەستاو چووە لای وخۆی بۆ رازاندەوە ، ئەویش هیچ تەماشای نەکرد، ئافرەتەکە چووە لای شوانێك کە هاتوو چۆی پەرستگایەکەی جوریجی دەکرد، ئەویش زینای لەگەڵ کرد، ئاوس بوو، کە منداڵەکەی بوو ، ئافرەتەکە گوتی : ئەو منداڵە لە جوریجە، خەڵکی چوونە سەری لێیانداو پەرستگایەکیان لێ روخاند، گوتی: بۆچی وادەکەن؟ گوتیان زینات کردوە لەگەڵ ئەم ئافرەتە داوێن پیسە و منداڵی لەتۆ بووە، گوتی : کوا منداڵەکە ؟ هێنایان بۆی، گوتی: لێم گەرێن تاکو نوێژ دەکەم، نویژی کرد وپارایەوە ، چووە لای منداڵەکە دەستێکی گەیاندە زگی ، گوتی : ئەی منداڵ کێ باوکتە؟ بەفەرمانی خوا منداڵ هاتە قسەو گوتی : شوانەکە، خەڵکی ڕۆیان کردە خوریج ماچیان

دەكرد و دەستیان لىێ دەدا بەخۆیان دادەهێنا، گوتیان: ئەم پەرستگایەت بۆ لە زێر دروست دەكەینەوە ، گوتی: نەخێر وەكو جاران لە قورِ بۆم دروست كەنەوە.

## سوپاسی خوا بە سوپاسی دایك وباوك بەستراوە:

(قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ – رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا –: ثَلَاثُ آيَاتٍ نَزَلَتْ مَقْرُونَةً بِثَلَاثٍ لَمْ تُقْبَلْ مِنْهَا وَاحِدَةٌ بِغَيْرِ قَرِينَتِهَا. إحْدَاهَا: قَوْله تَعَالَى: (أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ) (النساء: ٥٩) فَمَنْ أَطَاعَ اللَّهَ وَلَمْ يُطِعْ رَسُولَهُ لَمْ يُقْبَلْ مِنْهُ. وَالثَّانِيَةُ قَوْله تَعَالَى: (وَأَقِيمُوا الصَّلاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ) (البقرة: ٤٣) فَمَنْ صَلَّى وَلَمْ يُزَكِّ لَمْ يُقْبَلْ مِنْهُ. الثَّالِثَةُ قَوْله تَعَالَى: (أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ) (لقمان: ١٤) فَمَنْ شَكَرَ اللَّهَ وَلَمْ يَشْكُرْ وَالِدَيْهِ لَمْ يُقْبَلْ مِنْهُ، وَلِذَا قَالَ – صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ –: (رِضَا اللَّهِ فِي رِضَا الْوَالِدَيْنِ وَسَخَطُ اللَّهِ فِي سَخَطِ الْوَالِدَيْنِ) الزواجر عن اقتراف الكبائر

ئیبنو عەباس دەڵێ: سێ شت بەبێ یەكدی قەبول نین ، ١–گوێرایەلی خوا قەبول نیە تاكو گوێرایەلی پێغەمبەری لەگەڵ نەبێ وەك فەرموویەتی(أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ)

٢– شوكری خوا قەبول نیە تاكو شوكری دایك وباوكی لەگەڵ نەبێ ، وەك فەرموویەتی(أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ (لُقْمَان الْآيَة ١٤)

٣–نوێژ قەبول نیە بێ زەكات چونكە خوا فەرموویەتی (وَأَقِيمُوا الصَّلاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ)

## دایك پاداشتی نادرێتەوە:

( وَقَدْ رَأَى ابْنُ عُمَرَ – رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا – رَجُلًا يَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ حَامِلًا أُمَّهُ عَلَى رَقَبَتِهِ فَقَالَ: يَا ابْنَ عُمَرَ أَتَرَى أَنِّي جَزَيْتُهَا؟ قَالَ: لَا وَلَا بِطَلْقَةٍ وَاحِدَةٍ وَلَكِنَّكَ أَحْسَنْتَ وَاللَّهُ يُثِيبُكَ عَلَى الْقَلِيلِ كَثِيرًا) الزواجر عن اقتراف الكبائر

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر  خوا لە خۆی وبابی رازی بێ ، بینی پیاوێك دایکی لەسەر شانی داناوە تەواف پێ دەکات ، گوتی : ئەی ئیبنو عومەر ئایا من پاداشتی دایکم داوەتەوە هێناومە ماڵی خوا و تەواف پێ دەکەم و خزمەتی  دەکەم ، ئیبنو عومەر گوتی: نەخێر هەمووی ناکاتە یەك ژانە سکی لەکاتی منداڵ بوون ، تۆ تەنها چاکەیەکی کەمی لەگەڵ دەکەی ، بەڵام خوا پاداشتێکی زۆرت دەداتەوە.

## دایك ئنجا باوك:

( عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ أَحَقُّ بِحُسْنِ صَحَابَتِي؟ قَالَ: (أُمَّكَ) . قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: (أُمَّكَ) . قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ (أُمَّكَ) . قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: (أَبُوكَ) . وَفِي رِوَايَةٍ قَالَ: (أُمَّكَ ثُمَّ أُمَّكَ ثُمَّ أُمَّكَ ثُمَّ أَبَاكَ ثمَّ أدناك أدناك)  مُتَّفق عَلَيْهِ

واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر گوتی : ئەی نێرراوی خوا کێ لە هەموو کەس لە پێشترە چاکەی لەگەڵ بکەم، فەرمووی : دایکت ، گوتی : دوای ئەو : فەرمووی : دایکت، گوتی : دوای : فەرمووی : دایکت  ، گوتی: دوای ، فەرمووی : باوکت

وفي رواية(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ مَنْ أَحَقُّ النَّاسِ بِحُسْنِ الصُّحْبَةِ؟ قَالَ: (أُمُّكَ، ثُمَّ أُمُّكَ، ثُمَّ أُمُّكَ، ثُمَّ أَبُوكَ، ثُمَّ أَدْنَاكَ أَدْنَاكَ) روه مسلم

-( وَعَن معاوية بن جاهِمةُ أَنَّ جَاهِمَةَ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَدْتُ أَنْ أَغْزُوَ وَقَدْ جِئْتُ أَسْتَشِيرُكَ. فَقَالَ: (هَلْ لَكَ مِنْ أُمٍّ؟) قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: (فَالْزَمْهَا فَإِنَّ الْجَنَّةَ عِنْدَ رِجْلِهَا) رَوَاهُ أَحْمَدُ وَالنَّسَائِيُّ وَالْبَيْهَقِيّ فِي (شعب الْإِيمَان) قال الالباني اسناده جيد

واتە: جاهیمە هاتە لای پێغەمبەر گوتی : ئەی نێرراوی خوا ، دەمەوێ بچمە غەزا هاتوومە راوێژت پێ بکەم بزانم تۆ چی دەڵێی؟ پێ فەرموو : ئایا دایکت ماوە؟ گوتی: بەڵێ،

فەرمووی خزمەتی دایکت بکە ، چونکە بەهەشت لەکن پێیەکانیەتی (واتە: بەخزمەتی ئەو دەچیتە بەهەشت)

## باوك دەرگای ناوەراستی بەهەشتە :

١- (عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، أَنَّ رَجُلاً أَتَاهُ فَقَالَ: إِنَّ لِيَ امْرَأَةً وَإِنَّ أُمِّي تَأْمُرُنِي بِطَلاَقِهَا، قَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: الوَالِدُ أَوْسَطُ أَبْوَابِ الجَنَّةِ، فَإِنْ شِئْتَ فَأَضِعْ ذَلِكَ البَابَ أَوْ احْفَظْهُ قَالَ: وَقَالَ ابْنُ أَبِي عُمَرَ: رُبَّمَا قَالَ سُفْيَانُ: إِنَّ أُمِّي وَرُبَّمَا قَالَ: أَبِي) الترمذي وابن ماجه قال الالباني صحيح

واتە:لە ئەبی (درداوە) هاتووە دەڵێ پیاوێك هاتە لام گوتی : دایکم فەرمانم پێ دەکات خێزانم تەلاق بدەم، ئەبو دەردا دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر دەیفەرموو: باوك دەرگای ناوەراستی بەهەشتە، ئەگەر حەز دەکەی ئەم دەرگایە لە دەست خۆت بدە، ئەگەر حەزیش دەکەی بیپارێزە ، ئیبنو عومەر دەڵێ : سوفیان دەڵێ : کابرا یان گوتی دایکم یان گوتی باوکم.

معاني الكلمات((أوسط) أي سبب لدخول الولد من أحسن أبواب الجنة. وقال السيوطي أوسط الأبواب أي خيرها. (فأضع) أمر من الإضاعة وليس المراد التخيير بين الأمرين. بل المراد التوبيخ على الإضاعة والحث على الحفظ. مثل فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر )

## چاکە لەگەڵ دایک هۆکارە بۆ قورئان خوێندن لە بەهەشت:

((عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ قَالَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نِمْتُ فَرَأَيْتُنِي فِي الْجَنَّةِ فَسَمِعْتُ صَوْتَ قَارِئٍ يَقْرَأُ فَقُلْتُ مَنْ هَذَا قَالُوا هَذَا حَارِثَةُ بْنُ النُّعْمَانِ فَقَالَ لَهَا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَذَاكَ الْبِرُّ كَذَاكَ الْبِرُّ وَكَانَ أَبَرَّ النَّاسِ بِأُمِّهِ)) مسند أحمدقال الشيخ شعيب الأرناؤوط : إسناده صحيح ، رجاله ثقات رجال الشيخين)

(عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (بَيْنَا أَنَا أَدُورُ فِي الْجَنَّةِ، سَمِعْتُ صَوْتَ قَارِئٍ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالُوا: حَارِثَةُ بْنُ النُّعْمَانِ، كَذَلِكَ الْبِرُّ، قَالَ: (وَكَانَ أَبَرَّ النَّاسِ بِأُمِّهِ) صحيح ابن حبان قال الالباني صحيح

واتە: عائیشە دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی : لە بەهەشت دەگەرام ، گوێم لە دەنگی قورئان خوێنێك بوو ، گوتم ئەوە كێیە؟ گوتیان: ئەو حاریسەی كوڕی نوعمانە ، ئەوە چاكەیە، فەرمووی : (ئەو چاكترین كەس بوو لەگەڵ دایكی )

********************

# وتاری ژماره (٨٤) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سوڕەتی (السجده)

–سـوڕەتی (السـجده) سـوڕەتێکی مـەککی یـە ، لـە ریزبەنـدا ژمـارە(٣٢)ە و ژمـارەی ئایەتەکانی (٣٠) ئایەتە.

–باسی ئیمان بەخوا و ڕۆژی دوای دەکات ، وەباسی هێزوتوانای خوای گەورە دەکات و لە کۆتایی دا باسی پاداشتی ئیمانداران و سزای تاوانباران دەکات لە ڕۆژی قیامەت .

ئایا بۆچی ناونراوە (السجده)؟ چونکە خـوا باسـی سـیفاتی ئیمانـدارە چاکەکان دەکـات دەفەرموی کاتێ گوێیان لە قورئان دەبێ کرنۆش بۆ خوا دەبن (**إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا الَّذِينَ إِذَا ذُكِّـرُوا بِهَـا خَـرُّوا سُـجَّدًا وَسَـبَّحُوا بِحَمْـدِ رَبِّهِـمْ وَهُـمْ لَا يَسْـتَكْبِرُونَ ۩ (السجدة:١٥)**)

واتە: تەنها کەسانێ باوەڕ بە ئایەتەکانی ئێمە دێنن هـەر کـاتێ بـەو(ئایەتانـە) ئامۆژگـاری بکرێن ئەکەون بە ڕوودا بە سوژدە بردنەوە و بە پاکی ستایشـی پـەروەردگاریان دەکـەن و خۆیان بە گەورە دانانێن.

## – پێغەمبەر لە نوێژی بەیانی سوڕەتی (السجده) دەخوێند

(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ الم السَّجْدَةَ، وَهَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ) المعجم الاوسط للطبراني

واتـە: لـە ئیبنـو عەباسـەوە هـاتووە دەڵـێ: پێغەمبـەر ڕۆژانـی هـەینی لـە نوێـژی بـەیانی سوڕەتی (السجده) و(الانسان) دەخوێند.

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١٦ ) سورەتی السجده

(تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ يَدۡعُونَ رَبَّهُمۡ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ١٦) السجده

واته : تەنشتیان دوور ئەکەوێتەوە لە جێگای خەوتنیان (لەخەو هەڵدەسن شەو نوێژ دەکەن) هاوارو نزا لە پەروەردگاریان دەکەن بەترس و هیواوە و لەو ڕۆزی و سامانەی پێمان داون دەبەخشن.(پوختەی تەفسیر)

جا لەئایەتی دوای ئەم ئایەتە دەفەرمووی: ((فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٧) واتە: ئینجا هیچ کەس نازانێ چی شاراوەتەوە بۆیان لە (بەهەشت دا کە هۆی) گەشبوونی چاوانن ئەم پاداشتە (دەدرێنەوە) بەهۆی ئەو کردەوانەوەی کە کردویانە.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ (تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ) نَزَلَتْ فِي انْتِظَارِ هَذِهِ الصَّلاَةِ الَّتِي تُدْعَى العَتَمَةَ) رواه الترمذي قال الالباني صحيح

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە دەڵێ: ئەم ئایەتە (تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ) دەربارەی چاوەڕوانی کردنی نوێژی عیشا دابەزیوە .

**بۆ زانیاری** : ئەم چوار ئایەتەی دوای ئەم ئایەتە باسی بەرهەم و جیاوازی ئیماندارو فاسق دەکات

أَفَمَن كَانَ مُؤۡمِنٗا كَمَن كَانَ فَاسِقٗاۚ لَّا يَسۡتَوُۥنَ ١٨ ) السجده

واته : دەی ئایا کەسێ ئیماندار بووبێ وەك کەسێکە دەرچووبێ لە ئیمان (فاسق بووبێ) هەرگیز چونیەك نین.

أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْمَأْوَىٰ نُزُلًا بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ١٩) السجده

واتە: جا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە ئەوە بەهەشتانێکی پڕ ڕێزو خۆشیان بۆ هەیە بەهۆی ئەو کردەوانەوەی کە دەیان کرد.

وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُواْ فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۖ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخْرُجُواْ مِنْهَآ أُعِيدُواْ فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ٢٠) السجده

واتە : وە ئەوانەی کە فاسق بوون ئەوە جێگایان ئاگرە هەر کاتێ بیانەوێ لە دۆزەخ دەرچن دووبارە دەیانگێڕنەوە ناو دۆزەخ و پێیان دەووترێ بچەژن سزای ئەو ئاگرەی کە ئێوە باوەڕتان پێ نەدەکرد.

## ١-فەزڵ و گەورەیی شەونوێژ لە قورئاندا :

### ١-خوای گەورە مەدحیان دەکات :

تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ١٦) السجده واتە : تەنشتیان دوور ئەکەوێتەوە لە جێگای خەوتنیان (لەخەو هەڵدەسن شەو نوێژ دەکەن) هاوارو نزا لە پەروەردگاریان دەکەن( بەترس و هیواوە )و لەو ڕۆزی و سامانەی پێمان داون دەبەخشن.

### ٢-خوا بەچاکە کار باسیان دەکات :

(إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ١٥ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُواْ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ١٦ كَانُواْ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ١٧ الذاريات (ءَاخِذِينَ)(وەریدەگرن)

واتە: بێگومان پارێزکاران وان لە باخات و کەناری سەرچەشمەی ڕەواندا.(١٥) ئەوەی خـوا پـێ ی داوون وەری دەگـرن (چـونکە) بێگومـان ئـەوان لـەوەوپێش چاکە کـاربوون.(١٦) ئەوانە کەمێك لە شەودا دەخەوتن واتە شەو نوێژیان دەکرد.(١٧) (پوختەی تەفسیر)

٣- خوا بە بەندە چاکەکان ناویان دەبات:

وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا ٦٣ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا ٦٤) الفرقان

واتە: بەندە تایبەتی یەکانی خوای میهرەبان کەسـانێکن بـە ویقـارو نـەرمی دەڕۆن بەسـەر زەوی دا (بێ لووت بەرزی و کەشخە و فیز کردن) وە کاتـێ نـەزان و نەفامـەکان (بـە وتـەی ناشرین) لەگەڵیان بدوێن وتەیەك دەڵێن پێیان گوناه نەبێت.(٦٣) وە کەسانێکن لە شـەودا بۆ پەروەردگاریان سوژدە بەرن و شەو نوێژ دەکەن.(٦٤) (پوختەی تەفسیر)

٤-خوا جیان دەکاتەو ئەوانەی شەونوێژ دەکەن و شەونوێژ ناکەن:

أَمَّنۡ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ سَاجِدٗا وَقَآئِمٗا يَحۡذَرُ ٱلۡأٓخِرَةَ وَيَرۡجُواْ رَحۡمَةَ رَبِّهِۦۗ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٩ الزمر

ئایا ئەو کەسەی کە بەپێی بەرنامەو فەرمایشتەکانی خودا ژیانی دەباتە سـەرو بەشـێك لـە شـەوانی بـە سـوجدە بـردن و ڕاوەسـتان و پاڕانـەوە لـە خـودا زینـدوو دەکاتـەوەو بـە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و ئەنجامـدانی کـردەوەی چـاکە خـۆی لـە سـزای ڕۆژی دوایـی دەپارێزێت و ئومێدی بە ڕەحمەتی خودا هەیەو داوای لێ دەکـات بـێ بەشـی نـەکات، ئایـا ئەم کەسە وەکو ئەو کەسە وایە کە لە خودا یاخیی دەبێت و پشت دەکاتە فەرمانەکانی؟. بێگومان نەخێر... کەی ئەو دوو کەسە وەکو یەك وان؟. ئـەی پێغەمبـەر(صـلی اللـە علیـە وسلم) تۆ بڵێ: ئایا ئەوانەی خوێندەوارن و زاناو تێگەیشتوون( کە ئەو سیفەتانەیان هەیـە کە باسکران) وەکـو ئـەو کەسـانە وان کـە نەخوێنـدەوارو تێنەگەیشـتوون و هـیچ کـام لـەو سیفەتانەیان نیە؟. ئایا ئەو دووانە وەکو یەکن؟. بێگومان نەخێر، هەرگیز چوون یەك نین، بەڵام بەڕاستیی ئەو کەسانە لەم جیاوازیە تێی دەگەن کە خـاوەنی بـیرو هۆشـی تـەواون و

فـام و ژيريـى خۆيـان بـه چـاكيى دهخهنـه كـارو دهزانـن خـودا پهرسـتيى و بـهجێهێنانى فهرمانـهكانى خـودا زۆر جيـاوازه لـه بـىَ بـاوهڕيى و يـاخيى بـوون، هـهروهك زانـاو دانـاو خوێندهواران زۆر جياوازييان ههيه لهگـهڵ نهخوێنـدهواران و تێنهگهيشـتوانداو وهكـو يـهك نين.

## ٢- فهزل و گهورهيى شهونوێژ لهفهرموودهى پێغهمبهردا :

**١-عَلَيْكُمْ بِصَلَاةِ اللَّيْلِ وَلَوْ رَكْعَةً وَاحِدَةً) الطبراني في الكبير والاوسط**

واته: پێغهمبهر فهرموويهتى : دهست بگرن به شهونوێژ ئهگهر يهك ركعهتيش بىَ.

**٢-عَنْ عَبْدِ اللهِ قَالَ: ذُكِرَ رَجُلٌ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا زَالَ نَائِمًا حَتَّى أَصْبَحَ، مَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ، فَقَالَ ذَاكَ رَجُلٌ بَالَ الشَّيْطَانُ فِي أُذُنَيْهِ، أَوْ قَالَ: فِي أُذُنِهِ ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ و مُسْلِمٌ**

واته: له عهبدوڵاوه هاتووه دهڵىَ: باسى پياوێك كرا لهلاى پێغهمبهر ، گوتيان تاكو بـهيانى دهخهوىَ ههڵناسىَ بۆ نوێژ ، فهرمووى : ئهو شهيتان ميزى كردۆته گوێيهكانى.

**٣-(ثلاثةٌ يحبُهُمُ اللهُ ويَضْحَكُ إليهم ويَستَبْشِرُ بهم، الذى إذا انكشفتْ فِئةٌ قاتَلَ وَراءَها بنفسهِ للهِ فإمَّا أن يُقتَلَ وإمَّا أن يَنْصُرَهُ اللهُ ويَكْفِيَهُ فيقول أُنْظُروا إلى عبدى هذا كيف صَبَرَ لى بنفسه، والذى له امرأةٌ حَسَنَةٌ وفِراشٌ لَيِّنٌ حَسَنٌ فيقومُ من الليل فيقول يَذَرُ شَهْوتَهُ فَيَذْكُرُنى ولو شاءَ رَقَدَ، والذى إذا كان فى سفرٍ وكان معه رَكْبٌ فَسَهِروا ثم هَجَعُوا فقام من السَّحَرِ فى سَرَّاءٍ وضَرَّاءٍ (الطبرانى ، والحاكم عن أبى الدرداء) (فَسَهِروا ثم هَجَعُوا )(واتـه پـاش حهوانهو: پال دهدهنهوه)**

قال المنذرى إسناده حسن . وقال الهيثمى (قال الالباني حسن في السلسلة الصحيحة)

واتە: سێ کەس خوا خۆشی دەوێن وبەدەمیان پێدەکەنێ و موژدەیان پێ بە خەڵکی دەدات، ١-کاتێ سوپای موسڵمانان دەشکێ ، ئەو کەسە دەگەڕێتەوە شەڕدەکات یان دەکوژرێ یان سەردەکەوی ، ئەوەی بەسە خوا دەفەرمووێ: سەیری بەندەکەم بکەن چۆن لە پێناوی مندا بەئارامە بەگیانی خۆی. دووەم: پیاوێکە ئافرەتێکی جوان و ناوجێگایەکی خۆشی هەیە ، بەڵام شەوان هەڵدەستێتەوە بۆ شەونوێژ و یادی خوا دەکات و واز لە ئارەزووەکانی خۆی دێنێ ، سێیەم: کەسێکە لەگەڵ کۆمەڵێك لەسەفەردایە، پاش ئیسراحەت ئەوان لەخەودان وپاڵیان داوەتەوە، ئەویش کاتی بەرەبەیان هەڵدستێتەوە شەونوێژ دەکات.

وفى روايه(عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (عَلَيْكُمْ بِقِيَامِ اللَّيْلِ فَإِنَّهُ دَأْبُ الصَّالِحِينَ قَبْلَكُمْ وَهُوَ قُرْبَةٌ لَكُمْ إِلَى رَبِّكُمْ وَمَكْفَرَةٌ لِلسَّيِّئَاتِ وَمَنْهَاةٌ عَنِ الْإِثْمِ) رَوَاهُ التِّرْمِذِيّ قال الالباني في المشكاة المصابيح (حسن بشواهده)

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : (دەست بگرن بە شەونوێژەوە ، چونکە پیشەی صالیحانی پێش ئێوەیە، وە لەخواتان نزیك دەکاتەوە ، وە گوناحان دەسرێتەوە ، وە قەدەغەتان دەکات لە گوناحان.

## پاداشتی یەکدی هەڵساندنەوە بۆ شەونوێژ:

(إِذا اسْتَيْقَظَ الرَّجُلُ مِنَ اللَّيْلِ وأيْقَظَ أهْلَهُ وَصَلَّيا رَكْعَتَيْنِ كُتِبا مِنَ الذَّاكِرِينَ الله كَثِيراً والذَّاكِرات)رواه ابوداود والنسائي والبيهقي وابن حبان والحاكم قال الألباني (صحيح

واتە: ئەگەر پیاو شەوان هەڵسایەوە ، خانەوادەی بەخەبەر هێنا، شەونوێژیان کرد، ناویان دەنوسرێت لە ریزی ئەو کەسانەی زۆر یادی خوا دەکەن.

-شرح أي: سواءٌ أكان إماماً وهي مأمومة، أم صلى كل واحد منهما بمفرده، فالمهم أن توجد الصلاة منهما جميعاً، إما عن طريق الجماعة أو عن طريق انفراد كل واحد منهما بصلاته.

قوله: (كتبا من الذاكرين الله كثيراً والذاكرات) يعني: هذا فيه تفسير لما جاء في القرآن في قوله تعالى: ﴿وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾ (الأحزاب:٣٥) فهذه الآية فيها ذكر عشرة أصناف من الرجال والنساء، وآخرهم الذاكرون الله كثيراً والذاكرات، فالسنة تفسر كتاب الله عز وجل.فكون الزوجين يقومان في الليل ويصليان والناس نيام يدل على أنهما ليسا من الغافلين، بل من الذاكرين الله كثيراً والذاكرات. ويدخل فيه الرجل مع محارمه من النساء، والمرأة مع محارمها من الرجال، فكون الرجل يوقظ زوجته ويوقظ بناته، أو البنت توقظ أمها أو أباها لا بأس به.

***************

# وتاری ژماره (٨٥) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (الاحزاب)

سورەتی (الاحزاب) سورەتێکی مەدەنییە ، له ریزبەندا ژمارە(٣٣)ە، ژمارەی ئایەتەکانی (٧٣)ئایەتە.

-چەند شتێك له خۆ دەگرێت وەك ١- ئادابەکان ٢-چەند حوکمێك بۆ ریکخستنی خێزان ٣-هەردوو جەنگی (الاحزاب و بني قريظة)

ئایا بۆچی ناونراوە (الاحزاب)؟ چونکە لەم جەنگە قوریش و جوولەکەو هۆزی غەتەفان ببونە هاوپیمان دژی موسڵمانان ، بەڵام خوا گەورەر بەرت و بڵاوی کردن.

### ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٥) سورەتی الاحزاب:

﴿ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ فَإِن لَّمۡ تَعۡلَمُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمۡۚ وَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٞ فِيمَآ أَخۡطَأۡتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتۡ قُلُوبُكُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمًا ٥﴾ الاحزاب

واتە : هەر بەناوی باوکی خۆیانەوە بانگیان بکەن و نێویان بەرن، واتە: مەڵێن :(زەیدی کوڕی موحەممەد)، بەڵکو بڵێن: (زەیدی کوڕی حاریس)ـە، چونکە لای خوا هەر ئەوە پەسەند و دادگەرانەیە خۆ ئەگەر باوکیشیانتان نەدەزانی هەتا بە ناوی باوکیانەوە بانگیان بکەن ئەوە برای ئایینی و دۆستانن، ئەگەر موسڵمان بن، وە خۆشەویست و مەولاتان، واتە: پاش ئازادبوونی لە کۆیلەیی دەبێ بڵێن: فڵانە کەسی مەولام!، بۆیە بۆ دوایی پەیامبەر صلى الله عليه وسلم بە زەیدی دەگوت: تۆ براو مەولای ئێمەی: (أنت أخونا وَمولانا) (فتح الباري:٥٧٠/٧).خۆ ئەگەر بەهەڵە جارێکیش بانگتان لێ کردبن، زمانتان وا ڕاهاتبێ، ئەوە هیچ قەیناکاو گوناهێکتان ناگات لەو هەڵەدا بەڵکو گوناح لەوەدایە کە

ئەگەر بەدڵەوەو بەدەست ئەنقەست ئەو کارە بکەن و نێویان بەرن بەغەیری باوکیان.
خواش هەمیشە گوناح پۆشە، دلۆڤان و میهرەبانە.(تەفسیری ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ أَبَا حُذَيْفَةَ بْنَ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ وَكَانَ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَبَنَّى سَالِمًا وَأَنْكَحَهُ بِنْتَ أَخِيهِ هِنْدَ بِنْتَ الْوَلِيدِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ وَهُوَ مَوْلًى لِامْرَأَةٍ مِنْ الْأَنْصَارِ كَمَا تَبَنَّى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَيْدًا وَكَانَ مَنْ تَبَنَّى رَجُلًا فِي الْجَاهِلِيَّةِ دَعَاهُ النَّاسُ إِلَيْهِ وَوَرِثَ مِنْ مِيرَاثِهِ حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ إِلَى قَوْلِهِ وَمَوَالِيكُمْ فَرُدُّوا إِلَى آبَائِهِمْ فَمَنْ لَمْ يُعْلَمْ لَهُ أَبٌ كَانَ مَوْلًى وَأَخًا فِي الدِّينِ فَجَاءَتْ سَهْلَةُ بِنْتُ سُهَيْلِ بْنِ عَمْرٍو الْقُرَشِيِّ ثُمَّ العَامِرِيِّ وَهِيَ امْرَأَةُ أَبِي حُذَيْفَةَ بْنِ عُتْبَةَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ يَا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّا كُنَّا نَرَى سَالِمًا وَلَدًا وَقَدْ أَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِ مَا قَدْ عَلِمْتَ) رواه البخاري

واتە: عائیشەی دایکی ئیمانداران دەڵێ: ئەبو حوزیفە لەو کەسانە بوو کە بەشداری جەنگی بەدری کردبوو ، (سالم)ی کردبویە کوڕی خۆی و کچی برای خۆی لێ مارکردبوو کەناوی (هندی کچی ولید) بوو، ئەو مولای ئافرەتێکی ئەنصاربوو، وەهەروەها پێغەمبەریش (زید) کردبووە کوڕی خۆی ، وەهەر کەسێ لە زەمانی جاهیلی کەسێکی کردبایە کوڕی خۆی ، بەناوی ئەو بانگیان دەکرد، ومیراتی لێ دەگرت ، تاکو ئەم ئایەتە دابەزی وفەرمووی (ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ إِلَى قَوْلِهِ وَمَوَالِيكُمْ) بیانگێرنەوە بۆ باوکی خۆیان ، ئەوەی نەزانرا باوکی کێیە؟ براتانن لە ئایین و مولای ئێوەن ، (سەهلەی کچی سوهیل کوڕی عەمر قوریشی دوایش عامری هاتە لای پێغەمبەر ، کە خێزانی ئەبی حوزیفە بوو ،گوتی: ئەی نێرراوی خوا ، ئێمە دەبینین (سالم) کوڕە ، وە بێگومان ئایەتیش دەربارەی ئەم بابەتە دابەزیوە.

**كورتەیەك لە بەسەرهاتی ( زەیدی كوڕی حاریسە ):**

(أَنَّ مُشْرِكِي قُرَيْشٍ لَمَّا حَصَرُوا بَنِي هَاشِمٍ فِي الشِّعْبِ كَانَ حَكِيمُ بْنُ حِزَامٍ تَأْتِيهِ الْعِيرُ تَحْمِلُ الْحِنْطَةَ مِنَ الشَّامِ فَيُقَبِّلُهَا الشِّعْبَ، ثُمَّ يَضْرِبُ أَعْجَازَهَا فَتَدْخُلُ عَلَيْهِمْ فَيَأْخُذُونَ مَا عَلَيْهَا مِنَ الْحِنْطَةِ، وَلَهُ كَانَ زَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ وَهَبَهُ لِخَدِيجَةَ بِنْتِ خُوَيْلِدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا فَوَهَبَتْهُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَعْتَقَهُ وَتَبَنَّاهُ حَتَّى أَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ) (الأحزاب: ٥) فَانْتَسَبَ زَيْدٌ إِلَى أَبِيهِ حَارِثَةَ وَهُوَ رَجُلٌ مِنْ كَلْبٍ أَصَابَتْهُ سَبْيًا وَفِي هَذَا الشِّعْبِ وُلِدَ عَبْدُ اللهِ بْنُ الْعَبَّاسِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) اخبار مكة للفاكهي

(نَسَبُهُ وَسَبَبُ تَبَنِّي رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَهُ) :

قَالَ ابْنُ هِشَامٍ: زَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ بْنِ شَرَاحِيلَ بْنِ كَعْبِ بْنِ عَبْدِ الْعُزَّى ،وَكَانَ حَكِيمُ بْنُ حِزَامِ بْنِ خُوَيْلِدٍ قَدِمَ مِنْ الشَّامِ بِرَقِيقٍ ، فِيهِمْ زَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ وَصِيفٌ فَدَخَلَتْ عَلَيْهِ عَمَّتُهُ خَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ، وَهِيَ يَوْمئِذٍ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ لَهَا: اخْتَارِي يَا عَمَّةُ أَيَّ هَؤُلَاءِ الْغِلْمَانِ شِئْتِ فَهُوَ لَكَ، فَاخْتَارَتْ زَيْدًا فَأَخَذَتْهُ، فَرَآهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَهَا، فَاسْتَوْهَبَهُ مِنْهَا، فَوَهَبَتْهُ لَهُ، فَأَعْتَقَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَتَبَنَّاهُ، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يُوحَى إِلَيْهِ.

(شِعْرُ حَارِثَةَ حِينَ فَقَدْ ابْنَهُ زَيْدًا، وَقُدُومُهُ عَلَى الرَّسُولِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْأَلُهُ رَدَّهُ عَلَيْهِ) :

وَكَانَ أَبُوهُ حَارِثَةُ قَدْ جَزِعَ عَلَيْهِ جَزَعًا شَدِيدًا، وَبَكَى عَلَيْهِ حِينَ فَقَدَهُ، فَقَالَ:

بَكَيْتُ عَلَى زَيْدٍ وَلَمْ أَدْرِ مَا فَعَلْ ... أَحَيٌّ فَيُرْجَى أَمْ أَتَى دونه الْأَجَل

ثُمَّ قَدِمَ عَلَيْهِ وَهُوَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إنْ شِئْتَ فَأَقِمْ عِنْدِي، وَإِنْ شِئْتَ فَانْطَلِقْ مَعَ أَبِيكَ، فَقَالَ: بَلْ أُقِيمُ عِنْدَكَ. فَلَمْ يَزَلْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى بَعَثَهُ اللَّهُ فَصَدَّقَهُ وَأَسْلَمَ، وَصَلَّى مَعَهُ، فَلَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (ادْعُوهُمْ لِآبائِهِمْ ) قَالَ: أَنَا زَيْدُ ابْن حَارِثَةَ.

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٢٣-٢٤ ) سورەتی الاحزاب

(مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِۖ فَمِنۡهُم مَّن قَضَىٰ نَحۡبَهُۥ وَمِنۡهُم مَّن يَنتَظِرُۖ وَمَا بَدَّلُواْ تَبۡدِيلٗا ٢٣ لِّيَجۡزِيَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدۡقِهِمۡ وَيُعَذِّبَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوۡ يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ٢٤ ) الاحزاب

واتە : لەناو باوەڕداران دا پیاوانێك هەن ڕاستیان کرد لە ئەو پەیمانەی کە دابویان بەخوا ئینجا هەندێکیان نەزر و بەڵێنی خۆی بەجێ هێنا (شەهید بوو) هەندێکیشیان چاوەڕوانن هیچ گوڕانێکیان (لە بەڵێنی خۆیان دا) نەکردووە(٢٣) بۆ ئەوەی (خوا) پاداشتی ڕاست گۆیان بداتەوە بەهۆی ڕاستی یەکانەوە وە سزای دوو ڕووەکان بدات ئەگەر بیەوێ یا تەوبەیان لێ وەرگرێ بێگومان خوا لێبوردەی میهرەبانە.(٢٤).(پوختەی تەفسیر)

## ئەم ئایەتە دەربارەی ( ئەنەسی کوڕی نەزر ) دابەزیوە کە دەکاتە مامی ئەنەسی کوڕی مالیك:

-(ئەنەس) دەڵێ:مامم لەبەر ئەوە کەلە(بەدر)دا ئامادە نەببوو،خۆی زۆر بەزیانمەند دادەناو، بڕیاریدا بەخواکە لە جەنگی ئایندەدا جێدەستی دیار بێت بۆ ئیسلام و، قارەمانیەتی خۆی بنوێنێ، جا کە جەنگی خەندەق پێش هات، بێ دووو سێ چوویە جەنگەکەوەو، قارەمانانە جیهادی خۆیکردو،پاشان شەهیدبوو، ئەنەس دەڵێ: کە تەماشامانمان کرد، دەبینین(٨٣) برینی پێوەیەو وای لێکرابوو، پوورم گوتی: بە نیشانەی سەر پەنجەکانیا ناسیمەوە، ئەوجا ئەم ئایەتەی :( مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِ..) بۆ قەدردانی ئەوکارەی مامم هاتە خوارێ.

چەند دەقێك لەم بارەوە:

١-( عَنْ ثَابِتٍ، قَالَ: قَالَ أَنَسٌ: (عَمِّيَ الَّذِي سُمِّيتُ بِهِ لَمْ يَشْهَدْ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَدْرًا)، قَالَ: فَشَقَّ عَلَيْهِ، قَالَ: أَوَّلُ مَشْهَدٍ شَهِدَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

غُيِّبْتُ عَنْهُ، وَإِنْ أَرَانِيَ اللهُ مَشْهَدًا فِيمَا بَعْدُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيَرَانِي اللهُ مَا أَصْنَعُ، قَالَ: (فَهَابَ أَنْ يَقُولَ غَيْرَهَا)، قَالَ: (فَشَهِدَ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ أُحُدٍ)، قَالَ: فَاسْتَقْبَلَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ، فَقَالَ لَهُ أَنَسٌ: يَا أَبَا عَمْرٍو، أَيْنَ؟ فَقَالَ: وَاهًا لِرِيحِ الْجَنَّةِ أَجِدُهُ دُونَ أُحُدٍ، قَالَ: (فَقَاتَلَهُمْ حَتَّى قُتِلَ)، قَالَ: (فَوُجِدَ فِي جَسَدِهِ بِضْعٌ وَثَمَانُونَ مِنْ بَيْنِ ضَرْبَةٍ وَطَعْنَةٍ وَرَمْيَةٍ)، قَالَ: فَقَالَتْ أُخْتُهُ – عَمَّتِيَ الرُّبَيِّعُ بِنْتُ النَّضْرِ – فَمَا عَرَفْتُ أَخِي إِلَّا بِبَنَانِهِ، وَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: (رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا) (الأحزاب: ٢٣)، قَالَ: (فَكَانُوا يُرَوْنَ أَنَّهَا نَزَلَتْ فِيهِ وَفِي أَصْحَابِهِ) رواه مسلم

واتە: ئەنەس دەڵێ: مامم بەشداری شەڕی بەدری نەکردبوو ، لەسەر دڵی گران بوو، گوتی : یەکەم جەنگ لەگەڵ پێغەمبەر نەبوویمە، ئەگەر خوا شتێکی دیکە بێنێتە پێشەوە، خوا دەمبینێ چی دەکەم ؟ جا ئامادەبوو لەگەڵ پێغەمبەردا لەشەری (ئوحد) دەڵێ:گەیشتە سەعدی کوڕی موعاز ، ئەنەس پێ گوت : ئەی باوکی (عەمر) بۆ کوێ؟ گوتی : بەرەو بۆنی بەهەشت ، واهەستی پێ دەکەم لە خوار کێوی (ئوحد) دەڵێ: جەنگا تاکو کوژرا، دەڵێ ( لەلاشەی بینرا هەشتاو ئەوەندە برینەی پێوە بوو ، هی رم و تیرو شمشێر بوون) خوشکی دەڵێ: (مامۆژنم کە ناوی (روبیعی کچی نەزرە) براکەم نەناسیەوە ، مەگەر بەسەرە پەنجەکانی نەبێت ، جا ئەو ئایەتەی دابەزی (رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا) دەڵێ: وادەبینرا ئەم ئایەتە دەربارەی ئەو هاوەڵانی ئەو دابەزیوە.

وفي رواية–( عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: قَالَ عَمِّي أَنَسُ بْنُ النَّضْرِ، سُمِّيتُ بِهِ، لَمْ يَشْهَدْ بَدْرًا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَبُرَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: أَوَّلُ مَشْهَدٍ قَدْ شَهِدَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غِبْتُ عَنْهُ، أَمَا وَاللَّهِ لَئِنْ أَرَانِي اللَّهُ مَشْهَدًا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيَرَيَنَّ اللَّهُ مَا أَصْنَعُ ، قَالَ: فَهَابَ أَنْ يَقُولَ غَيْرَهَا، فَشَهِدَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ أُحُدٍ مِنَ العَامِ القَابِلِ فَاسْتَقْبَلَهُ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ، فَقَالَ: يَا أَبَا عَمْرٍو أَيْنَ؟ قَالَ: وَاهًا لِرِيحِ الجَنَّةِ

أَجِدُهَا دُونَ أُحُدٍ، فَقَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ، فَوُجِدَ فِي جَسَدِهِ بِضْعٌ وَثَمَانُونَ مِنْ بَيْنِ ضَرْبَةٍ وَطَعْنَةٍ وَرَمْيَةٍ، فَقَالَتْ عَمَّتِي الرُّبَيِّعُ بِنْتُ النَّضْرِ: فَمَا عَرَفْتُ أَخِي إِلَّا بِبَنَانِهِ ، وَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ (رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا) (الأحزاب: ٢٣) رواه الترمذي قال الالباني صحيح

******************

## وتاری ژماره (٨٦) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### ١-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٢٥ ) سورەتی الاحزاب

﴿وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُواْ خَيْرًا ۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ٢٥﴾ الاحزاب

واتە: خوا کافرانی تێکشکاند و گێڕانیەوە دواوە بەخۆیان و کینە و بوغزیانەوە، هیچ جۆرە خەیرێکیان دەست نەکەوت، هەر خوا خۆی ئیماندارانی لەجەنگ پاراست (هەر خۆێشی بە باو باران و لەشکری تایبەتی کافرانی تێکشکان)، جا هەمیشەو بەردەوام خوا بەهێزەو بەدەسەڵاتە(ئاسان)

پێغەمبەر دوعای لێ دەکردن:

-( اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ، سَرِيعَ الْحِسَابِ، اهْزِمِ الْأَحْزَابَ، اللَّهُمَّ اهْزِمْهُمْ وَزَلْزِلْهُمْ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

-( عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ:(لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ، أَعَزَّ جُنْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ، فَلَا شَيْءَ بَعْدَهُ)رواه احمد قال ارنؤوط صحيح

بەڵێ جەنگی ئەحزاب: ساڵی پێنجەمی کۆچی ڕوویدا، هۆکەیشی ئەوەبوو کە جوولەکەکانی (بەنی نەزیر)چوونە مەککەو لەگەڵ قورەیشدا وتوێژیان کردو هەڵیاننان بۆ بەگژا چوونی پەیامبەر صلی الله علیه وسلم وە ئامادەیی و پشتگیری خۆشیانیان بۆ دەربڕین و دەست خەرۆیان کردن کە تا ئاخر دڵۆپی خوێن لەگەڵیانن، پاش ئەوانیش سەردانی هۆزی (غەتەفان)یان کرد بۆ هەمان مەبەست، ئەوانیش لەگەڵ هاوپەیمانەکانیان ، وەك (بەنی ئەسەد)و (بەنی سولەیم) ڕێککەوتن بۆ ئەوەی بەیەك دەست لەموسڵمانەکان بدەن و،ئیتر هەتا هەتایە زیندوو نەبنەوە، پەیامبەری خوایش صلی الله علیه وسلم ئەنجوومەنی ڕاوێژی

ئـەو دەمـەی كـۆكردەوە بـۆ مەشـۆرەت، بـەڵام پـێش ئـەوە لەسـەر پیشـنیازی سـەلمانی فارسـیی خەنـدەقێكی قـووڵ بـەدەوری مەدینـەدا لێـدرا، بۆیـە ئـەو جەنگـەش ناوبـانگی بەجەنگی خەندەق (چاڵ)دەركـرد. بەڕاسـتی ئـەو ڕۆژە بـۆ بـڕواداران ڕۆژێكـی زۆر سـەخت بوو، چونكە لەلایەكـەوە (دوازدە هـەزار) جـەنگاوەر بـە ئەوپـەڕی دەسـەڵاتی جەنگییـەوە هاتبوونە سەریان، موسڵمانەكانیش تەنها (سێ هەزار كەس) بوون لەگەڵ كەمیی ژمارەیـان و خراپی هۆیەكانی جەنگییان، ئیتر دووڕووەكانی ناو شاری مەدینەش بابوەستێ چ هـەراو پرو پاڵاتەیەكیان نایەوە،بەڵام خوای گەورە – وەك لەئایەتی(٢٥)ی ئەم سوورەتەدا ڕای ئەگەیەنی– پۆرتی شكاندن و بەسەرشۆڕی گەڕانەوە، زەمینە سازبوو بۆ پاكسازی مەدینە لەخراپەكاری جوولەكەی(بەنی نەزیر)و، جولەكـەی (بـەنی قـوڕەیزە).چـوونكە لەمەدینـەدا سـێ دەسـتە جوولەكـە هـەبوون: (بـەنی قـوڕەیزە، بـەنی نـەزیر، بـەنی قـەینوقاع) هەرسێكەشیان كاتی خۆی پەیمانیان بە پەیامبەر صلی اللـه علیـه وسلم دابوو: كەلەگـەڵ دوژمنی ئـەودا هاوكـاری و سیخوڕی نەكـەن، بـەڵام (بـەنی قـەینوقاع)لـە سـاڵی دووەمـی كۆچیو، (بەنی نەزیر)لەساڵی چوارەمی كۆچیدا، هەریەكەیان بە بیانوویـەك پـەیمانی خـۆی هەڵوەشاندەوەو دەرەنجام دەستیان كردە ڕووبەڕوو بوونەوە، ئینجا پێغەمبەر صـلی اللـه علیـه وسـلم بـۆ یەكلاكردنـەوەی جەنگەكـە،– بەفـەرمانی خـوا– هاوەڵـانی كـۆكردەوە و فەرمووی: دەبێ هەر ئەمڕۆ پێش نوێژی عەسر بـەرەو (بـەنی قـوڕەیزە)بكەونـە ڕێ و هـەر لەوێش نوێژەكەتان بكەن، ئەم فەرموودەی ( لا يُصَلِّيَنَّ أحد منكم العصرَ إلا في بني قريظـة ) ئەو ماناو مەبەسـتە دەبەخشـێ، ئـەوجا موسـڵمانەكانیش بەپەلـە ئامـادە بـوون و پـێش خۆرئاوا بوون، قەڵا مەحكەمـەكانیان لێگـەمارۆدان، ئـەوجا پـاش(٢٥)ڕۆژ گـەمارۆ هـەموو خۆیان بەدەستەوەداو تەسلیم بوون، دیارە هەر لەو پاكسازییەشدا دەسـتەیەكیان كـوژران و، دەسـتەیەكیان دیـل كـران.(فقطـع دابـر القـوم الـذين ظلمـوا والحمـد لله رب العـالمين ).

(رامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: (حُبِسْنَا يَوْمَ الْخَنْدَقِ حَتَّى كَانَ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ فِي الْقِتَالِ، فَلَمَّا كُفِينَا الْقِتَالَ، وَذَلِكَ قَوْلُ اللَّهِ جَلَّ وَعَلَا (وَكَفَى اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتَالَ وَكَانَ اللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا) (الأحزاب: ٢٥) أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِلَالًا فَأَقَامَ الظُّهْرَ، فَصَلَّى كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا فِي وَقْتِهَا، ثُمَّ أَقَامَ الْعَصْرَ، فَصَلَّاهَا كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا فِي وَقْتِهَا، ثُمَّ أَقَامَ الْمَغْرِبَ، فَصَلَّى كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا فِي وَقْتِهَا) رواه ابن حبان قال الالباني صحيح

واتە: لەعبدالرحمن کوڕی سەعیدی خودریەوە هاتووە ئەویش لە بابی، دەڵێ: لەڕۆژی شەڕی خەندەق گیرمان خواردبوو و سەرقاڵ بووین تاکو مەغریب ، ئەوە پێش ئەوە دابەزین بۆ جەنگ ، کاتێ جەنگ تەواو بوو ، ئەوەیە فەرمایشتی خوا (وَكَفَى اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتَالَ وَكَانَ اللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا) پێغەمبەر فەرمانی کرد بە (بلال) قامەتی بۆ نوێژی نیوەڕۆ کرد ، نوێژی کرد بەشێوازی کاتی خۆی ، ئنجا قامەتی نوێژی عەسر کرا ، ئەویشی کرد بە شێوازی کاتی خۆی ، ئنجا قامەت کرا بۆ نوێژی مەغریب ، ئەویشی کرد بە شێوازی کاتی خۆی.

٢-( عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: شَغَلَنَا الْمُشْرِكُونَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ عَنْ صَلَاةِ الظُّهْرِ حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ فِي الْقِتَالِ مَا نَزَلَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَكَفَى اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتَالَ) (الأحزاب: ٢٥) (فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِلَالًا فَأَقَامَ لِصَلَاةِ الظُّهْرِ فَصَلَّاهَا كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا لِوَقْتِهَا، ثُمَّ أَقَامَ لِلْعَصْرِ فَصَلَّاهَا كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا فِي وَقْتِهَا، ثُمَّ أَذَّنَ لِلْمَغْرِبِ فَصَلَّاهَا كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا فِي وَقْتِهَا) رواه النسائي قال الالباني صحيح

-(عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ، عَنْ أَبِيهِ ، قَالَ: حُبِسْنَا يَوْمَ الْخَنْدَقِ عَنِ الظُّهْرِ ، وَالْعَصْرِ ، وَالْمَغْرِبِ ، وَالْعِشَاءِ ، حَتَّى كُفِينَا ذَلِكَ ، وَذَلِكَ قَوْلُ اللَّهِ: (وَكَفَى اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ

الْقِتَالَ وَكَانَ اللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا) (الأحزاب: ٢٥) فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ " فَأَمَرَ بِلَالًا فَأَقَامَ ثُمَّ صَلَّى الظُّهْرَ كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا قَبْلَ ذَلِكَ ثُمَّ أَقَامَ الْعَصْرَ فَصَلَّاهَا كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا قَبْلَ ذَلِكَ ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الْمَغْرِبَ كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا قَبْلَ ذَلِكَ ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الْعِشَاءَ كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا قَبْلَ ذَلِكَ ، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ (فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا) (البقرة: ٢٣٩) منصف ابن ابي شيبة

## پێغەمبەر تـوكی ( دوعـای ) لیٚ ده كردن :

(عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ: حَبَسُونَا عَنْ صَلَاةِ الْوُسْطَى: صَلَاةِ الْعَصْرِ مَلَأَ اللَّهُ بُيُوتَهُمْ وَقُبُورَهُمْ نَارًا) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واته: له عەلیەوه هاتووه خوا لیٚ رازی بیٚ ، كه پێغەمبەر رۆژی خەندەق فەرمووی : نەمان توانی نوێژی ناوەراست بكەین (نوێژی عەسر) لەبەر سەرقالی بەكاری جەنگ، خـوا مـالٚ و گۆریان پڕ بكات له ئاگر .

## گرنگی نوێژی عەصر:

١-(حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ٢٣٨) البقره

واته: ئاگاداری نوێژەكانتان بكەن وه(بەتایبەتی) نوێژی ناوەڕاست(كه نوێژی عەسره) وه له نوێژدا بوەستن بۆ خوا بەگەردن كەچی واته بیٚ قسەكردن.

٢-(عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ :مَنْ تَرَكَ صَلَاةَ الْعَصْرِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ) رَوَاهُ الْبُخَارِيّ

واته: هەركەسیٚ نوێژی عەسر وازلیٚ بێنیٚ كردەوەكانی پوچەلٚ دەبنەوه .

*****************

# وتاری ژماره (٨٧) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٨-٢٩) سورەتی الاحزاب

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ٢٨ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ٢٩) الاحزاب

واته : ژنەکانی پێغەمبەر، خواو پێغەمبەریان هەڵبژارد: دوای تێکشکانی گرووپەکان و دەستکەوتی جەنگی (بەنی قورەیزه)، ژنەکانی پەیامبەر صلی الله علیه وسلم پێیان وابوو کەهەقە ژیان و ژیواری ئەمانیش خۆش ببێ.. بۆیە داوایان لە پەیامبەر کرد کە بەڵکو کەمە کەمە ژیانیان خۆشترکا، بۆیە وتیان: ئەوەتە ژنان و کچانی(کیسرا)و(قەیسەر)بەو شێوەیە ڕائەبوێرن کە رادەبوێرن!، ئێمەش ئا لەم ژیانە تاڵ و تفتەدا دەژین هەقە تۆش وەك ئەوانەمان لەگەڵ بکەیت! ئەوسا خوایش بۆ راستکردنەوەی ئەو بۆچوونە یان، ئەم ئایەتەی ناردو فەرمووی: ئەی پەیامبەر! صلی الله علیه وسلم بەژنەکانت بڵێ: ئەر ئێوە ژین و جوانی ئەم دنیایەتان دەوێ دەسا وەرنە پێش، با مارەیی و هەندێ شتومەکتان بدەمێ و بەخوا پەسەندانەو جوانی دەستتان لێبەربدەم و بەرێتانکەم، واتە: بێ هیچ ڕەنجە دڵ و گازندەودەردی سەرییەك (٢٨) وە ئەگەر خواو پەیامبەرەکەی و، پاداشی دوارۆژتان دەوێ و، ڕازی دەبن بەو ژیانەی ئێستاتان ئەوە بەڕاستی خوا بۆ چاکەکارانتان -ئەوانەتان ڕازی ئەبن بەم ژیانە- پاداشتێکی گەورەی ئامادە کردووه.(٢٩) (ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ لَمْ أَزَلْ حَرِيصًا عَلَى أَنْ أَسْأَلَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ عَنْ الْمَرْأَتَيْنِ مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اللَّتَيْنِ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى (إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا) حَتَّى حَجَّ وَحَجَجْتُ مَعَهُ وَعَدَلَ وَعَدَلْتُ مَعَهُ بِإِدَاوَةٍ فَتَبَرَّزَ ثُمَّ جَاءَ فَسَكَبْتُ عَلَى يَدَيْهِ مِنْهَا فَتَوَضَّأَ فَقُلْتُ لَهُ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ مَنْ الْمَرْأَتَانِ مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اللَّتَانِ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا قَالَ وَاعَجَبًا لَكَ يَا ابْنَ عَبَّاسٍ هُمَا عَائِشَةُ وَحَفْصَةُ ثُمَّ اسْتَقْبَلَ عُمَرُ الْحَدِيثَ يَسُوقُهُ قَالَ كُنْتُ أَنَا وَجَارٌ لِي مِنْ الْأَنْصَارِ فِي بَنِي أُمَيَّةَ بْنِ زَيْدٍ وَهُمْ مِنْ عَوَالِي الْمَدِينَةِ وَكُنَّا نَتَنَاوَبُ النُّزُولَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَنْزِلُ يَوْمًا وَأَنْزِلُ يَوْمًا فَإِذَا نَزَلْتُ جِئْتُهُ بِمَا حَدَثَ مِنْ خَبَرِ ذَلِكَ الْيَوْمِ مِنْ الْوَحْيِ أَوْ غَيْرِهِ وَإِذَا نَزَلَ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ وَكُنَّا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ نَغْلِبُ النِّسَاءَ فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى الْأَنْصَارِ إِذَا قَوْمٌ تَغْلِبُهُمْ نِسَاؤُهُمْ فَطَفِقَ نِسَاؤُنَا يَأْخُذْنَ مِنْ أَدَبِ نِسَاءِ الْأَنْصَارِ فَصَخِبْتُ عَلَى امْرَأَتِي فَرَاجَعَتْنِي فَأَنْكَرْتُ أَنْ تُرَاجِعَنِي قَالَتْ وَلِمَ تُنْكِرُ أَنْ أُرَاجِعَكَ فَوَاللَّهِ إِنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيُرَاجِعْنَهُ وَإِنَّ إِحْدَاهُنَّ لَتَهْجُرُهُ الْيَوْمَ حَتَّى اللَّيْلِ فَأَفْزَعَنِي ذَلِكَ وَقُلْتُ لَهَا قَدْ خَابَ مَنْ فَعَلَ ذَلِكِ مِنْهُنَّ ثُمَّ جَمَعْتُ عَلَيَّ ثِيَابِي فَنَزَلْتُ فَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ فَقُلْتُ لَهَا أَيْ حَفْصَةُ أَتُغَاضِبُ إِحْدَاكُنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْيَوْمَ حَتَّى اللَّيْلِ قَالَتْ نَعَمْ فَقُلْتُ قَدْ خِبْتِ وَخَسِرْتِ أَفَتَأْمَنِينَ أَنْ يَغْضَبَ اللَّهُ لِغَضَبِ رَسُولِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَتَهْلِكِي لَا تَسْتَكْثِرِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَا تُرَاجِعِيهِ فِي شَيْءٍ وَلَا تَهْجُرِيهِ وَسَلِينِي مَا بَدَا لَكِ وَلَا يَغُرَّنَّكِ أَنْ كَانَتْ جَارَتُكِ أَوْضَأَ مِنْكِ وَأَحَبَّ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُرِيدُ عَائِشَةَ قَالَ عُمَرُ وَكُنَّا قَدْ تَحَدَّثْنَا أَنَّ غَسَّانَ تُنْعِلُ الْخَيْلَ لِغَزْوِنَا فَنَزَلَ صَاحِبِي الْأَنْصَارِيُّ يَوْمَ نَوْبَتِهِ فَرَجَعَ إِلَيْنَا عِشَاءً فَضَرَبَ بَابِي ضَرْبًا شَدِيدًا وَقَالَ أَثَمَّ هُوَ فَفَزِعْتُ فَخَرَجْتُ إِلَيْهِ فَقَالَ قَدْ حَدَثَ الْيَوْمَ أَمْرٌ عَظِيمٌ قُلْتُ مَا هُوَ أَجَاءَ غَسَّانُ قَالَ لَا بَلْ أَعْظَمُ مِنْ ذَلِكَ وَأَهْوَلُ طَلَّقَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نِسَاءَهُ وَقَالَ عُبَيْدُ بْنُ حُنَيْنٍ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ عُمَرَ فَقَالَ اعْتَزَلَ النَّبِيُّ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَزْوَاجَهُ فَقُلْتُ خَابَتْ حَفْصَةُ وَخَسِرَتْ قَدْ كُنْتُ أَظُنُّ هَذَا يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ فَجَمَعْتُ عَلَيَّ ثِيَابِي فَصَلَّيْتُ صَلَاةَ الْفَجْرِ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدَخَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَشْرُبَةً لَهُ فَاعْتَزَلَ فِيهَا وَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ فَإِذَا هِيَ تَبْكِي فَقُلْتُ مَا يُبْكِيكِ أَلَمْ أَكُنْ حَذَّرْتُكِ هَذَا أَطَلَّقَكُنَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ لَا أَدْرِي هَا هُوَ ذَا مُعْتَزِلٌ فِي الْمَشْرُبَةِ فَخَرَجْتُ فَجِئْتُ إِلَى الْمِنْبَرِ فَإِذَا حَوْلَهُ رَهْطٌ يَبْكِي بَعْضُهُمْ فَجَلَسْتُ مَعَهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَجِدُ فَجِئْتُ الْمَشْرُبَةَ الَّتِي فِيهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ لِغُلَامٍ لَهُ أَسْوَدَ اسْتَأْذِنْ لِعُمَرَ فَدَخَلَ الْغُلَامُ فَكَلَّمَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ كَلَّمْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَذَكَرْتُكَ لَهُ فَصَمَتَ فَانْصَرَفْتُ حَتَّى جَلَسْتُ مَعَ الرَّهْطِ الَّذِينَ عِنْدَ الْمِنْبَرِ ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَجِدُ فَجِئْتُ فَقُلْتُ لِلْغُلَامِ اسْتَأْذِنْ لِعُمَرَ فَدَخَلَ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ قَدْ ذَكَرْتُكَ لَهُ فَصَمَتَ فَرَجَعْتُ فَجَلَسْتُ مَعَ الرَّهْطِ الَّذِينَ عِنْدَ الْمِنْبَرِ ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَجِدُ فَجِئْتُ الْغُلَامَ فَقُلْتُ اسْتَأْذِنْ لِعُمَرَ فَدَخَلَ ثُمَّ رَجَعَ إِلَيَّ فَقَالَ قَدْ ذَكَرْتُكَ لَهُ فَصَمَتَ فَلَمَّا وَلَّيْتُ مُنْصَرِفًا قَالَ إِذَا الْغُلَامُ يَدْعُونِي فَقَالَ قَدْ أَذِنَ لَكَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإِذَا هُوَ مُضْطَجِعٌ عَلَى رِمَالِ حَصِيرٍ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ فِرَاشٌ قَدْ أَثَّرَ الرِّمَالُ بِجَنْبِهِ مُتَّكِئًا عَلَى وِسَادَةٍ مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ ثُمَّ قُلْتُ وَأَنَا قَائِمٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَطَلَّقْتَ نِسَاءَكَ فَرَفَعَ إِلَيَّ بَصَرَهُ فَقَالَ لَا فَقُلْتُ اللَّهُ أَكْبَرُ ثُمَّ قُلْتُ وَأَنَا قَائِمٌ أَسْتَأْنِسُ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ رَأَيْتَنِي وَكُنَّا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ نَغْلِبُ النِّسَاءَ فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ إِذَا قَوْمٌ تَغْلِبُهُمْ نِسَاؤُهُمْ فَتَبَسَّمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ رَأَيْتَنِي وَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ فَقُلْتُ لَهَا لَا يَغُرَّنَّكِ أَنْ كَانَتْ جَارَتُكِ أَوْضَأَ مِنْكِ وَأَحَبَّ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُرِيدُ عَائِشَةَ فَتَبَسَّمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَبَسُّمَةً أُخْرَى فَجَلَسْتُ حِينَ رَأَيْتُهُ تَبَسَّمَ فَرَفَعْتُ بَصَرِي فِي بَيْتِهِ فَوَاللَّهِ مَا رَأَيْتُ فِي بَيْتِهِ شَيْئًا يَرُدُّ الْبَصَرَ غَيْرَ أَهَبَةٍ ثَلَاثَةٍ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ادْعُ اللَّهَ فَلْيُوَسِّعْ عَلَى أُمَّتِكَ فَإِنَّ فَارِسَ وَالرُّومَ قَدْ وُسِّعَ عَلَيْهِمْ وَأُعْطُوا الدُّنْيَا وَهُمْ لَا يَعْبُدُونَ اللَّهَ فَجَلَسَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَكَانَ مُتَّكِئًا فَقَالَ أَوَفِي هَذَا أَنْتَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ إِنَّ أُولَئِكَ قَوْمٌ عُجِّلُوا طَيِّبَاتِهِمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ اسْتَغْفِرْ لِي فَاعْتَزَلَ النَّبِيُّ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نِسَاءَهُ مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ الْحَدِيثِ حِينَ أَفْشَتْهُ حَفْصَةُ إِلَى عَائِشَةَ تِسْعًا وَعِشْرِينَ لَيْلَةً وَكَانَ قَالَ مَا أَنَا بِدَاخِلٍ عَلَيْهِنَّ شَهْرًا مِنْ شِدَّةِ مَوْجِدَتِهِ عَلَيْهِنَّ حِينَ عَاتَبَهُ اللَّهُ فَلَمَّا مَضَتْ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ لَيْلَةً دَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ فَبَدَأَ بِهَا فَقَالَتْ لَهُ عَائِشَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ كُنْتَ قَدْ أَقْسَمْتَ أَنْ لَا تَدْخُلَ عَلَيْنَا شَهْرًا وَإِنَّمَا أَصْبَحْتَ مِنْ تِسْعٍ وَعِشْرِينَ لَيْلَةً أَعُدُّهَا عَدًّا فَقَالَ الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ لَيْلَةً فَكَانَ ذَلِكَ الشَّهْرُ تِسْعًا وَعِشْرِينَ لَيْلَةً قَالَتْ عَائِشَةُ ثُمَّ أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (آيَةَ التَّخَيُّرِ ) فَبَدَأَ بِي أَوَّلَ امْرَأَةٍ مِنْ نِسَائِهِ فَاخْتَرْتُهُ ثُمَّ خَيَّرَ نِسَاءَهُ كُلَّهُنَّ فَقُلْنَ مِثْلَ مَا قَالَتْ عَائِشَةُ ) رواه البخاري

واتە: لە عبداللە کوڕی عەباسەوە هاتووە خوا لە خۆی وبابی رازی بێ دەڵێ: سوور بووم لەسەر ئەوەی پرسیار بکەم لە (عومەری کوڕی خەتاب) ئەو دوو ئافرەتە کێن کە خوا دەربارەیان دەفەرمووێ (إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا) تاکو چووە حەج ومنیش چوومە حەج لەگەڵی ، لای دا منیش لامدا ، دەرکەوتەوە ، دوای هات ئاوم بەدەستی داکرد بۆ دەست نوێژ ، گوتم: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەو دوو ئافرەتە کێن؟ کە خوا دەربارەیان فەرموویەتی (إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا) گوتی: ئەی ئیبنو عەباس بۆ سەیرە، ئەو دوو ئافرەتە (عائیشە وحەفصەن) دوای (عومەر) قسەکەی گێرایەوە ، گوتی :

مـن و جیرانێکی ئەنصار لە بەنی ئومەیەی کوڕی زەید ، بەنۆبەت دەچووینە لای پێغەمبەر ، ئەگەر من چوبامە هەواڵم بەو دەدا لە وەحی شتی دیکە، ئەگەر ئەو چووبایە ئەو هەواڵی بە من دەدا، ئێمەی قوریش زاڵ بووین بەسەر ئافرەتەکانماندا، کاتێ چووینە مەدینە خەڵکیك هەبوون ئافرەت بەسەر ئەواندا زاڵ بوو، ئافرەتانی ئێمە لەئافرەتی ئەنصار رەفتاریان وەردەگرت، رۆژێك لەسەر خێزانی خۆم هاوارم کرد، گەرایەوە لام ، منیش قەبوڵم نەکردەوە.

ئەویش گوتی : بۆ رازی نابی بگەرێمەوە لات ، سوێند بەخوا خێزانەکانی پێغەمبەر دەگەرێنەوە لای ، هەیانە پشت دەپێغەمبەر دەکات تاکو شەو، ئەو شتە رایچڵەکاندم ، پێم گوتم ، خەسارەت مەندە کامیان وادەکات، دوای جلەکانم پێچایەوە ، چوومە لای

(حەفحە) گوتم : ئەی (حەفصە) یەکێکتان هەیە پێغەمبەری خوا توڕەبکات تاکو ئێوارە، گوتی: بەڵێ، گوتم : دۆراو زیانمەندی ئایا دڵنیای لەوەی خوا لێت توڕە نابێ ، لەبەر توڕە کردنی پێغەمبەر بەهیلاك بچی، لەسەر پێغەمبەر قورس مەکە، داوای شتی لێ مەکە، پشتی تێ مەکە ، شتێك هەبوو لەم داوا بکە، ئەگەر جیرانت لە تۆ جوانتر بوو یان خۆشەویستر بوو لای پێغەمبەر غیرە نەتگرێ ، مەبەستی (عائیشە) بوو.

هاوەڕێ ئەنصاریەکەم چووە لای پێغەمبەر لەنۆبەی خۆی ، عیشاو گەرایەوە بەتوندی لە دەرگای ئێمەی دا ، و گوتی : هەڵمکرد ،منیش ترسام وچوومە دەر بۆ لای گوتی: ئیمرۆ شتێکی گەورە رویداوە، گوتم چییە؟ ئایا (غسان (پاشایەك بوو نەنیاز بوو بەسەرماندا بدا) هاتووە، گوتی :نەخێر لەوە گەورەترە، وناخۆشترە، پێغەمبەر خێزانەکانی خۆی تەلاق داوە، وە (عوبیدی کوڕی حونەین) دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عەباس بوو دەیگوت: عومەر گوتی : پێغەمبەر ماوەیەك خۆی دوورخستەوە لە خێزانەکانی ، ئەڵێ گوتم : حەفصە دۆراو زەرەرمەند بوو، خۆم پێچایەوە چوومە مزگەوت نوێژی بەیانیم لەگەڵ پێغەمبەردا کرد، و چووە (ئەو شوێنەی ) خۆی و خۆی کەناردا، منیش چوومە لای (حەفصە) دەگریا، گوتم بۆچی دەگری ، ئایا ئاگادارم نەکردوە لەوە، ئایا پێغەمبەر ئێوەی تەلاق داوە؟ گوتی : نازانم ، ئەوە پێغەمبەرە کەناری گرتووە لە (مَشْرُبَةً ) هاتمەدەر بۆ مینبەر هەندێك خەڵکم بینی دەگرین، تۆزێك لەگەڵیان دانیشتم ، دوای حەزم کرد بچمە (ژووری ) لای پێغەمبەر. گوتمە خزمتکارەکەی مۆڵەت بۆ (عومەر) وەربگرە.

چووە ژوورەوە هاتەوە گوتی باسی تۆم کرد ، بێ دەنگ بوو، گەرامەوە تاکو دانیشتمەوە لەگەڵ ئەوانەی لای مینبەر بوون، دووبارە داوای مۆڵەتم کردوە، هەمان قسەی کردوە، چووم لەگەڵ ئەوانەی لای مینبەر دانیشتمەوە ، سێبارە داوام کردوە، چوو هەمان شتی گوتەوە، ئەرێ کە رۆیشتم خزمتکارەکەی بانگی کردم گوتی : مۆڵەتی دای پێغەمبەر ، چوومە ژوورەوە، پاڵی دابویەوە لەسەر حەسیر، هیچ رایەخێکی لەسەر نەبوو، شوێنەواری حەسیری پێوە دیار بوو، سڵاوم لێ کرد، بە پێوە راوەستام و گوتم : ئەی نێرراوی خوا

خێزانەکانت تەلاقداوە، چاوەکانی بۆم بەرزکردوە، فەرمووی : نەخێر ، گوتم (الله اكبر) دوای گوتم : ئەی نێرراوی خوا ئەگەر دەبینیم ئێمەی کۆمەڵی قوریش زاڵ بووین بەسەر ئافرەتاندا، کاتێ هاتینە مەدینە خەڵکی ئەوێ ئافرەت بەسەریاندا زاڵ بووە. پێغەمبەر پێکەنی.

دوای گوتم : ئەی نێرراوی خوا ئەگەر دەتبینیم چوومە لای (حەفصە) پێم گوت: تەنگاو مەبە ئەگەر جیرانەکەت لە تۆ جوانتر بوو یان لای پێغەمبەر خۆشەویستر بوو، مەبەستی عائیشە بوو، پێغەمبەر ئەوجارەش پێکەنی، دانیشتم کاتێ بینیم بێکەنی ، چاوم بەرزکردەوە بۆ ماڵەکەی ، سوێند بەخوا هیچم نەبینی جگە لە(لە سێ پیستە) گوتم ئەی نێرراوی خوا بۆچی داوا لە خوا ناکەی ئومەتەکەت دەوڵەمەند بێ، چونکە فارس و رۆم دەوڵەمەندن، دونیایان پێ دراوە، خواش ناپەرستن، پێغەمبەر پاڵیدابویەوە دانیشت وفەرمووی : ئەی کوری خەتاب ئەوانە قەومێکن خۆشیەکانی دونیان بۆ هاتۆتە پێش ، گوتم : ئەی نێرراوی خوا داوای لێبوردنم بۆ لە خوا بکە، لەبەر ئەوەیە پێغەمبەر دووری گرتووە لە خێزانەکانی ، کاتێ (حەفحە شتەکەی بۆ عائیشە گێرایەوە) بیست و نۆ شەوبوو ، فەرمووی : من یەك مانگە نەچوومە لایان ، کاتێ بیست و نۆ شەو تێپەری چووە لای عائیشە لەرا دەستی بەنۆبە کرد، عائیشە گوتی: ئەی نێرراوی خوا تۆ سوێندت خوارد یەك مانگ نەهێیتە لامان ، ئێستا بیست ونۆ شەو ژماردوومە، فەرمووی : ئەم مانگە بیست و نۆ شەوە، عائیشە: ئنجا خوا ئایەتی (ئیختیاری) دابەزاند (واتە: بژاردەی دەست ئافرەتان پێغەمبەریان دەوێ یان تەلاق) دەڵێ : لەمنەوە دەستی پێ کرد ، من پێغەمبەرم هەڵبژارد، دوای هەموو خێزانەکانی سەرپشك کرد ، هەمان قسەیان کرد ، کە عائیشە کردی.

## عومەر پێغەمبەر ئەخاتە پێكەنین:

(عَن جَابر قَالَ: دخل أَبُو بكر رَضِي الله عَنهُ يَسْتَأْذِنُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَجَدَ النَّاسَ جُلُوسًا بِبَابِهِ لَمْ يُؤْذَنْ لِأَحَدٍ مِنْهُمْ قَالَ: فَأُذِنَ لِأَبِي بَكْرٍ فَدَخَلَ ثُمَّ أَقْبَلَ عُمَرُ فَاسْتَأْذَنَ فَأُذِنَ لَهُ فَوَجَدَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسًا حَوْلَهُ نِسَائِهِ وَاجِمًا سَاكِتًا قَالَ فَقُلْتُ: لَأَقُولَنَّ شَيْئًا أُضْحِكُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ رَأَيْتَ بِنْتَ خَارِجَةَ سَأَلَتْنِي النَّفَقَةَ فَقُمْتُ إِلَيْهَا فَوَجَأْتُ عُنُقَهَا فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَالَ: (هُنَّ حَوْلِي كَمَا تَرَى يَسْأَلْنَنِي النَّفَقَةَ) . فَقَامَ أَبُو بكر إِلَى عَائِشَةَ يَجَأُ عُنُقَهَا وَقَامَ عُمَرُ إِلَى حَفْصَةَ يَجَأُ عُنُقَهَا كِلَاهُمَا يَقُولُ: تَسْأَلِينَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا لَيْسَ عِنْدَهُ؟ فَقُلْنَ: وَاللَّهِ لَا نَسْأَلُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْئًا أبدا لَيْسَ عِنْدَهُ ثُمَّ اعْتَزَلَهُنَّ شَهْرًا أَوْ تِسْعًا وَعِشْرِين ثمَّ نزلت هَذِه الْآيَة: (يَا أَيهَا النَّبِي قل لِأَزْوَاجِك)حَتَّى بلغ (للمحسنات مِنْكُن أجرا عَظِيما) قَالَ: فَبَدَأَ بعائشة فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَعْرِضَ عَلَيْكِ أَمْرًا أُحِبُّ أَنْ لَا تَعْجَلِي فِيهِ حَتَّى تَسْتَشِيرِي أَبَوَيْكِ) . قَالَتْ: وَمَا هُوَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَتَلَا عَلَيْهَا الْآيَةَ قَالَتْ: أَفِيكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَسْتَشِيرُ أَبَوَيَّ؟ بَلْ أَخْتَارُ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ وَأَسْأَلُكَ أَنْ لَا تُخْبِرَ امْرَأَةً مِنْ نِسَائِكَ بِالَّذِي قُلْتُ: قَالَ: (لَا تَسْأَلُنِي امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ إِلَّا أَخْبَرْتُهَا إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَبْعَثْنِي مُعَنِّتًا وَلَا مُتَعَنِّتًا وَلَكِنْ بَعَثَنِي مُعَلِّمًا مُيَسِّرًا) . رَوَاهُ مُسلم

معاني الكمات( (واجما) قال أهل اللغة هو الذي اشتد حزنه حتى أمسك عن الكلام (فوجأت عنقها) أي طعنت والعنق الرقبة وهو مذكر والحجاز تؤنث والنون مضمومة للاتباع في لغة الحجاز وساكنة في لغة تميم قاله في المصباح (معنتا ولا متعنتا) أي مشددا على الناس وملزما إياهم ما يصعب عليهم ولا متعنتا أي طالبا زلتهم وأصل العنت المشقة)

واتە: لە جابیرەوە هاتووە دەڵێ: ئەبوبەكر هات خوا لێ رازی بێ داوای مۆڵەتی كرد بچێتە ماڵی پێغەمبەر ، بینی خەڵكی لەبەر دەرگا وەستاون مۆڵەتیان پێ نادرێ، مۆڵەت درا بە ئەبوبەكر بچێتە ژوورەوە ، دوای (عمر) هات و داوای مۆڵەتی كرد ئەویش مۆڵەتدرا

بچێته ژوورەوە، بینی پێغەمبەر لە ناو ژنەکانی دانیشتوو بە داماوی و بێ دەنگی ، دەڵێ :
(عمر) گوتی: ئێستا قسەیەك دەکەم پێغەمبەر دەخەمە پێکەنین ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا وەی ئەگەر دەتدیت (کچی خارجە) واتە: خێزانی داوای مەسروفاتی زۆری لێ کردم ، بۆی هەڵسام ملم بادا ، پێغەمبەری خوا پێکەنی ، و فەرمووی : (ئەوانەی لە دەورم کۆبوینەوە داوای مەسروفاتی زۆرم لێ دەکەن (داوای خۆشیەکانی دونیا دەکەن) ئەبوبەکر هەڵسا بۆ عائیشە چوو ، عومەریش بۆ حەفصە چوو گوتیان : داوای شتێك لە پێغەمبەر دەکەن کە نیەتی، جا هەردوو خێزانەکانی گوتیان : سوێند بەخوا هەرگیز داوای شتێك لە پێغەمبەر ناکەین کە لای نەبێ، دوای مانگێك یان بیست و نۆ ڕۆژ خۆی لێ دوورخستەوە، ئنجا ئەو ئایەتە دابەزی وفەرمووی(يَا أَيهَا النَّبِي قل لِأَزْوَاجِك) تاکو دەگاتە (للمحسنات مِنْكُن أجرا عَظِيما)

جا لە عائیشەوە دەستی پێ کرد، فەرمووی : ئەی عائیشە دەمەوێ شتێکت بۆ بخەمەروو ، بەلاّم پەلە مەکە تاکو راوێژ بە باوك ودایکت دەکەی ، گوتی : ئەو شتە چییە ئەی نێرراوی خوا؟ پێغەمبەریش ئایەتەکەی بەسەردا خوێندەوە ، گوتی : ئایا دەربارەی تۆ راوێژ بە باب ودایکم بکەم ، نەخێر بەڵکو خوا و پێغەمبەرو ڕۆژی دوای هەڵدەبژێرم ، بەلاّم ئەوەی من گوتم بە هیچ لە خێزانەکانت مەڵێ، فەرمووی : هەر ئافرەتێك لەوان پرسیارم لێ بکات ، مەگەر هەواڵەکەی قسەکانی پێ دەڵێم خوا منی نەناردوە بە بارگرانی بۆ خەڵکی بەڵکو منی ناردوە بە مامۆستاو ئاسانکار.

وفي رواية (ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يُحَدِّثُ أَنَّهُ قَالَ مَكَثْتُ سَنَةً أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ عَنْ آيَةٍ فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَسْأَلَهُ هَيْبَةً لَهُ حَتَّى خَرَجَ حَاجًّا فَخَرَجْتُ مَعَهُ فَلَمَّا رَجَعْنَا وَكُنَّا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ عَدَلَ إِلَى الْأَرَاكِ لِحَاجَةٍ لَهُ قَالَ فَوَقَفْتُ لَهُ حَتَّى فَرَغَ ثُمَّ سِرْتُ مَعَهُ فَقُلْتُ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ مَنْ اللَّتَانِ تَظَاهَرَتَا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ أَزْوَاجِهِ فَقَالَ تِلْكَ حَفْصَةُ وَعَائِشَةُ قَالَ فَقُلْتُ وَاللَّهِ إِنْ كُنْتُ لَأُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكَ عَنْ هَذَا مُنْذُ سَنَةٍ فَمَا أَسْتَطِيعُ هَيْبَةً لَكَ قَالَ فَلَا تَفْعَلْ مَا ظَنَنْتَ أَنَّ عِنْدِي مِنْ عِلْمٍ فَاسْأَلْنِي فَإِنْ كَانَ لِي عِلْمٌ خَبَّرْتُكَ بِهِ قَالَ ثُمَّ

قَالَ عُمَرُ وَاللَّهِ إِنْ كُنَّا فِي الْجَاهِلِيَّةِ مَا نَعُدُّ لِلنِّسَاءِ أَمْرًا حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِنَّ مَا أَنْزَلَ وَقَسَمَ لَهُنَّ مَا قَسَمَ قَالَ فَبَيْنَا أَنَا فِي أَمْرٍ أَتَأَمَّرُهُ إِذْ قَالَتْ امْرَأَتِي لَوْ صَنَعْتَ كَذَا وَكَذَا قَالَ فَقُلْتُ لَهَا مَا لَكَ وَلِمَا هَا هُنَا وَفِيمَ تَكَلُّفُكِ فِي أَمْرٍ أُرِيدُهُ فَقَالَتْ لِي عَجَبًا لَكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ مَا تُرِيدُ أَنْ تُرَاجَعَ أَنْتَ وَإِنَّ ابْنَتَكَ لَتُرَاجِعُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى يَظَلَّ يَوْمَهُ غَضْبَانَ فَقَامَ عُمَرُ فَأَخَذَ رِدَاءَهُ مَكَانَهُ حَتَّى دَخَلَ عَلَى حَفْصَةَ فَقَالَ لَهَا يَا بُنَيَّةُ إِنَّكِ لَتُرَاجِعِينَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى يَظَلَّ يَوْمَهُ غَضْبَانَ فَقَالَتْ حَفْصَةُ وَاللَّهِ إِنَّا لَنُرَاجِعُهُ فَقُلْتُ تَعْلَمِينَ أَنِّي أُحَذِّرُكِ عُقُوبَةَ اللَّهِ وَغَضَبَ رَسُولِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا بُنَيَّةُ لَا يَغُرَّنَّكِ هَذِهِ الَّتِي أَعْجَبَهَا حُسْنُهَا حُبُّ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِيَّاهَا يُرِيدُ عَائِشَةَ قَالَ ثُمَّ خَرَجْتُ حَتَّى دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ لِقَرَابَتِي مِنْهَا فَكَلَّمْتُهَا فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ عَجَبًا لَكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ دَخَلْتَ فِي كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى تَبْتَغِيَ أَنْ تَدْخُلَ بَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَزْوَاجِهِ فَأَخَذَتْنِي وَاللَّهِ أَخْذًا كَسَرَتْنِي عَنْ بَعْضِ مَا كُنْتُ أَجِدُ فَخَرَجْتُ مِنْ عِنْدِهَا وَكَانَ لِي صَاحِبٌ مِنْ الْأَنْصَارِ إِذَا غِبْتُ أَتَانِي بِالْخَبَرِ وَإِذَا غَابَ كُنْتُ أَنَا آتِيهِ بِالْخَبَرِ وَنَحْنُ نَتَخَوَّفُ مَلِكًا مِنْ مُلُوكِ غَسَّانَ ذُكِرَ لَنَا أَنَّهُ يُرِيدُ أَنْ يَسِيرَ إِلَيْنَا فَقَدْ امْتَلَأَتْ صُدُورُنَا مِنْهُ فَإِذَا صَاحِبِي الْأَنْصَارِيُّ يَدُقُّ الْبَابَ فَقَالَ افْتَحْ افْتَحْ فَقُلْتُ جَاءَ الْغَسَّانِيُّ فَقَالَ بَلْ أَشَدُّ مِنْ ذَلِكَ اعْتَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَزْوَاجَهُ فَقُلْتُ رَغَمَ أَنْفُ حَفْصَةَ وَعَائِشَةَ فَأَخَذْتُ ثَوْبِي فَأَخْرُجُ حَتَّى جِئْتُ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مَشْرُبَةٍ لَهُ يَرْقَى عَلَيْهَا بِعَجَلَةٍ وَغُلَامٌ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَسْوَدُ عَلَى رَأْسِ الدَّرَجَةِ فَقُلْتُ لَهُ قُلْ هَذَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فَأَذِنَ لِي قَالَ عُمَرُ فَقَصَصْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذَا الْحَدِيثَ فَلَمَّا بَلَغْتُ حَدِيثَ أُمِّ سَلَمَةَ تَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَإِنَّهُ لَعَلَى حَصِيرٍ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ شَيْءٌ وَتَحْتَ رَأْسِهِ وِسَادَةٌ مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ وَإِنَّ عِنْدَ رِجْلَيْهِ قَرَظًا مَصْبُوبًا وَعِنْدَ رَأْسِهِ أَهَبٌ مُعَلَّقَةٌ فَرَأَيْتُ أَثَرَ الْحَصِيرِ فِي جَنْبِهِ فَبَكَيْتُ فَقَالَ مَا يُبْكِيكَ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ كِسْرَى وَقَيْصَرَ فِيمَا هُمَا فِيهِ وَأَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ فَقَالَ أَمَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ لَهُمْ الدُّنْيَا وَلَنَا الْآخِرَةُ ) رواه البخاري

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی (٣٣) سورەتی الاحزاب

﴿وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰۖ وَأَقِمۡنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ وَيُطَهِّرَكُمۡ تَطۡهِيرٗا ٣٣﴾ الاحزاب

واتە : وە لە ماڵەكانی خۆتاندا بمێننەوە وە زینەت و جوانی خۆتان دەرمەخەن (لەناو خەڵكی نا مەحرەمدا) وەكو خۆ دەرخستنی ئافرەتانی سەردەمی نەفامی یەكەم (پێش ئیسلام) نوێژ بكەن و زەكات بدەن وە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەكەی بكەن بەڕاستی خوا دەیەوێ ئەی ئال و بەیتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) هەر جۆرە پیسی و گوناهێك لە ئێوە دووربخاتەوە و پاك و خاوێنتان بكاتەوە بە تەواوی.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عن أُمِّ سَلَمَةَ تَذْكُرُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ فِي بَيْتِهَا فَأَتَتْهُ فَاطِمَةُ بِبُرْمَةٍ فِيهَا خَزِيرَةٌ فَدَخَلَتْ بِهَا عَلَيْهِ فَقَالَ لَهَا ادْعِي زَوْجَكِ وَابْنَيْكِ قَالَتْ فَجَاءَ عَلِيٌّ وَالْحُسَيْنُ وَالْحَسَنُ فَدَخَلُوا عَلَيْهِ فَجَلَسُوا يَأْكُلُونَ مِنْ تِلْكَ الْخَزِيرَةِ وَهُوَ عَلَى مَنَامَةٍ لَهُ عَلَى دُكَّانٍ تَحْتَهُ كِسَاءٌ لَهُ خَيْبَرِيٌّ قَالَتْ وَأَنَا أُصَلِّي فِي الْحُجْرَةِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ هَذِهِ الْآيَةَ (إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنْكُمْ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا) قَالَتْ فَأَخَذَ فَضْلَ الْكِسَاءِ فَغَشَّاهُمْ بِهِ ثُمَّ أَخْرَجَ يَدَهُ فَأَلْوَى بِهَا إِلَى السَّمَاءِ ثُمَّ قَالَ اللَّهُمَّ هَؤُلَاءِ أَهْلُ بَيْتِي وَخَاصَّتِي فَأَذْهِبْ عَنْهُمْ الرِّجْسَ وَطَهِّرْهُمْ تَطْهِيرًا اللَّهُمَّ هَؤُلَاءِ أَهْلُ بَيْتِي وَخَاصَّتِي فَأَذْهِبْ عَنْهُمْ الرِّجْسَ وَطَهِّرْهُمْ تَطْهِيرًا قَالَتْ فَأَدْخَلْتُ رَأْسِي الْبَيْتَ فَقُلْتُ وَأَنَا مَعَكُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ إِنَّكِ إِلَى خَيْرٍ إِنَّكِ إِلَى خَيْرٍ) رواه احمد برقم(٢٦٥٥١) والطبراني قال الشيخ شعيب الأرناؤوط : إسناده صحيح.

ببرمة: القدر، الخزيرة: لحم يقطع قطعا صغيرا ثم يُطْبَخُ بماءٍ كثرٍ وملحٍ (دكان : مصطبة يقعد عليها) (مصطبة: مكان مرتفع قليل يُجْلَسُ عليه) واتە:لە ئوم سەلەمەوە هاتووە دەڵێ:

پێغەمبەر لەماڵی خۆی بوو، فاتیمە هاتە لای ، مەجەلێکی پێبوو ، چەلاوکۆشتی تێدا بـوو، پێ فەرموو : مێردەکەت ودوو کورەکەت بانگ بکە، دەڵێ (علی و حسن وحسـین) هـاتن ، خواردیان لـەم کۆشـتاوە، پێغەمبـەر لەسـەر سـەکۆیەك دانیشـتبوو، بـەرماڵێکی خـەیبری هـەبوو ، ئـوم سـەلەمە دەڵـێ: مـن لـە ژووری خـۆم دانیشـتبووم خوائـەم ئایەتـەی دابەزاندوفەرمووی: (إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنْكُمْ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا) ئـوم سەلەمە دەڵێ: پێغەمبەر جلەکانی کـۆکردوە بەسـەردادان ، دوای دەسـتی خـۆی دەرهێنـا بـەرەو ئاسمـان ، ئنجـا فـەرمووی : (خودایـە ئەوانـە ئـال وبـەیتی مـنن ، خراپـەیان لـێ دورخەرەوە وە پاکیان بکەوە، خودایە ئەوانە ئال وبەیتی منن ، خراپەیان لێ دورخـەرەوە وە پاکیان بکەوە، ئوم سەلەمە دەڵێ: منیش سەرم دەرهێنا لە ژوورەکـەم گـوتم : منـیش لەگەڵ ئێوەم ئەی نێرراوی خوا ، فەرمووی : تۆ لەسەر خێرو چاکەی ، تـۆ لەسـەر خێـرو چاکەی .

## ئایا خۆڕووت کردنەوە ( التبرج ) چۆن پێدابووە؟

وفي رواية–(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: (وَلا تَبَـرَّجْنَ تَبَـرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الأولَى) قَالَ: كَانَتْ فِيمَا بَيْنَ نُوحٍ وَإِدْرِيسَ، وَكَانَتْ أَلْفَ سَنَةٍ، وَإِنَّ بَطْنَيْنِ مِنْ وَلَدِ آدَمَ كَانَ أَحَدُهُمَا يَسْكُنُ السَّهْلَ، وَالْآخِرُ يَسْكُنُ الْجَبَلَ. وَكَانَ رِجَالُ الْجَبَلِ صِبَاحًا وَفِي النِّسَاءِ دَمَامة. وَكَانَ نِسَاءُ السَّهْلِ صِبَاحًا وَفِي الرِّجَالِ دَمَامَةٌ، وَإِنَّ إِبْلِيسَ أَتَى رَجُلًا مِنْ أَهْلِ السَّهْلِ فِي صُورَةِ غُلَامٍ، فَآجَرَ نَفْسَهُ مِنْهُ، فَكَانَ يَخْدِمُهُ وَاتَّخَذَ إِبْلِيسُ شَيْئًا مِثْلَ الَّذِي يُزَمّر فِيهِ الرِّعاء، فَجَاءَ فِيهِ بِصَوْتٍ لَمْ يسمَع النَّاسُ مِثْلَهُ، فَبَلَغَ ذَلِكَ مَنْ حَوْلَهُ، فَانْتَابُوهُمْ يَسْمَعُونَ إِلَيْهِ، وَاتَّخذُوا عِيدًا يَجْتَمِعُونَ إِلَيْهِ فِي السَّنَةِ، فيتبرَّجُ النِّسَاءُ لِلرِّجَالِ. قَالَ: ويتزيَّن الرِّجَالُ لَهُنَّ، وَإِنَّ رَجُلًا مِنْ أَهْلِ الْجَبَلِ هَجَم عَلَيْهِمْ فِي عِيدِهِمْ ذَلِكَ، فَرَأَى النِّسَاءَ وصَبَاحتهن، فَأَتَى أَصْحَابَهُ فَأَخْبَرَهُمْ بِذَلِكَ،

فَتَحَوَّلُوا إِلَيْهِنَّ، فَنَزَلُوا مَعَهُنَّ وَظَهَرَتِ الْفَاحِشَةُ فِيهِنَّ، فَهُوَ قَوْلُهُ تَعَالَى: (وَلا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الأولَى ) اخرجه ابن ابي حاتم (من الدر المنثور للسيوطي

(دَمامة:اي قبح منظره، صِباح: يوم عيد، (صَباح: اول النهار)

وفي رواية-(عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: جَاءَتْ أُمَيْمَةُ بِنْتُ رُقَيْقَةَ، إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تُبَايِعُهُ عَلَى الْإِسْلَامِ، فَقَالَ: (أُبَايِعُكِ عَلَى أَنْ لَا تُشْرِكِي بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلَا تَسْرِقِي وَلَا تَزْنِي، وَلَا تَقْتُلِي وَلَدَكِ، وَلَا تَأْتِي بِبُهْتَانٍ تَفْتَرِينَهُ بَيْنَ يَدَيْكِ وَرِجْلَيْكِ، وَلَا تَنُوحِي، وَلَا تَبَرَّجِي تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى)رواه احمد قال ارنوؤط صحيح لغيره

## فەزل وگەورەیی ئال وبەیتی پێغەمبەر:

(وَإِنِّي تَارِكٌ فِيكُمُ الثَّقَلَيْنِ ، أَوَّلُهُمَا كِتَابُ اللهِ ، فِيهِ الْهُدَى وَالنُّورُ ، فَاسْتَمْسِكُوا بِكِتَابِ اللهِ ، وَخُذُوا بِهِ فَحَثَّ عَلَى كِتَابِ اللهِ ، وَرَغَّبَ فِيهِ ، ثُمَّ قَالَ: وَأَهْلُ بَيْتِي ، أُذَكِّرُكُمُ اللهَ تَعَالَى فِي أَهْلِ بَيْتِي ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ). أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی: من دوو شتتان بۆ لەپاش خۆم بە جێ دەهێڵم ، یەکەمیان کیتابی خوا ، رێنمایی و روناکی یە، دەست بگرن بە کیتابی خوا، وە ئیشی پێ بکەن، خەڵکی هاندا بۆ کارکردن بە قورئان، دوای فەرمووی : خانەوادی من ، خواتان یاد دەخەمەوە دەربارەی خانەوادەی من .

************************

## وتاری ژماره (٨٨) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### ١-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٣٥ ) سورەتی الاحزاب

﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ٣٥﴾ الاحزاب

واته : بەڕاستی پیاوە موسوڵمانەکان و ئافرەتە موسوڵمانەکان وە پیاوە باوەڕدارەکان و ئافرەتە باوەڕدارەکان و پیاوانی هەمیشە گوێڕایەڵ و ئافرەتانی هەمیشە گوێڕایەڵ و پیاوە ڕاست گۆکان و ئافرەتە ڕاست گۆکان و پیاوان و ئافرەتانی خۆگرو بەئارام وە پیاوانی لەخوا ترس و ژنانی لەخوا ترس و پیاوان و ئافرەتانی بەخشندە و پیاوان و ئافرەتانی ڕۆژووەوان پیاوان و ئافرەتانی داوێن پاك پیاوانێ کە زۆر یادی خوا دەکەن و ئافرەتانێ کە زۆر یادی خوا دەکەن خوا ئامادەی کردووە بۆ هەموویان لێخۆش بوون و پاداشتی گەورە.(پوختەی تەفسیر)

١- (عن أم سلمة رضي الله عنها أَنَّهَا قَالَتْ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ: مَا لِي أَسْمَعُ الرِّجَالَ يُذْكَرُونَ فِي الْقُرْآنِ، وَالنِّسَاءُ لَا يُذْكَرْنَ ؟ فَأَنْزَلَ الله تعالى: (إِنَّ المسلمين والمسلمات والمؤمنين والمؤمنات) (رواه النسائي في سننه عن أم سلمة رضي الله عنها).

واتە: لە ئوم سەلەمەوە هاتووە خوا لێ ڕازی بێ دەڵێ: گوتوتیە پێغەمبەر ، ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی لە قورئان باسی پیاوان دەکات ، بەڵام باسی ئافرەتان ناکات ، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی (إِنَّ المسلمين والمسلمات والمؤمنين والمؤمنات) .

٢-وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ، قَالَ النِّسَاءُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا لَهُ يَذْكُرُ الْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَذْكُرُ المؤمنات؟ فأنزل الله تعالى: (إِنَّ المسلمين والمسلمات) الآية (أخرجه ابن جرير عن ابن عباس رضي الله عنهما) والبيهقي في السنن الكبري

واتە: لەئیبنو عەباسەوە هاتووە خوا لـە خـۆی وبـابی رازی بـیٚ دەڵـیٚ: ئافرەتـان گوتیانـە پێغەمبەر بۆچی قورئان باسی ئیمانداری پیاو دەکـات باسـی ئیمانـداری ئـافرەت ناکـات؟ خواش ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (إِنَّ المسلمين والمسلمات والمؤمنين والمؤمنات).

٢-وفي رواية( عَنْ أُمِّ عُمَارَةَ الأَنْصَارِيَّةِ، أَنَّهَا أَتَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ: مَا أَرَى كُلَّ شَيْءٍ إِلَّا لِلرِّجَالِ وَمَا أَرَى النِّسَاءَ يُذْكَرْنَ بِشَيْءٍ؟ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ (إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ) (الأحزاب: ٣٥)رواه الترمذي قال الالباني صحيح الاسناد و الصحيح المسند من اسباب النزول

## گەورەیی ئافرەت لەم دەقانەی خوارەوە:

عبدالله کوری عومەر جوێن بە کورەکەی دەدات لەسەر ئافرەتان:

( قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ائْذَنُوا لِلنِّسَاءِ إِلَى الْمَسَاجِدِ بِاللَّيْلِ فَقَالَ ابْنٌ لَهُ وَاللَّهِ لَا نَأْذَنُ لَهُنَّ فَيَتَّخِذْنَهُ دَغَلًا وَاللَّهِ لَا نَأْذَنُ لَهُنَّ قَالَ فَسَبَّهُ وَغَضِبَ وَقَالَ أَقُولُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ائْذَنُوا لَهُنَّ وَتَقُولُ لَا نَأْذَنُ لَهُنَّ ) سنن ابي داود قال الالباني صحيح

واتـە: ڕۆژێـك (عبـدالله كـوری عمـر) خـوا لـە خـۆی وبـابی رازی بـیٚ گـوتی: پێغەمبـەر فەرموویەتی: ئافرەتان قەدەغە مەکەن لە هاتنە مزگەوت شەوان، کورێکی (عبدالله) گوتی: سوێند بەخوا رێگایان نادەین چونکە بۆ خراپە بەکاری دێنن، (عبـدالله) ش جـوێنی پێـداو تورەبوو ، گوتی : من دەڵێم پێغەمبەر فەرموویەتی : رێگایـان بـدەن ، تـۆ دەڵـیٚ رێگایـان نادەم.

## ئافرەتـان پارچەیەكن لە پیاوان:

( عن عائشة رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه و سلم قال ( إِنَّمَا النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ)
سنن ابي داود قال الالباني صحيح

واتــە: عائیشــەی دایكــی ئیمانــداران خــوا لــێ رازی بــێ دەڵــێ: پێغەمبــەر فەرموویــەتی : ئافرەتان پارچەیەكن لە پیاوان .

## ئافرەت هاوشێوەی پەراسووە:

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا فَإِنَّهُنَّ خُلِقْنَ مِنْ ضِلَعٍ وَإِنَّ أَعْوَجَ شَيْءٍ فِي الضِّلَعِ أَعْلَاهُ فَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ وَإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ فَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتە: لە ئەبو هورێرەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی: (ئامۆژگـاری یەكـدی بكـەن بە چاك بوون لەگەڵ ئافرەتان ، چونكە ئەوان لە پەراسووی دروستكراون .....، ئەگەر بچی راستی كەیتەوە دەشكێ، ئەگەر وازی لێ بێنی خوارە، ئامۆژگـاری یەكـدی بكـەن بـە چـاك بوون لەگەڵ ئافرەتان) (زانایان دەفەرموون پەراسوو بە خواری جوانە سـینگ دەپـارێزی ، ئافرەتیش بەم سروشتی خۆی جوانە ناكرێت وەكو پیاوی لێ بكرێت )

## ئەو كەسە چاكە كە لەگەڵ ئافرەتـان چاك بێ :

(عن عائشة قالت: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِأَهْلِهِ وَأَنَا خَيْرُكُمْ لِأَهْلِي وَإِذَا مَاتَ صَاحِبُكُمْ فَدَعُوهُ) رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ. والدارمي قال الالباني صحيح

## بەچاکی هەڵسوکەوت لەگەڵ ئافرەتان بکەن:

(وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ) (النساء: ١٩)

(وَفِي الْحَدِيثِ: (...اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا فَإِنَّهُنَّ عِنْدَكُمْ عَوَانٍ ....) رواه ابن ماجه

، عوان عندكم، يعني: بمنزلة الأسرى

عوان عندكم: أي أسرى في أيديكم. ، ((الْعَوَانُ) النَّصَفُ فِي سِنِّهَا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ وَالْجَمْعُ (عُونٌ)، (عوان) جمع عانية بمعنى الأسيرة

## ئافرەتان بەفەرمانی خوا بۆ ئێوە حەلاڵ کراون:

( فَاتَّقُوا اللهَ فِي النِّسَاءِ، فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانِ اللهِ، وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللهِ وَلَكُمْ عَلَيْهِنَّ أَنْ لَا يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ أَحَدًا تَكْرَهُونَهُ فَإِنْ فَعَلْنَ ذَلِكَ فَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ) رواه مسلم

## پێغەمبەر گریانی ئافرەت دەسڕێتەوە:

(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، بَلَغَ صَفِيَّةَ أَنَّ حَفْصَةَ قَالَتْ: يَا بِنْتَ يَهُودِيٍّ، فَبَكَتْ فَدَخَلَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهِيَ تَبْكِي، فَقَالَ: (مَا يُبْكِيكَ؟) فَقَالَتْ: قَالَتْ حَفْصَةُ أَنِّي ابْنَةُ يَهُودِيٍّ، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّكِ لِابْنَةُ نَبِيٍّ وَإِنَّ عَمَّكَ لِنَبِيٌّ، وَإِنَّكِ لَتَحْتَ نَبِيٍّ، فَبِمَ تَفْخَرُ عَلَيْكِ؟ ) ثُمَّ قَالَ: (اتَّقِي اللَّهَ يَا حَفْصَةُ) رواه الترمذي وابن حبان قال الالباني صحيح

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە دەڵێ: هەواڵە گەیشتە (صفیە) کە (حەفصە) پێ گوتوە کچە جوولەکە، پێغەمبەر دەچێتە لای دەبینێ دەگرێ، ئەفەرمووی بۆچی

دەگری ؟ ئەویش ئەڵێ: (حەفصە) دەڵێ : تۆ کچە جوولەکەی، پێغەمبەر فەرمووی بە (صفیە) تۆ کچە پێغەمبەری و مامیشت پێغەمبەرە ، وە مێردیشت پێغەمبەر بە چی شانازی بەسەر تۆدا دەکات ، وە فەرمووی : ئەی (حەفصە) تۆش لە خوا بترسە.

## پێغەمبەر هەرگیز لە ئافرەتانی نەداوە:

عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: (مَا ضَرَبَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْئًا قَطُّ بِيَدِهِ، وَلَا امْرَأَةً، وَلَا خَادِمًا، إِلَّا أَنْ يُجَاهِدَ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَمَا نِيلَ مِنْهُ شَيْءٌ قَطُّ، فَيَنْتَقِمَ مِنْ صَاحِبِهِ، إِلَّا أَنْ يُنْتَهَكَ شَيْءٌ مِنْ مَحَارِمِ اللهِ، فَيَنْتَقِمَ لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ) رواه مسلم

واتە: عائیشە دەڵێ : پێغەمبەر بەدەستی خۆی لە هیچ شتێکی نەداوە، وەهەرگیز لە ئافرەتانی نەداوە ، وە لە خزمتکارەکانی نەداوە ، مەگەر لە جیهاد لە رێگای خوا، هەرکەس شتێکی دەربارە کردبێ تۆڵەی لێ نە کردۆتەوە، مەگەر کەسێك سنوری خوای بەزاندبێ تۆڵەی لێ کردبێتەوە.

## کچان مەبوغزێنن:

(لَا تَكْرَهُوا الْبَنَاتِ، فَإِنَّهُنَّ الْغَالِيَاتُ الْمُؤْنِسَاتُ ) رواه والطبراني قال الالباني صحيح

واتە: کچان مەبوغزێنن چونکە ئەوان هۆگر و بەنرخ و گران بەهان.

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٣٧ ) سورەتی الاحزاب

﴿وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِيٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ ۖ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِيٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْاْ مِنْهُنَّ وَطَرًا ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ٣٧﴾ الاحزاب

واتە : پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قەڵای بەکوڕ کردن دەڕوخێنێ: ئەی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) وەبیر بێنە کاتێ بە (زەید) ئەوەی خوا چاکەی لەگەڵ کرد بە هێنانی بەرەو ئیمان و ئیسلام ، خۆیشت چاکەت لە گەڵکرد بەپەروەردەکردنی و ئازادکردنی لە کۆیلایەتی دەگوت: ژنی خۆت راگرەو لەخوا بترسەو، لای خۆت بیهێڵەرەوەو و تەڵاقیمەدە و شتێکیش کە خوا ئاشکرای دەکات، تۆ لەدڵ و دەرونی خۆتا دەیشاریتەوە ! واتە: خوا دەیەوێ (زەید) زەینەب تەڵاق بداو تۆش مارەی بکەیت. لەلایەن خواوە ئاگادار کرابووی کە دەرەنجام دەبێ تۆ زەینەب مارە بکەیت، ئەگەرچی ئەمڕۆش ژنی زەیدە، چونکە خوا ئەیەوێ بەو کارو کردەوەیە یاسایەکی سەردەمی نەفامیی هەڵوەشێنێتەوە، ئەوەبوو لەیاسای ئەواندا ژنی بەکوڕکراو یاساغ بوو مارە بکرێت، وەکو کوڕی پشتی خۆی دادەنرا، ژنەکەیشی دەبوویە بووکی! دیارە درکاندن و ئاشکراکردنی کارێکی ئاوا لای خەڵکی ئەو سەردەمە شتێکی زۆر گران و قورس بوو، چونکە تا ئێستا باو نەبووە هیچ کەسێك ژنی بەکوڕکراوی خۆی مارە بکات. پێویستە بگوترێ :هەندێ لەدوژمنانی ئیسلام بۆ ناشیرین کردنی شۆرەت و سومعەی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) پەنایان بردۆتە بەر هەندێ قسەو قسەلۆکی بێ ناوەڕۆك و دوور لەڕاستی کە بەداخەوە لەهەندێ تەفسیرەکانیشدا هاتووە.. دیسانەوە زۆر بەداخەوە بڕێ لەنووسەرەکانی خۆیشمان بێ سەر لێکردنەوە ئەو قسانە دەهێنن ولە نووسراوەکانیاندا بڵاوی دەکەنەوە ! گوایە بەگومانی ئەوان جارێك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەڕوات بۆ ماڵی زەیدو، زەیدیش -لەو کاتەدا- لەماڵەوە نابێت، زەینەب پێشوازیی دەکات، جاکاتێ کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەیبینێت کتوپڕ

خۆشەویستیی زەینەب دەچێتە دڵیەوەو ئەڵێ: (سبحان الله مُقَلِّبَ القلوب !) زەینەب ئەمە ئەبیستێ و پاشان بۆ زەیدی دەگێڕێتەوە، ئەوسا ئەویش نیازی تەڵاقدانی ئەکات، پەیامبەریش پێی ئەڵێت: (أمسك عليك زوجك)، جا قورئان - بۆ درکاندنی ئەو راستیە- دێتە خوارەوەو عیتابی لێ ئەکات لەسەر ئەوە کە بۆچی شەرم دەکات لەخەڵکی بۆ مارەکردنی ژنی بەکوڕ کراوی خۆی!.. کە بڕیاری خوای لەسەرە. ئەم جۆرە ریوایەتانە وەك (ئەبو بەکری ئیبنولعەرەبی) ئەڵێت: ئەو جۆرە قسەو باسانە بۆ زاتێکی وەکو پێغەمبەر زۆر زۆر لەراستییەوە دوورە، چونکە هەر ئایەتی: (وتخفي في نفسك ما الله مبديه ..) بەڵگەی ناڕاستی و پووچەڵیی ئەو ریوایەتەیە،وە بەپێی ریوایەتەکە ئەبێ خوا عیشقی (زەینەب)ی لە دڵی پەیامبەردا ئاشکرا کردبێت بۆ خەڵکی!! دە ئایا خوا عیشق و ئەوینی زەینەبی دەرخست، یان ئەوەی دەرخست کە ئەبێ زەینەبی ژنی بەکوڕکراوی مارە بکا؟ هەرچەندە زۆریش شەرم بکات، هەتا قەڵای بەکوڕ کردنی پێ هەڵوەشێنێتەوە؟ .شیاوی باسە کاتی خۆی خاتوو خەدیجە زەیدی کوڕی حاریسەی کڕیی و بەخشیی بە پەیامبەر، ئەویش پاش ماوەیەك ئازادی کردو بەپێی باوی ئەو سەردەمەش کردی بەکوڕی خۆیی و، (زەینەب)ی پوورزای خۆیی لێ مارە کرد..). پاشان ئەفەرموێ: ( فلما قضي زيد منها وطرا زوجناكها لكيلا يكون على المؤمنين حرج في أزواج أدعيائهم ..).. خەڵکینە بیر بکەنەوەو تێفکرێن: ئایا گلەیی لەکەسێك ئەکرێ لەبەرامبەر ئەوەوە کە خۆشەویستی خۆی ئاشکرا نەکردووە لەگەڵ ژنی دراوسێکەیدا؟! حاشا کە هەرگیز پەیامبەر (صلى الله عليه وسلم) شتی وا بکات.. عیشق و ئەوینی ژنێك لە دڵیا بێت و نەیدرکێنێت کە پێشتریش هیچ بەرگرییەك نەبووبێت لە مارە کردنیدا، بەڵام ئێستا بیەوێ شتی وا بکات، من پێم وایە پیاوێکی خاوەن شەرەفی دنیاییش هەرگیز ئەوە ناکات، چ جای پەیامبەرێکی خاوەن ئەخلاق و قییەم.. کە خوا پێی دەفەرموێ: (وإنك لعلي خلق عظيم ). راستی ئەو رووداوە ئەوەبوو باسمان کرد کە: خوا پەیامبەری(صلى الله عليه وسلم) ئاگادار کردبوو کە دەرەنجام هەر ئەبێ زەینەب مارە بکات، ئەگەرچی ئێستاش ژنی زەیدی بەکوڕکراوتە ، زۆریش بەلاتەوە کارێکی گران و قورسە! جا ئەوە بوو کاتێ کە (زەید) هات و سکاڵای

لەزەینەب خان کرد، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی نەگوت: تەڵاقی بدە، بەڵکو وتی: ( أمسك عليك زوجك ). شیاوی باسیشە ئیمامی (تەبەریی) و (ئیبن کەسیر) و (قورتوبی) هەر بەم جۆرەیان و تووە وتۆ دەترسیت مەردم بڵێن موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) ژنی کوڕەکەی خۆی مارە کردووە، خۆ خوا شایستەترەو لەپێشترە تۆلێی بترسیت و فەرمانی جێبەجێ بکەیت ئینجا کە زەید زەینەبی خواست و بووبە هاوسەری، پاشان پێکەوە نەیانکراو تەڵاقییداو جیا بوونەوە، ئێمە لە تۆمان مارە کرد. ئەمە بەڵگەیەکی تەواو ئاشکرایە کە ئەوشتەی پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) حەزی نەدەکرد بیدرکێنێ.. مارە کردنی زەینەب خان بوو دوای تەڵاقدانی، چونکە لای ئەون بووکیەتی، بووکیش مارە ناکرێ خوا ئەو بڕیارەیدا تا هیچ دڵتەنگیی و گرفتێك بۆ بڕواداران لە مارە کردنی ژنی بەکوڕکراویان دروست نەبێ و، بەشتێکی ناشرین و ناپەسەندی دانەنێن وگرا کاتێ ئەو کورانە تەمابڕ ببن لێیان و تەڵاقیان بدەن بڕیاری خوایش بۆ مارەکرکردنی زەینەب، شتێکی بڕاوەیەو، هەر دەبێ جێبەجێ بکرێت(تەفسیری ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عن أَنَسٍ قَالَ جَاءَ زَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ يَشْكُو فَجَعَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ اتَّقِ اللَّهَ وَأَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ قَالَ أنس لَوْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَاتِمًا شَيْئًا لَكَتَمَ هَذِهِ قَالَ فَكَانَتْ زَيْنَبُ تَفْخَرُ عَلَى أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَقُولُ زَوَّجَكُنَّ أَهَالِيكُنَّ وَزَوَّجَنِي اللَّهُ تَعَالَى مِنْ فَوْقِ سَبْعِ سَمَوَاتٍ وَعَنْ ثَابِتٍ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ نَزَلَتْ فِي شَأْنِ زَيْنَبَ وَزَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ) رواه البخاري

واتە: لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە دەڵێ: زەیدی کوڕی حاریسە هات سکالای کرد لەلای پێغەمبەر دەربارەی (زینب) کە تەلاقی بدات ، ئەویش فەرمووی : لەخوا بترسە دەستی لێ مەکەوە، ئەنەس دەڵێ : ئەگەر پێغەمبەر هیچ شتی شاردبایەوە، ئەوەی

دەشاردەوە، دەڵێ: (زينب) شانازی بە خۆی دەکرد لە ناو خێزانەکانی پێغەمبەر ، دەیگوت ئێوە کەس وکارتان ماری کردوون ، بەلاّم من خوا لەسەرووی حەوت تەبەقەی ئاسمان ماری کردوم .، (لەسابیتەوە هاتووە دەڵێ (وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ) دەربارەی (زينب و زيد) دابەزیوە.

٢وفي رواية-(عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: لَمَّا انْقَضَتْ عِدَّةُ زَيْنَبَ، قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِزَيْدٍ: (فَاذْكُرْهَا عَلَيَّ)، قَالَ: فَانْطَلَقَ زَيْدٌ حَتَّى أَتَاهَا وَهِيَ تُخَمِّرُ عَجِينَهَا، قَالَ: فَلَمَّا رَأَيْتُهَا عَظُمَتْ فِي صَدْرِي، حَتَّى مَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَنْظُرَ إِلَيْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَكَرَهَا، فَوَلَّيْتُهَا ظَهْرِي، وَنَكَصْتُ عَلَى عَقِبِي، فَقُلْتُ: يَا زَيْنَبُ: أَرْسَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَذْكُرُكِ، قَالَتْ: مَا أَنَا بِصَانِعَةٍ شَيْئًا حَتَّى أُوَامِرَ رَبِّي، فَقَامَتْ إِلَى مَسْجِدِهَا، وَنَزَلَ الْقُرْآنُ، وَجَاءَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا بِغَيْرِ إِذْنٍ، قَالَ، فَقَالَ: وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَطْعَمَنَا الْخُبْزَ وَاللَّحْمَ حِينَ امْتَدَّ النَّهَارُ، فَخَرَجَ النَّاسُ وَبَقِيَ رِجَالٌ يَتَحَدَّثُونَ فِي الْبَيْتِ بَعْدَ الطَّعَامِ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاتَّبَعْتُهُ، فَجَعَلَ يَتَتَبَّعُ حُجَرَ نِسَائِهِ يُسَلِّمُ عَلَيْهِنَّ، وَيَقُلْنَ: يَا رَسُولَ اللهِ، كَيْفَ وَجَدْتَ أَهْلَكَ؟ قَالَ: فَمَا أَدْرِي أَنَا أَخْبَرْتُهُ أَنَّ الْقَوْمَ قَدْ خَرَجُوا أَوْ أَخْبَرَنِي، قَالَ: فَانْطَلَقَ حَتَّى دَخَلَ الْبَيْتَ، فَذَهَبْتُ أَدْخُلُ مَعَهُ، فَأَلْقَى السِّتْرَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ، وَنَزَلَ الْحِجَابُ، قَالَ: وَوُعِظَ الْقَوْمُ بِمَا وُعِظُوا بِهِ زَادَ ابْنُ رَافِعٍ فِي حَدِيثِهِ: (لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَنْ يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ) (الأحزاب: ٥٣) إِلَى قَوْلِهِ (وَاللهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ) (الأحزاب: ٥٣) رواه مسلم

معاني الكلمات : (لزيد) هو زيد بن حارثة الذي سماه الله سبحانه في تلك السورة من كتابه (فاذكرها علي) أي فاخطبها لي من نفسها (تخمر عجينها) أي تجعل في عجينها الخمير قال المجد وتخمير العجين تركه ليجود (فلما رأيتها عظمت في صدري) معناه أنه هابها واستجلها من أجل إرادة النبي صلى الله عليه وسلم تزوجها فعاملها معاملة من تزوجها صلى الله عليه وسلم في الإعظام والإجلال والمهابة وقوله أن رسول الله هو بفتح الهمزة من أن أي من أجل ذلك وقوله نكصت أي رجعت وكان جاء إليها ليخطبها وهو ينظر إليها على ما كان من

عادتهم وهذا قبل نزول الحجاب فلما غلب عليه الإجلال تأخر وخطبها وظهره إليها لئلا يسبقه النظر إليها (إلى مسجدها) أي موضع صلاتها من بيتها (ونزل القرآن) يعني نزل قوله تعالى فلما قضى زيد منها وطرا زوجناكها فدخل عليها بغير إذن (ولقد رأيتنا) أي رأيت أنفسنا (حين امتد النهار) أي ارتفع هكذا هو في النسخ حين بالنون (غير ناظرين إناه) أي غير منتظرين لإدراكه والإنى كإلى مصدر أنى يأنى إذا أدرك ونضج ويقال بلغ هذا إناء أي غايته ومنه حميم آن وعين آنية وبابه رمى ويقال أنى يأنى أيضا إذا دنا وقرب ومنه ألم يأن للذين آمنوا أن تخشع قلوبهم لذكر الله وقد)

–وقوله : (فجا رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) فدخل عليها بغير إذن) : لأنها زوجته ، وان الله أعلمه)شرح صحيح مسلم لقاضي عياض

*************************************************

## وتاری ژماره (٨٩) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٥٣) سورەتی الاحزاب

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيۡرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَٰكِنۡ إِذَا دُعِيتُمۡ فَٱدۡخُلُواْ فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِينَ لِحَدِيثٍۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ يُؤۡذِي ٱلنَّبِيَّ فَيَسۡتَحۡيِۦ مِنكُمۡۖ وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ وَإِذَا سَأَلۡتُمُوهُنَّ مَتَٰعٗا فَسۡـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٖۚ ذَٰلِكُمۡ أَطۡهَرُ لِقُلُوبِكُمۡ وَقُلُوبِهِنَّۚ وَمَا كَانَ لَكُمۡ أَن تُؤۡذُواْ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓاْ أَزۡوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦٓ أَبَدًاۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ٥٣﴾ الاحزاب

واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە مەچنە ژوورەوە بۆ ماڵەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) مەگەر ڕێگەتان پێ بدرێ بۆ نان خواردنێك بێ ئەوەی چاوەڕوانی پێگەیشتنی بکەن بەڵام ئەگەر بانگ کران (بۆ نان خواردن) ئەوسا بڕۆنە ژوورەوە ئینجا ئەگەر خواردنەکەتان خوارد بڵاوەی لێ بکەن وە مەمێننەوە بۆ قسە کردن چونکە بەڕاستی ئەو (مانەوەتان) ئازاری پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەدات ئەویش شەرم دەکات لێتان (کە بێ دەنگە) بەڵام خوا لە (ووتنی) هەق شەرم ناکات وە هەر کاتێ داوای شتێکی ناو ماڵتان کرد لە (هاوسەرەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)) ئەوە لە پشتی پەردەوە لێیان داواکەن ئەو (شێوە داواکردنە) تان خاوێن ترە بۆ دڵی ئێوەو ئەوانیش بە هیچ شێوەیە بۆ ئێوە دروست نی یە ئازاری (دڵی) پێغەمبەری خوا بدەن وە هەرگیز نابێ خێزانەکانی پاش خۆی مارە بکەن بەڕاستی ئەو (ئازاردانی دڵ و مارە کردنە) تان بەلای خواوە (گوناهێکی) زۆر گەورەیە.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عن أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ أَوْلَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ بَنَى بِزَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ فَأَشْبَعَ النَّاسَ خُبْزًا وَلَحْمًا ثُمَّ خَرَجَ إِلَى حُجَرِ أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ كَمَا كَانَ يَصْنَعُ صَبِيحَةَ بِنَائِهِ فَيُسَلِّمُ عَلَيْهِنَّ وَيُسَلِّمْنَ عَلَيْهِ وَيَدْعُو لَهُنَّ وَيَدْعُونَ لَهُ فَلَمَّا رَجَعَ إِلَى بَيْتِهِ رَأَى رَجُلَيْنِ جَرَى بِهِمَا الْحَدِيثُ فَلَمَّا رَآهُمَا رَجَعَ عن بَيْتِهِ فَلَمَّا رَأَى الرَّجُلَانِ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجَعَ عن بَيْتِهِ وَثَبَا مُسْرِعَيْنِ فَمَا أَدْرِي أَنَا أَخْبَرْتُهُ بِخُرُوجِهِمَا أَمْ أُخْبِرَ فَرَجَعَ حَتَّى دَخَلَ الْبَيْتَ وَأَرْخَى السِّتْرَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ وَأُنْزِلَتْ آيَةُ الْحِجَابِ ) رواه البخاري

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە خوا لـێ رازی بـێ هـاتووە دەڵـێ: پێغەمبـەر وەلیمـەی کرد (نانی شای) کاتێ (زینب) کچی جەحشـی گواسـتەوە، خـەڵکی تێـر کـرد لـە گۆشـت و نان، دوای چووە ژوورەکانی دایکانی ئیمانداران ، وەك پیشەی هەمیشەیی دەچوو سـلاوی لێ دەکردن ودوعای بۆ دەکردن ، ئەوانیش بەهەمان شێوە سلاویان لـێ دەکـردو دوعایـان بۆ دەکرد، کاتێ گەراوە ماڵەکەی دەبینێ دوو پیاو گەرمیان کردیە لە قسان، کـە ئـەو دوو پیاوە پێغەمبەریان بینی گەراوە پەلەیان کرد برۆن ، جا نازانم من هەواڵم پێدان برۆن یان کەسێکی دیکە، کە گەرایـەوە ژوورەکـەی پەردەکـەی لـە نێـوان مـن وخـۆی دادایـەوە ، و ئایەتی حیجاب دابەزی .

٢-(عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ خَرَجَتْ سَوْدَةُ بَعْدَ مَا ضُرِبَ عَلَيْهَا الْحِجَابُ لِتَقْضِيَ حَاجَتَهَا وَكَانَتْ امْرَأَةً جَسِيمَةً تَفْرَعُ النِّسَاءَ جِسْمًا لَا تَخْفَى عَلَى مَنْ يَعْرِفُهَا فَرَآهَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فَقَالَ يَا سَوْدَةُ وَاللَّهِ مَا تَخْفَيْنَ عَلَيْنَا فَانْظُرِي كَيْفَ تَخْرُجِينَ قَالَتْ فَانْكَفَأَتْ رَاجِعَةً وَرَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَيْتِي وَإِنَّهُ لَيَتَعَشَّى وَفِي يَدِهِ عَرْقٌ فَدَخَلَتْ فَقَالَتْ يَا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنِّي خَرَجْتُ فَقَالَ لِي عُمَرُ كَذَا وَكَذَا قَالَتْ فَأُوحِيَ إِلَيْهِ ثُمَّ رُفِعَ عَنْهُ وَإِنَّ الْعَرْقَ فِي يَدِهِ مَا وَضَعَهُ فَقَالَ إِنَّهُ قَدْ أُذِنَ لَكُنَّ أَنْ تَخْرُجْنَ لِحَاجَتِكُنَّ) متفق عليه

واتە: لە عائیشەوە هاتووە دەڵێ: پاش حیجاب فەرز بوون، سەوودەی خێزانی پێغەمبەر چوو بۆ ئاتاجی خۆی ، وە ئافرەتێکی قەولەو بوو لەچاو ئافرەتان دیار بوو، دەناسراوە ئەوی پێشتر دیتبووی ، (عومەری کوڕی خەتاب) بینی گوتی: ئەی (سەودە) سوێند بەخوا تۆ لە ئێمە ناشاردرێتەوە ، بزانە چۆن دیتە دەرێ، عائیشە دەڵێ: ئەویش گەڕایەوە و هاتە لای پێغەمبەر کە لەو کاتە لەماڵی من بوو ، نانی ئێوارەی دەخوارد ئێسکە گۆشتێکی لە دەستدابوو، هاتە ژوورەوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من چوومە دەرێ بۆ سەرئاو ، (عمر) ئاوای پێ گوتم، دەڵێ : وەحی بۆ هات و دوای تەواو بوو ، ئێسکەکەی هەر لە دەست بوو داینەنابوو ، فەرمووی : مۆڵتان پێدراوە بچن بۆ ئاتاجی خۆتان جێ بەجێ بکەن.

معاني الكلمات( ((ضرب) فرض. (فانكفأت) ملت ورجعت. (عرق) هو العظم الذي أخذ عنه أكثر اللحم)( (جسيمة) أي عظيمة الجسم (تفرع النساء) أي تطولهن فتكون أطول منهن والفارع المرتفع العالي، (لا تخفى على من يعرفها) يعني لا تخفى إذا كانت متلففة في ثيابها ومرطها في ظلمة الليل ونحوها على من سبقت له معرفة طولها لانفرادها بذلك (عرق) هو العظم الذي عليه بقية لحم ، (البِراز) بفتح الباء هو الموضع البارز الظاهر وقد قال الجوهري في الصحاح البراز بكسر الباء هو الغائط وهذا أشبه أن يكون المراد هنا فإن مراد هشام بقوله يعني البراز تفسير قوله صلى الله عليه وسلم قد أذن لكن أن تخرجن لحاجتكن فقال هشام المراد بحاجتهن الخروج للغائط لا لكل حاجة من أمور المعايش)

٣-(عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنْتُ آكُلُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَيْسًا فِي قَعْبٍ، فَمَرَّ عُمَرُ، فَدَعَاهُ فَأَكَلَ، فَأَصَابَتْ إِصْبَعُهُ إِصْبَعِي، فَقَالَ: حِسْ أُوهْ أُوهْ، لَوْ أُطَاعُ فِيكُنَّ مَا رَأَتْكُنَّ عَيْنٌ، فَنَزَلَتْ: آيَةُ الْحِجَابِ) رواه الطبراني قال الالباني سنده صحيح

واتە:لە عائیشەی دایکی ئیمانداران هاتووە دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەردا لەناو قاپێک (حیس)مان دەخوارد (خواردنێکە لە خورماو روون وئارد دروست دەکری)

(عمر) بەوێدا تێپەری پێغەمبەر بانگی کرد ، ئەویش خواردی ، پەنجەی بە پەنجەی من کەوت ، گوتی : ئاها ئاها، ئەگەر کرابایە کەس چاوی بە ئێوە نەکەوتبایە، بەم بۆنەوە ئایەتی (حیجاب) دابەزی

ملاحظة:(طريق الجمع بين هذه الروايات: قال الحافظ في الفتح ج١ ص٢٦٠، وطريق الجمع بينهما أن أسباب نزول الحجاب تعددت، وكانت قصة زينب آخرها أخرجها للنص على قصتها في الآية أو المراد بآية الحجاب في بعضها قوله تعالى (يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلابِيبِهِنَّ) الآية. ا. هـ.

وأقول في كون المراد بآية الحجاب قوله (يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلابِيبِهِنَّ) نظر. إذ قد صرحت الروايات في شأن قصة زينب بنزول قوله (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ) الآية وفي شأن قول عمر١ عند الطبري ج١٢) الصحيح المسند من اسباب النزول

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٥٥ ) سورەتی الاحزاب

(لَا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِيٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ ۗ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا ٥٥) الاحزاب

واتە : ژنان لەمانە ڕوو ناپۆشن: ئیتر باوك و كوڕو مەحرەمەكانی تریان هاتن و وتیان: ئایا بۆ ئێمەیش هەر دەبێ وابێ ئەی پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)؟! ئەوسا بۆ وەڵامی ئەوە ئەم ئایەتە هات و فەرمووی: هیچ گوناحێك لەسەر خێزانەكانی پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) نییە – ئەڵبەت ژنانی تریش هەروا– كە بێ پەردەو ڕووبەڕوو لەگەڵ باوك و كوڕو برازاو خوشكەزاو ژنانی موسڵمان و بەندەی خۆیاندا قسە بكەن چونكە پەردە لەگەڵ ئەوانەدا ئەزیەت و كارێكی گرانە و ئەوانەیش مەترسی كاری دزێو و خراپیان لێناكرێت. وە بە نهێنی و بە ئاشكرا، لەخوا بترسن و سنوورەكانی مەشكێنن بە

راستی خوا بەسەر هەموو شتێکەوە شایەدەو هەمیشە ئاگایە ، و هیچ شتێکی لێ ون نابێت.(رامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَن ابْن عَبَّاس رَضِي الله عَنْهُمَا فِي قَوْله (لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِيٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ) قال انزلت هذه الاية في نساء النبي صلى الله عَلَيْهِ وَسلم خاصة ، وقوله (نسائهن) يعني نساء المسلمات (وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ) من المماليك والاماء ، ورخَّص لهن ان يَرونَهُنَّ بعد ما ضرب عَلَيْهِنَّ الحجاب) ذكره السيوطي في الدر المنثور

واتە: ئیبنو عەباس دەڵێ: فەرمایشتی خوا (لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِيٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ) دەڵێ : ئەم ئایەتە دابەزیوە تایبەت بە خێزانەکانی پێغەمبەر ، (وَلَا نِسَآئِهِنَّ) واتە: ئافرەتە موسڵمانەکان (وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ) واتە: بەندەکان ، مۆڵەت درا بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر ئەوانەی باسکران بیانبینن قەیناکا ، پاش ئەوەی حیجاب لەسەریان فەرز کرا.

## ٣-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٥٩ ) سوڕەتی الاحزاب

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ٥٩) الاحزاب

واتە : دەبێ ژنان خۆیان بە چارشێو داپۆشن: ئەی پەیامبەر(صلى اللـه عليـه وسلم) بەژنەکانت، کچەکانت و ژنانی بڕوادار بڵێ: لە باڵاپۆش و عاباکانیان بپێچن بە خۆیانا، بە شێوەیەك کە تەواوی سەرو مل و جەستەیان داپۆشێ.

(پێناسەیەك بۆ جیلباب): ئیبنی عەباس دەڵێت: جیلباب: ئەو جل و بەرگەیە تەواوی جەستە هەرلە پێ تا تەوقە سەر داپۆشێ دەشکرێ بڵێیین: ئەو پارچە قوماشەیە کە ژنان بەسەر جل و بەرگەکانیاندا دەیپێچن بەخۆیاندا وەکو عەبا کە ژنانی عێراقیی بەکاری دێنن. بەڵێ ژنان هەرکاتێ لەماڵ چونە دەرێ بۆهەر ئیش و کارێکی پێویست، دەبێ ئەو (جیلباب)ـە بەکار بهێنن و تەواوی سەرو مل و گەردن و سنگ و بەرەکیان پێداپۆشن هەتا دەگاتە قولە پێیان، بەکارهێنانی ئەو پارچە حیجابەش کە ئێستا لەناودایە جێی جیلباب دەگرێتەوە بەمەرجێك (میقنەعە)ـی لەگەڵدابێ. ئەو خۆداپۆشینەش لەبارترین شتە کە ئێوە بە پاك و خاوێنی و داوێن پارێزی بناسرێن و بەر قسەو بوختان نەکەون و ئازارو ئەزیەت نەدرێن هەمیشەو بەردەوام خوا چاوپۆشیکارە بەرامبەر بەوانەی پێشتر درێغیان هەبووبێت زۆریش میهرەبانە لەگەڵ ئەوانەدا فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەن (تەفسیری رامان)

١-(عَنْ أَبِي مَالِكٍ قَالَ: كَانَ نِسَاءُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْرُجْنَ بِاللَّيْلِ لِحَاجَتِهِنَّ، وَكَانَ نَاسٌ مِنَ الْمُنَافِقِينَ يَتَعَرَّضُونَ لَهُنَّ فَيُؤْذَيْنَ فَقِيلَ ذَلِكَ لِلْمُنَافِقِينَ فَقَالُوا: إِنَّمَا نَفْعَلُهُ بِالْإِمَاءِ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ يَا أيها النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءَ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلا يُؤْذَيْنَ فَأَمَرَ بِذَلِكَ حَتَّى عُرِفُوا مِنَ الْإِمَاءِ) ابن ابي حاتم والسيوطي في الدر المنثور

واتە: لە مالیکەوە هاتووە دەڵێ: خێزانەکانی پێغەمبەر شەوان دەهاتنە دەر بۆ پێویستیان، کەسانێکی مونافیق پێیان دەگەیشتن ئازاریان دەدان بە قسەی نەشیاو ، بە مونافیقانیان گوترا بۆچی وادەکەن ، گوتیان : ئێمە بەرامبەر کەنیزەکان وادەکەین ، جا ئەم ئایەتە دابەزی و فەرمووی (يَا أيها النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءَ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلا يُؤْذَيْنَ فَأَمَرَ بِذَلِكَ حَتَّى عُرِفُوا مِنَ الْإِمَاءِ) .جا فەرمان کرا بەخۆداپۆشین تاکو خێزانەکانی پێغەمبەر لە کەنیزەکان جیا بکرێنەوە.

**٣-(عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: (كُنَّ نِسَاءُ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّينَ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْفَجْرَ ثُمَّ يَرْجِعْنَ مُتَلَفِّعَاتٍ بِمُرُوطِهِنَّ قَبْلَ أَنْ يُعْرَفْنَ) سنن الدارمي قال حسين سليم أسد الداراني اسناده صحيح**

**واته:عائیشه دەڵێ: خێزانەکانی پێغەمبەر نوێژی بەیانمان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەر ، دوای دەگەڕانەوە ماڵ بە داپۆشراوی پێش ئەوەی بناسرێن.**

***************************

# وتاری ژماره (٩٠) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (یس)

سورەتی (یس) سورەتێکی مەککی یە، لەریزبەندا ژمارە(٣٦)ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (٨٣) ئایەتە.

-باسی (٣) شتی سەرەکی دەکات ، (ئیمان بە زیندوبونەوە ، چیرۆکی شارەی (ئەنتاکییە)، یەکتاپەرستی پەروەردگار)

-باسی مەوقیفی بانگخوازێکی ئیماندار دەکات کە ناوی (حبیب النجار) ئامۆژگاری گەلەکەی دەکات بەلآم دەیکوژن ، خواش ئەیخاتە بەهەشتەوە.

-باسی رۆژ و مانگ کە دوو دروستکراوی بە سوود وسەرسورهێنەرن .

-باسی ڕۆژی قیامەت دەکات کە چۆن تاوانباران جیادەکرینەوە بۆ دۆزەخ

-ئایا بۆچی ناونراوە (یس) ؟ چونکە خوای گەورە دەسپێکی سورەتەکە بەم دوو پێتە دەست پێ دەکات ، ئەوەش ئاماژەیە بۆ ئیعجازی قورئانی پیرۆز.

### ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١٢) (سورەتی یس)

(إِنَّا نَحْنُ نُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَٰرَهُمْ ۚ وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ فِيٓ إِمَامٍ مُّبِينٍ ١٢) یس

واتە: بێگومان هەر ئێمە مردووەکان زیندوو دەکەینەوە، هەرچی کردوویانە و دەیکەن تۆماری دەکەین لەگەڵ ئاسەوارەکانیشیاندا، هەموو شتێکمان لە کتێبێکی ئاشکرادا (تۆمارگەی تایبەتدا) بەوردی تۆمار و ئامارکردووە.(ئاسان)

(امام مبين)(واته : لوح المحفوظ) (ڕامان)

## ئايا هۆی دابەزينی ئەم ئايەتە پيرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ أَبِي سَعِيدِ الخُدْرِيِّ، قَالَ: كَانَتْ بَنُو سَلِمَةَ فِي نَاحِيَةِ المَدِينَةِ فَأَرَادُوا النُّقْلَةَ إِلَى قُرْبِ المَسْجِدِ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ: (إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي المَوْتَى وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ) (يس: ١٢) فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ آثَارَكُمْ تُكْتَبُ فَلَا تَنْتَقِلُوا) رواه الترمذي قال الالباني صحيح

واتە: لەئەبی سەعيدی خودريەوە هاتووە دەڵێ: بەنو سەلەمە لەلايەكی مەدينە بوون ، ويستيان ماڵەكانيان بگوازنەوە بۆ نزيك مزگەوت ، جا ئەم ئايەتە دابەزی (إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي المَوْتَى وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ) پێغەمبەر پێی فەرموون : شوێنەوارتان دەنوسرێت ماڵتان مەگوازنەوە. (واتە: شوێنەواری هاتو چۆتان بۆ هاتنە مزگەوت)

٢-( عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ خَلَتْ الْبِقَاعُ حَوْلَ الْمَسْجِدِ فَأَرَادَ بَنُو سَلِمَةَ أَنْ يَنْتَقِلُوا إِلَى قُرْبِ الْمَسْجِدِ فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ لَهُمْ إِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّكُمْ تُرِيدُونَ أَنْ تَنْتَقِلُوا قُرْبَ الْمَسْجِدِ قَالُوا نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ أَرَدْنَا ذَلِكَ فَقَالَ يَا بَنِي سَلِمَةَ دِيَارَكُمْ تُكْتَبْ آثَارُكُمْ دِيَارَكُمْ تُكْتَبْ آثَارُكُمْ) رواه مسلم

واتە: لە جابيری كوڕی عەبدولاوە هاتووە دەڵێ: دەوروبەری مزگەوت پڕبوو لە ئاوەدانی ، بەنو سەلەمە ويستيان ماڵەكانيان بگوازنەوە بۆ نزيك مزگەوت ، ئەم هەواڵە گەيشتەوە پێغەمبەر ، پێ فەرموون : هەواڵم پێ گەيشتوە ئێوە بەنيازن بێنە نزيك مزگەوت ، گوتيان بەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا نيازمان وايە، فەرمووی : ئەی بەنی سەلەمە لەماڵی خۆتان بن شوێنەواری هەنگاوەكانتان دەنوسرێت، لەماڵی خۆتان بن شوێنەواری هەنگاوەكانتان دەنوسرێت .

## ڕوونکردنەوەی (مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ): کردەو وشوێنەواریان تۆمار دەکەین.

١-(عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْد اللَّهِ الْبَجَلِيِّ قَالَ: (قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ سَنَّ سُنَّةً حَسَنَةً فَلَهُ أَجْرُهَا وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ بَعْدِهِ مِنْ غَيْرِ ان يُنْقَصَ مِنَ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ، وَمَنْ سَنَّ سُنَّةً سَيِّئَةً كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهَا وَوِزْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ بَعْدِهِ لَا يُنْقَصُ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ، ثُمَّ تَلا هَذِهِ الْآيَةَ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ قَوْلُهُ تَعَالَى: وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُبِينٍ قَالَ: أُمُّ الْكِتَابِ) اخرجه ابن ابي حاتم والسيوطي في الدر المنثور

٢-(-قال مجاهد في قوله تعالى: (وَنَكْتُبُ مَاَ قَدَّمُواْ وَآثَارَهُمْ) قَالَ: مَا أَوْرَثُوا من الضلالة، وقال سعيد بن جبير: (وَآثَارَهُمْ) يَعْنِي مَا أَثَرُوا، يَقُولُ: مَا سَنُّوا مِنْ سُنَّةٍ فَعَمِلَ بِهَا قَوْمٌ مِنْ بَعْدِ موتهم، وَهَذَا الْقَوْلُ هُوَ اخْتِيَارُ الْبَغَوِيِّ. وَالْقَوْلُ الثَّانِي: أَنَّ الْمُرَادَ بِذَلِكَ آثَارُ خُطَاهُمْ إِلَى الطَّاعَةِ أو المعصية، قال مُجَاهِدِ: (مَا قَدَّمُواْ) أَعْمَالُهُمْ (وَآثَارَهُمْ) قَالَ: خُطَاهُمْ بأرجلهم (وهو قول الحسن وقتادة). وقال قتادة: لو كان الله عزَّ وجلَّ مُغْفِلًا شَيْئًا مِنْ شَأْنِكَ يَا ابْنَ آدَمَ أغفل ما تغفل الرِّيَاحُ مِنْ هَذِهِ الْآثَارِ، وَلَكِنْ أَحْصَى عَلَى ابْنِ آدَمَ أَثَرَهُ وَعَمَلَهُ كُلَّهُ، حَتَّى أَحْصَى هَذَا الْأَثَرَ فِيمَا هُوَ مِنْ طَاعَةِ اللَّهِ تعالى أو مَعْصِيَتِهِ، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَكْتُبَ أَثَرَهُ في طاعة الله تعالى فَلْيَفْعَلْ، وَقَدْ وَرَدَتْ فِي هَذَا الْمَعْنَى أَحَادِيثُ.

٣-( عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: تُوُفِّيَ رَجُلٌ بِالْمَدِينَةِ مِمَّنْ وُلِدَ بِالْمَدِينَةِ، فَصَلَّى عَلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: (يَا لَيْتَهُ مَاتَ فِي غَيْرِ مَوْلِدِهِ) فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ النَّاسِ: وَلِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ (إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا مَاتَ فِي غَيْرِ مَوْلِدِهِ، قِيسَ لَهُ مِنْ مَوْلِدِهِ إِلَى مُنْقَطَعِ أَثَرِهِ فِي الْجَنَّةِ) رواه ابن ماجه وابن حبان واحمدوالنسائي قال الالباني حسن (معاني الكلمات: (إلى منقطع أثره) أي إلى موضع قطع أجله. فالمراد بالأثر الأجل لأنه يتبع العمر

واتە: پیاوێك لە مەدینە وەفاتی كرد، پێغەمبەر نوێژی لەسەر كرد ، فەرمووی : خۆزگە لە شوێنی لە دایك بوونی وەفاتی نەكردبایە، گوتیان بۆچی ئەی نێرراوی خوا؟ فەرمووی :

چونكه مرۆڤ ئەگەر لە جێگايەكی جگە لە شوێنی خۆی وەفاتی كرد، بۆی ئەندازە دەكرێ تاكو ئەو شوێنەی لێ وەفات كردوە لە بەهەشت .

٤-( عَنْ بُسْرِ بْنِ جَحَّاشٍ الْقُرَشِيِّ قَالَ بَزَقَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي كَفِّهِ ثُمَّ وَضَعَ أُصْبُعَهُ السَّبَّابَةَ وَقَالَ يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنَّى تُعْجِزُنِي ابْنَ آدَمَ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِنْ مِثْلِ هَذِهِ فَإِذَا بَلَغَتْ نَفْسُكَ هَذِهِ وَأَشَارَ إِلَى حَلْقِهِ قُلْتَ أَتَصَدَّقُ وَأَنَّى أَوَانُ الصَّدَقَةِ ) رواه ( احمد والبيهقي والحاكم ) قال الالباني صحيح

**مانای** (مَنْ سَنَّ سُنَّةً حَسَنَةً فَعَمِلَ بِهَا كَانَ لَهُ أَجْرُهَا وَمِثْلُ أَجْرِ مَنْ عَمِلَ بِهَا لَا يَنْقُصُ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ ، وَمَنْ سَنَّ سُنَّةً سَيِّئَةً فَعَمِلَ بِهَا كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهَا وَمِثْلُ وِزْرِ مَنْ عَمِلَ بِهَا لَا يَنْقُصُ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ) رەاە مسلم

(واتە: هەركەسێ لە ئیسلامدا رێ ورەوشتێكی چاك دابمەزرێنێ، دیارە پاداشتی تایبەتی خۆی دەبێ، هاورێ لەگەڵ هەر كەسێكی دیكەش پاش ئەو كاری پێبكا" بەڵام بێ ئەوەی لە كرێ و پاداشی ئەوان شتێ كەم بكا، خۆ ئەگەر كەسێك رچەیەكی خراپی شكاندو خەڵكی وە دووی كەوتن، بێگومانە هەم گوناحی خۆیی و، هەم گوناحی شوێنكەوتووەكانیشی هەڵدەگرێت، بێ ئەوەی شتێك لە گوناحی ئەوان كەم بكاتەوە

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٧٧-٨٣ ) سورەتی ( یس )

﴿أَوَ لَمۡ يَرَ ٱلۡإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقۡنَٰهُ مِن نُّطۡفَةٖ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٞ مُّبِينٞ ٧٧ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلٗا وَنَسِيَ خَلۡقَهُۥۖ قَالَ مَن يُحۡيِ ٱلۡعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٞ ٧٨ قُلۡ يُحۡيِيهَا ٱلَّذِيٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلۡقٍ عَلِيمٌ ٧٩ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلۡأَخۡضَرِ نَارٗا فَإِذَآ أَنتُم مِّنۡهُ تُوقِدُونَ ٨٠ أَوَلَيۡسَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخۡلُقَ مِثۡلَهُمۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلۡخَلَّٰقُ ٱلۡعَلِيمُ ٨١ إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ٨٢ فَسُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٨٣ ) یس

واتە : ئایا ئادەمی نەیزانیوە کە ئەومان لە نوتفەیەك دروست کردووە کەچی یەکسەر دەبێتە دوژمنێکی دیار (دەمەقاڵێ کەرێکی ئاشکرا) یە.(٧٧) و نموونەمان بۆ دێنێتەوە و بەدیهێنانی خۆی لە بیرچۆتەوە (ئەو بێ بڕوایە) دەڵێ کێ ئێسکەکان زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا کە ڕزیون.(٧٨) ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) بڵێ ئەو زاتە زیندوویان دەکاتەوە کە لە یەکەم جارەوە بەدی هێناون و ئەو بە هەموو دروست کراوێك زاناو ئاگایە.(٧٩) زاتێ کە لە درەختی سەوز ئاگری بۆ دروست کردون ئیتر ئێوە ئاگری پێ دەکەنەوە.(٨٠) ئایا زاتێ کە ئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناوە ناتوانێ وێنەیان دروست بکات؟ بەڵێ دەتوانێ و هەر ئەوەیش دروست کەری زانایە.(٨١) بەڕاستی کاری ئەو (خوا) ئەمەیە هەر کاتێ بیەوێ شتێك بەدی بێنێ پێی دەڵێ: ببە دەست بەجێ ( ئەو شتە) دەبێت.(٨٢) جا پاك و بێگەردە، خوایە کە موڵکایەتی هەموو شتێك بەدەست ئەوە و بۆ لای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە.(٨٣) (پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ أَبِي مَالِكٍ: أَنَّ أُبَيَّ بْنَ خَلَفٍ الْجُمَحِيَّ جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – بِعَظْمٍ حَائِلٍ فَفَتَّهُ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ يَبْعَثُ اللَّهُ هَذَا بَعْدَمَا أَرَمَّ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، يَبْعَثُ اللَّهُ هَذَا وَيُمِيتُكَ ثُمَّ يُحْيِيكَ ثُمَّ يُدْخِلُكَ نَارَ جَهَنَّمَ ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ) الصحيح المسند من اسباب النزول ، والحديث عزاه السيوطي في الدر لعبد الرزاق والبزار وابن جرير وابن المنذر وابن أبي حاتم والحاكم وابن مردويه والبيهقي في الشعب

واتە:لە ئەبی مالیکەوە هاتووە دەڵێ: (ئوبەی کوڕی خەلەف)ی جومەحی هاتە لای پێغەمبەر پارچە ئێسقانێکی لە دەستدا بوو ، بەدەستەکانی هەڵیپڕوچاندە سەر یەکتری ، ئنجا گوتی: ئەی (محمد) ئایا خوا ئەمە زیندو دەکاتەوە پاش ڕزین ؟ فەرمووی : بەڵێ ، خوا ئەم ئێسکە زیندو دەکاتەوە ، وە تۆش دەمرێنێ و زیندوت دەکاتەوە و دەتخاتە ناو

ئاگری دۆزەخەوە.(ئەوەش بەڵگەیە لەسەر راستیەتی پێغەمبەر وقورئانی پیرۆز و یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر)

٢-( قَالَ الْمُفَسِّرُونَ: إِنَّ أُبَيَّ بْنَ خَلَفٍ أتى النبي صلى اللّه عليه وسلم بِعَظْمٍ حَائِلٍ (قَدْ بَلِيَ) فَقَالَ:يَا مُحَمَّدُ، أَتُرَى اللَّهُ يُحْيِي هَذَا بَعْدَ مَا قَدْ رَمَّ؟ فَقَالَ: نَعَمْ وَيَبْعَثُكَ وَيُدْخِلُكَ النَّارَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الْآيَاتِ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قالَ مَنْ يُحْيِ الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ) الصحيح المسند

## رۆژێك پێغەمبەر ئەم ئایەتەی خوێندەوە فەرمووی:

( عَنْ بُسْرِ بْنِ جَحَّاشٍ الْقُرَشِيِّ، قَالَ: تَلَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذِهِ الْآيَةَ (فَمَالِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ قِبَلَكَ مُهْطِعِينَ ٣٦ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ عِزِينَ ٣٧ أَيَطْمَعُ كُلُّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ أَن يُدْخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٍ ٣٨ كَلَّآۖ إِنَّا خَلَقْنَٰهُم مِّمَّا يَعْلَمُونَ ٣٩) المعارج) ، ثُمَّ بَزَقَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى كَفِّهِ فَقَالَ: يَقُولُ اللَّهُ: يَا ابْنَ آدَمَ أَنَّى تُعْجِزُنِي وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِنْ مِثْلِ هَذِهِ حَتَّى إِذَا سَوَّيْتُكَ وَعَدَلْتُكَ مَشَيْتَ بَيْنَ بُرْدَتَيْنِ وَلِلْأَرْضِ مِنْكَ وَئِيدٌ يَعْنِي شَكْوَى فَجَمَعْتَ وَمَنَعْتَ حَتَّى إِذَا بَلَغَتِ التَّرَاقِيَ قُلْتَ: (أَتَصَدَّقُ وَأَنَّى أَوَانُ الصَّدَقَةِ) رواه الحاكم وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ ووافقه الذهبي

*****************

# وتاری ژماره (٩١) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (ص)

له ریزبەندا ژماره (٣٨) ە وه ژمارەی ئایەتەکانی (٨٨) ئایەته.

سورەتی (ص) سورەتێکی مەککی یە، لەسەرەتادا خوا سوێند بە قورئان دەخوات ، وەباسی عەقیدە دەکات ، وه باسی هەڵوێستی کافران دەکات کە پێیان سەیرە پێغەمبەر داوای یەك خواپەرستی دەکات (أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ (ص:٥)

واته: کافران گوتیان (محمد) خوایەکیانی هەموو کردە یەك خوا ، بەراستی ئەوە شتێکی سەیرە

وه باسی چیرۆکی (داود وسلیمان) دەکات کە باب وکورن ، و پادشاوپێغەمبەریشن .

-ئایا بۆچی ناونراوە (ص) ؟ چونکە بە حەرفی (ص) دەست پێ دەکات و یەکێکە لە حروف هیجائی .

### ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١-٨) سورەتی (ص)

(بِسۡمِ اللَّـهِ الرَّحۡمَٰنِ الرَّحِيمِ . صٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ١ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي عِزَّةٖ وَشِقَاقٖ ٢ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّن قَرۡنٖ فَنَادَواْ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٖ ٣ وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡۖ وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ ٤ أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ ٥ وَٱنطَلَقَ ٱلۡمَلَأُ مِنۡهُمۡ أَنِ ٱمۡشُواْ وَٱصۡبِرُواْ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمۡۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٞ يُرَادُ ٦ مَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِي ٱلۡمِلَّةِ ٱلۡأٓخِرَةِ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا ٱخۡتِلَٰقٌ ٧ أَءُنزِلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ مِنۢ بَيۡنِنَاۚ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّن ذِكۡرِيۚ بَل لَّمَّا يَذُوقُواْ عَذَابِ ٨ )

واته : به(صاد) دەخوێنرێتەوه و سەیری سەرەتای سورەتی (البقره) بکه بۆ مانای ئەم جۆره پیتانه سوێند به قورئانی خاوەن رێز و پەند و ئامۆژگاری.(١) بەڵام ئەوانەی بێ باوەڕن ڕۆ چوون لە خۆ بەگەورە زانین و دژایەتیدا بەرانبەر ئیسلام و شوێن کەوتووانی.(٢) چەندەها گەلمان پێش ئەوان (کافرانی مەککه) لەناو برد ئینجا هاواریان کرد له حاڵێکدا کاتی ڕزگار بوون نەما بوو.(٣) سەریان سوڕدەما کە ترسێنەرێکیان لە خۆیان بۆ هاتووه وه بێ باوەڕان دەیان وت ئەم (پێغەمبەره) جادوو گەرێکی زۆر درۆزنه.(٤) ئایا ئەو (پێغەمبەره) هەموو خواکانی کردۆته یەك خوا، بەڕاستی ئەمە (کە یەك خوا ببێ) شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەره.(٥) وه گەورەکانی(قوڕەیش لەگەڵ پێغەمبەر قسەیان کرد و هەڵسان) به پەله دەرچوون (بە خەڵکیان وت) بڕۆن و خۆگر بن لەسەر (پەرستنی) خواکانتان بەڕاستی ئەمە (ی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)) دەیلێ شتێکه له ئێوه داوا کراوه تا ببێته گەورەی هەموو عەرەب .(٦) ئەمەمان نەبیستووه لە کۆتا ئاییندا (که نەسرانی یه) ئەمه تەنیا شتێکی هەڵبەستراوه.(٧) ئایا چۆن وەحی لەناو هەموومان دا بۆ ئەو موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) دابەزێنراوه (نەخێر ڕاست ناکەن) بەڵکو ئەوانه له گوماندان لەقورئانەکەی من (نەخێر وانیه) بەڵکو ئەوانە هێشتا سزای منیان نەچەشتووه بۆیه باوەڕ ناهێنن.(٨)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەته پیرۆزه چی بوو؟

١- (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: نَزَلَ (ص وَالْقُرْآنِ ذِي الذِّكْرِ) فِيهِمْ وَفِي مَجْلِسِهِمْ ذَلِكَ يَعْنِي مَجْلِسَ أَبِي طَالِبٍ، وَأَبِي جَهْلٍ وَاجْتِمَاعِ قُرَيْشٍ إِلَيْهِمْ حِينَ نَازَعُوا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) رواه الحاكم في المستدرك وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ وَلَمْ يُخْرِجَاهُ ووفقه الذهبي وقال والعباس ثقة

واته: ئیبنو عەباس دەڵێ: ئـەم ئایەتـە (ص وَالْقُرْآنِ ذِي الذِّكْرِ) دەربـارەی کـۆڕی ئەوانـە دابەزیوە، واتە: کۆڕی (ئەبو تالیب و ئـەبو جـەهل) و کۆبونـەوەی (قـوریش) بۆیـان ، کـە کێشەیان بوو دەربارەی پێغەمبەر .

(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: مَرِضَ أَبُو طَالِبٍ، فَجَاءَتْ قُرَيْشٌ، وجاء النبي صلى اللّه عليه وسلم، وَعِنْدَ رَأْسِ أَبِي طَالِبٍ مَجْلِسُ رَجُلٍ، فَقَامَ أَبُو جَهْلٍ كَيْ يَمْنَعَهُ ذَلِكَ، فَشَكَوْهُ إِلَى أَبِي طَالِبٍ فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي مَا تُرِيدُ مِنْ قَوْمِكَ؟ قَالَ: يَا عَمِّ إِنَّمَا أُرِيدَ مِنْهُمْ كَلِمَةً تَذِلُّ لَهُمْ بِهَا الْعَرَبُ وَتُؤَدِّي إِلَيْهِمُ الْجِزْيَةَ بِهَا الْعَجَمُ (قَالَ: وَمَا الْكَلِمَةُ؟) قَالَ: كَلِمَةٌ وَاحِدَةٌ، قَالَ: مَا هِيَ؟ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَقَالُوا: أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهًا وَاحِدًا؟ قَالَ: فَنَزَلَ فِيهِمُ الْقُرْآنُ: ص وَالْقُرْآنِ ذِي الذِّكْرِ بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ حَتَّى بَلَغَ إِنْ هَذَا إِلَّا اخْتِلَاقٌ.

قَالَ الْمُفَسِّرُونَ: لَمَّا أَسْلَمَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ شَقَّ ذَلِكَ عَلَى قُرَيْشٍ وَفَرِحَ الْمُؤْمِنُونَ. قَالَ الْوَلِيدُ بْنُ الْمُغِيرَةِ لِلْمَلَأِ مِنْ قُرَيْشٍ- وَهُمُ الصَّنَادِيدُ وَالْأَشْرَافُ-:

امْشُوا إِلَى أَبِي طَالِبٍ. فَأَتَوْهُ فَقَالُوا لَهُ: أَنْتَ شَيْخُنَا وَكَبِيرُنَا وقد عَلِمْتَ مَا فَعَلَ هَؤُلَاءِ السُّفَهَاءُ، وَإِنَّا أَتَيْنَاكَ لِتَقْضِيَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ ابْنِ أَخِيكَ. فَأَرْسَلَ أَبُو طَالِبٍ إلى النبي صلى اللّه عليه وسلم فَدَعَاهُ فَقَالَ (لَهُ) يَا ابْنَ أَخِي، هَؤُلَاءِ قَوْمُكَ يَسْأَلُونَكَ ذَا السَّوَاءِ فَلَا تَمِلْ كُلَّ الْمَيْلِ عَلَى قَوْمِكَ. فَقَالَ: وَمَاذَا يَسْأَلُونِي؟ قَالُوا: ارْفُضْنَا وَارْفُضْ ذِكْرَ آلِهَتِنَا وَنَدَعُكَ وَإِلَهَكَ، فقال النبي صلى اللّه عليه وسلم: أَتُعْطُونِي كَلِمَةً وَاحِدَةً تَمْلِكُونَ بِهَا الْعَرَبَ وَتَدِينُ لَكُمْ بِهَا الْعَجَمُ؟ فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ: لِلَّهِ أَبُوكَ لَنُعْطِيَنَّكَهَا وَعَشْرَ أَمْثَالِهَا، فقال النبي صلى اللّه عليه وسلم: قُولُوا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ. فَنَفَرُوا مِنْ ذَلِكَ وَقَامُوا فَقَالُوا: أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهًا وَاحِدًا كَيْفَ يَسَعُ الْخَلْقَ كُلَّهُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِمْ هَذِهِ الْآيَاتِ (إِلَى قَوْلِهِ) : كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ)

أسباب نزول القرآن للواحدي قال المحقق كمال بسيوني زغلول: أخرجه الترمذي في التفسير (٣٢٣٢) وقال: هذا حديث حسن.وأخرجه النسائي في التفسير (٤٥٦) .وابن جرير في تفسيره (٢٣/ ٧٩) وأخرجه أحمد في مسنده (١/ ٢٢٧) .وأخرجه الحاكم في

المستدرك (٢/ ٤٣٢) وصححه ووافقه الذهبي، قلت: في تصحيحه نظر حيث إن في إسناده عند الحاكم يحيى بن عمارة قال الحافظ في التقريب: مقبول، وقال في التهذيب:ذكره ابن حبان في الثقات أ. هـ.وزاد السيوطي نسبته في الدر (٥/ ٢٩٥) لابن أبي شيبة وعبد بن حميد وابن المنذر وابن حاتم وابن مردويه.

(ئيبن عەباس) دەڵێ: کاتێ کە(ئەبوتالیب) نەخۆشکەوت، دەستەیەك لەناودارانی قورەیش –بە هاوڕێیەتی (ئەبوجەهل) – چوون بۆلای و پێیان وت: تۆ دەزانی برازاکەت چی دەکاو، چی دەڵێ بەخواکانمان؟! بەڵکو بنێری ئامۆژگاری بکەیت! ئەویش ناردی وهات و چووە ژوورەوە و، دیتی لەتەنیشت ئەبووتالیبی مامیەوە جێی تەنها کەسێ ماوە جا (ئەبو جەهل) لەترسی ئەوە نەوەك موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) لەوێ دانیشێ و، بەقسە شیرینەکانی ئەبوتاڵیب نەرم بکا، پەلاماری داو چووە پاڵی ئەبووتاڵیب، ئیتر جێ بۆ پێغەمبەر نەمایەوەو لەلای دەرگاکەوە دانیشت! ئەمیش وتی برازاکەم! بۆ چ خزمان گلەییت لێدەکەن سەبارەت بە خواکانیان؟! فەرمووی: مامە! من تەنها یەك قسەم هەیە، ئەگەر بیڵێن و بەگوێم بکەن ئەوا هەمووعەرەب گوێرایەڵ دەبن و، ئەگەر عەجەمەکانیش نەیلێن سەرانەی خۆیان دەدەن. جا هەموویان لەقسەکەی داچڵەکین و وتیان: ئێمە لەباتی ئەو، ئەو وشەیە دەڵێین. ئەبووتاڵیب وتی: برازاکەم! وشەکەی تۆ چییە؟ فەرمووی: (لا إله إلا الله) یە. پاش ئەوە هەموو تووڕە بوون و هەڵسان و ڕۆیشتن و خۆیان ئەتەکان و بەدەم ڕێگەوە دەیانگوت: (أجعل الالهه إلها واحدا !). (ئیبن جەریر، ئەحمەد، نەسائیی، ترمزیی) ریوایەتیان کردووە). (رامان)

****************

## وتاری ژماره (٩٢) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (الزمر)

سـورەتی (الزمـر) سـورەتێکی مەککـەی یـە، لـە ریزبەنـدا ژمـارە(٣٨) ە وە ژمـارەی ئایەتەکانی (٨٨) ئایەتە

سـەرەتا دەفـەرمووی قورئـان موعجیزیـەکی زینـدووی پێغەمبـەرە کـە لایـەن خـوا بـۆی دابەزیوە،وە دەفەرمووی فەرقی زۆرە ئەوەی زۆرخوایـان دەپەرستێ و ئـەوەی یـەك خـوا دەپەرستێ ، وە داوای گەرانـەوە دەکـات بـۆ لای خـوا ، لـە کۆتایـدا باسـی نـەفخ و دونیـا تێکچوون دەکات .

–ئایا بۆچـی نـاونراوە (الزمـر) ؟ چـونکە باسـی دوو تـاقم (الزمرە)دەکـات، تـاقمی ئـەهلی بەهەشت و تاقمی ئەهلی دۆزەخ .

–ئایا ئەم سورەتە لە کوێ دابـەزیوە ؟ عبـدالله کـوڕی عبـاس دەڵـێ سـورەتی (الزمـر) لـە مەککە دابەزیوە جگە لەم (٣) ئایەتە نەبێ دەربارەی وەحشـی دابـەزیون کـاتێ (حمـزە) دەکوژێ که ئەمانەن:

(قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ٥٣ وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُواْ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ٥٤ وَٱتَّبِعُوٓاْ أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ٥٥ ) الزمر

مانای ئەم (٣) ئایەتە(ئەی موحەممەد(صلی الله علیـە وسـلم) بڵـێ: ئـەی بەنـدەکانم ئـەی ئەوانەی کە خۆتان زۆر گوناهبار کردووە نائومێد مەبن لە میهرەبانی و بەزەیی خوا چونکە بێگومان خوا لە هـەموو گوناهـەکانتان خـۆش دەبێـت بەڕاسـتی هـەر ئـەوە لێبـوردەی بـە

بـەزەیی یـە.(٥٣) وە بگەڕێنـەوە بـۆ لای پـەروەردگارتان وە گـەردن کەچـی ئـەو بـن بـەر لەوەی سزاتان بۆ بێت پاشان یارمەتی نـادرێن (لەلایـەن هـیچ کـەس) ەوە.(٥٤) وە شـوێن چاکترین شتێ بکەون کە نێردراوەتە خوارەوە بۆتان لە پەروەردگارتانەوە بـەر لـەوەی لـە ناکاودا سزاتان بۆ بێت کە ئێوە هەر هەستی پێ نەکەن.(٥٥) (پوختەی تەفسیر)

*************************

## وتاری ژماره (٩٣) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### ١-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١٧-١٨ ) سورەتی الزمر

﴿وَٱلَّذِينَ ٱجۡتَنَبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعۡبُدُوهَا وَأَنَابُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰۚ فَبَشِّرۡ عِبَادِ ١٧ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٨﴾ الزمر

واته : وه کەسانێ کە لە پەرستنی بت (و هەموو پەرستراوێکی تر) خۆیان پاراستووه وه گەڕاونەتەوه بۆ لای خوا مژدەی گەورە تەنیا بۆ ئەوانە کەواتە مژدە بدە بەندەکانم.(١٧) ئەوانەی گوێ دەگرن بۆ قسەو گوفتار ئینجا شوێن چاکترینی ئەو (قسانە) دەکەون ئەوانە کەسانێکن خودا ڕێنموونیی کردوون هەر ئەوانەن خاوەنانی ژیری و هۆش.(١٨) (پوختەی تەفسیر)

(فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓ )(ئیبن عەباس) ئەڵێ: مەبەست ئەوپیاوەیە کە گوێی لە چاك ولەخراپەوه ئەبێ بەڵام ئەو پەیرەوی لەچاکەکە ئەکاو، واز لە خراپەکە دێنێ. هەندێ ئەڵێن: ئەوپیاوەیە کە قورئان وغەیری قورئان ئەبیسێ، پاشان گوێ هەربۆ قورئانەکە ئەگرێ. هەندێکی دیکە ئەڵێن: مەبەست ئەوکەسەیە کە هەم مافی تۆڵەو، هەم مافی لێبوردنی هەیە، کەچی ئەو تۆڵە ناسێنێو دەبوورێ ئەوانەن کەخوا بەرەوخۆی ڕێنومایی کردو ون بۆئەوەی خۆی پێیخۆشە هەرئەوانەشن ژیرو فامیدەو خاوەن ئاوەز (رامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَن ابْن عمر رَضِي الله عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ سعيد بن زيد وَأَبُو ذَر وسلمان يتبعُون فِي الْجَاهِلِيَّة أحسن القَوْل وَأحسن القَوْل وَالْكَلَام (لَا إِلَه إِلَّا الله )قَالُوا بهَا فَانْزِل الله تَعَالَى على نبيه صلى الله عَلَيْهِ وَسلم (يَسْتَمِعُون القَوْل فيتبعون أحْسنه) الْآيَة) الدر المنثور للسوطي

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە خوا لەخۆی وبابی رازی بێ دەڵێ: (سعید کوڕی زید و ئەبو زەررو سلمان) خوا لێیان رازی بێ ، لەسەردەمی جاهیلی بە دوای جوانترین قسە دەکەوتن ، چاکترین و باشترین قسەش (لَا إِلَه إِلَّا الله) یە، دەڵێن : بۆیە خوا بۆ پێغەمبەرەکەی دابەزندوفەرمووی (يَسْتَمِعُون القَوْل فيتبعون أحْسنه) واتە: گوێ لە قسە رادەگرن و بە دوای باشترین دەکەون ، کە ئیسلام لە هەموو ئایینێك چاکترە. بە دوای کەوتن.

٢-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: إِنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ – رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ – آمَنَ بِالنَّبِيِّ – صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – وَصَدَّقَهُ، فَجَاءَ عُثْمَانُ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ وَطَلْحَةُ وَالزُّبَيْرُ وَسَعِيدُ بْنُ زَيْدٍ وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ فَسَأَلُوهُ، فَأَخْبَرَهُمْ بِإِيمَانِهِ فَآمَنُوا، وَنَزَلَتْ فِيهِمْ ( فَبَشِّرْ عِبَادِ الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ) قَالَ: يُرِيدُ مِنْ أَبِي بَكْرٍ (فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ) اسباب النزول للواحدي

واتە: لەئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: ئەبوبەکری صیدیق خوا لێ رازی بێ ، ئیمانی بە پێغەمبەر هێنا وە بە راستی دانا، چەند برادەرێکی هەبوون هاتنە لای کە ئەمانە بوون (عُثْمَانُ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ وَطَلْحَةُ وَالزُّبَيْرُ وَسَعِيدُ بْنُ زَيْدٍ وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ) پرسیاریان لێ کرد دەربارەی ئیمان هێنانی ، ئەویش هەواڵی پێدان کە موسڵمان بووە ، ئەوانیش هەموویان ئیمانیان هێنا ، جا دەبارەیان ئەم ئاتەتە دابەزی (فَبَشِّرْ عِبَادِ الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ) دەڵێ مەبەستی ئەبوبەکرە (فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ) واتە : بە دوای چاکترینیان دەکەون.

) شا یەنی باسە ئەم پیاوانە دوای بوونە کەڵە پیاوی گەورە و قیادەی ئیسلامیان گرتە ئەستۆ.

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی (٥٣) سورەتی الزمر

﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ٥٣﴾ الزمر

**واتە** : (بانگەواز بۆ تەوبە، پێش هاتنی سزا: (قل یا عبادي الذین أسرفوا علي أنفسهم) ئەی موحەممەد ! (صلی اللە علیە وسلم) لە منەوە بڵێ: ئەی بەندەکانی من! ئەی ئەوانەی ستەم و زیادە رۆییتان لە خۆتان کردووە !( لا تقنطوا من رحمة الله) ئێوە لەرەحمەت و میهرەبانی خوا بێ ئومێد مەبن، (ئیبن عەباس) دەڵێ: برێ لە موشریك و هاوبەشدانەرەکان، خەڵکێکی زۆریان کوشتبوو، زینایان کردبوو، پاشان هاتنە لای پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) وتیان: ئەو قسەو باسە تۆ دەیڵێی شتێکی زۆر چاکە، ئەی خۆزگە کەفارەتی گوناحەکانمانت پێ دەوتین: ئەو جا ئایەتی (والذین لایدعون مع الله إلها آخر ولا یقتلون النفس التي حرم الله إلا بالحق ولا یزنون ) ، وە ئایەتی (قل یاعبادي الذین أسرفوا علي أنفسهم لا تقنطوا من رحمة الله ..)، هات. ، متفق علیە/ (فتح الباري: ٤١١/١٨ مسلم: ١١٣/١) إن الله یغفر الذنوب جمیعا) بەڕاستی خوا لە هەموو گوناحێ خۆش ئەبێ دیارە ئەم بانگەشەیە بۆ تەواوی تاوانبارانە کە بگەڕێنەوە بۆلای خوا، ئەگەرچی گونا هیشیان بەئەندازەی کەفی سەر زەریاکان بێ، چونکە ئەوە لێبوردەو میهرەبان (رامان)

-( وَقِيلَ إنَّ هَذِهِ الْآيَةَ أَرْجَى آيَةٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ تَعَالَى) گوتراوە: بە ئومێدترین ئایەتە لە قورئان

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ نَاسًا مِنْ أَهْلِ الشِّرْكِ كَانُوا قَدْ قَتَلُوا وَأَكْثَرُوا وَزَنَوْا وَأَكْثَرُوا فَأَتَوْا مُحَمَّدًا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالُوا إِنَّ الَّذِي تَقُولُ وَتَدْعُو إِلَيْهِ لَحَسَنٌ لَوْ تُخْبِرُنَا أَنَّ لِمَا عَمِلْنَا كَفَّارَةً فَنَزَلَ وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَنَزَلَتْ قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ ) رواه البخاري

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە خوا لە خۆی بابی رازی بێ دەڵێ : کەسانێك هەبوون لە ئەهلی هاوبەشدانەران بۆ خوا ، خەڵکیان کوشتبوو بە زیادەوە ، زینایان کردبوو بە زیادەوە، هاتنە لای پێغەمبەر گوتیان ئەوەی تۆ دەڵێ و خەڵکی بۆ بانگ دەکەی شتێکی جوانە، ئایا ئەوەی ئێمە کردومانە لێبوردنی هەیە ، خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند (وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ) واتە: ئەوانەی هاوار بۆ پەرستراو ناکەن لەگەڵ خوا ، وە خەڵکی بەناحەق ناکوژن، و زینا ناکەن) دوایش ئەم ئایەتەی دابەزاند (قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ) واتە: ئەی (محمد) بە بەندەکانم بلێ ئەوانەی گوناحیان کردوە نائومید مەبن لە رەحمەتی خوا.

٢-(عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، قَالَ: لَمَّا اجْتَمَعْنَا لِلْهِجْرَةِ اتَّعَدْتُ أَنَا وَعَيَّاشُ بْنُ أَبِي رَبِيعَةَ، وَهِشَامُ بْنُ الْعَاصِي الْمَيْضَاةَ، مَيْضَاةَ بَنِي غِفَارٍ فَوْقَ سَرِفٍ وَقُلْنَا: أَيُّكُمْ لَمْ يُصْبِحْ عِنْدَهَا فَقَدِ احْتَبَسَ فَلْيَنْطَلِقْ صَاحِبَاهُ، فَحُبِسَ عَنَّا هِشَامُ بْنُ الْعَاصِ فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ فَنَزَلْنَا فِي بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ بِقُبَاءَ وَخَرَجَ أَبُو جَهْلِ بْنُ هِشَامٍ وَالْحَارِثُ بْنُ هِشَامٍ إِلَى عَيَّاشِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ، وَكَانَ ابْنَ عَمِّهِمَا وَأَخَاهُمَا لِأُمِّهِمَا حَتَّى قَدِمَا عَلَيْنَا الْمَدِينَةَ فَكَلَّمَاهُ فَقَالَا لَهُ: إِنَّ أُمَّكَ نَذَرَتْ أَنْ لَا تَمَسَّ رَأْسَهَا بِمِشْطٍ حَتَّى تَرَاكَ، فَرَقَّ لَهَا، فَقُلْتُ لَهُ: يَا عَيَّاشُ إِنَّهُ وَاللَّهِ إِنْ يُرِيدُكَ الْقَوْمُ إِلَّا عَنْ دِينِكَ فَاحْذَرْهُمْ فَوَاللَّهِ لَوْ قَدْ أَذَى أُمَّكَ الْقَمْلُ لَقَدِ امْتَشَطَتْ، وَلَوْ قَدِ اشْتَدَّ عَلَيْهَا حَرُّ مَكَّةَ أَحْسَبُهُ

قَالَ: لَاسْتَظَلَّتْ. فَقَالَ: إِنَّ لِي هُنَاكَ مَالًا فَآخُذُهُ. قَالَ: قُلْتُ: وَاللَّهِ إِنَّكَ لَتَعْلَمُ أَنِّي مِنْ أَكْثَرِ قُرَيْشٍ مَالًا فَلَكَ نِصْفُ مَالِي، وَلَا تَذْهَبْ مَعَهَا، قَالَ: فَأَبَى عَلَيَّ إِلَّا أَنْ يَخْرُجَ مَعَهُمَا فَقُلْتُ لَهُ لَمَّا أَبَى عَلَيَّ: أَمَا إِذْ فَعَلْتَ مَا فَعَلْتَ فَخُذْ نَاقَتِي هَذِهِ فَإِنَّهَا نَاقَةٌ ذَلُولٌ فَالْزَمْ ظَهْرَهَا، فَإِنْ رَابَكَ مِنَ الْقَوْمِ رَيْبٌ فَانْجُ عَلَيْهَا، فَخَرَجَ مَعَهُمَا عَلَيْهَا حَتَّى إِذَا كَانُوا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ، قَالَ أَبُو جَهْلِ بْنُ هِشَامٍ: وَاللَّهِ لَقَدِ اسْتَبْطَأَتْ بَعِيرِي هَذَا أَفَلَا تَحْمِلُنِي عَلَى نَاقَتِكَ هَذِهِ؟ قَالَ: بَلَى، فَأَنَاخَ وَأَنَاخَا لِيَتَحَوَّلَ عَلَيْهَا، فَلَمَّا اسْتَوَوْا بِالْأَرْضِ عَدَيَا عَلَيْهِ وَأَوْثَقَاهُ، ثُمَّ أَدْخَلَاهُ مَكَّةَ وَفَتَنَاهُ فَافْتُتِنَ، قَالَ: وَكُنَّا نَقُولُ: وَاللَّهِ لَا يَقْبَلُ اللَّهُ مِمَّنِ افْتُتِنَ صَرْفًا وَلَا عَدْلًا، وَلَا تُقْبَلُ تَوْبَةُ قَوْمٍ عَرَفُوا اللَّهَ ثُمَّ رَجَعُوا إِلَى الْكُفْرِ لِبَلَاءٍ أَصَابَهُمْ، قَالَ: وَكَانُوا يَقُولُونَ ذَلِكَ لِأَنْفُسِهِمْ فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ أَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِمْ وَفِي قَوْلِنَا لَهُمْ وَقَوْلِهِمْ لِأَنْفُسِهِمْ (قُلْ: يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ، إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا) (الزمر: ٥٣) إِلَى قَوْلِهِ (وَأَنْتُمْ لَا تَشْعُرُونَ) (الزمر: ٥٥) قَالَ عُمَرُ: فَكَتَبْتُهَا فِي صَحِيفَةٍ وَبَعَثْتُ بِهَا إِلَى هِشَامِ بْنِ الْعَاصِي قَالَ هِشَامٌ: فَلَمْ أَزَلْ أَقْرَؤُهَا بِذِي طُوًى أُصْعِدُ بِهَا فِيهِ حَتَّى فَهِمْتُهَا، قَالَ: فَأُلْقِيَ فِي نَفْسِي أَنَّهَا إِنَّمَا أُنْزِلَتْ فِينَا وَفِيمَا كُنَّا نَقُولُ فِي أَنْفُسِنَا، وَيُقَالُ: فِينَا فَرَجَعْتُ فَجَلَسْتُ عَلَى بَعِيرِي فَلَحِقْتُ بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْمَدِينَةِ) رواه البزار

واتە: لەعومەری کوڕی خەتابەوە هاتووە دەڵێ: بۆ کۆچ کردن بۆ مەدینە (من و عیاش و هیشام) ڕێکەوتین بەیەکەوە کۆچ بکەین و شوێنێکمان دیاری کرد ، گوتمان : هەرکەسێك نەهاتە ئەم شوێنە دیارە گیراوە ، جا (هشام) نەهات ، جا کە گەیشتینە مەدینە لە قوبا لای بەنی عەمری کوڕی سالم دابەزین (ابوجهل کوڕی هشام و حارسی کوڕی هشام) هاتنە دوای (عیاشی کوڕی ڕەبیعە) لە لایەکی ئامۆزایان بوو ، لەلایەکی دیکە برایان بوو لە دایکیان، بە دوامان گەیشتنە مەدینە، قسەیان لەگەڵ کرد گوتیان : ئەی (عیاش) دایکت سوێندی خواردەوە خۆی نەشوات و شانەی نەکات تاکو نەتبینێ ، (عمر) دەڵێ: گوتم : ئەی عیاش سوێند بە خوا دەیانەوی لە ئاینی پاشگەزت بکەنەوە ئاگاداری خۆتەبە، سوێند بەخوا ئەگەر دایکت ئازاری گەیشتی وئەسپێی کەوتە سەری خۆی دەشوا، ئەگەر

گەرماشی گەیشتێ دەچێتە بەر سێبەر ، گوتی : ئاخر ماڵم لەوێ بەجێ هیشتووە دەچمەوە ماڵەکەم دەهێنمەوە ، گوتم: ئەی عیاش تۆ دەزانی من لەناو قوریشیەکان ماڵم زۆرە نیوەی ماڵم بۆ تۆ، بەس مەگەرێوە لەگەڵیان، بەقسەی نەکردم ، گوتم : مادام وایە ئەو وشترەی من ببە لەگەڵ خۆت چونکە چووست وچالاکە ئەگەر زانیت فێڵە خۆتی پێ قورتار بکە، گەراوە لەگەلیان لە نزیك (مەککە) ئەبو جەهل دەڵێ وشتری من هیلاك وماندو بووە ، لەگەڵ خۆم سواری وشترەکەت بکە، ئەویش دەڵێ باشە، لەگەڵی سوار دەبێ بە هەردووکیان پەڵ بەستی دەکەن و دەبینەوە مەککە ، (عمر) دەڵێ: ئێمە دەمانگوت سوێند بەخوا ئەوانەی خۆیان توشی ئەم وەزعە کرد خوا واجب و سوننەتیان لێ قەبول ناکات ، وە تۆبەشیان لێ قەبول ناکات، چونکە خوایان ناسیوە و دوای گەرانەوە سەر کوفر، خۆیان توشی بەلا کرد ، ئەوانیش بەخۆیان هەمان قسەیان دەکرد دەیانگوت خوا عەفومان ناکات ، بەلام کە پێغەمبەر گەیشتە مەدینە خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند دەربارەی قسەی ئێمە وئەوان (قُلْ: يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ، إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا) (الزمر: ٥٣) إِلَى قَوْلِهِ (وَأَنْتُمْ لَا تَشْعُرُونَ) (الزمر: ٥٥)) (عمر) دەڵێ : بەدەستی خۆم ئایەتەکم نوسی رەوانەم کرد بۆ (هشام کورِ عاصی) هشام دەڵێ : هەر دەمخوێندەوە تێی نەدەگەیشتم تاکو خوا خستیە دڵمەوە، بۆ ئێمەو ئەوەی دەمانگوت بەرامبەر خۆمان دابەزیوە، دەیانگوت بۆ ئێوە دابەزیوە ، دەڵێ : گەرامەوە سواری وشترەکەم بووم و گەیشتمەوە پێغەمبەر)

تێبینی: دوای پێغەمبەر فەرمان دەکات بۆ رزگاردنیان یەکێ لە هاوەڵان بەناوی (الولید کوری الولید) شەو بە دزی دەچێ (هشام و عیاش ) رزگار دەکات ، زنجیریان دەپسێتێ. ئەمەش دەقی رووداوەکەیە ئیبنو هیشام هێناویەتی بەم شێوەیە:

(خُرُوجُ الْوَلِيدِ بْنِ الْوَلِيدِ إلَى مَكَّةَ فِي أَمْرِ عَيَّاشٍ وَهِشَامٍ) :

قَالَ ابْنُ هِشَامٍ: فَحَدَّثَنِي مَنْ أَثِقُ بِهِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ، وَهُوَ بِالْمَدِينَةِ: مَنْ لِي بِعَيَّاشِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ، وَهِشَامِ بْنِ الْعَاصِي؟ فَقَالَ الْوَلِيدُ بْنُ الْوَلِيدِ بْنِ الْمُغِيرَةِ: أَنَا لَكَ يَا

رَسُولَ اللَّهِ بِهِمَا، فَخَرَجَ إلَى مَكَّةَ، فَقَدِمَهَا مُسْتَخْفِيًا، فَلَقِيَ امْرَأَةً تَحْمِلُ طَعَامًا، فَقَالَ لَهَا: أَيْنَ تُرِيدِينَ يَا أَمَةَ اللَّهِ؟ قَالَتْ: أُرِيدُ هَذَيْنِ الْمَحْبُوسَيْنِ- تَعْنِيهِمَا- فَتَبِعَهَا حَتَّى عَرَفَ مَوْضِعَهُمَا، وَكَانَا مَحْبُوسَيْنِ فِي بَيْتٍ لَا سَقْفَ لَهُ، فَلَمَّا أَمْسَى تَسَوَّرَ عَلَيْهِمَا، ثُمَّ أَخَذَ مَرْوَةً فَوَضَعَهَا تَحْتَ قَيْدَيْهِمَا، ثُمَّ ضَرَبَهُمَا بِسَيْفِهِ فَقَطَعَهُمَا، فَكَانَ يُقَالُ لِسَيْفِهِ: (ذُو الْمَرْوَةِ) لِذَلِكَ، ثُمَّ حَمَلَهُمَا عَلَى بَعِيرِهِ، وَسَاقَ بِهِمَا، فَعَثَرَ فَدَمِيَتْ أُصْبُعُهُ، فَقَالَ: (هَلْ أَنْتِ إلَّا أُصْبُعٌ دَمَيْتِ ... وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ مَا لَقَيْتِ) ثُمَّ قَدِمَ بِهِمَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ.) سيرة ابن هشام

## پێغەمبەر دوعای بۆ دەكردن تاكو خوا رزگاریان بكات:

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَدْعُوَ عَلَى أَحَدٍ أَوْ يَدْعُوَ لِأَحَدٍ قَنَتَ بَعْدَ الرُّكُوعِ فَرُبَّمَا قَالَ إِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ: اللَّهُمَّ أَنْجِ الْوَلِيد بن الْوَلِيد وَسَلَمَة ابْن هِشَام وَعَيَّاش بن رَبِيعَةَ اللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ وَاجْعَلْهَا سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ يَجْهَرُ بِذَلِكَ وَكَانَ يَقُولُ فِي بَعْضِ صَلَاتِهِ: اللَّهُمَّ الْعَنْ فُلَانًا وَفُلَانًا لِأَحْيَاءٍ مِنَ الْعَرَبِ حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ: (لَيْسَ لَك من الْأَمر شَيْء) الْآيَة) مُتَّفق عَلَيْهِ

## موژدێكی خۆشی پێغەمبەر:

(وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَخْطَأْتُمْ حَتَّى تَمْلأَ خَطَايَاكُمْ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ ثُمَّ اسْتَغْفَرْتُمُ اللَّهَ لَغَفَرَ اللَّهُ لَكُمْ. وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ وَلَوْ لَمْ تُخْطِئُوا لَجَاءَ اللَّهُ بِقَوْمٍ يُخْطِئُونَ ثُمَّ يَسْتَغْفِرُونَ اللَّهَ فَيَغْفِرُ لَهُمْ) رواه احمد قال شعيب ارنوؤط حسن لغيره وقال الالباني صحيح

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی: سوێندم بەوەی گیانی منی بەدەستە ، ئەگەر هێندە گوناحان بكەن نێوان زەوی و ئاسمان پڕ بكەن ، دوای تۆبە بكەن، خوا تۆبەتان لێ

قەبوول دەكات ، وە سوێندم بەوەی گیانی منی دەستە ئەگەر ئێوە گوناحان نەکەن، خـوا کەسانێك دێنێـت گوناحـان دەكـەن ، دوای داوای لێبـوردن لـە خـوا دەكـەن خـواش لێیـان دەبورێ.

## لێبوردنی خوا پڕاو پڕی ئاسمانە :

(يَا ابنَ آدَم إنَّكَ مَا دَعَوتَنِي إلا غَفَرتُ لَكَ عَلَى ما كَانَ مِنكَ وَلا أُبَالِي يَا ابنَ آدَم لَو بَلَغتَ ذُنُوُكَ عَنَانَ السَّماءِ ثُمَّ استَغفَرتَنِي غَفَرتُ لَكَ وَلا أُبَالي، يَا ابنَ آدَم إنَكَ لَو أتيتَنِي بِقُرابِ الأرضِ خَطَايَا ثُمَّ لَقِيتَنِي لا تُشرِكُ بِي شَيئاً لأتَيتُكَ بِقُرابِهَا مَغفِرَةً)، رواه الترمذي وقال: حديث حسن غريب.

واتە: خوای پاك و بێگەرد ئەفـەرموێت ئـەی ئـادەمیزاد هـەرکاتێك بپاڕێیتـەوە و تکـام لـێ بکەیت هەر لێت خۆش ئەبم–هەرچیت کردبێت– و گرینگ نی یە بەلامەوە، ئەی ئـادەمیزاد ئەگەر تاوانەکانت بگەنـە بـەرزی ئاسمـان لـە پاشـاندا داوای لێبوردنـت لێ کـردم هـەر لێـت ئەبورم و گرنگ نی یە بەلامەوە، ئەی ئادەمیزاد ئەگەر بـە ئەنـدازەی پـڕی زەوی تاوانـەوە پێم بگەیت بەمەرجێك هاوبەشـت بـۆ دانـەنابم، بەئەنـدازەی لێواولێـوی زەوی لێ بوردنـەوە بەرەو ڕووت دێم.

### هەموو شەوێ خوا دێتە ئاسمانی یەکەم بۆ لێبوردنی خەڵکی:

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الْآخِرُ يَقُولُ مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ ) صحيح البخاري

واتە: لە ئەبو هوریرەوە هاتووە دەڵێ : پێغەمبەر فەرموویەتی : هەموو شەوێك خوای گەورە دێتە ئاسمانی دونیا ، کاتێ سێیەکی کۆتایی شەو دەمێنێ، دەفەرموێت: کێ لێم دەپارێتەوە تاکو وەڵامی بدەمەوە، کێ داوایەکی هەیە تاکو پێ ببەخشم، کێ داوای لێ بوردنم لێ دەکات تاکو لێ خۆشم

### چیرۆکێك لەم بارەوە :

کەسێکی بەتەمەن سەفەر دەکات بە پاپۆر ، لەناو پاپۆر پیاوێك دەبینێ، ئافرەتێکی لەگەڵدایە گۆرانی پێ دەڵێ ، خۆشی ناوە ناوە ئارەق دەخواتەوە، موسیقاش لێ دەدات، کابرای بەتەمەن لە دڵی خۆی گوتی : بابچم دەعوەی لەگەڵ بکەم ، چووە لای سەر بردە بن گوێی: گوتی گوێ بگرە بائایەتێکی قورئانت بۆ بخوێنمەوە ، گوتی : بلێ ، گوتی : خوا دەفەرمووی: (قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا)(٧٧ النسا) واتە: ژیانی دونیا کورتە ، قیامەت باشترە بۆ کەسێك تەقوادار بێ، لە قیامەت زوڵم لە کەس ناکرێ. کابرا گوتی : هێشا بۆم بخوێنەوە جا ئەم ئایەتەشی بۆ خوێندەوە (وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ۚ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا ۚ وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟ يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ٢٩) (الكهف)واتە: بلێ حەق (ئەم قورئانە) لەلایەن پەروەردگارتانەوە هاتووە جا هەرکەسێ دەیەوێت با باوەڕبێنێ و

هەرکەسیش دەیەوێت با کافر بێت بەڕاستی ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ ستەمکاران ئاگرێك کە بلێسەکەی (وەکو ڕەشماڵ) دەوریان دەدات وە ئەگەر (لە تینوانا) هاواری ئاو بکەن ئاوێکیان بۆ دەهێنرێ وەك مسی تواوە (یا وەك چلك و چەپەڵی ڕۆن زەیت وایە) ڕوو دوم و چاوەکان دەبرژێنێ ئای چ خواردنەوەیەکی پیس و خراپە و ئای چ شوێن و جێگایەکی خراپە.

کابرا گوتی : ئێستا چی بکەم چاسەری من چییە؟ چۆن خوا عەفوم دەکات ، کابرای بەتەمەن ئەم ئایەتەی بۆ خوێندەوە: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ٥٣﴾ الزمر) **واتە: ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)** بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە خۆتان زۆر گوناهبار کردووە نائومێد مەبن لە میهرەبانی و بەزەیی خوا چونکە بێگومان خوا لە هەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت بەڕاستی هەر ئەوە لێبوردەی بە بەزەیی یە.

لە کۆتایدا کابرا لە کەیف خۆشی ئەم موژدە قورئانییە بورایەوە یەکسەر گیانی دەرچوو ، بوو بە ئاخیر خێر.

**********************

# وتاری ژماره (٩٤) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٦٤-٦٦) سورەتی الزمر

﴿قُلۡ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَأۡمُرُوٓنِّيٓ أَعۡبُدُ أَيُّهَا ٱلۡجَٰهِلُونَ ٦٤ وَلَقَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٦٥ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعۡبُدۡ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ٦٦﴾ الزمر

واته : ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) بڵێ: دەی ئایا ئێوە داوام لێ دەکەن من بێجگە لە خوا شتێکی تر بپەرستم ئەی نەزانان.(٦٤) سوێند بەخوا نیگا کراوە بۆ تۆ وە بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆش ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێ ی بەڕاستی کردەوەت هەڵدەوەشێتەوە وە بێگومان لە زەرەرمەندان دەبیت.(٦٥) وا مەکە بەڵکو تەنها خوا بپەرستە وە لە سوپاس کاران بە.(٦٦)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم (٢) ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- ( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ قُرَيْشًا دَعَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ إِلَى أَنْ يُعْطُوهُ مَالًا فَيَكُونُ أَغْنَى رَجُلٍ بِمَكَّةَ وَيُزَوِّجُونَهُ مَا أَرَادَ مِنَ النِّسَاءِ وَيَطَأُونَ عَقِبَهُ ، فَقَالُوا: هَذَا لَكَ عِنْدَنَا يَا مُحَمَّدُ ، وَكُفَّ عَنْ شَتْمِ آلِهَتِنَا ، وَلَا تَذْكُرْهَا بِشَرٍّ؛ فَإِنْ بَغَضْتَ فَإِنَّا نَعْرِضُ عَلَيْكَ خَصْلَةً وَاحِدَةً ، وَلَكَ فِيهَا صَلَاحٌ قَالَ: (وَمَا هِيَ؟) قَالَ: تَعْبُدُ إِلَهَنَا سَنَةً اللَّاتَ وَالْعُزَّى ، وَنَعْبُدُ إِلَهَكَ سَنَةً قَالَ: (حَتَّى أَنْظُرَ مَا يَأْتِينِي مِنْ رَبِّي) ، فَجَاءَ الْوَحْيُ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ مِنَ اللَّوْحِ الْمَحْفُوظِ: قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ السُّورَةَ ، وَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (قُلْ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَأْمُرُونِّي أَعْبُدُ أَيُّهَا الْجَاهِلُونُ) (الزمر: ٦٤) ، (بَلِ اللَّهَ فَاعْبُدْ وَكُنْ مِنَ الشَّاكِرِينَ) (الزمر: ٦٦) رواه الطبراني في معجمه الصغير ولباب المنقول للسيوطي

واته: له ئیبنو عەباسەوە خوا لێ رازی بێ هاتووە دەڵێ: قوریش داوایان له پێغەمبەر کرد ماڵ وسامانی بدەنێ بیکەنە دەوڵەمەنترین کەسی مەککە ، وە چ ئافرەتێکی بوێ لێ مارەدەکەن ، گوتیان : ئەوە له ئێمەوە بۆ تۆ ئەی (محمد) تۆش وازبێنێ لە جوێندان بە خواکانی ئێمە، بەخراپەش باسیان مەکە، ئەگەر تۆرِنەبی ، ئێمە شتێکت بۆ دەخەینە روو ، بۆ تۆش چاکەی تێدایە ، فەمووی : ئەو شتە چییە؟ گوتیان : سالێك تۆ (االلات والعزی) بپەرستە ،وە ئێمەش سالێك خوای تۆ دەپەرستین ، فەرمووی : با چاوەروان بکەین بزانم خوا چ فەرمانێکم پێ دەکات ، جا وەحی هات لەلایەن خواوە له لەوحی مەحفوزەوە (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ) السُّورَةَ) وە ئەوەش دابەزی (قُلْ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَأْمُرُونِّي أَعْبُدُ أَيُّهَا الْجَاهِلُونَ) (٦٤) واتە: ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) بڵێ: دەی ئایا ئێوە داوام لێ دەکەن من بێجگە لە خوا شتێکی تر بپەرستم ئەی نەزانان. وە (بَلِ اللَّهَ فَاعْبُدْ وَكُنْ مِنَ الشَّاكِرِينَ) (الزمر: ٦٦) واتە: وا مەکە بەڵکو تەنها خوا بپەرستە وە لە سوپاس کاران بە.(٦٦)

## ئەوەی شوکر بێ و ئیمان بێنێ خوا عەزابی نادات:

خوا فەرموویەتی :( مَا يَفۡعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمۡ إِن شَكَرۡتُمۡ وَءَامَنتُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ١٤٧ ) واتە: ئایا خوا چ ئیشێکی هەیە بە سزادانتان ئەگەر سوپاسی بکەن وە باوەری پێ بێنن وە خوا هەمیشە پێزانی سوپاسە و زانایە.

پێویستە شوکری خوا و دایك وباوك بکرێ:

(وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ وَهۡنًا عَلَىٰ وَهۡنٖ وَفِصَٰلُهُۥ فِي عَامَيۡنِ أَنِ ٱشۡكُرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيۡكَ إِلَيَّ ٱلۡمَصِيرُ ١٤)

واتە: ئێمە فەرمانمانداوە بە ئادەمیزاد بە چاك رەفتاری لەگەڵ دایك و باوکیدا، دایکی بە ئێش و ئازارو لاوازی و بێتاقەتیەکی زۆرەوە، (بە پێستی سکی نۆ مانگ) هەڵی گرتووە،

بڕینەوەشی لە دوای دوو ساڵە، فەرمانمان پێدا کە ئـەی ئینسـان سوپاسـگوزاری منـیش و دایك و باوکیشت بە، دڵنیابن کە گەڕانەوەتان هەر بۆ لای منە.(تەفسیری ئاسان)

## پێویستە سوپاسی خەڵکیش بکرێ:

(قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ لَمْ يَشْكُرِ النَّاسَ لَمْ يَشْكُرِ اللَّهَ) رواه الترمذي قال الالباني صحيح لغيره

واتە: ئەوەی سوپاسی خەڵکی نەکات ، سوپاسی خواش ناکات.

## باس کردنی نیعمەتی خوا شوکرە:

(عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (مَنْ لَمْ يَشْكُرِ الْقَلِيلَ لَمْ يَشْكُرِ الْكَثِيرَ، وَمَنْ لَمْ يَشْكُرِ النَّاسَ لَمْ يَشْكُرِ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ، وَالتَّحَدُّثُ بِنِعْمَةِ اللهِ شُكْرٌ، وَتَرْكُهَا كُفْرٌ، وَالْجَمَاعَةُ رَحْمَةٌ، وَالْفُرْقَةُ عَذَابٌ) رواه عبد الله بن أحمد في زوائده بإسناد لا بأس به ورواه ابن أبي الدنيا في كتاب اصطناع المعروف باختصار قال الالباني (حسن صحيح

واتە:لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی: ئـەوەی بـۆ کـەم سوپاس گوزار نـەبێ ، بـۆ زۆریـش سوپاسـگوزار نییـە، ئـەوەی سوپاسـی خـەڵکی نـەکات سوپاسی خواش ناکات، باسی کردنی نیعمەتەکانی خوا شوکرە، باسنەکردنی نیعمەتـەکان شاردنەوەی نیعمەتە، کۆمەڵ بوون رەحمەتە ، پەرتەوازە بوون عەزابە.

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٦٧ ) سورەتی الزمر

﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ٦٧﴾ الزمر

واتە: کافران خوایان نە ناسیوە (بە گەورەیان نەزانی) بەو جۆرەی شیاوێتی لە ڕۆژی دوایی دا هەموو زەوی لە چنگی ئەودایە (بەدەست خوایە) وە ئاسمانەکانیش بە دەستی ئەو پێچراونەوە خوا پاك و بڵندترە لەوەی کە دەیکەنە هاوبەشی.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: جَاءَ حَبْرٌ مِنَ الْيَهُودِ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى أُصْبُعٍ وَالْأَرَضِينَ عَلَى أُصْبُعٍ وَالْجِبَالَ وَالشَّجَرَ عَلَى أُصْبُعٍ وَالْمَاءَ وَالثَّرَى عَلَى أُصْبُعٍ وَسَائِرَ الْخَلْقِ على أُصْبُعٍ ثُمَّ يَهُزُّهُنَّ فَيَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ أَنَا اللَّهُ. فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَعَجُّبًا مِمَّا قَالَ الْحَبْرُ تَصْدِيقًا لَهُ. ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّماوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يشركُونَ﴾ مُتَّفق عَلَيْهِ

واتە: لە عەبدولڵای کوڕی مەسعودەوە هاتووە دەڵێ: زانایەکی جوولەکە هاتە لای پێغەمبەر ، گوتی: ئەی (محمد) ڕۆژی قیامەت خوا ئاسمانەکان دەخاتە سەر یەك پەنجە ، وە زەویش ئەخاتە سەر یەك پەنجە ، وە چیاکان و دەرختەکان دەخاتە سەر یەك پەنجە، ئاو وخۆڵیش ئەخاتە سەر یەك پەنجە ، وە هەموو دروستکراوەکانی دیکە ئەخاتە سەر یەك پەنجە، دوای دەیان هەژێنێ و دەفەرموێ: (من پادشام و من خوام ، پێغەمبەر بە قسەکانی پێکەنی و بە سەرسوڕمانەوە بۆی و بەراستی دانانی ، لەپاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّماوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يشركُونَ﴾

## کاریگەری ئەم ئایەتە :

٢-( عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَرَأَ هَذِهِ الْآيَةَ ذَاتَ يَوْمٍ عَلَى الْمِنْبَرِ وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ هَكَذَا بِيَدِهِ وَيُحَرِّكُهَا يُقْبِلُ بِهَا وَيُدْبِرُ يُمَجِّدُ الرَّبُّ نَفْسَهُ أَنَا الْجَبَّارُ أَنَا الْمُتَكَبِّرُ أَنَا الْمَلِكُ أَنَا الْعَزِيزُ أَنَا الْكَرِيمُ فَرَجَفَ بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمِنْبَرُ حَتَّى قُلْنَا لَيَخِرَّنَّ بِهِ (رواه احمد ) قال الشيخ شعيب الأرناؤوط : إسناده صحيح على شرط مسلم ، رجاله ثقات رجال الشيخين غير حماد بن سلمة فمن رجال مسلم

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر ڕۆژێك لەسەر مینبەر ئەو ئایەتەی خوێندەوە () پێغەمبەر دەیفەرموو: بەم شێوە دەیانجوڵنێ، ..... خوا دەفەموێ: (منم بەدەستەڵاتدار) (منم خۆبەزلزان) (من پادشام)(منم بە توانا) (منم بەرێز) جا مینبەر لەرزی لەبەر جۆش وخرۆشی پێغەمبەر ، گوتمان ئێستا بەردەبێتەوە.

٣-( إنّ المُقْسِطِينَ عِنْد الله يَوْمَ القِيَامَةِ على مَنَابِرَ مِنْ نُورٍ عنْ يَمينِ الرَّحمن وَكِلتا يَدَيْهِ يَمِينٌ الذينَ يَعْدِلونَ فِي حُكْمِهِمْ وأهْلِيهِمْ وَمَا وُلُّوا) رَوَاهُ مُسلم واحمد و النسائي عَن ابْن عمرو.

٤-( عَن عبد الله بن عَمْرو قَالَ: قا ل رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَطْوِي اللَّهُ السَّمَاوَاتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثُمَّ يَأْخُذُهُنَّ بِيَدِهِ الْيُمْنَى ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ أَيْنَ الْجَبَّارُونَ؟ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ؟ ثُمَّ يَطْوِي الْأَرَضِينَ بِشِمَالِهِ – وَفِي رِوَايَة: يَأْخُذُهُنَّ بِيَدِهِ الْأُخْرَى – ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ أينَ الجبَّارونَ أينَ المتكبِّرونَ؟ ) رَوَاهُ مُسلم

واتە: لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی:ڕۆژی قیامەت خوا ئاسمانەکان دەپێچێتەوە ، ئینجا بە دەستی ڕاستی دەیانگرێ ، ئینجا دەفەرموێ: من پادشام کوانی بەهێزەکان ؟ کوان خۆبەزلگرەکان؟ ئینجا زەوی دەپێچێتەوە بە

دەستی چەچی ، لە ریوایەتی دیکە دەڵێ: دەیانگرێ بەدەستی دیکەی ، ئینجا دەڵـێ: مـن پادشام کوانی دەستەلاتدارەکان ؟ کوانێ خۆبەزلگرەکان.

**********************

# وتاری ژماره (٩٥) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## بابەتەکانی ئەم وتارە ( خوا ئاگادارە ، ئیستیقامەت )

### سورەتی ( فصلت )

سورەتی (فصلت) سورەتێکی مەککییە ، لە ریزبەندا ژمارە (٤١) ژمارەی ئایەتەکانی (٥٤)ئایەتە وەکو سورەتەکانی دیکەی مەککە باسی لایەنی عەقیدە دەکات ، وەباسی سەرەنجامی لە ناوچوونی گەلی عادو سەموود دەکات بەهۆی تاوانەوە ، وەباسی سەرەنجامی ئیمانداره تەقوادارەکان دەکات کە بەهۆی خۆراگریان و دامەزراویان دەگەنە بەهەشت لەگەلْ پێغەمبەران و راستگۆیان و شەهیدان و صالیحان ، لەکۆتایدا خوا وەعدەی داوە هەندێ شتی نهێنی بونەوەریان پیشان بدات لە ئاخیر زەمان ، بۆ ئەوەی بەلْگەبێ بۆ راستی قورئان ، وەك فەرموویەتی:

(سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (فصلت:٥٣)

واتە : لەمەودوا بەلْگەکانی خۆمانیان نیشان دەدەین لە ئاسۆی دونیا وە لە خودی خۆیاندا هەتا بۆیان ڕوون بێتەوە بێگومان ئەم (قورئانە) ڕاستە ئایا پەروەردگارت بەس نی یە کە بەڕاستی ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا.

ئایا بۆچی ناونراوە (فصلت) ؟ چونکە خوای گەورە ئایەتەکانی روون دەکاتەوە ، و هێزودەستەلاتی خۆی نیشان دەدات چەند بەهێزو کارجوانە، وە بەلْگەی یەکلاکرەوە دەسلمێنێ لەبونەوەری خوی

### ١-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٢٢ ) سورەتی فصلت

﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ٢٢﴾ فصلت

واتە : وە ئێوە خۆتان نەدەشاردەوە (نەدەپاراست لە گوناه) لە شایەتی دانی گوێ و چاوو پێستی لەشتان لە دژتان بەڵکو وا گومانتان دەبرد کە خوا نازانێ بەزۆرێك لەو کارانەی کە دەیکەن.(پوختەی تەفسیر)

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عَنْ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ اجْتَمَعَ عِنْدَ الْبَيْتِ قُرَشِيَّانِ وَثَقَفِيٌّ أَوْ ثَقَفِيَّانِ وَقُرَشِيٌّ كَثِيرَةٌ شَحْمُ بُطُونِهِمْ قَلِيلَةٌ فِقْهُ قُلُوبِهِمْ فَقَالَ أَحَدُهُمْ أَتُرَوْنَ أَنَّ اللَّهَ يَسْمَعُ مَا نَقُولُ قَالَ الْآخَرُ يَسْمَعُ إِنْ جَهَرْنَا وَلَا يَسْمَعُ إِنْ أَخْفَيْنَا وَقَالَ الْآخَرُ إِنْ كَانَ يَسْمَعُ إِذَا جَهَرْنَا فَإِنَّهُ يَسْمَعُ إِذَا أَخْفَيْنَا فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَمَا كُنْتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ الْآيَةَ ) رواه البخاري

وفي رواية (عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ الْآيَةَ قَالَ كَانَ رَجُلَانِ مِنْ قُرَيْشٍ وَخَتَنٌ لَهُمَا مِنْ ثَقِيفَ أَوْ رَجُلَانِ مِنْ ثَقِيفَ وَخَتَنٌ لَهُمَا مِنْ قُرَيْشٍ فِي بَيْتٍ فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ أَتُرَوْنَ أَنَّ اللَّهَ يَسْمَعُ حَدِيثَنَا قَالَ بَعْضُهُمْ يَسْمَعُ بَعْضَهُ وَقَالَ بَعْضُهُمْ لَئِنْ كَانَ يَسْمَعُ بَعْضَهُ لَقَدْ يَسْمَعُ كُلَّهُ فَأُنْزِلَتْ وَمَا كُنْتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ الْآيَةَ ) رواه البخاري

واتە: لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە هاتووە دەڵێ: ئایەتی (وَمَا كُنْتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ) دوو پیاوی قوریشی و دوو پیاوی هۆزی سەقیف لە کۆبونەوە لە بەیت(کەعبە) ، هەندێکیان گوتیانە هەندێکیان : ئایا ئێوە وادەزانن خوا گوێی لە قسان دەبێ، هەندێکیان گوتیان : هەندێکی گوێی لێ دەبێ ، هەندێکی گوێی لێ نابێ (یان

ئەوەی بەدەنكی بەرز بگوترێ گوێی لێ دەبێ ، بەلاّم ئەوەی بەدەنكی نزم بگوترێ گوێی لێ نابێ) هەندێك گوتیان : ئەگەر گوێی لە هەندێك بێ گوێی لە هەموو دەبێ، یان ئەگەر گوێی لە دەنگی بەرز بێ ، گوێی لە دەنگی نزمیش دەبێ ) جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند وفەرمووی (وَمَا كُنْتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ)

معاني الكلمات : (ختن) كل من كان من قبل المرأة كأبيها وأخيها فهو ختن ويطلق أيضا على زوج البنت والأخت. (ثقيف) إحدى قبائل العرب وكانت تسكن الطائف ، وفي حدبث (علي ختن رسول الله....)

## هیچ شتێ لە خوا وون نابێ:

(إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخۡفَىٰ عَلَيۡهِ شَيۡءٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ٥) ال عمران

واتە: بەڕاستی خوا هیچ شتێكی لێ ون نابێت نە لەزەوی وە نە لەئاسماندا.

(وَهُوَ ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ يَعۡلَمُ سِرَّكُمۡ وَجَهۡرَكُمۡ وَيَعۡلَمُ مَا تَكۡسِبُونَ ٣)

واتە: وە تەنها ئەو خوایە (بالاّ دەست و پەرستراوە) لە ئاسمانەكان و لە زەویدا نهێنی و ئاشكراتان دەزانێ و بەهەموو كردەوەیەكیش كە دەیكەن ئاگادارە.(پوختەی تەفسیر)

## دوعایەكی پێغەمبەر :

(اللهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، وَمَا أَسْرَفْتُ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ) رواه مسلم

واتە: خودایە داوات لێ دەكەم لە گوناحەكانم خۆشبە، ئەوەی لەرابردوو كردومە ، یان لە داهاتوو دەیكەم ، یان بەنهێنی كردومە یان بە ئاشكرای ، وە ئەوەی زێدەڕۆیم كردوە ، وە ئەوەی تۆ لە من چاكتر دەزانی من نایزانم .....)

**ئەم سورەتە باسی (استقامە) دامەزراوی دەکات :**

**﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ٣٠ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأٓخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِيٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ٣١ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ٣٢ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ٣٣ وَلَا تَسْتَوِي ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ۚ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ٣٤ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ٣٥﴾ فصلت**

واتـە: بەڕاسـتی ئەوانـەی وتیـان خـوا پەروەردگارمانـەو لەپاشـان ڕاسـت (لەسـەر ئـایین) بەردەوام بوون فریشتەکان پۆل پۆل دێنە لایان (کاتی مردن یان زیندوو بوونـەوە) (پێیـان دەڵێن) کە مەترسن و خەفەت مەخۆن وە مژدەبێ لێتان ئەو بەهەشتەی کـە بـەڵێنتان پـێ درابوو.(٣٠) ئێمە لەژیانی دنیـا و لـە ڕۆژی دواییـدا دۆسـتی ئێـوەین وە لـەو (بەهەشـتەدا) هەرچـــی حـــەزی لـــێ بکـــەی بۆتـــان ئامادەیـــە وە هەرچـــی داوا بکـــەن لەوێـــدا لـــە خزمەتتاندایە.(٣١) ڕێز لێنان و میوانداریە لەلایەن خوای لێبوردەی میهرەبانەوە.(٣٢) کـێ وتەی چاکترو بەجێ ترە لەو کەسـەی (خـەڵك) بـۆلای خـوا بـانگ دەکـات وە کـاری چـاکە دەکات و دەڵێ بێگومان من لە پێڕی موسوڵمانانم.(٣٣) چاکە و خراپە چوون یەك نـین بـە چـاکترین شـێوە وەڵـامی (خراپـە) بـدەرەوە ئەوسـا کەسـێ کـە لـە نێـوان تـۆ و ئـەودا دوژمنایەتی هەیە وەك دۆستێکی دڵسۆزو گیانی بـە گیـانی یـە لـێ دێـت.(٣٤) بـەم ئاسـتە ناگات کەسانێ نەبێ کە خۆ ڕادەگرن و بە ئارامن وە پێ ی ناگات مەگـەر کەسـێ خـاوەنی بەشی هەرە گەورە بێت لە پاداشت.(٣٥)

## چەند دەقێك لەسەر دامەزراوی ( استقامه ) :

١-(أَنَّ سُفْيَانَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ الثَّقَفِيَّ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ حَدِّثْنِي بِأَمْرٍ أَعْتَصِمُ بِهِ، قَالَ: قُلْ: رَبِّيَ اللَّهُ، ثُمَّ اسْتَقِمْ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَكْثَرُ مَا تَخَافُ عَلَيَّ؟ فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِلِسَانِ نَفْسِهِ، ثُمَّ قَالَ: (هَذَا) رواه ابن ماجه قال الالباني صحيح

واتە: سوفیانی كوڕی عەبدوڵای سەقەفی دەڵێ : گوتم ئەی نێرراوی خوا كارێكم پێ بڵێ دەستی پێوە بگرم ، فەرمووی : بڵێ: (الله پەروەردگارم ، دوایش دامەزراوبە لەسەری ، گوتم : ئەی نێرراوی خوا لەچی لێم دەترسی (واتە: چی بۆم مەترسی هەیە) پێغەمبەریش زمانی خۆی گرت فەرموی ئەوە (واتە: زمانت بپارێزە) .

٢-(عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عَبْدِ اللهِ الثَّقَفِيِّ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، قُلْ لِي فِي الْإِسْلَامِ قَوْلًا لَا أَسْأَلُ عَنْهُ أَحَدًا بَعْدَكَ - وَفِي حَدِيثِ أَبِي أُسَامَةَ غَيْرَكَ - قَالَ: قُلْ: آمَنْتُ بِاللهِ، فَاسْتَقِمْ) رواه مسلم

واتە: سوفیان دەڵێ گوتم: ئەی نێرراوی شتێكم پێ بلێ لە ئیسلام لە پاش تۆدا لە كەس نەپرسم، فەرمووی : بڵێ باوەڕم بەخوا هێناوە ، وەلەسەری بەردەوام بە.

## خودایە ئیستیقامەمان پێ ببەخشە :

٣-(عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: كَانَ إِذَا تَلَا (وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ) (فصلت: ٣٣) قَالَ: هَذَا حَبِيبُ اللَّهِ، هَذَا وَلِيُّ اللَّهِ، هَذَا صَفْوَةُ اللَّهِ، هَذَا خِيرَةُ اللَّهِ، هَذَا أَحَبُّ أَهْلِ الْأَرْضِ إِلَى اللَّهِ، أَجَابَ اللَّهَ فِي دَعْوَتِهِ، وَدَعَا النَّاسَ إِلَى مَا أَجَابَ اللَّهَ فِيهِ مِنْ دَعْوَتِهِ، وَعَمِلَ صَالِحًا فِي إِجَابَتِهِ، وَقَالَ: إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ لِرَبِّهِ، هَذَا خَلِيفَةُ اللَّهِ "، وَكَانَ إِذَا تَلَا (إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا) (فصلت: ٣٠) قَالَ: (اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبُّنَا فَارْزُقْنَا الِاسْتِقَامَةَ) الزهد والرقائق لابن المبارك

واته: له (حسن البصری) هاتووه کاتێ ئەم ئایەتەی دەخوێند (وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ) دەیگوت ئەوە خۆشەویستی خوایە ، ئەوە دۆستی خوایە، ئەوە هەڵبژاردراوی خوایە، ئەوە خوشەویسترین خەڵکی زەویە لەلای خوا، خەڵکی وەڵامی بانگەوازی داوەتەوە ، کردەوەی چاك دەکرێ بە بانگەوازی ئەو، دەڵێ من لە موسڵمانان بۆ پەروردگاری خۆم ، ئەوە جێنشینی خوایە (واتە: دینی خوا بەخەڵکی رادەگیەنێ) وە ئەگەر ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە (إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا) دەیگوت (خودایە تۆ پەروەردگارمانی دامەزراویمان پێ ببەخشە)

## شەقیقی بەلخی دەڵێ:

(وَقَالَ شَقِيقٌ: أَرْبَعَةُ أَشْيَاءَ مِنْ طَرِيقِ الِاسْتِقَامَةِ: لَا يَتْرُكُ أَمْرَ اللهِ لِشِدَّةٍ تَنْزِلُ بِهِ ، وَلَا يَتْرُكُهُ لِشَيْءٍ يَقَعُ فِي يَدِهِ مِنَ الدُّنْيَا فَلَا يَعْمَلُ بِهَوَى أَحَدٍ ، وَلَا يَعْمَلُ بِهَوَى نَفْسِهِ لِأَنَّ الْهَوَى مَذْمُومٌ ، لِيَعْمَلَ بِالْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ ) حلية الأولياء وطبقات الأصفياء

واتە: چوار شت رێگای دامەزراوین : ١- لە کاتی ناخۆشی فەرمانی خوا فەرمۆش نەکەی ٢-فەرمانی خوا بۆ ئارەزووی هیچ کەس بەجێ نەهێڵی ٣- بە ئارەزوو خۆشت کار نەکەی چونکە ئارزوو لۆمە کراوە ٤- با کاربکرێ بە قورئان و فەرموودە.

## چیرۆکێك لەم بارەوە:

ئەڵێن کابرایەك چووە حەجی ماڵی خوا ، پاشان رۆژێك چاوی کەوت بە شایی رەشبەلەك ، خۆی بۆ نەگیرا چووە شایی ، ماوەیەك لە شایدا بوو، دوای لەناو شایی بەربویەوە وەفاتی کرد ، بویە ئاخیر شەر . هەربویەش پێغەمبەر فەرموویەتی (إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالْخَوَاتِيمِ) رواه ابن حبان

واتە: کردەوەکان کۆتایان مەرجە ئاخۆ باش دەبن یان خراپە. (خودایە رەحم بە هەموولایەکمان بکەی)

# وتاری ژماره (٩٦) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

بابەتەکانی ئەم وتارە (پێناسەی سورەتی شورا، خزمایەتی ، گرنگی شورا ، رێگای راست وچەوت

## سورەتی ( الشوری )

سورەتی (الشوری) سورەتێکی مەککییە ، لە ریزبەندا ژمارە (٤٢)ە ژمارەی ئایەتەکانی (٥٣) ئایەتە ، وەکو سورەتەکانی دیکەی مەککە باسی عەقیدەوبیروباوەڕ دەکات ، وە تێدا هاتووە ئایینی گشت پێغەمبەران لەیەك سەرچاوە هاتووە، وە داوامان لێ دەکات وەلامی خوا بدینەوە وەك فەرموویەتی (ٱسۡتَجِيبُواْ لِرَبِّكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۚ مَا لَكُم مِّن مَّلۡجَإٖ يَوۡمَئِذٖ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٖ (الشوری:٤٧)

واتە : گوێڕایەڵ بن بۆ پەروەردگارتان پێش ئەوەی رۆژێك بێت لە لایەن خواوە کە گەڕانەوەی بۆ نی یە ئەو رۆژە هیچ پەناگایەکتان نابێت وە هیچ ئینکاری یەکتان پێ ناکرێ.(پوختەی تەفسیر)

لە کۆتایدا بە پێغەمبەر دەفەرموێت پێش هاتنی وەحی نەدەزانی (کیتاب و ئیمان) چییە ؟ وەك

دەفەرموێت (وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَٰكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَن نَّشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ (الشوری:٥٢)

واتە: هەر بەو شێوە (کە وەحی پێ دێ) قورئانمان بۆ تۆ نارد (ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)) بە فەرمانی خۆمان کە تۆ نەتدەزانی کتێب و ئیمان چی یە بەڵام ئێمە

ئـەوەمان کـردە ڕووناکی یـەك ڕێنمـوونی هـەر کەسـێکی پـێ دەکـەین کـە بمانـەوێت لـە بەنـدەکانمان وە بەڕاسـتی تـۆ (خـەڵك) ڕێنمـوونی دەکـەیت بـۆ ڕێگـای ڕاسـت.(پوختـەی تەفسیر)

ئایا بۆچی ناونراوە (الشوری) ؟ چونکە باسی گرنگی شورا دەکات لـە ئیسـلامدا ، دەوری زۆری هەیـە لـە ژیـانی تـاك و کۆمەڵـدا . وەك فەرموویـەتی (وَالَّـذِينَ اسْـتَجَابُوا لِـرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ (الشوری:٣٨)

واتە:وە ئەوانەی کە گوێڕایەڵی پەروەردگاریان کردووە نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام داوە وە کارو باری نێوانیان بەپرس و مەشورەتە وە لەو ڕۆزی یەی پێمان داوون دەیبەخشن.

## گرنگی راوێژ لە ئیسلامدا :

پێناسەی راوێژ: واتە پرس و ڕا بەیەکدی کردن و وتووێژ لەگەڵ یەکدی کردن ، بـەئامانجی ئەوە ، کە رای راست و بڕیاری راست و بڕیارو هەڵویستی راست وەدەست بێ

–لە قورئاندا سوڕەتێك بەناوی راپرسی (الشوری) هاتووە.

خوا مەدحی ئیمانداران دەکات کە راوێژ دەکەن ، وەك فەرموویەتی:

(وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ (الشوری:٣٨)

ئیبنو کەسیر (٧) جۆر راوێژی ژماردووە ، لەوانە

١–بۆ گرتنی کاروانی قوریش ، پێغەمبەر راوێژی بە هاوەڵان کرد .

كَمَا أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِن بَيْتِكَ بِالْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ لَكَارِهُونَ (الأنفال:٥)

٢–بۆ جەنگی ئوحد بە راوێژ چوونە دەر بۆ جەنگ کردن.

٣-پێغەمبەر لەگەڵ هۆزی غەتەفان رێكەوت بەروبومی مەدینـەیان بـداتێ، تـاكو ئـەوانیش هاوكاری قوریش نەكەن بۆ شەڕ لەگەڵ هاوەڵان ، كاتێ راوێژی بە (سەعدی كـوڕی موعـازو سەعدی كوڕی عوبادە)كرد رازی نەبوون گوتیان : كاتێ ئێمە لە جاهیلی بوون شـتمان پـێ نـەداون ، ئێستا ئێمـە بـەهۆی ئیسـلامەوە بـە عیـزەت بـووین ، جگـە لـە شمشێر هیچی دیكـەیان نـادەینێ ، لـەم دەقـدا هـاتووە((أَكْرَمَنَا اللَّهُ بِالْإِسْلَامِ وَهَدَانَا لَهُ وَأَعَزَّنَا بِكَ وَبِهِ، نُعْطِيهِمْ أَمْوَالَنَا! (وَاَللَّهِ) مَا لَنَا بِهَذَا مِنْ حَاجَةٍ، وَاَللَّهِ لَا نُعْطِيهِمْ إلَّا السَّيْفَ)

٤-راوێژی بە (علی و ئوسامە) كرد ئایا عائیشە تەلاق بـدات یـان نـا، كـاتێ بوختاتیـان بـۆ كرد، پێش دابەزینی ئایەتەكان .

### ١-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٢٣ ) سورەتی الشوری

﴿ذَٰلِكَ ٱلَّذِي يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ۗ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا إِلَّا ٱلۡمَوَدَّةَ فِي ٱلۡقُرۡبَىٰ ۗ وَمَن يَقۡتَرِفۡ حَسَنَةً نَّزِدۡ لَهُۥ فِيهَا حُسۡنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ شَكُورٌ ٢٣﴾ الشوری

واتە : ئەو (بەخششە) ئەوەیە كە خوا مژدە دەدات بـە بەنـدەكانی ئەوانـەی كـە باوەڕیـان هێناوەو چاكەكانیان كردووە (ئـەی موحەممـەد(صـلی اللـە علیـە وسـلم)) بڵـێ داوای هـیچ پاداشتێكتان لێ ناكەم لەسەری مەگەر خۆش ویستنی خزمایەتی هەر كەس هەر چاكەیەك بكات چـاكەی بـۆ زیـاد دەكـەین (بـە چـەند بەرانبـەر) بەڕاسـتی خـوا لێبـوردەی سـوپاس گوزارە.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ قَوْلِهِ إِلَّا الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى فَقَالَ سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ قُرْبَى آلِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ عَجِلْتَ إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَكُنْ بَطْنٌ مِنْ قُرَيْشٍ إِلَّا كَانَ لَهُ فِيهِمْ قَرَابَةٌ فَقَالَ إِلَّا أَنْ تَصِلُوا مَا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ مِنْ الْقَرَابَةِ ) رواه البخاري

واتە: لە عەبدولای کوڕی عەباسەوە هاتووە خوا لێ ڕازی بێ ، پرسیاری لێ کراوە دەبارەی (چاکە کردن لەگەڵ خزمان) سەعیدی کوڕی جوبیر گوتی: (خزمان واتە: خانەوادەی (محمد) ئیبنو عەباس گوتی : پەلەت کرد ، پێغەمبەر لە مەککە خزماتی لەگەڵ هەمووان هەبوو ، فەرمووی : من لەبەر خزماتی پێتان ڕادەگەینم تاکو نەسوتێن بە ئاگر .

وفي رواية (عن طَاوُس قَالَ سُئِلَ ابْنُ عَبَّاسٍ عَنْ هَذِهِ الْآيَةِ قُلْ لَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى فَقَالَ سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ قُرْبَى آلِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ أَعَلِمْتَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَكُنْ بَطْنٌ مِنْ قُرَيْشٍ إِلَّا كَانَ لَهُ فِيهِمْ قَرَابَةٌ فَقَالَ إِلَّا أَنْ تَصِلُوا مَا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ مِنْ الْقَرَابَةِ) سنن الترمذي قال الالباني صحيح

## سید قوتب دەڵێ:

(سەید قوتب) خوا لێی خۆش بێت ئەڵێت: پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێکرا کە بەقورەیش بڵێ: من لەبەرامبەر نزیك خستنەوەتان بە (روضات الجنات)ەوەو، دوور خستنەوەتان لەو سزای دۆزەخە هیچ پاداش و کرێیەکم ناوێ، مەگەر تەنها ئەوە کە خزمایەتی بپارێزن، واتە: پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ هەموو تیرەکانی قورەیشدا، خزمایەتی هەبوو، ئەو هەوڵەیشی تەنها لەو ڕووەوەیە کە مافی خزمایەتی

بەسـەرەوە هەیـە، بۆیـە ئـاوا هـەوڵی دوور خسـتەوەیان لـەدۆزەخ دەدات و بەبەهەشـت نزیکیان دەکاتەوە) (ڕامان)

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٥٢) سورەتی الشوری

﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَٰكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَن نَّشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ (الشوری:٥٢)

واتە: هەر بەو شێوە (کە وەحی پێ دێ) قورئانمان بۆ تۆ نارد (ئەی موحەممەد(صلی اللـە علیە وسلم)) بە فـەرمانی خۆمـان کـە تـۆ نەتـدەزانی کتێـب و ئیمـان چـی یـە بـەڵام ئێمـە ئـەوەمان کـردە ڕووناکی یـەك ڕێنمـوونی هـەر کەسـێکی پـێ دەکـەین کـە بمانـەوێت لـە بەنـدەکانمان وە بەڕاسـتی تـۆ (خـەڵك) ڕێنمـوونی دەکـەیت بـۆ ڕێگـای ڕاسـت.(پوختـەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عَنْ عليّ قال قِيلَ للنبيِّ صلى الله عليه وسلم: هل عَبَدَتَ وَثَنا قطّ؟ قال: (لا) ، قالوا: فهل شَرِبْتَ خَمرا قط؟ قال: (لا) ، وما زلتُ أعرفُ أن الذي هم عليه كفرٌ وما كنتُ أدري ما الكتاب ولا الإيمان) أبو نُعيم في الدلائل

واتە: لە عەلیەوە هاتووە دەڵـێ: بـە پێغەمبـەر گـۆترا ئایـا هـیچ کاتێـك بتـت پەرسـتووە؟ فـەرمووی نـەخێر ، گوتیـان : ئایـا قـەت عارەقـت خواردۆتـەوە؟ فـەرمووی نـەخێر ، وە دەمزانی ئەوەی ئەوان لەسەرینی کوفرە ، بەڵام نەمدەزانی کیتاب و ئیمان چییە؟

٢-(عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، (وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ) (الشورى: ٥٢) قَالَ: (الصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ هُوَ الْإِسْلَامُ وَهُوَ أَوْسَعُ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ) رواه الحاكم وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ ووافقه الذهبي

واته: له جابیری کوڕی عەبدوڵاوه هاتووه خوا له خۆی وبابی رازی بێ ، دەربارەی مانای (وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ) دەڵێ : ڕێگار راست بریتیه له ئیسلام ، وه فراوانتره له نێوان ئاسمان و زەوی.

**هەندی دەق لەسەر ڕێگای راست** (الصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ):

**١-(إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ٩)** الاسرا

واته: بەڕاستی ئەم قورئانە ڕێنموونی دەکات بۆ ڕێبازو بەرنامەیەك کە ڕاسترینە و موژدەش دەدات بەو باوەڕدارانەی کە کردەوە چاکەکان دەکەن کە بە ڕاستی پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە.(پوختەی تەفسیر)

٢-(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ خَطَّ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطًّا ثُمَّ قَالَ: (هَذَا سَبِيلُ اللَّهِ ثُمَّ خَطَّ خُطُوطًا عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ وَقَالَ هَذِهِ سُبُلٌ عَلَى كُلِّ سَبِيلٍ مِنْهَا شَيْطَانٌ يَدْعُو إِلَيْهِ) ثُمَّ قَرَأَ (إِن هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ) الْآيَةَ. رَوَاهُ أَحْمد وَالنَّسَائِيّ والدارمي وابن حبان قال الالباني حسن

واته: له عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە هاتووه دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر هێلێکی راکێشا و فەرمووی (ئەوە ڕێگای خودایە) ئینجا چەند هێلێکی دیکەی راکێشا لە لای راست وچەپی ئەو هێله، فەرمووی : ئەوە ڕێگاکانن هەر ڕێگایەك شەیتانێکی لەسەرە خەڵکی بۆ بانگ دەکات ، دوای ئەم ئایەتەی خوێندەوە (إِن هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ)

تەواوی ئایەتەکە بەم شێوە ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٥٣﴾ الانعام

واتە: فەرمانی داوە کە بێگومان ئەمە ڕێگای ڕاستی منە کە ڕاست و دروستە کەواتە شوێنی بکەون و شوێنی ڕێچکەکانی تر مەکەون چونکە دوورتان دەخەنەوەو لاتان دەدەن لە ڕێگەی خوا، خوا ئەو شتانەی بەئێوە ڕاسپاردووە بۆ ئەوەی پارێزکار بن.(پوختەی تەفسیر)

*************************

## وتاری ژماره (٩٧) له هۆیەكانی دابەزینی قورئان

بابەتەكانی ئەم وتارە (**پێناسەی سورەتی الزخرف والدخان، دابەزینی عیسا، دوعای پێغەمبەر له قوریش**)

### سورەتی (الزخرف)

لەم ووتاردا باسی هۆكاری دابەزینی دوو ئایەتی دوو سورەت دەكەین لە (الزخرف والشوری)

١-سورەتی (الزخرف) سورەتێكی مەككییە ، لە ریزبەندەی ژمارە (٤٣)ی و ژمارەی ئایەتەكانی (٨٩) ئایەتە وەكو سورەتەكانی دیكە باسی عەقیدەوبیروباوەڕ دەكات ، باسی چەند شتێكی خراپی گۆمەڵگای جاهیلی دەكات وەك رق بونەوە لە كچان ، وكچ بریاردان بۆ خوا واگومانیان دەبرد مەلائیكەت كچی خوان پاكی و بێ گەردی بۆ خوا ، وەباسی (ابراهیم) دەكات چۆن دژی بتپەرستی بووە ، وەباسی چیرۆكی (موسی و فرعون)دەكات ، لە كۆتایدا باسی هەندی مەشهدی رۆژی قیامەت دەكات .

ئایا بۆچی ناونراوە (الزخرف) ؟ چونكە باسی جوانی و زینەتی دونیا دەكات زۆر كەس پێ فریو دەخوات ، كەچی لای خوا قیمەتی باڵی پیشولەی نیە) وەك فەرموویەتی :

(وَزُخْرُفًا ۚ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَٱلْءَاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ٣٥ )

واتە (وە زەخرەفەی زۆر (لە ئاڵتون و زیو) جا هەموو ئەوانە بەهرەو خۆشی ژیانی دونیایە بەڵام (پاداشتی) ڕۆژی دوایی لای پەروەردگارت بۆ پارێزكارانە.

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٥٧-٦١ ) سوڕەتی الزخرف

﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوۡمُكَ مِنۡهُ يَصِدُّونَ ٥٧ وَقَالُوٓاْ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيۡرٌ أَمۡ هُوَۚ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢاۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٌ خَصِمُونَ ٥٨ إِنۡ هُوَ إِلَّا عَبۡدٌ أَنۡعَمۡنَا عَلَيۡهِ وَجَعَلۡنَٰهُ مَثَلٗا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٥٩ وَلَوۡ نَشَآءُ لَجَعَلۡنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةٗ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَخۡلُفُونَ ٦٠ وَإِنَّهُۥ لَعِلۡمٞ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمۡتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ٦١﴾ الزخرف

واتە : ئەو دەمەش کە کوڕەکەی مەریەم (عیسا) بەنموونە باسکرا. (عەبدوڵلای زبعری) نموونەیەکی هێنایەوەو وتی: ئایا ئێمەو پەرستراوەکانمان و خەڵکی تر وەك ئێمە دەچنە دۆزەخەوە ! جا خۆ ئەگەر ئەو قسە وابێ دەبێ عیساو فریشتەکانیش هەر بچنە دۆزەخەوە ! لەناکاو هۆزەکەت لەو نموونەیەی (زبعری) کردیانە گاڵەو هەرا، جا کاتێ ئەوەیان بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گێڕرایەوە فەرمووی: بەڵێ: هەرکەسێ خۆی پێی خۆشبێ لەباتی خوا بپەرسترێ، ئەوە لەگەڵ پەرستراوەکەیدا دەچێتە دۆزەخەوە، وە بەراستی ئەوانە هەر شەیتان دەپەرستن، وەئەوەش فەرمانی بەپەرستنی دابێ ، جا خوا ( إن الذين سبقت لهم منا الحسني أولئك عنها مبعدون ). ناردە خوارێ. واتە: بێگومان ئەوانەی لە لایەن ئێمەوە پێشتر بڕیاری بەختەوەرییان بۆ دراوە لەدۆزەخ دوور دەخرێنەوە، واتە: ئەگەر چی پەرسترابیشن.(٥٧) وە وتیان: ئایا پەرستراوەکانی ئێمە چاکترن، یان عیسا ؟! دە ئەگەر عیسا بڕواتە دۆزەخەوە، دەبا ئێمەیش هەربچینە دۆزەخەوە ئەو نموونەیان هەر بۆ دەمەدەمێ هێنایەوە بەڵکو ئەوان هۆزێکن هەر دەمبازی دەکەن (٥٨) عیساش هەربەندەیەکی ئێمە بوو، بەهرەی پێغەمبەریتیمان پێ بەخشی و کردمانە بەنموونەیەك بۆ نەوەکانی یەعقوب لە سەر دەسەڵاتی خۆمان (٥٩) وە ئەگەر بمان ویستبا هەندێکتانمان دەکردە فریشتە لەزەویدا جێتانی تیا بگرنەوە (٦٠) وە بێگومان (دابەزینی عیسا بۆ سەر زەوی) یەکێکە لە نیشانەکانی قیامەت کەواتە دەربارەی قیامەت هیچ گومانتان نەبێ ڕاستە وە شوێنی من بکەون ئەمە ڕێگای ڕاستە.(٦١)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عَنْ أَبِي يَحْيَى، مَوْلَى ابْنِ عُقَيْلٍ الْأَنْصَارِيِّ، قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: قَالَ: لَقَدْ عُلِّمْتُ آيَةً مِنَ الْقُرْآنِ مَا سَأَلَنِي عَنْهَا رَجُلٌ قَطُّ، فَمَا أَدْرِي أَعَلِمَهَا النَّاسُ، فَلَمْ يَسْأَلُوا عَنْهَا، أَمْ لَمْ يَفْطِنُوا لَهَا، فَيَسْأَلُوا عَنْهَا؟ ثُمَّ طَفِقَ يُحَدِّثُنَا، فَلَمَّا قَامَ، تَلاوَمْنَا أَنْ لَا نَكُونَ سَأَلْنَاهُ عَنْهَا، فَقُلْتُ: أَنَا لَهَا إِذَا رَاحَ غَدًا، فَلَمَّا رَاحَ الْغَدَ، قُلْتُ: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ، ذَكَرْتَ أَمْسِ أَنَّ آيَةً مِنَ الْقُرْآنِ، لَمْ يَسْأَلْكَ عَنْهَا رَجُلٌ قَطُّ، فَلا تَدْرِي أَعَلِمَهَا النَّاسُ، فَلَمْ يَسْأَلُوا عَنْهَا، أَمْ لَمْ يَفْطِنُوا لَهَا؟ فَقُلْتُ: أَخْبِرْنِي عَنْهَا، وَعَنِ اللاتِي قَرَأْتَ قَبْلَهَا. قَالَ: نَعَمْ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِقُرَيْشٍ: (يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ، إِنَّهُ لَيْسَ أَحَدٌ يُعْبَدُ مِنْ دُونِ اللَّهِ فِيهِ خَيْرٌ) وَقَدْ عَلِمَتْ قُرَيْشٌ أَنَّ النَّصَارَى تَعْبُدُ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ، وَمَا تَقُولُ فِي مُحَمَّدٍ، فَقَالُوا: يَا مُحَمَّدُ، أَلَسْتَ تَزْعُمُ أَنَّ عِيسَى كَانَ نَبِيًّا وَعَبْدًا مِنْ عِبَادِ اللَّهِ صَالِحًا، فَلَئِنْ كُنْتَ صَادِقًا، فَإِنَّ آلِهَتَهُمْ لَكَمَا تَقُولُونَ. قَالَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَلَمَّا ضُرِبَ ابْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ) (الزخرف: ٥٧) قَالَ: قُلْتُ: مَا يَصِدُّونَ؟ قَالَ: يَضِجُّونَ، (وَإِنَّهُ لَعِلْمٌ لِلسَّاعَةِ) (الزخرف: ٦١) ، قَالَ: هُوَ خُرُوجُ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلامُ قَبْلَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ) رواه احمد قال شعيب ارنوؤط اسناده صحيح وقال الالباني صحيح في السلسلة الصحيحة

واتە: لەئەبی یەحیای خزمەتکاری عەقیلی ئەنصاری هاتووە :دەڵێ : ئیبنو عەباس دەڵێ: بێگومان ئایەتێك فێرکراوم لە قورئان هەرگیز پیاوێك پرسیاری لێ نەکردوم، نازانم خەڵکی دەزانن بۆیە پرسیاری لێ ناکەن ، یان تێی ناگەن بۆیە پرسیاری ناکەن؟ ئنجا کۆتای بەقسەکان هات ، و هەڵسارۆیشت ، ئێمەش لۆمەی یەکترمان بۆچی پرسیارمان لێ نەکرد، منیش گوتم من بەیانی پرسیاری لێ دەکەم، کە بەیانی هاتەوە ، گوتم : ئەی ئیبنو عەباس دوێنێ گوتت ئایەتێك لە قورئان هەیە خەڵکی پرسیاری لێم ناکەن نازانم خەڵکی دەزانن یان لێ حاڵی نابن بۆیە پرسیاری لێ ناکەن؟ گوتم : هەواڵم بدەێ دەربارەی ئەم ئایەتەی پێشتر خوێندەوە ، گوتی : بەڵێ ، پێغەمبەر گوتیە قوریش (ئەی کۆمەڵی قوریش ، پەرستنی جگە لە خوا خێری پێوە نیە) وە قوریش دەیانزانی گاورەکان

(عیسا) دەپەرستن ، وە چی دەڵێن دەربارەی (محمد) گوتیان : ئەی (محمد) ئایا تۆ واحاڵی نی کە (عیسا) پێغەمبەر و بەندەیەکە لە بەندە صالیحەکانی خوا، ئەگەر تۆ راست دەکەی ، پەرستراوەکانی ئەوان بۆ ئێوەیە، دەڵێ : خواش ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (وە کاتێ عیسای کوڕی مەریەم بە نموونە هێنرایەوە دەست بەجێ گەلەکەت دەیکەنە هاوارو قیڕەی خۆشی (وا دەزانن قسەی ئەوان بەسەر قسەی پێغەمبەردا(صلی الله علیه وسلم)) سەرکەوتووە ، دەڵێ : چۆن رێگری دەکەن؟ گوتی : هاوار دەکەن ،و (وَإِنَّهُ لَعِلْمٌ لِلسَّاعَةِ) دەڵێ: ئەوە هاتنی عیسای کوڕی مەریەمە سەلامی خوا لێ بێ پێش هاتنی قیامەت

٢ سوڕەتی (الدخان ): سوڕەتێکی مەککییە ، لە ریزبەندا ژمارە (٤٤) وە ژمارەی ئایەتەکانی (٥٩) ئایەتە، وەکو سوڕەتەکانی دیکە مەککە باسی عەقیدەوبیروباوەڕ دەکات ، لەکۆتاییدا باسی چارەنوسی چاکەکاران و خراپەکاران دەکات .

–ئایا بۆچی ناونراوە (الدخان)؟ چونکە خوای گەورە ئەم دوڵەکەی کردە پەند بۆ ترساندنی کافران زۆر نەما لەناو بچن ، دوای بە دوعا و بەرەکەتی پێغەمبەر ئەم دوکەڵ نەکا

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١٠-١٥) سوڕەتی الزخرف

(فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ١٠ يَغۡشَى ٱلنَّاسَۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ١١ رَّبَّنَا ٱكۡشِفۡ عَنَّا ٱلۡعَذَابَ إِنَّا مُؤۡمِنُونَ ١٢ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكۡرَىٰ وَقَدۡ جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مُّبِينٞ ١٣ ثُمَّ تَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ وَقَالُواْ مُعَلَّمٞ مَّجۡنُونٌ ١٤ إِنَّا كَاشِفُواْ ٱلۡعَذَابِ قَلِيلًاۚ إِنَّكُمۡ عَآئِدُونَ ١٥)الدخان

واتە: چاوەروانی ڕۆژێ بە، بە دوکەڵ بەری ئاسمان دەگرێ: جا چاوەڕوانی ڕۆژێك بە ئەی موحەممەد ! (صلی الله علیه وسلم) کە ئاسمان بەئاشکرا دووکەڵێکی لێ پەیدا دەبێت، لە

دەرەنجامی، گرانیی و، قات و قڕیەك سەر لە قورەیش هەڵ ئەداو برسیەتیەکی ترسناك دایان ئەگرێ و، لە بەربرسێتی یەکتر نابینن و ئاسمانیش وەك چرە دووکەڵ دێتە پێش چاویان، دیارە ئەوەیش قاری خوایە، بەتایبەت کە پەیامبەر (صلی الله علیە وسلم) دوعای لە قورەیش کردو فەرمووی: ( اللهم أشدد وطأتك على مضر واجعلها عليهم سنين كسني يوسف ..) بوخاریی. واتە: خوایە ! گرانیی و، قات و قڕوییەکی وایان بەسەربدە، هەر وەك گرانیەکەی ساڵەکانی سەردەمی یوسف. ئەم تەفسیرە– کە تەفسیری (..يوم تأتي السماء بدخان مبين )مان پێکرد– راو بۆچوونی (تەبەریی) و زۆرێك لە راڤەکەرانی قورئان بوو، ئەوەتە (ئیبن جەریر) ئەڵێ: (والصواب في ذلك ماروي عن ابن مسعود من أن الدخان الذي أمر الله نبيه (صلي الله عليه وسلم) أن يرتقبه، هو ماأصاب قومه من الجهد والجوع حتي أكلوا العظام والميتة). بەڵام (ئیبن عەبباس) –خوا لێیان رازی بێت– ئەڵێت: مەبەست بە (دخان)ـەکە، ئەو دووکەڵەیە، نیشانەیەکە لەنیشانەکانی هاتنی قیامەت. (ئیبن کەسیر)یش ئەمەی پەسەند کردووە و دەڵێت: هەرچەند دەشگونجێت ئەوەی یەکەم بێت.(١٠) (يغشي الناس هذا عذاب أليم) سزا دووکەڵەکە هەموو خەڵکیمەککە دەگرێتەوە، هەر کە بینیشیان ئەڵێن:ئەمە سزایەکی ئێش پێگەیەنەرە(١١) لەبەرناچاری هاواریان لێ بەرز ئەبێتەوەو ئەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە ! ئەم سزایەمان لەسەر لاببە، بێگومان ئێمە باوەڕ دێنین(١٢) جا تازە لەکوێ، یان چۆن بڕوا هێنانی ناچاریی، سوودیان پێدەگەیەنێت ؟ خۆ بەراستیی پەیامبەرێکی ئاشکرایان بۆ هات پێش سزاکە، بڕواشیان نەهێنا (١٣) پاشان –لەباتی بڕوا هێنان– روویان لێ وەرگێڕاو وتیان: (ئەو محەممەد)ـە فێر کراوێکی شێتە ! جا گەلێك بۆچوونی ئاوا بێ، ئیتر چۆن ئامۆژگاری وەر ئەگرێ ؟ بۆیە شایستەی ئەو سزایە بوون(١٤) جگە لەوە، ئێوە زۆر سپڵەو بێ وەفایشن، چونکە بەراستی ئێمە هەر کەمێك سزاکەتان لەسەر لاببەین، خێرا دەچنەوە سەر کاری خۆتان ، واتە:هیچ کات دانامەزرێن و عیبرەت ناگرن(١٥)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(قَالَ عَبْدُ اللَّهِ إِنَّمَا كَانَ هَذَا لِأَنَّ قُرَيْشًا لَمَّا اسْتَعْصَوْا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَعَا عَلَيْهِمْ بِسِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ فَأَصَابَهُمْ قَحْطٌ وَجَهْدٌ حَتَّى أَكَلُوا الْعِظَامَ فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَنْظُرُ إِلَى السَّمَاءِ فَيَرَى مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا كَهَيْئَةِ الدُّخَانِ مِنْ الْجَهْدِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ قَالَ فَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقِيلَ لَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ اسْتَسْقِ اللَّهَ لِمُضَرَ فَإِنَّهَا قَدْ هَلَكَتْ قَالَ لِمُضَرَ إِنَّكَ لَجَرِيءٌ فَاسْتَسْقَى لَهُمْ فَسُقُوا فَنَزَلَتْ إِنَّكُمْ عَائِدُونَ فَلَمَّا أَصَابَتْهُمْ الرَّفَاهِيَةُ عَادُوا إِلَى حَالِهِمْ حِينَ أَصَابَتْهُمْ الرَّفَاهِيَةُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى إِنَّا مُنْتَقِمُونَ قَالَ يَعْنِي يَوْمَ بَدْرٍ) رواه البخاري

واتە: لە عەبدولاَی کوڕی مەسعودەوە هاتووە دەڵێ: ئەوە لەبەر ئـەوەبوو ، قورەیشـیەکان کاتێ سەرپێچی پێغەمبەریان کرد دوعای لێ کردن، بۆ گرانـی وەك گرانـی سـاڵی یوسـف ، توشی قات وقری بوون تاکو وایان لێ هات ئێسقان ومەردابویان دەخوارد ، پیاو تەماشـای ئاسمـانی دەکـرد لــە چـاوی وەك دوکــەڵ بــوو لــە برسـان، جـا خــوا ئــەم ئایەتــەی دابەزاندوفــەرمووی (فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ) دەڵێ: هاتنە لای پێغەمبەر پێیان گوت: ئەی نێردراوی خوا داوای باران بکە بۆ قـورەیش ، چونکە بە هـیلاك چـوون ، ئـەویش داوای بـارانی بـۆ کـردن ،و بۆیـان بـاری، جـا خـوا ئـەم ئایەتەی بۆ دابەزاندوفەرمووی :(إِنَّكُمْ عَائِدُونَ) جا کـاتێ حاڵیـان خـۆش بویـەوە گەڕانـەوە سـەرخراپەی جـاران ، جـا خـوا ئـەم ئایەتـەی بـۆ دابەزندوفـەرمووی (يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى إِنَّا مُنْتَقِمُونَ) واتە: ڕۆژی (بدر)

**********************

## وتاری ژماره (٩٨) له هۆیەكانی دابەزینی قورئان

بابەتەكانی ئەم وتارە(**پێناسە سورەتی (الجاثیة) ، جوێندان بە زەمانە، خەو بەڵگەیە لەسەر زیندوبونەوە**)

### سورەتی (الجاثیة)

سورەتی (الجاثیة) سورەتێكی مەككییە ، لە ریزبەندا ژمارە (٥)ە، وە ژمارەی ئایەتەكانی (٣٧) ئایەتە ، وەكو سورەتەكانی دیكە مەككە باسی عەقیدەوبیروباوەڕ دەكات ، باسی باوەڕبوون بە خوا و پێغەمبەر و ڕۆژی دوای و پاداشت و سزا دەكات ، وە باسی چەند ئایەتێكی بونەوەر دەكات ، لە كۆتایدا باسی پاداشتی عادیلانەی خوا دەكات لە ڕۆژی قیامەت چاكەكار بۆ بەهەشتە ،و خراپەكاربۆ دۆزەخ .

ئایا بۆچی ناونراوە (الجاثیة) ؟ چونكە خەڵكی دەكەونە سەر ئەژنۆ لەترسان لەبەر سەختی حیساب و لێ پێچینەوەی ڕۆژی قیامەت ) وەك دەفەرموێت :

﴿وَتَرَى كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً ۚ كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَى إِلَى كِتَابِهَا الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ (٢٨:)

واتە (هەموو گەلێ دەبینی كۆمەڵ كۆمەڵ كەوتوون بەسەر ئەژنۆدا هەموو گەلێ بانگ دەكرێ بۆلای پەڕاوەكەی ئەمڕۆ سزاو پاداشت دەدرێنەوە بە گوێرەی ئەو كردەوانەی كە دەتانكرد.

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٤) سورەتی (الجاثیة)

﴿وَقَالُواْ مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ٢٤﴾ الجاثية

واتە : هاوبەشدانەرەکان وتیان: جگە لەم ژیانی دونیایەمان، شتێکی تر لە گۆڕدا نیە، بۆ خۆمان ئەژین و ئەمرین، واتە: دەستەیەك ئەژیی و دەستەیەك ئـــــەمرێ، ئیتر دوای ئەوە نەزیندوو بوونەوە هەیە، نە لێپرسینەوە (وما یهلکنا إلا الدهر) وە هەر سروشت و زەمـان و رۆژگارە دەمانمرێنی و لەناومان دەبات. لەوە ئەچێ ئەوانە هەندێك بوو بن، بڕوایـان وابـوو بـێ کـە هـەموو شـتێك هـەر بەدەسـتی سروشـت و رۆژگـارە، لەوانـەن کـە پێیـان وتـوون (دەهریی)، ئێستایش پاش ماوەیـان لـەهۆنراوەو پەخشـانی شـاعیرەکاندا ئـەبینرێ: (وەك ئەم وشانە: فەلەك! زەمانە! غەددار! چەرخی چەپگەڕ..هتد)، جا ئەوانە لە هـەموو سـات و سەردەمێکدا سـەریان هەڵداوەو سـەر هەڵئـەدەن و، هـەوڵی چەسـپاندنی ئـەو بیرۆکەیـە ئەدەن، بەو هیوایەوە خەڵکی لە شەرعی خـوا دوور بخەنـەوە، گومـانیش نییـە لـەوەدا کـە بەخەستی خۆیشیان سەرگەردانن، جگە لە شوێنکەوتووەکانیشیان.. ئەوە کۆمەڵی سادەو ساویلکەیە[1]. ئیمامی (موسلیم) ئەم فەرموودەیـەی هێنـاوە: (لا تسـبوا الـدهر، فـإن الله هـو الـدهر). پێشـەوا شـافیعیی ئـەڵێ: عەرەبـەکان لەسـەردەمی جاهیلیەتـدا کـە بـەڵاو نەهامەتێکیان تووش دەبوو ئەیان وت: (یاخی بە الدهر!)، ئـەو رووداوانـەیان دەدایـە پـاڵساڵ و زەمان وجنێویان ئەدا، خۆ لە واقیع و بنەڕەتیشدا هەر خوای گەورەیـە ئـەو کارانـە ئەکا، جا کەوابوو وەك جنێویان بەخوا دابێ وایە، چونکە لەهەقیقەتدا خوا خۆیەتی زەمانە دەگێڕێ و (فاعیل)ـە، (ئیبن کەسیر). (وما لهم بذلك من علم ) ئەوانەش ئەو قسـە ئەکـەن، هیچ جۆرە زانستێکیان لـەو بـارەوە نیـە، هـەر لـە خۆیانـەوە ئـەو قسـەیە دەکـەن ،واتـە: ئەوەی دەیڵێن لە رێی زانستەوە نیە إن هم إلا یظنون بـەڵکو تـەنها گومـان ئەبـەن، گومـان بەو لاوە هیچ دڵنیاییەکیان نییە (ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عن سُفْيَان بْن عُيَيْنَةَ، قَالَ: (كَانَ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ يَقُولُونَ: إِنَّمَا يُهْلِكُنَا اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ، هُوَ الَّذِي يُهْلِكُنَا، وَيُمِيتُنَا، وَيُحْيِينَا، قَالَ اللَّهُ: (مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا) الْآيَةَ (الجاثية: ٢٤) قَالَ الزُّهْرِيُّ: عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (يَقُولُ اللَّهُ جَلَّ وَعَلَا: يُؤْذِينِي ابْنُ آدَمَ، يَسُبُّ الدَّهْرَ، وَأَنَا الدَّهْرُ، بِيَدِي الْأَمْرُ، أُقَلِّبُ لَيْلَهُ وَنَهَارَهُ، فَإِذَا شِئْتُ قَبَضْتُهُمَا) رواه ابن حبان قال الالباني صحيح واورده الشيخ مُقْبلُ الوادعي في الصحيح المسند من اسباب النزول

واتە:لە سوفیانی عویەینەوە هاتووە دەڵێ: خەڵکی زەمانی جاهیلی دەیانگوت : شەو ورۆژ ئێمە لەناو دەبات ، ئەو لەناومان دەبات و دەمانمرێنێ ودەمان ژێنێ، خواش فەرمووی : ئەوان دەلێن (مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا) ژیان تەنها دونیایە وبەس .

ئیمامی زوهری: لەسەعیدی کوڕی موسیبەوە، ئەویش لە ئەبوهوریرەوە : دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی : خودای پایەبەرز دەفەرموێ : ئادمیزاد ئازارم دەدات ، جوێن بە زەمانە دەدات ، ومن زەمانەم ، کارەکان بە دەستی منە ، شەو و ڕۆژ هەڵدەسورێنم ، ئەگەر ویستم دەیانگرم.

## چەند دەقێك لەم بارەوە:

١-( عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: يُؤْذِينِي ابْنُ آدَمَ يَقُولُ: يَا خَيْبَةَ الدَّهْرِ فَلَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: يَا خَيْبَةَ الدَّهْرِ فَإِنِّي أَنَا الدَّهْرُ، أُقَلِّبُ لَيْلَهُ وَنَهَارَهُ، فَإِذَا شِئْتُ قَبَضْتُهُمَا ) رَوَاهُ مُسْلِمٌ

واتە: لەئەبی هوریرەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی : خوا فەرمووەتی: ئادەمیزاد ئازارم دەدات ، کاتێ دەڵێ ئەی زەمانەی زەرمەند ، با کەس لە ئێوە وانەڵێ، من شەو رۆژ هەڵدەگێرم، ئەگەر ویستم دەیامگرمەوە.

٢-وفي رواية (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ( لَا تَسُبُّوا الدَّهْرَ، فَإِنَّ اللهَ هُوَ الدَّهْرُ) رَوَاهُ مُسْلِمٌ

**خەوتن باشترین بەڵگەیە بۆ زیندوبونەوە :**

(النَّوْمُ أَخُو المَوْتِ وَلاَ يَمُوتُ أَهْلُ الْجَنَّةِ) رواه البيهقي

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : خەوتن برای مردنە (واتە : مردنی بچوکە) وە خەڵکی بەهەشت ناخەون.

**هەربۆیەش سوننەتە لەکاتی لە خەو هەڵسان ئەم دوعایە بکەی :**

(إِذا اسْتَيْقَظَ أحَدُكُمْ فَلْيَقُلِ: الحَمْدُ لله الَّذِي رَدَّ عَلَيَّ رُوحِي وعافانِي فِي جَسَدِي وأذِنَ لِي بِذِكْرِهِ) رواه(ابْن السّني) عَن أبي هُرَيْرَة.

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : ئەگەر یەکێك لە ئێوە هەستا لە خەو با بڵێ: (سوپاس بۆ ئەو خوایەی رووحی بۆ گێرامەوە ، وەلاشەی سەلامەت کردم، وە رێگای دام یاد و زیکری بکەم.

**( ئارسەر ئەلیسۆن ) بە ئایەتی خەوتن موسڵمان بوو:**

(ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلۡأَنفُسَ حِينَ مَوۡتِهَا وَٱلَّتِي لَمۡ تَمُتۡ فِي مَنَامِهَا ۖ فَيُمۡسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيۡهَا ٱلۡمَوۡتَ وَيُرۡسِلُ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ٤٢)

واتە: هەر خوایە کە گیانەکان دەکێشێت لەکاتی مردنیاندا، هەروەها ئەو گیانەش کە نەمرد لە خەوەکەیدا هەر خوا بۆی دەنێرێتەوە، جا ئەو کەسەی کە خوا بڕیاری مردنی

دابێت ڕوحەکەی دەگرێتەوە و ناگەڕێتەوە بۆ لاشەی، ئەو کەسەش کە ڕۆژی تەواو نەبووبێت دەینێرێتەوە بۆی تا کاتێکی دیاریکراو، بەڕاستی ئا لەو دیاردانەدا چەندەها بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە بۆ کەسانێك کە تێفکرن و بیر بکەنەوە (لەم ساڵانەی دوایدا ئارسەر ئەلیسۆن زانای فیزیای ناوکیی لە کۆنگرەیەکدا لە قاهیرە بابەتێکی دەربارەی مردن و خەو پێشکەش کرد تیایدا وتبووی: دوای نزیکەی ٢٥ ساڵ لێکۆڵینەوە و وردبوونەوە بۆم دەرکەوتووە کە خەو جۆرە مردنێکە، ئەو کاتە زانایەکی موسڵمان ئاماژەی بۆ ئەم ئایەتەکرد، ئیتر ئارسەر سەری سوڕماو سەرەنجام شایەتمانی هێنا، ئێستا موسڵمانێکی ئینگلیزی تێکۆشەرە).(تەفسیری ئاسان)

**********************

# وتاری ژماره (٩٩) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

بابەتەکانی ئەم وتارە(پێناسە سورەتی (**الاحقاف**) ، عبدالله ی کوڕی سلام کێیە؟، عبدالله ی کوری سلام (٣) پرسیار لە پێغەمبەر دەکات ، عبدالله ی کوڕی سلام چۆن موسڵمان دەبێ ، عبدالله ی کوڕی سلام ئەهلی بەهەشتە، خەونێکی عبدالله کوڕی سلام..........)

## سورەتی (الاحقاف):

سورەتی (الاحقاف) سورەتێکی مەککییە ، لە ریزبەندا ژمارە (٤٦)ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (٣٥)ئایەتە ، وەکو سورەتەکانی دیکە مەککە باسی عەقیدەوبیروباوەڕ دەکات ، باسی دوو نموونە دەکات نموونەی (مندالّی صالح)ی لەسەر فیترە نموونەی مندالّی (نا صالح) کە لە فیترەی لاداوە ، وەباسی (هود) و قەومی (عاد) دەکات ، وە باسی کۆمەلێك جن دەکات کە گوێیان لە قورئان گرتووە دوای ئیمانیان پێ هێناوە وبۆ گەلی خۆیان باس کردوە

ئایا بۆچی ناونراوە (الاحقاف) ؟ چونکە الاحقاف ناوی شوێنەی قەومی عادە کەخوا لەناوی بردن وەك فەرموویەتی :( **وَاذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُ بِالْأَحْقَافِ وَقَدْ خَلَتِ النُّذُرُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ (الأحقاف:٢١)** )

واتە : ئەی(موحەممەد(صلی الله علیە وسلم) هوودی) برای گەلی عاد باس بکە کاتێ گەلەکەی ترساند لە (وولاّتی) ئەحقاف بێگومان پێغەمبەرانی زۆر ڕابوردوون لە پێش و دوا ئەویشەوە (ووتوویانە) جگە لە خوا هیچی تر نەپەرستن بێگومان من دەترسم لە سزای ڕۆژێکی گەورە بۆ ئێوە پێش بێ.(پوختەی تەفسیر)

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١٠) سورەتی (الاحقاف)

﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٠﴾ الاحقاف

واته : پێیان بڵێ: باشە چ دەبینن و حاڵتان چۆن دەبێت ئەگەر، ڕۆشن بوویەوە ئەم قورئانە لەلایەن خواوە بێت و، ئێوەیش هەر بڕوای پێ نەکەن؟! وە شایەتێك زانایەکی پلە بەرز- عەبدوڵڵای کوڕی سەلام- لەنەوەی یەعقوب گەواهیی لەسەر وێنەی واتای قورئان دا ئنجا بڕوای بە (محمد و بەقورئان) هێنا، وە ئێوەش هەرخۆتان بە گەورە زانی لە بڕواهێنان، ئایا ئێوە ستەمکار نین؟ بەراستی خوا هیدایەت و ڕێنوێنی قەومی ستەمکار واتە: کافر ناکات، چونکە بەئارەزووی خۆیان ئەو ڕێگەیانە هەڵبژاردووە.(ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الْأَشْجَعِيِّ، قَالَ: انْطَلَقَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا مَعَهُ حَتَّى دَخَلْنَا كَنِيسَةَ الْيَهُودِ، فَقَالَ: (يَا مَعْشَرَ الْيَهُودِ، أَرُونِي اثْنَيْ عَشَرَ رَجُلًا يَشْهَدُونَ أَنَّ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ يَحُطُّ اللَّهُ عَنْ كُلِّ يَهُودِيٍّ تَحْتَ أَدِيمِ السَّمَاءِ الْغَضَبَ الَّذِي غَضِبَ عَلَيْهِمْ) قَالَ: فَأُسْكِتُوا مَا أَجَابَهُ مِنْهُمْ أَحَدٌ، ثُمَّ رَدَّ عَلَيْهِمْ فَلَمْ يُجِبْهُ مِنْهُمْ أَحَدٌ، فَقَالَ: (أَبَيْتُمْ فَوَاللَّهِ لَأَنَا الْحَاشِرُ، وَأَنَا الْعَاقِبُ، وَأَنَا النَّبِيُّ الْمُصْطَفَى، آمَنْتُمْ أَوْ كَذَّبْتُمْ) ، ثُمَّ انْصَرَفَ وَأَنَا مَعَهُ حَتَّى كِدْنَا أَنْ نَخْرُجَ، فَإِذَا رَجُلٌ مِنْ خَلْفِنَا يَقُولُ: كَمَا أَنْتَ يَا مُحَمَّدُ، فَقَالَ ذَلِكَ الرَّجُلُ: أَيُّ رَجُلٍ تَعْلَمُونِي فِيكُمْ يَا مَعْشَرَ الْيَهُودِ؟ قَالُوا: وَاللَّهِ مَا نَعْلَمُ أَنَّهُ كَانَ فِينَا رَجُلٌ أَعْلَمُ بِكِتَابِ اللَّهِ مِنْكَ، وَلَا أَفْقَهُ مِنْكَ، وَلَا مِنْ أَبِيكَ قَبْلَكَ، وَلَا مِنْ جَدِّكَ قَبْلَ أَبِيكَ، قَالَ: فَإِنِّي أَشْهَدُ لَهُ بِاللَّهِ أَنَّهُ نَبِيُّ اللَّهِ الَّذِي تَجِدُونَهُ فِي التَّوْرَاةِ، فَقَالُوا: كَذَبْتَ، ثُمَّ رَدُّوا عَلَيْهِ قَوْلَهُ، وَقَالُوا فِيهِ شَرًّا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (كَذَبْتُمْ لَنْ يُقْبَلَ قَوْلُكُمْ أَمَّا آنِفًا فَتُثْنُونَ عَلَيْهِ مِنَ الْخَيْرِ مَا أَثْنَيْتُمْ، وَأَمَّا إِذَا آمَنَ فَكَذَّبْتُمُوهُ، وَقُلْتُمْ فِيهِ مَا قُلْتُمْ فَلَنْ يُقْبَلَ قَوْلُكُمْ) قَالَ:

فَخَرَجْنَا وَنَحْنُ ثَلَاثَةٌ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَنَا وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَّامٍ وَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِ: (قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ كَانَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ وَكَفَرْتُمْ بِهِ) (الأحقاف: ١٠) رواه الحاكم في المستدرك وقال صحيح على شرط البخاري ومسلم ووافقه الذهبي واورده الشيخ مقبل الوادعي في الصحيح المسند من اسبان النزول

واته: له عەوف كوڕی مالیکی ئەشجەعی هاتووه دەڵێ: پێغەمبەر دەرچووو منیشی لەگەڵ بووم ، تاکو چووینه ناو کەنیسەیەکی جوولەکه فەرمووی (ئەی کۆمەڵی جوولەکە، دوازده پیاوم نیشابدەن شایەدی بدەن ، کە هیچ پەرستراوێك جگە لە خوا ، و (محمد) یش نێرراوی خوایه، خوا غەزبی خۆی لادەبات لەسەر هەموو جوولەکان، دەڵێ: بێ دەنگ بوون کەس وەڵامی نەدایەوه، دووبارەی کردوه کەس وەڵامی نەدایەوه، فەرمووی : (سەرپێچیتان کرد ، سوێند بەخوا ، من کۆکەرەوەم ، من دواهەمین پێغەمبەرم ، من پێغەمبەری هەڵبژێردراوم، جا ئەگەر ئیمان بێنن یان درۆبکەن من بەراست نەزانن) دوای رۆیشت و منیش لەگەڵی بووم ، تاکو نزیك بوو بچینه دەرێ، پیاوێك لە دوامان بوو دەیگوت ، هەروەها تۆش ئەی (محمد) ئەو پیاوه گوتی: ئەی کۆمەڵی جوولەکه ئێوه چۆن من دەناسن ، گوتیان : سوێند بەخوا لەتۆ شارەزاتر نیه له کیتابی خوا(تەورات) وه له تۆ شەرعزان تر نیه، لەپێش تۆش لەباوکت شازاتره نەبوو ،وه له باپیرت شارزاتر نەبوو پێش باوکت ، گوتی : دەبزانن من شایەدی دەدەم بەخوا ، ئەو پێغەمبەری خوایه که له تەورات ئێوه سیفەتەکانی دەبینن، گوتیان : درۆ دەکەی ، دوای قسەکەیان بەسەردادایەوه به خراپه باسیان کرد، پێغەمبەر فەرمووی : ( درۆ دەکەن ، ئەو قسەتان لێ وەرناگیرێ ، ئێستا مەدحتان دەکرد، بەلأم که ئیمانی هێنا دەڵێن دەرۆزنی) دەڵی : هاتینه دەرێ له (کەنیسه) ئێمه (٣) کەس بووین ، پێغەمبەر و من عبدالله ی کوڕی سەلام ، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی (قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ (الأحقاف: ١٠).

وفي رواية (عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الْأَشْجَعِيُّ، قَالَ: انْطَلَقَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا مَعَهُ حَتَّى دَخَلْنَا كَنِيسَةَ الْيَهُودِ بِالْمَدِينَةِ يَوْمَ عِيدِهِمْ، وَكَرِهُوا دُخُولَنَا عَلَيْهِمْ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا مَعْشَرَ الْيَهُودِ، أَرُونِي إِثْنَيْ عَشَرَ رَجُلًا يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ يُحْبِطُ اللَّهُ عَنْ كُلِّ يَهُودِيٍّ تَحْتَ أَدِيمِ السَّمَاءِ الْغَضَبَ الَّذِي غَضِبَ عَلَيْهِ، قَالَ: فَأَمْسَكُوا وَمَا أَجَابَهُ مِنْهُمْ أَحَدٌ، ثُمَّ رَدَّ عَلَيْهِمْ، فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، ثُمَّ ثَلَّثَ فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، فَقَالَ: ) أَبَيْتُمْ فَوَاللَّهِ إِنِّي لَأَنَا الْحَاشِرُ، وَأَنَا الْعَاقِبُ، وَأَنَا الْمُقَفِّي آمَنْتُمْ أَوْ كَذَّبْتُمْ (، ثُمَّ انْصَرَفَ، وَأَنَا مَعَهُ حَتَّى دَنَا أَنْ يَخْرُجَ، فَإِذَا رَجُلٌ مِنْ خَلْفِنَا يَقُولُ: كَمَا أَنْتَ يَا مُحَمَّدُ، قَالَ: فَقَالَ ذَلِكَ الرَّجُلُ: أَيُّ رَجُلٍ تَعْلَمُونِي فِيكُمْ يَا مَعْشَرَ الْيَهُودِ؟ قَالُوا: مَا نَعْلَمُ أَنَّهُ كَانَ فِينَا رَجُلٌ أَعْلَمُ بِكِتَابِ اللَّهِ، وَلَا أَفْقَهُ مِنْكَ، وَلَا مِنْ أَبِيكَ مِنْ قَبْلِكَ، وَلَا مِنْ جَدِّكَ قَبْلَ أَبِيكَ، قَالَ: فَإِنِّي أَشْهَدُ لَهُ بِاللَّهِ أَنَّهُ نَبِيُّ اللَّهِ الَّذِي تَجِدُونَهُ فِي التَّوْرَاةِ، قَالُوا: كَذَبْتَ، ثُمَّ رَدُّوا عَلَيْهِ، وَقَالُوا لَهُ شَرًّا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ) كَذَبْتُمْ، لَنْ يُقْبَلَ قَوْلُكُمْ، أَمَّا آنِفًا، فَتُثْنُونَ عَلَيْهِ مِنَ الْخَيْرِ مَا أَثْنَيْتُمْ، وَأَمَّا إِذَا آمَنَ كَذَّبْتُمُوهُ، وَقُلْتُمْ مَا قُلْتُمْ، فَلَنْ يُقْبَلَ قَوْلُكُمْ (، قَالَ: فَخَرَجْنَا، وَنَحْنُ ثَلَاثَةٌ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَنَا، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِ: (قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ كَانَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ وَكَفَرْتُمْ بِهِ) الْآيَةَ (الأحقاف: ١٠) رواه ابن حبان واحمد وقالا الالباني و شعيب ارنوؤط (صحيح)

## عبدالله كوڕى سلام كێيه؟

پێش ئيسلام : زانايەكى جوولەكەبوو ، لـە نـەوەى يوسـفى كـوڕى يعقوبـە، عبـدالله كـوڕى سلام كوڕى حارسى ئيسرائلى يە.

## عبدالله كوڕى سەلام ئەهلى بەهەشتە :

(عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُتِيَ بِقَصْعَةٍ مِنْ ثَرِيدٍ، فَأَكَلَ فَفَضَلَ مِنْهُ فَضْلَةٌ، فَقَالَ: يَدْخُلُ مِنْ هَذَا الْفَجِّ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ يَأْكُلُ هَذِهِ الْفَضْلَةَ قَالَ سَعْدٌ: فَجَاءَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلامٍ فَأَكَلَهَا ) مسند احمد قال شعيب الأرنؤوط اسناده حسن

واتـە: موصـعەبى كـوڕى سـەعدى ئـەبى وەقـاص لـە بـاوكى دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: ڕۆژێـك تەشريبيان بۆ پێغەمبەر هێنا و خواردى ، هەندێك زيادى كردومايەوە ، فەرمووى : كەسێك بەم ڕێگايە دێتە ژوورەوە لە ئەهلى بەهەشـتە، و لـەم تەشـريبە دەخـوات ، سـەعد دەڵـێ: عبدالله ى كوڕى سەلام هات و خواردى.

## خەونێكى عبدالله ى كوڕى سەلام :

(عَنْ قَيْسِ بْنِ عُبَادٍ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا فِي مَسْجِدِ الْمَدِينَةِ فَدَخَلَ رَجُلٌ عَلَى وَجْهِهِ أَثَرُ الْخُشُوعِ فَقَالُوا: هَذَا رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ تَجَوَّزَ فِيهِمَا ثُمَّ خَرَجَ وَتَبِعْتُهُ فَقُلْتُ: إِنَّكَ حِينَ دَخَلْتَ الْمَسْجِدَ قَالُوا: هَذَا رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ. قَالَ: وَاللَّهِ مَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ أَنْ يَقُولَ مَا لَا يَعْلَمُ فَسَأُحَدِّثُكَ لِمَ ذَاكَ؟ رَأَيْتُ رُؤْيَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَصَصْتُهَا عَلَيْهِ وَرَأَيْتُ كَأَنِّي فِي رَوْضَةٍ – ذَكَرَ مِنْ سَعَتِهَا وَخُضْرَتِهَا – وَسَطَهَا عَمُودٌ مِنْ حَدِيدٍ أَسْفَلُهُ فِي الْأَرْضِ وَأَعْلَاهُ فِي السَّمَاءِ فِي أَعْلَاهُ عُرْوَةٌ فَقِيلَ لِيَ: ارْقَهْ. فَقُلْتُ: لَا أَسْتَطِيعُ فَأَتَانِي مِنْصَفٌ فَرَفَعَ ثِيَابِي مِنْ خَلْفِي فرقِيتُ حَتَّى كُنْتُ فِي أَعْلَاهُ فَأَخَذْتُ بِالْعُرْوَةِ فَقِيلَ: اسْتَمْسِكْ

فَاسْتَيْقَظْتُ وَإِنَّهَا لَفِي يَدِي فَقَصَصْتُهَا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (تِلْكَ الرَّوْضَةُ الْإِسْلَامُ وَذَلِكَ الْعَمُودُ عَمُودُ الْإِسْلَامِ وَتِلْكَ العروة الْعُرْوَةُ الْوُثْقَى فَأَنْتَ عَلَى الْإِسْلَامِ حَتَّى تَمُوتَ وَذَاكَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واته: له قەیسی کوڕی عوبادەوە هاتووە دەڵێ: له مزگەوتی مەدینـە دانیشـبووم ، پیاوێك هاتە ژوورێ شوێنەواری ملکەچی پێوە دیار بوو، گوتیـان : ئـەو پیـاوە ئـەهلی بەهەشـتە، دوو رکعات نوێژی سووکی کردن و ڕۆیشت ،و منیش بەدوای کەوتم، پـێم گـوت : کـاتێ تـۆ هاتیە مزگەوت گوتیان : ئەو پیاوە ئەهلی بەهەشتە، گوتی: سوێند بەخوا پێویست ناکات ئەوە بلێن ئەگەر نەزانن ، با بۆت باس بکەم ئەوە چۆن بوو؟ گوتی له زەمانی پێغەمبـەردا خەونێکم بینی و بۆ پێغەمبەرم گێرایەوە، لەوخەودا بینیم من له نـاو باخێکـدام ، فـراوان و سەوز بوو ، له ناوەراستی عەمودێکی ئاسن تێدابوو ، لای خوارێ له زەوی چـەقا بـوو، لای سـەروی لـە ئاسمـان بـوو، وقـوڵفێکی پێوەبـوو، گوتیانـە مـن سـەرکەوە، گـوتم نـاتوانم ، کەسێکی شـارەوزا هـات لـە پشـتەوە کراسـەکەی گـرتم و بەسـەر کـەوتم ، تـاکو گەیشـتمە سەرێ ، و قوڵفەکەم گرت، گوتیان :بیگرە ، بە خەبەر هاتم ، وەك ئـەوەی لـە نـاو دەسـتم دابـێ ، جـا بـۆ پێغەمبـەرم گێڕایـەوە ، فـەرمووی : (ئـەو باخـە بـاخی ئیسـلامە ، ئـەو عەمودەش عەمودی ئیسلامە ، ئەو قوڵفەش ، قوڵفی بەهێزە دەسـتت پێـوە گرتـووە ، تـۆ لەسەر ئیسلام دەبی تاکو دەمری ، ئەو پیاوەش (عبدالله کوڕی سەلامە)

## عبدالله ی کوڕی سەلام (٣ ) پرسیار لە پێغەمبەر دەکات:

(عَن أنس قا ل سَمِعَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ بِمَقْدَمِ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ فِي أَرْضٍ يَخْتَرِفُ فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ إِنِّي سَائِلُكَ عَنْ ثَلَاثٍ لَا يَعْلَمُهُنَّ إِلَّا نَبِيٌّ: فَمَا أَوَّلُ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ وَمَا أَوَّلُ طَعَامِ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟ وَمَا يَنْزِعُ الولدُ إِلَى أبيهِ أَو إِلَى أمه؟ قا ل: (أَخْبرنِي بهنَّ جِبْرِيلُ آنِفًا أَمَّا أَوَّلُ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ فَنَارٌ تَحْشُرُ النَّاسَ مِنَ الْمَشْرِقِ إِلَى الْمَغْرِبِ

وَأَمَّا أَوَّلُ طَعَامٍ يَأْكُلُهُ أَهْلُ الْجَنَّةِ فَزِيَادَةُ كَبِدِ الْحُوت وَإِذَا سَبَقَ مَاءُ الرَّجُلِ مَاءَ الْمَرْأَةِ نَزَعَ الْوَلَدَ وَإِذَا سَبَقَ مَاءُ الْمَرْأَةِ نَزَعَتْ) . قَالَ: أشهد أَن لاإله إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّكَ رَسُولُ اللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الْيَهُودَ قَوْمٌ بُهْتٌ وَإِنَّهُمْ إِنْ يعلمُوا بِإِسْلَامِي من قبل أَن تَسْأَلَهُمْ يبهتوني فَجَاءَتِ الْيَهُودُ فَقَالَ: (أَيُّ رَجُلٍ عَبْدُ اللَّهِ فِيكُمْ؟) قَالُوا: خَيْرُنَا وَابْنُ خَيْرِنَا وَسَيِّدُنَا وَابْنُ سيدِنا فَقَالَ: (أرأيتم إِنْ أَسْلَمَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ؟) قَالُوا أَعَاذَهُ اللَّهُ مِنْ ذَلِكَ. فَخَرَجَ عَبْدُ اللَّهِ فَقَالَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ فَقَالُوا: شَرُّنَا وَابْنُ شَرِّنَا فَانْتَقَصُوهُ قَالَ: هَذَا الَّذِي كُنْتُ أَخَافُ يَا رسولَ الله) رَوَاهُ الْبُخَارِيّ

واتە: لە ئەنەسەوە هاتووە دەڵێ: عبدالله ی کوڕی سەلام زانی پێغەمبەر هاتۆتە مەدینە ، چووە لای ، و گوتی : من سێ پرسیارت لێ دەکەم ، وەڵامەکەی تەنها پێغەمبەران دەزانن ، ١-یەکەم نیشانەی ڕۆژی قیامەت چییە؟ وە یەکەمین خواردنی ئەهلی بەهشت چییە؟ وە بۆچی منداڵ دەچێتەوە سەر بابی یان دایکی؟ فەرمووی : پێش ئێستا جوبریل هەواڵی پێ دام ، یەکەم نیشانەی قیامەت ئاگرێکە خەڵکی کۆدەکاتەوە لە ڕۆژهەلاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، وە یەکەمین خواردنی خەڵکی بەهەشت زیادە جەرگەی نەهەنگە ، وە وەڵامی سێیەم : ئەگەر ئاوی پیاو پێش ئاوی ئافرەت کەوت کوڕ دەردەچێ ، بەلام ئەگەر ئاوی ئافرەت پێش ئاوی پیاو کەوت کچ دەردەچێ ، (عبدالله) گوتی : شایەدی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە (الله) وە تۆش نێرراوی خوای، ئەی نێرراوی خوا قەومی جوولەکە بوختان چین، ئەگەر بزانن من موسڵمان بویمە بوختانم بۆ دەکەن،جا پێش ئەوەی بزانن موسڵمان بویمە پرسیاریان لێ بکە دەربارەی من ، جا جوولەکە هاتنە لای پێغەمبەر ، پێ فەرموون : (عبدالله) پیاوێکی چۆنە لە ناو ئێوە ؟ گوتیان : باشترینمانە وگەورەمانە، وەکوڕی گەورەمانە، پێ فەرموون : ئەدی ئەگەر عبدالله ی کوڕی سەلام موسڵمان بێ چی دەڵێن ، گوتیان: پەنا بەخوا لەو شتە، جا عبدالله کە خۆی شاردبویەوە هاتە دەرو گوتی : (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ) گوتیان : خەراپترین کەسە و کوڕی خەرابترین

کەسە و تۆڵەی لێ بکەنەوە، عبداللە گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی کە من لێ دەترسام ئەوە بوو .واتە: بەم شێوە بوختان دەکەن.

## عبداللە ی کوڕی سەلام جوولەکە بە درۆ دەخاتەوە:

(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ: أَن الْيَهُود جاؤوا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرُوا لَهُ أَنَّ رَجُلًا مِنْهُمْ وَامْرَأَةً زَنَيَا فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا تَجِدُونَ فِي التَّوْرَاةِ فِي شَأْنِ الرَّجْمِ؟) قَالُوا: نَفْضَحُهُمْ وَيُجْلَدُونَ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ: كَذَبْتُمْ إِنَّ فِيهَا الرَّجْمَ فَأْتُوا بِالتَّوْرَاةِ فَنَشَرُوهَا فَوَضَعَ أَحَدُهُمْ يَدَهُ عَلَى آيَةِ الرَّجْمِ فَقَرَأَ مَا قَبْلَهَا وَمَا بَعْدَهَا فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ: ارْفَعْ يَدَكَ فَرَفَعَ فإِذا فِيهَا آيةُ الرَّجم. فَقَالُوا: صَدَقَ يَا محمَّدُ فِيهَا آيَة الرَّجْم. فَأمر بهما النَّبِي صلى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرُجِمَا. وَفِي رِوَايَةٍ: قَالَ: ارْفَعْ يَدَكَ فَرَفَعَ فَإِذَا فِيهَا آيَةُ الرَّجْمِ تَلُوحُ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنَّ فِيهَا آيَةَ الرَّجْمِ وَلِكِنَّا نَتَكَاتَمُهُ بَيْنَنَا فَأَمَرَ بِهِمَا فَرُجِمَا) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتە: لە عەبدولای کوڕی عومەرەوە هاتووە دەڵێ : جوولەکە هاتنە لای پێغەمبەر گوتیان پیاوێك و ئافرەتێکی جوولەکە زینایان کردوە حوکمیان بۆ بدە، فەرمووی : چی لە تەورات هەیە دەربارەی رەجم ، گوتیان : ریسوا دەکرێن و قامچیان لێ دەدرێ، (عبداللە کوڕی سەلام ) گوتی : درۆ دەکەن ، لەتەوراتدا رەجم دەکرێن،و دەبرۆن تەورات بێنن ، هێنایان کردیانەوە ، یەکێك دەستی لەسەر ئایەتی رەجم دانا ، پاش و پێشی خوێندەوە ، (عبداللە ) پێ گوت دەستت هەڵگرە، دەستی هەڵگرت کە تەماشایان کرد ئایەتی رەجمی تێدابوو، گوتیان : ئەی (محمد) راستە ئایەتی رەجمی تێدایە، جا پێغەمبەر فەرمانی کرد هەردووکیان ژن و پیاوەکەیان رەجم کردن. (دیارە پیاوەکە ژنی هەبوو، و ژنەکەش مێرد)

وفي رواية–(عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ الْيَهُودَ جَاءُوا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرُوا لَهُ أَنَّ رَجُلًا مِنْهُمْ وَامْرَأَةً زَنَيَا، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا تَجِدُونَ فِي التَّوْرَاةِ مِنْ شَأْنِ الزِّنَا؟ قَالُوا: نَفْضَحُهُمْ وَيُجْلَدُونَ، قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلَامٍ: كَذَبْتُمْ، إِنَّ فِيهَا

الرَّجْمَ، فَأَتَوْا بِالتَّوْرَاةِ فَنَشَرُوهَا فَجَعَلَ أَحَدُهُمْ يَدَهُ عَلَى آيَةِ الرَّجْمِ، وَجَعَلَ يَقْرَأُ مَا قَبْلَهَا وَمَا بَعْدَهَا، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلَامٍ: ارْفَعْ يَدَكَ، فَرَفَعَهَا فَإِذَا فِيهَا آيَةُ الرَّجْمِ، فَقَالُوا: صَدَقَ يَا مُحَمَّدُ، فِيهَا آيَةُ الرَّجْمِ، فَأَمَرَ بِهِمَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرُجِمَا، قَالَ عَبْدُ اللهِ: فَرَأَيْتُ الرَّجُلَ يَحْنِي عَلَى الْمَرْأَةِ يَقِيهَا الْحِجَارَةَ ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ و مُسْلِمٌ

## يەكەمین قسە كە ( عبدالله كوڕی سەلام ) گوێی لە پێغەمبەر دەبێ:

(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ جِئْتُ فَلَمَّا تَبَيَّنْتُ وَجْهَهُ عَرَفْتُ أَنَّ وَجْهَهُ لَيْسَ بِوَجْهِ كَذَّابٍ. فَكَانَ أَوَّلُ مَا قَالَ: (أَيُّهَا النَّاسُ أَفْشُوا السَّلَامَ وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ وَصِلُوا الْأَرْحَامَ وَصَلُّوا بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ بِسَلام) رَوَاهُ التِّرْمِذِيّ وَابْن مَاجَه والدارمي

واتە: لە عەبدولاَی كوڕی سەلامەوە هاتووە دەڵێ: كاتێ پێغەمبەر تەشریفی هاتە مەدینە، منیش چووم بزانم كەسێكی چۆنە، كاتێ سەیری دەم وچاوم كرد ، زانیم دەم وچاوی ئەو هی درۆزنان نیە، وە یەكەمین قسە كە كردی فەرمووی (ئەی خەڵكینە سەلام بلاَوبكەنەوە زۆر سەلام لە یەكدی بكەن، وە خواردن بەخەڵكی بدەن ، وە سیلەی رەحم جێ بەجێ بكەن، وە هەستن شەوان شەونوێژ بكەن ، كەسانێك لەو كاتدا خەوتوون ، ئنجا بەسەلام و ئاشتی دەچنە بەهەشتەوە.

## ( عبدالله كوڕی سەلام ) زانایەو ئەهلی بەهەشتە :

( عَنْ يَزِيدَ بْنِ عُمَيْرٍ قَالَ: لَمَّا حَضَرَ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ الْمَوْتُ قِيلَ لَهُ: أَوْصِنَا يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: أَجْلِسُونِي، فَإِنَّ الْعِلْمَ وَالْإِيمَانَ مَكَانَهُمَا مَنَ ابْتَغَاهُمَا وَجَدَهُمَا، يَقُولُ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَالْتَمِسُوا الْعِلْمَ عِنْدَ أَرْبَعَةٍ: عِنْدَ عُوَيْمِرٍ أَبِي الدَّرْدَاءِ، وَعِنْدَ سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ،

وَعِنْدَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَعِنْدَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَّامٍ الَّذِي كَانَ يَهُودِيًّا فَأَسْلَمَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يَقُولُ: (أَنَّهُ عَاشِرُ عَشْرَةٍ فِي الْجَنَّةِ) رواه الحاكم والترمذي قال الالباني صحيح

واته: له یەزیدی کوڕی عومیرەوه هاتووه دەڵێ: کاتێ (موعازی کوڕی جەبەل) لەسەر مەرگدا بوو ، پێ گوترا ئامۆژگاریمان بکە ئەی باوکی عبدالرحمن، گوتی : دامنیشێنن گوتی: (زانست و ئیمان لەو شوێنن کە بۆیان بگەرێی ، سێ جاران وایگوت، وە گوتی: زانست لەلای چوار کەس وەر گرن ، لەلای (عومەیری ئەبی دەردا، و سەلمانی فارسی ، وعەبدولای کوڕی مەسعود، و عەبدولای کوڕی سەلام ، کە زانایەکی جوولەکە بوو و دوای موسڵمان بوو، من گوێم له پێغەمبەر بوو، دەیفەرموو :(ئەو (عبدالله کوڕی سەلام دەیەم کەسە لە بەهەشتە)

## پێغەمبەر ناو لە کوڕی ( عبدالله کوڕی سەلام ) دەنێ:

(عن يُوسُفَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَّامٍ قَالَ: سَمَّانِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُوسُفَ، وَأَقْعَدَنِي عَلَى حِجْرِهِ، وَمَسَحَ عَلَى رَأْسِي ) الادب المفرد قال الالباني صحيح

واته: له (یوسف)ی کوڕی عبدالله کوڕی سەلامەوه هاتووه دەڵێ: پێغەمبەر ناوی لە من (یوسف) وە لە کۆشی خۆی دانام و دەستی بەسەردا هێنام.

******************

# وتاری ژماره (١٠٠) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

بابەتەکانی ئەم وتارە( هاتنی جنۆکە بۆ لای پێغەمبەر ، جنۆکە بۆچی دروستکراوه، لەچی دروستکراوه، بۆچی دەچنە ئاگر، ئایا کافرن یان موسڵمان ، ئایا شەیتان جنۆکەیە)

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٩) سورەتی (الاحقاف)

﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓاْ أَنصِتُواْ ۖ فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْاْ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ٢٩﴾ الاحقاف

واتە : جنی (جنۆکە) هاتنە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گوێیان لە قورئـان گـرت: وە بیر بێنە ئەو کاتە ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) – وەك حاکم ئەڵێ– کە نۆکەس لە جنۆکەکانمان ناردە لات تا گوێ رابگرن لە قورئان. پێشەوا ئەحمەد لەزوبەیرەوە ئەڵێت: پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) نە ئەو جنۆکانەی دیت، وە نە قورئانیشی بۆ ئەوان خوێند، بەڵکو هەر ئەمەبوو کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) جارێك لەگەڵ تاقمێ لە هاوەڵانی خۆیدا بۆ بازاڕی (عوکاز) دەرۆیشتن، لەو دەمەیشدا جنۆکەکان رێگری کرابوون لە ئاسمان ، جادواتر رۆیشتنەوە بۆ لای هۆزەکەی خۆیان ووتیان: چ ئەڵێن؟! چ روویداوە؟! رێگری کراوین لە ئاسمان..! وتیان: دەبێ شتێکی گرنگ روویدابێ؟ ئادەی بە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا بڕۆن ببینن چ روویداوە؟! ئەوانیش رۆیشتن و بەم لاو بەولادا زۆر گەڕان، سەرەنجام رێیان کەوتە (تیهامە)، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە (نەخلە) بوو بەمەبەستی بازاڕی عوکاز، وەکاتی نوێژی بەیانی بوو، نوێژیان دەکرد، هەندێ لە جنۆکەکانیش گوێیان لە قورئانەکەی پێغەمبەر بوو ، جا لەنێو خۆیاندا وتیان: ئەمەیە رێی لێگرتووین لە ئاسمان، جا ئیتر گەڕانەوە وتیان: (فقالوا إنا

سمعنا قرآنا يهدي إلى الرشد فآمنا به ولن نشرك بربنا أحدا ). جا سوورەتی (قل أوحي إلـي أنه استمع نفر مـن الجـن ..) هـات ، خـوای گـەورەش قسـەو وتـوو وێـژی جنۆکـەکانی لـەو سـوورەتەدا بـۆ گێڕایـەوە) بوخـاری: و مسـلم: و بەیهـەقی: بـەڵێ ئـەم ریوایەتـەو چـەند ریوایەتێکی دیکـە وادەگەیـەنن کـە پێغەمبـەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم) ئـەو جارەیـە هـەر هەستی بە ئامادەبوونی جنۆکەش نەکردبێ، بەڵکو گوێیان لە قورئانەکـەوە بـووە، پاشـان گەڕانەوە بۆ لای هۆزەکەیان و رووداوەکەیان گێڕایەوەو، ئەوانیش پـۆل پـۆل و، هـۆز هـۆز نوێنەریان نارد بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ئـەویش قورئـانی بـۆ خوێنـدن و بـانگی کـردن بـۆ ئیسـلام و موسـڵمان بـوون. (شـەیتان و جنۆکـە) جگـە لـە (ملاحیـدەو فەلاسـیفە)ی کۆن و (عـەلمانی)یـەکانی نـوێی ئێسـتا کەسـی تـر ئینکـارو نکووڵییـان ناکـا (شەیخول ئیسلام ئیبن تەیمیه) دەڵێ: (وجماهیر الأمم یقر بالجن ولهم وقائع یطول وصفها ولم ینکر الجن إلا شرذمة قلیلة من جهال المتفلسفة والأطباء ونحوهم)الفتاوی . وە جگـە لەقورئان بەفەرموودەیش بـوون و وجوودیـان سـەلمێنراوە، ئیمـامی (بوخـاریی) لـە (ئـەبو هورەیرە)وە فەرموودەی دیلەکەی هێناوە: (یا ابا هریره ! مافعل أسیرك ..!؟ بەڵێ هاتنی ئەو جنۆکانە بۆ گوێگرتن لە قورئان بەڵگەیـە بـۆ ئـەوە کـە کۆمـەڵێك لەدروسـتکراوی خـوا هەیـە.. پێیـان ئـەڵێن (جـن) و ئـەتوانن بـەو شـێوەیە کـەقورئان هـاتووە بیخوێننـەوەو بیلێنەوە.. جا ئێمەش لەوە زیاتر ناتوانین باسـی (جـن) بکـەین، وە پیویسـتە بروامـان بـە بوونیشیان هەبێ ئەگەرچی نەشبینرین ، چونکە هەر رۆژەی شتێکی نوێ دەرئەکـەوێ کـە ئەگەر پێش پێنج سەدە، باسی ئەو شتانە بکرایە کە ئەمڕۆ دەرکـەوتوون ئـەیانوت: شـێت بوون، لەولایشەوە ئێمە هێشتا واین لە سەرەتای رێگادا بۆ دەرخسـتنی شـتە نادیارەکـان. (فلما حضروه قالوا أنصتوا ) ئینجا کاتێ گەیشـتن و ئامـادەی قورئـان خوێندنەکـە بـوون لەناو یەکتردا وتیان: گوێ بگرن و بێ دەنگ بن، جا کەوابوو (ئەی قورەیش) بـۆ ئێـوە زۆر نەنگە کە بـڕوا نـاهێنن پێـی (فلما قضـي ولـوا إلـي قـومهم منـذرین) ئینجـا کـە خوێنـدنی قوئانەکە تەواوبوو، خێرا گەڕانەوە بۆ لای قەومەکەیان بە ترساندنیان لە سزای خوا(رامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: هَبَطُوا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ بِبَطْنِ نَخْلَةَ فَلَمَّا سَمِعُوهُ قَالُوا: أَنْصِتُوا. قَالُوا: صَهٍ. وَكَانُوا تِسْعَةً أَحَدُهُمْ زَوْبَعَةُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ، فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنْصِتُوا) (الأحقاف: ٢٩) الْآيَةُ إِلَى (ضَلَالٍ مُبِينٍ) (آل عمران: ١٦٤ ) رواه الحاكم وقال صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ ووافقه الذهبي

واتە: لە عەبدولای کوڕی مەسعودەوە هاتووە دەڵێ: جنەکان دابەزینە لای پێغەمبەر کاتێ قورئانی دەخوێند لە ناوچەی (نەخلە) کە گوێیان لێ بوو قورئان دەخوێنێ ، گوێیان بۆ گرت ، گوتیانە : یەکدی بێ دەنگ بن ، وە ژمارەیان (٩) کەس بوون ، یەکێکیان (زوبیعە) بوو ، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی : (وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ، فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنْصِتُوا) واتە: کاتێ هەندێك کەس لە جن ڕەوانەی لای تۆ کرد ، گوێیان گرت بۆ قورئان ، کاتێ ئامادەبوون ، گوتیانە یەکدی بێ دەنك بن.

(صَهْ: اسم فعل للامر بمعني ( بمعنى اسكت : للمفرد والمثنى و والجمع)

-( قال الحليمي رحمه الله: فمنها أنه كان صلى الله عليه وسلم رسولا إلى الثقلين ، أما الإنس، فإن الله عز وجل قال: (قل يا أيها الناس إني رسول الله إليكم جميعا) (الأعراف: ١٥٨) وأمره أن يقول: (وأوحي إلي هذا القرآن لأنذركم به ومن بلغ) (الأنعام: ١٩) وأما الجن فإن الله عز وجل يقول: (وإذ صرفنا إليك نفرا من الجن يستمعون القرآن فلما حضروه قالوا أنصتوا) (الأحقاف: ٢٩) إلى قوله: (ويجركم من عذاب أليم) (الأحقاف: ٣١) شعب الايمان للبيهقي

واتە: حیلمی کە یەکێك لە زانایان دەڵێ: پێغەمبەر ڕەوانکراوە بۆ ئینسان و جنۆکە، دەربارەی ئینسان خوا فەرموویەتی (قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ

# وتاری ژماره (١٠٨) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (الرحمن)

ئەم لە شاری مەدینە دابەزیوە لە ریزبەندا ژمارە(٥٥) ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (٧٨) ئایەتە.

چەند لایەنێکی گرنگی ئەم سورەتە:

١-باسی لەوە دەکات زەوی خوا بۆ هەموو کەس وەك فەرموویەتی :

(وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ ١٠

٢-باسی لایەنێکی نەفسی پیاو دەکات:

(فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٞ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنّٞ ٥٦

واتە: لەو باخانەدا هەن حۆریانێك كە تەنها چاویان لە مێردی خۆیانە پێش ئەوان دەستی كەسیان لێ نەكەوتووە نە لە ئادەمی و نە لە جنۆكە.

٣-باسی لەوە دەكات كەس نامێنێ جگە لە خوا وەك فەرموویەتی:

(كُلُّ مَنۡ عَلَيۡهَا فَانٖ ٢٦ وَيَبۡقَىٰ وَجۡهُ رَبِّكَ ذُو ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ٢٧

## هۆی دابەزینی ئایەتەی ژمارە(٤٦) سورەتی (الرحمن)

(وَلِمَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ٤٦) الرحمن

(میوانداریی بەهەشتییەكان: (ولمن خاف مقام ربه جنتان) وەبۆ هەركەسێك لە جێگای وەستانی خۆی لەبەردەم پەروەردگاری خۆی دەترسێ – لەوە فەرمانەكانی خوای بۆ

جێبـەجێ نـەبێ- دوو بەهەشـتی گـەورە هەیـە، بەهەشـتێك بـۆ سـوكناو جێگـای خـۆی، بەهەشتێكیش بۆ خـاوو خێزانـی، یـا بەهەشـتێك لەبەرامبـەر جێبـەجێكردنی فەرمانـەكانی خــواوەو، ئــەوی دیكەشـیان بـەهۆی نـەكردنی قەدەغەكراوەكانیـەوە، ئەمەیـە كـە خــوا ئەفەرموێ: (وأما من خاف مقـام ربـه ونهـى الـنفس عـن الهـوى فـإن الجنـه هـى المـأوى ).

پێغەمبەریش (صلى الله علیه وسلم) ئەفـەرموێ: (**جنتـان مـن فضـة آنيتهمـا ومـا فيهمـا، وجنتان من ذهب آنيتهما وما فيهما، وما بين القوم وبين أن ينظروا إلي ربهم –عز وجل– إلا رداء الكبرياء علي وجهه فيجنة عدن** )أخرجه البخارى (ڕامان)

(جَنَّتَانِ مِنْ فِضَّةٍ آنِيَتُهُمَا، وَمَا فِيهِمَا، وَجَنَّتَانِ مِنْ ذَهَبٍ آنِيَتُهُمَا، وَمَا فِيهِمَا، وَمَا بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُرُوا إِلَى رَبِّهِمْ إِلَّا رِدَاءُ الْكِبْرِيَاءِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْنٍ) متفق عليه

شرح: ((وما بين القوم وبين أن ينظروا إلى ربهم إلا رداء الكبرياء على وجهه في جنة عدن) قال العلماء كان النبي صلى الله عليه وسلم يخاطب العرب بما يفهمونه ويقرب الكلام إلى أفهامهم ويستعمل الاستعارة وغيرها من أنواع المجاز ليقرب متناولها فعبر صلى الله عليه وسلم عن زوال المانع ورفعه عن الأبصار بإزالة الرداء وقوله في جنة عدن أي الناظرون في جنة عدن فهي ظرف للناظر)

## ئایا ئەم ئایەتە دەربارەی كێ دابەزیوە؟

وەڵام : دەربارەی ئەبوبەكر دابەزیوە خوا لێی رازی بێ.

وَأخرج ابْن أبي حَاتِم وَأَبُو الشَّيْخ فِي العظمة عَن عَطاء أَن أَبَا بكر الصّديق رَضِي الله عَنهُ ذكر ذَات يَوْم وفكر فِي الْقِيَامَة والموازين وَالْجنَّة وَالنَّار وصفوف الْمَلَائِكَة وطيّ السَّمَوَات ونسف الْجبَال وتكوير الشَّمْس وانتثار الْكَوَاكِب فَقَالَ: وددتُ أَنِّي كنتُ خضراءَ من هَذَا الْخضر تَأتي عليَّ بَهِيمَة فتأكلني وَأَنِّي لم أخلق فَنزلت هَذِه الْآيَة (وَلمن خَافَ مقَام ربه جنتان) الدر المنثور

واته: عەتا دەڵێ: ڕۆژێك (ابوبكر) خوا لێی رازی بێ ، بیری كردەوە لە هاتنی قیامەت و تەرازوو و بەهەشت و ئاگر ، وە راوەستانی فریشتەكان پۆل پۆل ، وە پێچانەوەی ئاسمانەكان و روخانی كێوەكان و پێچانەوەی خۆر و هەڵوەرینی ئەستێرەكان ، گوتی: ئای لەوڕۆژە سەختە خۆزگە من گیاوگۆل دەبووم ، ئاژەلەكان دەیانخواردم و من دروست نەكرابامە ، جا دەربارەی ئەم لە خوا ترسانە خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند وفەرمووی (وَلمن خَافَ مقَام ربه جنتان) واتە: ئەوەی لەخوا بترسێ خوا دوو باخی دەداتێ.

وَأخرج ابْن جرير عَن ابْن عَبَّاس (وَلمن خَافَ مقَام ربه جنتان) قَالَ: وعد الله الْمُؤمنِينَ الَّذين خَافُوا مقَامه فأدوا فَرَائِضه الْجنَّة) الدر المنثور

واته: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: مانای (وَلمن خَافَ مقَام ربه جنتان) واتە: خوا بەلێنی بەو ئیمانداران داوە كە لەترسی خوا واجبەكانی جێ بەجی دەكەن ، دەیانخاتە بەهەشتەوە.

وفي رواية عن ابْن عَبَّاس (وَلمن خَافَ مقَام ربه جنتان) يَقُول: خَافَ ثمَّ اتَّقى والخائف من ركب طَاعَة الله وَترك مَعْصِيَته) **الدر المنثور للسيوطي**

واته: لەخوا ترساوە ، دوای تەقوای كردوە، ترساوە خواپەرستی كردوە، و وازی لە گوناحان هێناوە.

وفى روابە-( وَأخرج ابْن جرير عَن إِبْرَاهِيم (وَلمن خَافَ مقَام ربه جنتان) قَالَ: إِذا أَرَادَ أَن يُذنب أمسك مَخَافَة الله) **الدر المنثور للسيوطي**

واته: دەڵێ: دوو بەهەشت بۆ ئەو كەسەیە ویستویەتی گوناح بكات دوای لە ترسی خوا نەیكردوە.

وە پێغەمبەر لەم بارەوە فەرموویەتی:

(عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ جَنَّتَانِ مِنْ فِضَّةٍ آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا وَجَنَّتَانِ مِنْ ذَهَبٍ آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا وَمَا بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُرُوا إِلَى رَبِّهِمْ إِلَّا رِدَاءُ الْكِبْرِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْنٍ ) رواه البخاري

واته: دوو بەهەشت (باخچە) لە زیو بە ئامان و ئەوەی تیاندایە، وە دوو بەهەشت (باخچە) لە زێر لە ئامان وکەل وپەلی ناوی .....)

## هەڵوەستەیەك دەربارەی ئایەتی (١٣) سورەتی الرحمن:

تێبینی : ئەم ئایەتە لەم سورەتدا (٣١) جار دووبارە بۆتەوە

(فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ١٣) الرحمن

واتە: لەكام چاكەی پەروەردگار حاشا دەكەن؟: (**فبأي آلاء ربكما تكذبان**) جا ئیتر بەكام نیعمەت لە نیعمەتەكانی پەروەردگارتان (ئەی گرۆی ئادەمیی و جنیی!) ناشوكری دەكەن ؟ حەقتانە كە سەیری ئەو هەموو بەهرانە دەكەن بڕوابێنن و خۆتان یەكلابكەنەوە بۆی، (عەبدوڵڵای كوڕی عومەر) ئەڵێت: پەیامبەر (صلی اللە علیە وسلم) جارێك سوورەتی (ڕەحمان)ی بەسەر هاوەڵانیدا خوێندەوەو بێدەنگ بوون! ئەویش فەرمووی: بۆچی وەڵام نادەنەوە؟ بۆچی هەركات بموتایە: (**فبأي آلاء ربكما تكذبان**) جنیەكان ئەیانوت: (لا بشئ من نعمك ربنا نكذب فلك الحمد). تیرمزیی هێناویەتی و (حاكم)یش بەڕەواو دروستی داناوە. تێبینی: ڕستەی (فبأي آلاء ربكما تكذبان) لەم سوورەتەدا (٣١) جار دووپاتكراوەتەوە.(تەفسیری ڕامان)

## پێغەمبەر سورەتی( الرحمن )ی بۆ هاوەڵانی خوێندەوە:

(عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى أَصْحَابه فَقَرَأَ عَلَيْهِم سُورَةَ الرَّحْمَنِ مِنْ أَوَّلِهَا إِلَى آخِرِهَا فَسَكَتُوا فَقَالَ: (لَقَدْ قَرَأْتُهَا عَلَى الْجِنِّ لَيْلَةَ الْجِنِّ فَكَانُوا أَحْسَنَ مَرْدُودًا مِنْكُمْ كُنْتُ كُلَّمَا أَتَيْتُ على قَوْله (فَبِأَيِ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ) قَالُوا لَا بِشَيْءٍ مِنْ نِعَمِكَ رَبَّنَا نُكَذِّبُ فَلَكَ الْحَمْدُ) رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ قال الالباني حَسَنٌ في سلسلة الأحاديث الصحيحة

واتە: لە جابیرەوە هاتووە خوا لێ رازی بێ دەڵێ: رۆژێك پێغەمبەر هاتە لای هاوەڵانی سورەتی (الرحمن)بەسەردا خوێندن لە سەرەتاوە تاکو کۆتایی ، هاوەڵان بێ دەنگ بوون، پێغەمبەر فەرمووی ئەوە بۆچی بێ دەنگن ؟ فەرمووی : ئەو شەوەی جنەکان هاتنە لام بۆم خوێندنەوە ، لە ئێوە چاکتر وەڵامیان دایەوە ، هەر کاتێ ئەم ئایەتەم دەخوێندەوە (فَبِأَيِ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ) دەیانگوت : نەخێر خودایە هیچ نازو نیعمەتێکی تۆ بەدرۆ نازانین ، لەسەر نیعمەتەکانت سوپاست دەکەین.

******************

# وتاری ژماره (١٠٩) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## ١-سورەتی (الواقعه ):

ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژمارە(٥٦)ە، وە ژمارەی ئایەتەکانی (٩٦) ئایەتە .

ئـەم سـورەتە باسـی ناخۆشیەکانی رۆژی قیامـەت دەکـات و باسـی دابەشبونی خـەڵکی دەکات کە دابەش دەبن بۆ (٣) بەشان ، باسی دروست بوونی ئینسـان و رووەك دەکـات ، لـە کۆتاییـدا باسـی سـەرنجامی ئـەو سـێ چـینە دەکـات ، چـینی بەختـەوەران و چـینی بەدبەختەکان و چینی پێشبرکی کاران بۆ چاکە.

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٧٥-٨٢) سورەتی (الواقعه )

﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ٧٥ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٞ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ٧٦ إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ٧٧ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ٧٨ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ٧٩ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٨٠ أَفَبِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَنتُم مُّدۡهِنُونَ ٨١ وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ ٨٢﴾ الواقعه

واتە : جا سوێندبێ بە شوێنی (هەڵهاتن و ئـاوا بـوونی) ئەسـتێرەکان.(٧٥) بەڕاسـتی ئـەم سوێندە ئەگەر بزانن سوێندێکی زۆر گەورەیە.(٧٦) کە بێگومان ئەمە قورئـانێکی گـەورەو بەرێزە.(٧٧) لەناو کتێبێکی شاراوەدایە کە (لوح المحفوظ) ە.(٧٨) جگـە لـە (فریشـتـەی پاکـان کـەس دەسـتی لـێ نـادات.(٧٩) نێردراوەتـە خـوارەوە لەلایـەن پـەروەردگاری جیهانیانەوە.(٨٠) دەی ئایا ئێوە بەم قورئانـە بـاوەڕ ناکـەن.(٨١) وە لـەجیاتی سـوپاس گوزاری لەسەر ڕۆزیتان ئێوە باوەڕ ناهێنن.(٨٢)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عن ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: مُطِرَ النَّاسُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَصْبَحَ مِنَ النَّاسِ شَاكِرٌ وَمِنْهُمْ كَافِرٌ، قَالُوا: هَذِهِ رَحْمَةُ اللهِ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَقَدْ صَدَقَ نَوْءُ كَذَا وَكَذَا قَالَ: فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: (فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ) (الواقعة: ٧٥) حَتَّى بَلَغَ: (وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ) (الواقعة: ٨٢ ) رَوَاهُ مُسْلِمٌ

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: خەڵکی بارانیان بۆ باری لە زەمانی پێغەمبەردا، فەرمووی : خەڵکی ئەمرۆ بەیانی کردەوە هەندێك سوپاسی خوا و هەندێك کافربوون، گوتیان : چۆن ئەو بارانە رەحمەتی خودایە، هەندێك گوتیان: ئەستێرە بارانی بۆ باراندین ، دەڵێ: جا بەوبۆنەوە ئەم ئایەتە دابەزی (وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ)

ومن غريب الحديث : (نوء) : أى المنزلة من منازل القمر ، وكانت العرب تنسب إليه المطر)

وفي رواية-(عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ، أَنَّهُ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَاةَ الصُّبْحِ فِي الْحُدَيْبِيَةِ فِي إِثْرِ سَمَاءٍ كَانَتْ مِنَ اللَّيْلِ ، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ ، فَقَالَ: (هَلْ تَدْرُونَ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟) ، قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَالَ: أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِي مُؤْمِنٌ بِي ، وَكَافِرٌ ، فَأَمَّا مَنْ قَالَ: مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللَّهِ وَرَحْمَتِهِ ، فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِي كَافِرٌ بِالْكَوَاكِبِ ، وَأَمَّا مَنْ قَالَ: مُطِرْنَا بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا ، فَذَلِكَ كَافِرٌ بِي مُؤْمِنٌ بِالْكَوَاكِبِ ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەمی هاتووە خوا لێ رازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر لە حودەیبیە نوێژی بەیانی بۆ کردین ، کە شەوێ باران باری بوو، کاتێ تەواو بوو ڕووی لە خەڵکی کرد وفەرمووی( ئایا دەزانن پەروەدگاری ئێوە چی دەڵێ؟) گوتیان : خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن ، فەرموویەتی : هەندێك لە بەندەکانم بەیانیان کردوە بە موسڵمانی ، وهەندێك بەکافری ، ئەوەی گوتی: بە فەزل و رەحمەتی خوا بارانمان بۆ باری

، ئەوە ئیمانی بەمن هەیە و کافرە بە ئەستێرەکان، بەلاّم ئەوەی بلّێ: بارانمان بۆ باری بەهوی فلانە ئەستێرە، ئەوە کافرە بەمن و ئیمانی بە ئەستێرە هێناوە.

## چوار شتە لە کاری جاهیلانە:

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَرْبَعٌ فِي أُمَّتِي مِنْ أَمْرِ الجَاهِلِيَّةِ لَنْ يَدَعَهُنَّ النَّاسُ: النِّيَاحَةُ، وَالطَّعْنُ فِي الأَحْسَابِ، وَالعَدْوَى أَجْرَبَ بَعِيرٌ فَأَجْرَبَ مِائَةَ بَعِيرٍ مَنْ أَجْرَبَ البَعِيرَ الأَوَّلَ، وَالأَنْوَاءُ مُطِرْنَا بِنَوْءٍ كَذَا وَكَذَا : هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ) رواه الترمذي قال الالباني حسن

واتە: لە ئەبوهویرەوە هاتووە دەلّێ: پێغەمبەر فەرموویەتی: چوار شت لە کاری جاهیلانە خەلّکی وازیان لێ ناهێنێ، هات وهاوار لە کاتی مردن، توانج گرتن لە رەچەلّەك، ......، کەش وهەوا وەك بلّێن فلانە ئەستێرە باران دەبارێنێ.

## ٢- سورەتی (الحديد):

–ئەم سورەتە لەریزبەندا ژمارە (٥٧) وە ژمارەی ئایەتەکانی (٢٩) ئایەتە.

ئەم سورەتە لە (مەدینە) دابەزیوە ، باسی تەشریعات و پەروەدەی کۆمەلّگا دەکات لەسەر بناغەیەکی دروستی ئیسلامی .

–ئەم سورەتە باسی (٣) بابەتی گرنگ دەکات :

١–ئەم بونەوەرە هەمووی مولّکی خوایە وخۆی هەلّیدەسورێنێ .

٢–پێویستە قوربانی بە روح و شتە بەنرخەکان بدرێت تاکو ئالّای ئیسلام بەرز بێ.

٣–وێنە کردنی دونیا وەکو خۆی وشتەفرویدەرەکانی ، تاکو دوا رۆژ لە بیرنەکرێت .

–لەسەرەتادا باسی ئەوە دەكات هەموو شتێك تەسبیحاتی خوا دەكات.

–باسی چەند سیفەت و ناوێكی خوای گەورە دەكات.

–باسی ئەهلی ئیمان و ئەهلی نیفاق دەكات ، ئەهلی ئیمان ڕۆژی قیامەت بە نور و روناكی دەڕۆن ، بەڵام مونافیق دەكەوێتە تارێكی وەك چۆن لە دونیا لەسەر گومرایی و تاریكی بووە.

–ئایا بۆچی ناونراوە (الحدید) ؟ چونكە باسی ئاسن دەكات ، كە هێزە بۆ ئینسان لە شەڕو ئاشتی.

**١-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٢٧ ) سورەتی ( الحدید )**

**(ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ ۖ وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً ۚ وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ۖ فَـَٔاتَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ** ٢٧) الحدید

واتە: لە پاشان بە شوێن ئەواندا دیسان پێغەمبەرانی خۆمانمان نارد وە دواتر عیسای كوڕی مەریەممان نارد وە ئینجیلمان پێ بەخشی وە لە دڵی ئەوانەدا كە شوێنی كەوتوون سۆزو بەزەییمان دروست كرد وە گۆشەگیری یەك كە خۆیان دایان هێنابوو كە ئێمە ئەوەمان لەسەر پێویست نە كردبوون بەڵام خۆیان دایان هێنا بۆ ڕەزامەندی خوا كەچی وەك پێویست بوو پارێزگاری ئەو گۆشەگیریەیان نەكرد ئێمەش بەخشیمان بەوانەیان كە باوەڕیان هێنابوو پاداشتی خۆیان وە زۆریشیان لە سنوور دەرچوون.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَتْ مُلُوكٌ بَعْدَ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ عَلَيْهِ الصَّلَاة وَالسَّلَامُ بَدَّلُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنْجِيلَ، وَكَانَ فِيهِمْ مُؤْمِنُونَ يَقْرَءُونَ التَّوْرَاةَ قِيلَ لِمُلُوكِهِمْ: مَا نَجِدُ شَتْمًا أَشَدَّ مِنْ شَتْمٍ يَشْتِمُونَا هَؤُلَاءِ، إِنَّهُمْ يَقْرَءُونَ: (وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) (المائدة: ٤٤)، وَهَؤُلَاءِ الْآيَاتُ مَعَ مَا يَعِيبُونَا بِهِ فِي أَعْمَالِنَا فِي قِرَاءَتِهِمْ، فَادْعُهُمْ فَلْيَقْرَءُوا كَمَا نَقْرَأُ، وَلْيُؤْمِنُوا كَمَا آمَنَّا، فَدَعَاهُمْ، فَجَمَعَهُمْ، وَعَرَضَ عَلَيْهِمُ الْقَتْلَ أَوْ يَتْرُكُوا قِرَاءَةَ التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ، إِلَّا مَا بَدَّلُوا مِنْهَا، فَقَالُوا: مَا تُرِيدُونَ إِلَى ذَلِكَ، دَعُونَا، فَقَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ: ابْنُوا لَنَا أُسْطُوَانَةً ثُمَّ ارْفَعُونَا إِلَيْهَا، ثُمَّ اعْطُونَا شَيْئًا نَرْفَعُ بِهِ طَعَامَنَا وَشَرَابَنَا، فَلَا نَرِدُ عَلَيْكُمْ. وَقَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ: دَعُونَا نَسِيحُ فِي الْأَرْضِ، وَنَهِيمُ وَنَشْرَبُ كَمَا يَشْرَبُ الْوَحْشُ، فَإِنْ قَدَرْتُمْ عَلَيْنَا فِي أَرْضِكُمْ فَاقْتُلُونَا. وَقَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ: ابْنُوا لَنَا دُورًا فِي الْفَيَافِي، وَنَحْتَفِرُ الْآبَارَ، وَنَحْتَرِثُ الْبُقُولَ فَلَا نَرِدُ عَلَيْكُمْ، وَلَا نَمُرُّ بِكُمْ، وَلَيْسَ أَحَدٌ مِنَ الْقَبَائِلِ إِلَّا وَلَهُ حَمِيمٌ فِيهِمْ. قَالَ: فَفَعَلُوا ذَلِكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا) (الحديد: ٢٧) وَالْآخَرُونَ قَالُوا: نَتَعَبَّدُ كَمَا تَعَبَّدَ فُلَانٌ، وَنَسِيحُ كَمَا سَاحَ فُلَانٌ، وَنَتَّخِذُ دُورًا كَمَا اتَّخَذَ فُلَانٌ، وَهُمْ عَلَى شِرْكِهِمْ، لَا عِلْمَ لَهُمْ بِإِيمَانِ الَّذِينَ اقْتَدَوْا بِهِ، فَلَمَّا بَعَثَ اللَّهُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَمْ يَبْقَ مِنْهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ، انْحَطَّ رَجُلٌ مِنْ صَوْمَعَتِهِ، وَجَاءَ سَائِحٌ مِنْ سِيَاحَتِهِ، وَصَاحِبُ الدَّيْرِ مِنْ دَيْرِهِ، فَآمَنُوا بِهِ، وَصَدَّقُوهُ، فَقَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَآمِنُوا بِرَسُولِهِ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِنْ رَحْمَتِهِ) (الحديد: ٢٨) أَجْرَيْنِ بِإِيمَانِهِمْ بِعِيسَى وَبِالتَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ، وَبِإِيمَانِهِمْ بِمُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَتَصْدِيقِهِمْ. قَالَ: يَجْعَلْ لَكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِ الْقُرْآنَ، وَاتِّبَاعَهُمُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لِئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ الْكِتَابِ) (الحديد: ٢٩) يَتَشَبَّهُونَ بِكُمْ (أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَى شَيْءٍ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ) (الحديد: ٢٩) الْآيَةَ) رواه النسائي تحقيق الألباني:صحيح الإسناد موقوف

واتە: لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە هاتووە دەڵێ: پادشاکان پاش (عیسى کوڕی مەریم) صەلات وسەلامی خوای لەسەر بێ، تەورات و ئینجلیان گۆڕی ، وە ئیمانداریان لەناو

هـەبوون تـەوراتیان دەخوێنـد ، گوترایـە پادشـاکانیان : ئەوانـە بـە خوێنـدەوەی تـەورات جوێنمـان پـێ دەدەن، ئەوانـە ئـەوە دەخوێنـەو (وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) (المائدة: ٤٤) بەو ئایەتانە عەیبمان لێ دەگرن، جا بانگیان بکەن باوەکو ئێمـە بخوێنەوە وەك ئێمە ئیمانیان پـێ هـەبێ، جـا ئیمانـدارەکانیان کـۆکردەوە کوشـتنیان بـۆ خستنە روو یان واز لە خوێندنەوەی تەورات و ئینجیل دێـنن، یـان بیگـۆڕن، ئیمانـدارەکان گوتیان : لێمان گەڕێن چیتان دەوێ، کۆمەڵێك گوتیان: پەرسـتگامان بـۆ دروسـت بکـەن و بەرزمان بکەنـەوە ،دوای شـتێکمان بـدەنێ خـواردن و خواردنـەوەی پـێ بـەرز بکەینـەوە، حەقمان پێتان دانیە، کۆمەڵێکی دیکە گوتیان: لێمان گەرین بۆ خۆمان بە زەویدا دەگەرێن دەپۆڕێنین ، دەخۆینەوە هەروەك درندەکان دەخۆنەوە ، ئەگەر لە خاکی خۆتان دەسـتان گەیشـتە ئێمـە بمـانکوژن، کۆمـەڵێکی دیکـە گوتیـان: گـەرەکێکمان بـۆ دروسـت بکـەن لـە بیابان، ئێمەش بیران لێ دەدەیـن، پاقلـە دەچـێنین ، حـەقتان لـە ئێمـە نـەبێ، وە بـەلای ئێوەدا رەتنابین، وەهیچ هۆزێك نیە مەگەر دۆسـتایەتی لەناویانـدا هەیـە، دەڵـێ: ئـەوەیان کرد ، خواش ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد (وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا) (الحدید:٢٧) ئەوانی دیکە گوتیان: خواپەرستی دەکـەین هـەر وەك فلان ، بە زەویدا دەگـەرێن وەك فـلان ، دەچینە خـانوان وەك فـلان ، ئـەوان لەسـەر شیریکی ئەوانن ، هـیچ زانیاریـان نیـە بـە ئیمـانی ئەوانـەی دوایـان کـەوتوون ، کـاتێ خـوا پێغەمبەری نارد ، ئەوانە کەسیان نەبوون کـەمێك نـەبێ، جـا ئـەوەی لـە پەرسـتگا هـات و ئەوەی گەرۆك بـوو هـات ، ئـەوەی لـە خـانوان بـوو هـات، ئیمانیـان هێنـا بـە پێغەمبـەر و بەراستیان دانا، خواش فەرمووی (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَآمِنُوا بِرَسُولِهِ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِنْ رَحْمَتِهِ) (الحدید: ٢٨) دوو پاداشت یەکەم بە ئیمانیـان بـە عیسـی و تـەورات وئینجیـل پاداشتی دووەم ئیمانیان بە (محمد) وبەراست زانینی ، دەفەرموێ (يَجْعَلْ لَكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِ) واتە بە قورئان و شوێنکەوتنی ، وەدەفەرمووێ(لِئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ الْكِتَابِ) (الحدید: ٢٩) واتە : خۆیان بە ئێوە دەچوێنن (أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَى شَيْءٍ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ)

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٨) سوڕەتی (الحدید)

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَءَامِنُواْ بِرَسُولِهِۦ يُؤۡتِكُمۡ كِفۡلَيۡنِ مِن رَّحۡمَتِهِۦ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ نُورٗا تَمۡشُونَ بِهِۦ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٢٨) الحديد

واتە: ئەی ئەو کەسانەی کەباوەڕتان هێناوە لەخوا بترسن و پارێزگاربن و باوەڕی پتەو بهێنن بەپێغەمبەرەکەی، تا دوو بەرابەر پاداشت و ڕەحمەتتان بەسەردا ببارێنێت، هەروەها نوور و ڕوناکیەتان پێ ببەخشێت لەبەر ڕۆشنایيەکەی دا چالاکی بنوێنن و ڕێبازی ژیان بگرنەبەر، تا لێتان خۆش ببێت، چونکەئەو خوایە لێخۆشبوو میهرەبانە (تەفسیری ئاسان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(عَن ابْن عمر قَالَ: قَالَ رَسُول الله صلى الله عَلَيْهِ وَسلم: إِن الله قسم الْعَمَل وَقسم الْأجر وَفِي لفظ وَقسم الْأَجَل فَقيل للْيَهُود: اعْمَلُوا فعملوا إِلَى نصف النَّهَار فَقيل: لكم قِيرَاط وَقيل لِلنَّصَارَى: اعْمَلُوا فعملوا من نصف النَّهَار فَقيل: لكم قِيرَاط وَقيل للْمُسلمين: اعْمَلُوا فعملوا من الْعَصْر إِلَى غرُوب الشَّمْس فَقيل: لكم قيراطان فتكلمت الْيَهُود وَالنَّصَارَى فِي ذَلِك فَقَالَت الْيَهُود: أنعمل إِلَى نصف النَّهَار فَيكون لنا قِيرَاط وَقَالَت النَّصَارَى: أنعمل من نصف النَّهَار إِلَى الْعَصْر فَيكون لنا قِيرَاط وَيعْمل هَؤُلَاءِ من الْعَصْر إِلَى غرُوب الشَّمْس فَيكون لَهُم قيراطان فَأنْزل الله (لِّئَلَّا يَعۡلَمَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ أَلَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ٢٩ (الحديد) ثمَّ قَالَ: إِن مثلكُمْ فِيمَا قبلكُمْ من الْأُمَم كَمَا بَين الْعَصْر إِلَى غرُوب الشَّمْس) الدر المنثور

واتە: لە عەبدولاَی کوڕی عومەرەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی: خوا کردەوەو پاداشتی دیاری کردوە(لەریواتێکدا ئەجەلی دیاری کردوە) گوترایە جوولەکە کاربکەن کاریان کرد تاکو نیوەڕۆ ، پێیان گوترا : قیراتێك پاداشتان هەیە، وە بە گاوەرەکان گوترا:

کاربکەن ، کاریان کرد لە نیوەڕۆ را تاکو عەسر، پێیـان گـوترا : پاداشـتان قیراتێکـە ، وە بەموسڵمان گوترا: کاربکەن ، جا کاریان کرد لە عەسرا تاکو مەغریب ، پێیان گوترا : ئێوە دوو قیراتان پاداشت بۆ هەیە، جا جوولەکە بە جەواب هاتن گوتیان: ئێمـە کاربکـەین تـاکو نیوەڕۆ یەك قیرات خێرمان بگاتێ ، گاوە گوتیان : ئێمە لە نیوەڕۆ تـاکو عەسـر کاربکـەین پاداشـتی یـەك قیراتمـان بـۆ هـەبێ، ئەوانـە (موسـڵمانان) لـە عەسـر را تـاکو مـەغریب دوو قیراتیـان بـۆ هەیـە، خـوا ئـەم ئایەتـەی دابەزاندوفـەرمووی ﴿لِّئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَيْءٍ مِّن فَضْلِ ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلْفَضْلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ٢٩﴾

، دوای پێغەمبـەر فـەرمووی: نموونـەی ئێـوە لەگـەڵ گـەلانی پـێش ئێـوەدا وەك نموونـەی نێوان عەسرو مەغریبە(واتە: کاتێکی کەم و پاداشتی زۆر)

## دوو نموونە لە فەرموودەی پێغەمبەر لەم بارەوە:

١-( عَنْ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّمَا أَجَلُكُمْ فِيمَا خَلَا مِنَ الأُمَمِ كَمَا بَيْنَ صَلَاةِ العَصْرِ إِلَى مَغَارِبِ الشَّمْسِ وَإِنَّمَا مَثَلُكُمْ وَمَثَلُ اليَهُودِ وَالنَّصَارَى كَرَجُلٍ اسْتَعْمَلَ عُمَّالًا، فَقَالَ: مَنْ يَعْمَلُ لِي إِلَى نِصْفِ النَّهَارِ عَلَى قِيرَاطٍ قِيرَاطٍ؟ فَعَمِلَتِ اليَهُودُ عَلَى قِيرَاطٍ قِيرَاطٍ، فَقَالَ: مَنْ يَعْمَلُ لِي مِنْ نِصْفِ النَّهَارِ إِلَى الْعَصْرِ عَلَى قِيرَاطٍ قِيرَاطٍ فَعَمِلَتِ النَّصَارَى عَلَى قِيرَاطٍ قِيرَاطٍ، ثُمَّ أَنْتُمْ تَعْمَلُونَ مِنْ صَلَاةِ العَصْرِ إِلَى مَغَارِبِ الشَّمْسِ عَلَى قِيرَاطَيْنِ قِيرَاطَيْنِ، فَغَضِبَتِ اليَهُودُ وَالنَّصَارَى وَقَالُوا: نَحْنُ أَكْثَرُ عَمَلًا وَأَقَلُّ عَطَاءً، قَالَ: هَلْ ظَلَمْتُكُمْ مِنْ حَقِّكُمْ شَيْئًا؟ قَالُوا: لَا، قَالَ: فَإِنَّهُ فَضْلِي أُوتِيهِ مَنْ أَشَاءُ ) هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ) رواه الترمذي قال الالباني صحيح

واتە: لەئیبنو عومەرەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی : مانەوەی ئێوە لە دونیا لە چاو گەلان وەکو ماوەی نێوان عەصر و مەغریبە، وە نموونەی ئێوە و جوولەکـەوگاورەکان

، وەکو پیاوێکە چەند کرێکارێکی هەبن، جا دەڵێ: کێ کارم بۆ دەکات تاکو نیوەڕۆ بەرامبەر یەك یەك قیرات، جا جوولەکە کاریان کرد بە قیرات قیرات، دوای گوتی: کێ کارم بۆ دەکات لە نیوەڕۆ را تاکو عەصر بە قیرات قیرات ، جا گاورەکان کاریان کرد تاکو عەصر بە قیرات قیرات، جا ئێوە کارتان کرد لە عەصر را تاکو مەغریب بە دوو قیرات ، جا جوولەکەو گاور توڕەبوون ، گوتیان ئێمە زیاتر کارمان کردوە و کرێمان کەمترە، جا گوتی : ئایا زوڵمم لە حەقی ئێوە کردوە، گوتیان نەخێر، گوتی: ئەوە فەزل و چاکەی خۆمە کێ حەزبکەم پێی دەبەخشم.

٢-(عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَثَلُ الْمُسْلِمِينَ وَالْيَهُودِ وَالنَّصَارَى كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَأْجَرَ قَوْمًا يَعْمَلُونَ لَهُ عَمَلًا يَوْمًا إِلَى اللَّيْلِ عَلَى أَجْرٍ مَعْلُومٍ فَعَمِلُوا لَهُ إِلَى نِصْفِ النَّهَارِ فَقَالُوا لَا حَاجَةَ لَنَا إِلَى أَجْرِكَ الَّذِي شَرَطْتَ لَنَا وَمَا عَمِلْنَا بَاطِلٌ فَقَالَ لَهُمْ لَا تَفْعَلُوا أَكْمِلُوا بَقِيَّةَ عَمَلِكُمْ وَخُذُوا أَجْرَكُمْ كَامِلًا فَأَبَوْا وَتَرَكُوا وَاسْتَأْجَرَ أَجِيرَيْنِ بَعْدَهُمْ فَقَالَ لَهُمَا أَكْمِلَا بَقِيَّةَ يَوْمِكُمَا هَذَا وَلَكُمَا الَّذِي شَرَطْتُ لَهُمْ مِنْ الْأَجْرِ فَعَمِلُوا حَتَّى إِذَا كَانَ حِينُ صَلَاةِ الْعَصْرِ قَالَا لَكَ مَا عَمِلْنَا بَاطِلٌ وَلَكَ الْأَجْرُ الَّذِي جَعَلْتَ لَنَا فِيهِ فَقَالَ لَهُمَا أَكْمِلَا بَقِيَّةَ عَمَلِكُمَا مَا بَقِيَ مِنْ النَّهَارِ شَيْءٌ يَسِيرٌ فَأَبَيَا وَاسْتَأْجَرَ قَوْمًا أَنْ يَعْمَلُوا لَهُ بَقِيَّةَ يَوْمِهِمْ فَعَمِلُوا بَقِيَّةَ يَوْمِهِمْ حَتَّى غَابَتْ الشَّمْسُ وَاسْتَكْمَلُوا أَجْرَ الْفَرِيقَيْنِ كِلَيْهِمَا فَذَلِكَ مَثَلُهُمْ وَمَثَلُ مَا قَبِلُوا مِنْ هَذَا النُّورِ) رواه البخاري

### سێ کەس دوو پاداشتیان هەیە :

(ثَلَاثَةٌ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُمْ مَرَّتَيْنِ: رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمَنَ بِنَبِيِّهِ، وَأَدْرَكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَآمَنَ بِهِ وَاتَّبَعَهُ وَصَدَّقَهُ، فَلَهُ أَجْرَانِ، وَعَبْدٌ مَمْلُوكٌ أَدَّى حَقَّ اللهِ تَعَالَى وَحَقَّ سَيِّدِهِ، فَلَهُ أَجْرَانِ، وَرَجُلٌ كَانَتْ لَهُ أَمَةٌ فَغَذَّاهَا، فَأَحْسَنَ غِذَاءَهَا، ثُمَّ أَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ أَدَبَهَا، ثُمَّ أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا فَلَهُ أَجْرَانِ) رواه مسلم

واتـه: سـێ کـەس پاداشـیان دوو بەرامبـەر دەبێـت: پیـاوێ لـەخاوەن نامـەکان کـەبڕوای بەپێغەمبەرەکەی خۆی هێنابێ و بڕوا بەمنیش بێنێت، وە بەندەیـەکیش مـافی خـواو، مـافی گـەورەو ئاغاکـەی خـۆی جێبـەجێ بکـا، وە پیـاوێکیش بـەڕێك و پێکـی ئـەدەب و وێڵـی کەنیزەکەی بدا، پاشان ئازادی بکاو بیهێنێ

******************

## وتاری ژماره (١١٠) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### سورەتی (المجادله)

ئەم سورەتە لەریزبەندا ژمارە (٥٨)ە، وە ژمارەی ئایەتەکانی (٢٢)ئایەتەیە.

ئەم سورەتە لە مەدینە دابەزیوە ، باسی حوکمی زیهار و کەفارەتەکەی دەکات

-سەرەتا باسی چیرۆکی (خەولەی کچی سەعلەبە) دەکات کە پیاوەکەی زیهاری لەگەڵ کردبوو ، سکالای حاڵی خۆی هێنایە لای پێغەمبەر گوتی ئەم پیاوە زوڵمی لیّ کردوم ، پیّ فەرموو تەلاقت کەوتووە ، خەولە گوتی سکالام دەبمە لای خوا، خواش وەلآمی دایەوە ئایەتی بۆ دابەزاند فەرمووی (قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ ١) المجادله

واتە : بێگومان خوا قسەی ئەو ژنەیە بیست گفت و گۆی لەگەڵ تۆ کرد (ئەی موحەمەد !(صلى الله عليه وسلم)لەبارەی مێردەکەیەوە وتشتکی إلى الله و سکاڵای بۆلای خوا ئەبرد بۆ چارەسەر والله یسمع تحاورکما لەکاتێکدا خواش گوێی لەگفتوگۆکەی هەردووکتانە وە بوو. رۆژێك (ئەوسی کوری سامیت) رکی لە خاتوو (خەولە)ی هاوسەری هەڵسا وتی: تۆ لەجێگەی دایکمی، پاشان (خەولە) رۆیشت بۆلای پەیامبەر (صلی اللە علیە وسلم) و رووداوەکەی بۆگێڕایەوە، ئەویش فەرمووی لێی حەرام بوویت و نابیّ بگەڕێیتەوە لای.(خەولە)ش وتی: سوێند بە خوا تەڵاق بە دەمیا نەهاتووەو باوکی منداڵانمەو خۆشی ئەویّ ، پەیامبەریش (صلى الله عليه وسلم) وەڵامی هەر ئەوەبوو بۆی، ئیتر خەولەش هەر ئەرۆیشت و ئەهات و بە خەفەتەوە ئە تلایەوە و رووی دەکردە خواو هاناو سکاڵای خۆی بۆخوا دەبرد، دەرەنجام خوای میهرەبانیش بۆ وەڵامەکەی چوار ئایەتی ئەوەڵی ئەم سوورەتەی ناردە خوارەوە. پێشەوا ئەحمەد) بەراستی خوا خوایەکی بیسەری ئەو پاڕانەوەو وتوو وێژەی ئەوانە، بە کردو کرداریشیان بینایە.(ڕامان)

–باسی حوکمی زیهاروکەفارەتەکەی دەکات (ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمۡۖ إِنۡ أُمَّهَٰتُهُمۡ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔي وَلَدۡنَهُمۡۚ وَإِنَّهُمۡ لَيَقُولُونَ مُنكَرٗا مِّنَ ٱلۡقَوۡلِ وَزُورٗاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٞ ٢) المجادله

واتە : ئەوانەتان کە ڤهار دەکەن لەگەڵ ژنەکانیاندا (پێیان دەڵێن وەك دایکمان وان) ئەوانە دایکی ئەوان نین دایکی ئەوان هەر ئەو ژنانەن کە ئەوانیان لێ بووە، وە بێگومان ئەوانە گفتارێکی خراپی ناپەسەند دەڵێن و درۆ دەکەن وە بەڕاستی خوا لێ خۆش بووی بووردەیە.(پوختەی تەفسیر)

–باسی قسەی نێوان دوو کەس دەکات بە نهێنی کە لە ئادابی جوولەکەیە بۆ ئازاردانی موسڵمانان

(أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ مَا يَكُونُ مِن نَّجۡوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمۡ وَلَا خَمۡسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمۡ وَلَآ أَدۡنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمۡ أَيۡنَ مَا كَانُواْۖ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُواْ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ٧) المجادله

واتە: ئایا نەت زانیوە کە خوا دەزانێ چی لە ئاسمانەکان وە چی لە زەوی دایە چپەی هیچ سێ کەسێك نی یە کە خوا چوارەمیان نەبێ وە چپەی هیچ پێنج کەسێك نی یە کە ئەو شەشەمیان نەبێت وە نە کەمتر لەو ژمارە نە زۆرتر نی یە مەگەر خوایان لەگەڵدایە لە هەر جێگایەك دا بن پاشان لەڕۆژی دوایی دا ئاگاداریان دەکاتەوە بەوەی کە کردوویانە بەڕاستی خوا بە هەموو شتێك ئاگادارو زانایە.(پوختەی تەفسیر)

–باسی سلاوی خراپی جوولەکە دەکات کە دەهاتنە مەجلیسی پێغەمبەر (وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوۡكَ بِمَا لَمۡ يُحَيِّكَ بِهِ..... )

عائیشە لە باسی سلاوی جوولەکە دەڵێ دەیانگوت:

(عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ كَانَ الْيَهُودُ يُسَلِّمُونَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُونَ السَّامُ عَلَيْكَ فَفَطِنَتْ عَائِشَةُ إِلَى قَوْلِهِمْ فَقَالَتْ عَلَيْكُمْ السَّامُ وَاللَّعْنَةُ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَهْلًا

يَا عَائِشَةُ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الرِّفْقَ فِي الْأَمْرِ كُلِّهِ فَقَالَتْ يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَوَلَمْ تَسْمَعْ مَا يَقُولُونَ قَالَ أَوَلَمْ تَسْمَعِي أَنِّي أَرُدُّ ذَلِكِ عَلَيْهِمْ فَأَقُولُ وَعَلَيْكُمْ) صحيح البخاري

–سوەرەتەکە کۆتایی دێنێت بەوەی خۆشەویستیمان بۆ خوابێ ، رەق لێ بونەوەش بۆ خوا بێ، وەك پێغەمبەر فەرموویەتی:

(مَنْ أَعْطَى لِلَّهِ وَمَنَعَ لِلَّهِ وَأَحَبَّ لِلَّهِ وَأَبْغَضَ لِلَّهِ وَأَنْكَحَ لِلَّهِ فَقَدْ اسْتَكْمَلَ إِيمَانَهُ) رواه الترمذي واحمد قال الالباني حسن

–ئایا بۆچی ناونراوە (المجادله)؟ چونکە گفتو گۆ لەنێوان پێغەمبەر و خەولە رویدا

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١) سورەتی (المجادله)

(قَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوۡجِهَا وَتَشۡتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسۡمَعُ تَحَاوُرَكُمَآۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ ١) المجادله

واتە : بەڕاستی خوا بیستی وتەی ئەو ژنەی کە لە بارەی مێردەکەیەوە گفتوگۆی لەگەڵ ئەکردی وە سکاڵای خۆی بۆ لای خوا ئەبرد وە خوا گوێی لە وتووێژی هەردووکتان بوو بەڕاستی خوا بیسەری بینایە.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عَنْ خَوْلَةَ بِنْتِ ثَعْلَبَةَ قَالَتْ وَاللَّهِ فِيَّ وَفِي أَوْسِ بْنِ صَامِتٍ أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ صَدْرَ سُورَةِ الْمُجَادَلَةِ قَالَتْ كُنْتُ عِنْدَهُ وَكَانَ شَيْخًا كَبِيرًا قَدْ سَاءَ خُلُقُهُ وَضَجِرَ قَالَتْ فَدَخَلَ عَلَيَّ يَوْمًا فَرَاجَعْتُهُ بِشَيْءٍ فَغَضِبَ فَقَالَ أَنْتِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمِّي قَالَتْ ثُمَّ خَرَجَ فَجَلَسَ فِي نَادِي قَوْمِهِ سَاعَةً ثُمَّ دَخَلَ عَلَيَّ فَإِذَا هُوَ يُرِيدُنِي عَلَى نَفْسِي قَالَتْ فَقُلْتُ كَلَّا وَالَّذِي نَفْسُ خُوَيْلَةَ بِيَدِهِ لَا تَخْلُصُ إِلَيَّ وَقَدْ قُلْتَ مَا قُلْتَ حَتَّى يَحْكُمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ فِينَا بِحُكْمِهِ قَالَتْ فَوَاثَبَنِي وَامْتَنَعْتُ

مِنْهُ فَغَلَبْتُهُ بِمَا تَغْلِبُ بِهِ الْمَرْأَةُ الشَّيْخَ الضَّعِيفَ فَأَلْقَيْتُهُ عَنِّي قَالَتْ ثُمَّ خَرَجْتُ إِلَى بَعْضِ جَارَاتِي فَاسْتَعَرْتُ مِنْهَا ثِيَابَهَا ثُمَّ خَرَجْتُ حَتَّى جِئْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ فَذَكَرْتُ لَهُ مَا لَقِيتُ مِنْهُ فَجَعَلْتُ أَشْكُو إِلَيْهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا أَلْقَى مِنْ سُوءِ خُلُقِهِ قَالَتْ فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ يَا خُوَيْلَةُ ابْنُ عَمِّكِ شَيْخٌ كَبِيرٌ فَاتَّقِي اللَّهَ فِيهِ قَالَتْ فَوَاللَّهِ مَا بَرِحْتُ حَتَّى نَزَلَ فِيَّ الْقُرْآنُ فَتَغَشَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا كَانَ يَتَغَشَّاهُ ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ فَقَالَ لِي يَا خُوَيْلَةُ قَدْ أَنْزَلَ اللَّهُ فِيكِ وَفِي صَاحِبِكِ ثُمَّ قَرَأَ عَلَيَّ قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ إِلَى قَوْلِهِ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرِيهِ فَلْيُعْتِقْ رَقَبَةً قَالَتْ فَقُلْتُ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا عِنْدَهُ مَا يُعْتِقُ قَالَ فَلْيَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ قَالَتْ فَقُلْتُ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ شَيْخٌ كَبِيرٌ مَا بِهِ مِنْ صِيَامٍ قَالَ فَلْيُطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا وَسْقًا مِنْ تَمْرٍ قَالَتْ قُلْتُ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا ذَاكَ عِنْدَهُ قَالَتْ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإِنَّا سَنُعِينُهُ بِعَرَقٍ مِنْ تَمْرٍ قَالَتْ فَقُلْتُ وَأَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ سَأُعِينُهُ بِعَرَقٍ آخَرَ قَالَ قَدْ أَصَبْتِ وَأَحْسَنْتِ فَاذْهَبِي فَتَصَدَّقِي عَنْهُ ثُمَّ اسْتَوْصِي بِابْنِ عَمِّكِ خَيْرًا قَالَتْ فَفَعَلْتُ قَالَ سَعْدٌ الْعَرَقُ الصَّنُّ ( رواه احمد )

واتە: لەخەولـەی کچـی سـەعلبەوە هـاتووە دەڵێ:سـوێند بـەخوا سـەرەتای سـورەتی (المجادله) دەربارەی من و ئەوسی کوڕی سامیت دابەزیوە ، دەڵێ من خێزانـی ئـەو بـووم، پیرێکی مامەلە خۆش بوو نەبوو ، دەڵێ ڕۆژێك هاتەوە داوایەکم لێ کرد تورەبـوو ، گـوتی: تۆ بۆ من وەکو دایکمی ، چووە دەرەوە نـاو کـۆڕی خزمـانی ، دوای هاتـەوە داوای کـردم، گوتم : سوێندم بەوەی گیانی خەولەی بەدەستە، نزیکم نابی ، ئەوەی گوتت گۆتت ، تـاکو خوا و پێغەمبەر بریـاری لـێ نـەدەن دەڵـێ درێـژی کـردم بـەڵام لـێ نەگـەرام هـیچ بکـات و پیرێکی لاواز بوو لەخۆم دوورخستەوە،چوومە لای جیرانەکانم ، جل وبەرگم بە ئـەمانت لـێ وەرگرت و چوومە لای پێغەمبەر ، لە لای دانیشتم، شتەکەم بۆ گێرایەوە ، باسی ڕەفتـاری خراپی ئەوم کرد، پێغەمبەر فەرمووی: ئەی خەولە کوڕە مامت پیرە دەربارەی ئەو لە خوا

بترسه،دەڵێ: سوێند بەخوا چی پێ نەچوو خوا قورئانی دەربارەی من ناردە خوارەوە، پێغەمبەر فەرمووی : ئەی خەولە خوا ئایەتی دەربارەی تۆ و پیاوەکەت ناردەخوارەوە جا بۆی خوێندمەوە(قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ إِلَى قَوْلِهِ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ)

جا پێغەمبەر پێی فەرمووم : پێ بڵێ با بەندەیەك ئازاد بكات، ئەڵێ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا والله پارەی نیە بەندە ئازاد بكات، فەرمووی با دوو مانگ لەسەر یەك بە ڕۆژوبێ، گوتم : ئەی پێغەمبەری خوا والله بەتەمەنە ناتوانێ بە ڕۆژوبێ، فەرمووی : با (٦٠) فەقیر تێربكات ویسقێك لە خورما، گوتم : والله ئەی پێغەمبەری خوا نییەتی ،فەرمووی : ئێمە یارمەتی دەدەین، بە سەبەتێك لە خورما، گوتم : منیش یارمەتی دەدەم بەسەبەتێك خورما ئەی نێرراوی خوا،فەرمووی : پێكات و دەستت خۆش بێ و چاكت كرد، برۆ كەفارەتەكەی بۆ بدە، وە داوات لێ دەكەم چاك بی لەگەڵ ئامۆزاكەت، دەڵێ: منیش وام كردوباش بووم لەگەڵی.

## عائیشە دەڵێ سوپاس بۆ ئەو خوایەیی گوێی لە شتان دەبێ:

(عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتِ : الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى وَسِعَ سَمْعُهُ الأَصْوَاتَ لَقَدْ جَاءَتِ الْمُجَادِلَةُ تَشْتَكِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- وَأَنَا فِى نَاحِيَةِ الْبَيْتِ مَا أَسْمَعُ مَا تَقُولُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِى تُجَادِلُكَ فِى زَوْجِهَا) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ

واتە:لە عائیشەی دایكی ئیمانداران هاتووە خوا لێی رازی بێ دەڵێ: سوپاس بۆ ئەوە خوایەیی كە ماوەی گوێی لێ بونی فراوانە، بیگومان ئافرەتەكە (خەولە) هات سكالای هێنایە لای پێغەمبەر ، من لە گۆشەیەكی ماڵەكەم بووم،تێنەگەیم چی گوت:بەلآم خوا بیستی وئایەتی دابەزندوفەرمووی (قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِى تُجَادِلُكَ فِى زَوْجِهَا)

وفي رواية-( قَالَتْ عَائِشَةُ تَبَارَكَ الَّذِي وَسِعَ سَمْعُهُ كُلَّ شَيْءٍ إِنِّي لَأَسْمَعُ كَلَامَ خَوْلَةَ بِنْتِ ثَعْلَبَةَ وَيَخْفَى عَلَيَّ بَعْضُهُ وَهِيَ تَشْتَكِي زَوْجَهَا إِلَى رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهِيَ تَقُولُ يَا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَكَلَ شَبَابِي وَنَثَرْتُ لَهُ بَطْنِي حَتَّى إِذَا كَبِرَتْ سِنِّي وَانْقَطَعَ وَلَدِي ظَاهَرَ مِنِّي اللَّهُمَّ إِنِّي أَشْكُو إِلَيْكَ فَمَا بَرِحَتْ حَتَّى نَزَلَ جِبْرَائِيلُ بِهَؤُلَاءِ الْآيَاتِ قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ ) صحيح سنن ابن ماجه

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٨ ) سورەتی ( المجادله )

(أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نُهُواْ عَنِ ٱلنَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُواْ عَنْهُ وَيَتَنَٰجَوْنَ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ ۖ وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ وَيَقُولُونَ فِيٓ أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ ۚ حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا ۖ فَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ٨) المجادله

واتە : ئایا سەرنجت نەداوە بەلای ئەوانەی کە قەدەغە کران لە چپە پاشان دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی لێیان قەدەغە کرابوو وە لەگەڵ یەکتریدا بە چپە ئەدوێن دەربارەی گوناهو دەست درێژی و بێ فەرمانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وە کاتێ بێن بۆ لات سەلامت لێ دەکەن بە شێوەیەك کە خوا بەو جۆرە سەلامی لێ نەکردوویت وە لەدڵی خۆیاندا دەڵێن: (ئەگەر پێغەمبەرە) بۆچی خوا سزامان نادات بەهۆی ئەو قسانەی کە پێ ی دەڵێن دۆزەخیان بەسە کەدەچنە ناویەوە (هەڵی دەگیرسێنن) کە جێگایەکی زۆر خراپە.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُنَاسٌ مِنْ الْيَهُودِ فَقَالُوا السَّامُ عَلَيْكَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ قَالَ وَعَلَيْكُمْ قَالَتْ عَائِشَةُ قُلْتُ بَلْ عَلَيْكُمْ السَّامُ وَالذَّامُ فَقَالَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا عَائِشَةُ لَا تَكُونِي فَاحِشَةً فَقَالَتْ مَا سَمِعْتَ مَا قَالُوا فَقَالَ أَوَلَيْسَ قَدْ رَدَدْتُ

عَلَيْهِمْ الَّذِي قَالُوا قُلْتُ وَعَلَيْكُمْ ، وفي رواية فَفَطِنَتْ بِهِمْ عَائِشَةُ فَسَبَّتْهُمْ فَقَالَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَهْ يَا عَائِشَةُ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْفُحْشَ وَالتَّفَحُّشَ وَزَادَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَإِذَا جَاءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ إِلَى آخِرِ الْآيَةِ ) صحيح مسلم

واته: له عائيشەی دایکی ئیمانداران هاتووه دەڵێ: خەڵکانێك له جووله‌كه هاتنه لای پێغەمبەر گوتیان : مردنت بێته سەر ئەی باوكی قاسم، ئەویش فەرمووی : بۆ سەر ئێوەش ، عائیشەدەڵی گوتم : بەڵكو مردن بێته سەرتان و توشی عەیب وعاربن، پێغەمبەر فەرمووی : ئەی عائیشه : جوێنیان پێ مەدە،ئەڵێ گوتم : ئایا گوێت لێ نەبوو چیان گوت ، فەرمووی : ئایا من وەلامم نەدانەوە بۆ ئەوەی گوتیان ، گوتم بۆ سەر ئێوەش، له ریوایەتیكەدا دەڵێ: عائیشه تێیان گەیشت و جوێنی پێدان ، پێغەمبەر فەرمووی : ئەی عائیشه لەسەر خۆبە، خوا جوێن و جوێندانی پێ خۆش نیه ، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (وَإِذَا جَاءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ إِلَى آخِرِ الْآيَةِ) واته: دێنه لات سلاوت لێ دەكەن خوا بەم شێوه سلاوت لێ ناكات.

وفي رواية-(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو أَنَّ الْيَهُودَ كَانُوا يَقُولُونَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَامٌ عَلَيْكَ ثُمَّ يَقُولُونَ فِي أَنْفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا اللَّهُ بِمَا نَقُولُ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةَ وَإِذَا جَاءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ إِلَى آخِرِ الْآيَةَ(رواه احمد ) ٦٥٨٩قال الشيخ شعيب الأرناؤوط : صحيح ، وهذا إسناد حسن

وفي رواية-(عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: إِنَّ رَهْطًا مِنَ اليَهُودِ دَخَلُوا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالُوا: السَّامُ عَلَيْكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (عَلَيْكُمْ)، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: بَلْ عَلَيْكُمُ السَّامُ وَاللَّعْنَةُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا عَائِشَةُ، إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الرِّفْقَ فِي الأَمْرِ كُلِّهِ)، قَالَتْ عَائِشَةُ: أَلَمْ تَسْمَعْ مَا قَالُوا؟ قَالَ: (قَدْ قُلْتُ عَلَيْكُمْ) رواه الترمذي قال الالباني صحيح

## ٣-هۆی دابەزینی ئایەتی (١٢-١٣) سورەتی (المجادله)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَٰجَيۡتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَةٗۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ١٢ ءَأَشۡفَقۡتُمۡ أَن تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَٰتٖۚ فَإِذۡ لَمۡ تَفۡعَلُواْ وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٣﴾ المجادله

واته : ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە هەر کاتێ (ویستان) قسەی پەنهانی لەگەڵ پێغەمبەردا(صلی الله علیه وسلم) بکەن ئەوە پێش چپە کردنەکەتان خێرێك بکەن ئەمە بۆ خۆتان چاکتر و پاکترە ئینجا ئەگەر هیچتان نەبوو ئەوە بێگومان خوا لێخۆش بوو میهرەبانە.(١٢) ئایا دەترسان (لە هەژاری) پێش چپە کردنەکەتان خێرێك بکەن ئینجا ئەگەر خێرەکەتان نەکرد و خواش تەوبەی لێ گیراکردن ئەوسا نوێژ بکەن و زەکات بدەن وە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن وە خوا شارەزایە بەوەی کە دەیکەن.(١٣)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَوْلَهُ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَاجَيْتُمُ الرَّسُولَ فَقَدِمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَةً﴾ (المجادلة: ١٢) وَذَلِكَ أَنَّ الْمُسْلِمِينَ أَكْثَرُوا الْمَسَائِلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، حَتَّى شَقُّوا عَلَيْهِ ، فَأَرَادَ اللَّهُ تَعَالَى أَنْ يُخَفِّفَ عَنْ نَبِيِّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، فَلَمَّا قَالَ ذَلِكَ ظَنَّ كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ ، وَكَفُّوا عَنِ الْمَسْأَلَةِ ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى بَعْدَ هَذَا ﴿فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُوا وَتَابَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ﴾ (الْمُجَادَلَةَ: ١٣) فَوَسَّعَ اللَّهُ ذَلِكَ ، وَلَمْ يُضَيِّقْ) الدر المنثور وابن ابي حاتم في تفسيره والمدخل إلى السنن الكبرى ولباب المنقول للسيوطي

واتە:لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: فەرمایشتی خوا﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَاجَيْتُمُ الرَّسُولَ فَقَدِمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَةً﴾ واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە هەر کاتێ (ویستان) قسەی پەنهانی لەگەڵ پێغەمبەردا(صلی الله علیه وسلم) بکەن ئەوە پێش

چپە کردنەکەتان خێرێك بکەن ئەمە بۆ خۆتان چاکتر و پاکترە ئینجا ئەگەر هیچتان نەبوو ئەوە بێگومان خوا لێخۆش بوو میهرەبانە.(پوختەی تەفسیر)

ئەوە بوو موسڵمانان زۆر پرسیاریان لە پێغەمبەر دەکرد ، نارحەتیان کرد بوو، خوا ویستی بەم ئایەتە باری پێغەمبەر سووك بکات، جا بەم ئایەتە خەڵکی لێ حاڵی بوون و وازیان لە زۆر پرسیارکردن هێنا، خواش پاشان ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرموی (فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُوا وَتَابَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ) ئەگەر خێرەکەتان نەکرد و خوا عەفوی کردن ، نوێژان بکەن و زەکات بدەن.

تێبینی: ئەم دەرسە لەم ئایەتە فێر دەبین ، ئەو کەسانەی پێگەی بەهێزیان هەیە لە ناو گۆمەڵگا بەتایبەتی زانایان پێویستە ڕەچاوی ئەوە بکرێ زۆر نارحەت نەکرێن باشە.

************************

## وتاری ژماره (١١١) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

لەم وتارەدا دوو هۆکار باس دەکەین .

یەکیان له سورەتی (المجادله):

### ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١٤-١٨) سورەتی (المجادله)

((أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْاْ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ١٤ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ١٥ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ١٦ لَّن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ١٧ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ ۚ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ١٨) المجادله

واته : ئایا بۆ سەرنجێك نادەی بە لای ئەوانەی کە دۆستایەتی ئەکەن لەگەڵ هۆزێك کە خوا غەزەبی لێگرتوون ئەوان نە لە ئێوەن و نە لە ئەوانن وە سوێند دەخۆن بەدرۆ لە کاتێکدا خۆیان دەزانن درۆ دەکەن.(١٤) خوا سزای دژواری بۆ ئامادە کردوون بەڕاستی ئەوەی ئەوان دەیانکرد کارێکی ناپەسەند بوو.(١٥) سوێندەکانیان کردبووە قەڵغان و بەرگری (خەڵك) یان کرد لە ڕێبازی خوا ئینجا بۆ ئەوان هەیە سزای ڕیسواکەر.(١٦) ماڵ و منداڵیان هیچ سوودێکی نی یە بۆیان ئەوانە یار و هاودەمی ئاگرن تیا دەمێننەوە بە هەمیشەیی.(١٧) لە ڕۆژێکدا کە خوا هەموویان زیندوو دەکاتەوە ئەوسا سوێندی بۆ دەخۆن هەر چۆنێ سوێندیان دەخوارد بۆ ئێوە (لە دنیادا) وە وا دەزانن شتێکیان بە دەستەوەیە با بزانن بەڕاستی هەر ئەوانن درۆزن.(١٨)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١- (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسًا فِي ظِلِّ حُجْرَتِهِ قَالَ يَحْيَى قَدْ كَادَ يَقْلِصُ عَنْهُ فَقَالَ لِأَصْحَابِهِ يَجِيئُكُمْ رَجُلٌ يَنْظُرُ إِلَيْكُمْ بِعَيْنِ شَيْطَانٍ فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَلَا تُكَلِّمُوهُ فَجَاءَ رَجُلٌ أَزْرَقُ فَلَمَّا رَآهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَعَاهُ فَقَالَ عَلَامَ تَشْتُمُنِي أَنْتَ وَأَصْحَابُكَ قَالَ كَمَا أَنْتَ حَتَّى آتِيَكَ بِهِمْ قَالَ فَذَهَبَ فَجَاءَ بِهِمْ فَجَعَلُوا يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا وَمَا فَعَلُوا وَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ يَوْمَ يَبْعَثُهُمْ اللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ إِلَى آخِرِ الْآيَةِ) رواه احمد والطبراني قال الشيخ شعيب الأرناؤوط : إسناده حسن والواحدي من اسباب النزول(قلص: هێنانەو یەك گرژبویەوە، (قلص الظل) واتە: سێبەرەكە گەرایەوە.

واتە:لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر دانیشتبوو لە ژێر سێبەری ژوورەكەی، خەریك بوو سێبەرەكە تەواو دەبوو بەهاوەڵانی فەرموو: ئێستا پیاوێك دێت بە چاوی شەیتان تەماشاتان دەكات، ئەگەر دیتتان قسەی لەگەڵ مەكەن، جا كە هات پیاوێكی كەسك بوو ، كاتێ پێغەمبەر چاوی پێ كەوت ، بانگی كرد و پێی فەرموو: بۆچی تۆ و دۆستەكانت جوێنم پێ دەدەن، گوتی : دەچم دۆستەكانم دێنم ، چوو هێنانی ، سوێندیان خوارد بەخوا نەجوێنیان داوە نەوایان كردوە،جا خوا ئایەتی دابەزاندوفەرمووی (يَوْمَ يَبْعَثُهُمْ اللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ إِلَى آخِرِ الْآيَةِ) واتە: ڕۆژی قیامەت كە خوا هەموویان زیندو دەكاتەوە سوێند بۆ خوا دەخۆن وەك چۆن سوێند بۆ ئێوە دەخۆن......تاكۆتایی ئایەتەكە.

وفي رواية –قَوْلُهُ عز وجل: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ تَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ) الْآيَاتِ)(١٤–١٤)

إِلَى قَوْلِهِ: (وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَى شَيْءٍ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ) وقال السُّدِّيُّ وَمُقَاتِلٌ: نَزَلَتْ فِي عَبْدِ اللَّهِ بْنِ نَبْتَلٍ الْمُنَافِقِ كَانَ يُجَالِسُ النَّبِيَّ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – ثُمَّ يَرْفَعُ حَدِيثَهُ إِلَى

الْيَهُودِ، فَبَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – فِي حُجْرَةٍ مِنْ حُجَرِهِ، إِذْ قَالَ: يَدْخُلُ عَلَيْكُمُ الْآنَ رَجُلٌ قَلْبُهُ قَلْبُ جَبَّارٍ وَيَنْظُرُ بِعَيْنَيْ شَيْطَانٍ، فَدَخَلَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ نَبْتَلٍ وَكَانَ أَزْرَقَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – عَلَامَ تَشْتُمُنِي أَنْتَ وَأَصْحَابُكَ؟ فَحَلَفَ بِاللَّهِ مَا فَعَلَ ذَلِكَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – (فَعَلْتَ)، فَانْطَلَقَ فَجَاءَ بِأَصْحَابِهِ فَحَلَفُوا بِاللَّهِ مَا سَبُّوهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الْآيَاتِ) الواحدي في اسباب النزول

واتە: سوودی و موقاتیل دەڵێن: ئەو پیاوە (عبدالله كوڕی نەبتیل) ی موونافیق بوو، دەهاتە مەجلیسی پێغەمبەر دوای دەچووە لای جوولەكەكان قسەكانی بۆ دەگێڕانەوە ،كە پێغەمبەر پێ فەرمووی بۆچی تۆ و دۆستەكانت جوێنم پێ دەدن، چوو هێنانی سوێندیان خوارد كە جوێنیان نەداوە ، خواش ئەم ئایەتەی دەربارە ناردەخوارەوە.

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٢) سورەتی (المجادلە)

(لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓاْ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ۖ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱللَّهِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ٢٢) المجادله

واتە: هیچ كۆمەڵێ نابینیت كە باوەڕی بە خواو بە ڕۆژەكەی تر ببێت دۆستایەتی ئەوانە بكەن دژایەتی خواو پەیامبەرەكەی دەكەن هەرچەندە ئەوانە باوكیان ، یان كوڕو نەوەیان ، یا براو عەشرەتیان بن، بە كورتیی: مرۆڤی باوەڕدار نابێبە هیچ شێوەیەك دۆستایەتیبكا لە گەڵ دوژمنانی خواو پێغەمبەردا ئەگینا لەوان دەژمێردرێن ئەوانە – كەلەدۆستایەتی دوژمنانی خوا خۆئەپارێزن– كەسانێكن خوا ئیمان و باوەڕی لەنێودڵیاندا چەسپاندووە، بەهیچ شتێ لەق نابێت، بۆیە (ئەبو عوبەیدە) لەڕۆژی (بەدر)دا باوكی خۆی كوشت، (ئەبوبەكری صدیق) بڕیاری كوشتنی (عبد الرحمن)ی كوڕی خۆیدا، (موصعەبی كوڕی

عومەیر) (عوبەیدە)ی برای خۆی کوشت. (حەمزەو عەلی) چەند کەسیان لە تیرەو بنەماڵەی خۆیان کوشت، چونکە ناحەزو دژ بەئیسلام بوون وە پشتگیری کردوون بە سەرخستن لە لایەن خۆیەوە و لەپاشە ڕۆژیشدا ئەیانباتە نێو چەند باخاتێکی بەهەشتەوە کە جۆگە ئاوی زۆر لە ژێر درەختەکانیدا ئەڕوات بەهەتا هەتاییش تێیدا دەبن خوا لێیان خۆشنوود و ڕازیی بووە، ئەوانیش لە خوا ڕازیی بوون ئا ئەوانە گرووپەکەی خوان ئاگادار و هۆشیاربن! کە هەر گرووپەکەی خوان بەرەوەکان لەدونیاو، لەقیامەتدا. (ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَن عبد الرَّحْمَن بن ثَابت بن قيس بن الشماس أَنه اسْتَأْذَنَ النَّبِي صلى الله عَلَيْهِ وَسلم أَن يزور خَاله من الْمُشْركين فَأَذِنَ لَهُ فَلَمَّا قَدِمَ قَرَأَ رَسُولُ اللهِ صلى الله عَلَيْهِ وَسلم وأُناسٌ حَولَهُ (لَا تَجِد قوما يُؤمنُونَ بِاللَّه) الْآيَة) الدر المنثور للسيوطي

واتە: لە (عبدالرحمن کوڕی سابیتەوە کوری قەیسی کوڕی شەماس هاتووە دەڵێ: داوای مۆڵەتم کرد لە پێغەمبەر کە سەردانی خاڵم بکەن کە موشریك بوو، ئەویش مۆڵەتی داو ، کاتێ چووم پێغەمبەر ئەو ئایەتەی خوێندەوە و چەند کەسێکێکیشی لە دەورە بوون،( لَا تَجِد قوما يُؤمنُونَ بِاللَّه)

٢-وفي رواية( عَنِ ابْنِ شَوْذَبٍ، قَالَ: جَعَلَ أَبُو أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ الْجَرَّاحِ يَتَصَدَّى لِابْنِهِ أَبِي عُبَيْدَةَ يَوْمَ بَدْرٍ، فَجَعَلَ أَبُو عُبَيْدَةَ يَحِيدُ عَنْهُ، فَلَمَّا أَكْثَرَ قَصَدَهُ أَبُو عُبَيْدَةَ فَقَتَلَهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى فِيهِ هَذِهِ الْآيَةَ حِينَ قَتَلَ أَبَاهُ: (لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ، أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ) (المجادلة: ٢٢) الْآيَةَ) حلية الاولياء ولباب المنقول للسيوطي

واتە: لەئیبنو شوزەبەوە هاتووە دەڵێ: باوکی ئەبو (عبیدەی کوڕی جەرراح) بەرەو کورەکەی هات لە شەڕی بەدر ، ئەبو عوبیدە خۆی لەبەر لادا تاکو نەیکوژێ، بەلاَم باوکی سوور بوو کورەکەی بکوژێ ، بۆیە ئەبو عوبیدە باوکی خۆی کوشت ، بەوبۆنەوە ئەم ئایەتە دابەزی (لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ، أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ)

( لَا تَجِد قوما يُؤمنُونَ بِاللَّه وَالْيَوْم الآخر يوادون من حاد الله وَرَسُوله) قَالَ سُفْيَان: يرَوْنَ أَنَّهَا أنزلت فِيمَن يخالط السُّلْطَان) الدر المنثور

واتە: سوفیان دەڵێ: وادەبینرێت ئەم ئایەتە بۆ ئەو کەسانە دابەزیبێت کە لەگەڵ دەستەلاَت تێکەڵ دەبن.

## ئامۆژگاری ئیبنو عەباس بۆ موجاهید:

( عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: قَالَ لِي ابْنُ عَبَّاسٍ: يَا مُجَاهِدُ، أَحِبَّ فِي اللَّهِ، وَأَبْغِضْ فِي اللَّهِ، وَوَالِ فِي اللَّهِ، وَعَادِ فِي اللَّهِ، فَإِنَّمَا تَنَالُ مَا عِنْدَ اللَّهِ بِذَلِكَ، وَلَنْ يَجِدَ عَبْدٌ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ وَإِنْ كَثُرَ صَلَاتُهُ وَصِيَامُهُ حَتَّى يَكُونَ كَذَلِكَ، وَقَدْ صَارَتْ مُؤَاخَاةُ النَّاسِ الْيَوْمَ أَوْ عَامَّتِهِمْ فِي الدُّنْيَا، وَذَلِكَ لَا يُجْزِئُ عَنْ أَهْلِهِ شَيْئًا، ثُمَّ قَرَأَ (الْأَخِلَّاءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ) (الزخرف: ٦٧) وَقَرَأَ (لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ) (المجادلة: ٢٢) تعظيم قدر الصلاة لمحمد بن نصر بن الحجاج الْمَرْوَزِي

واتە: موجاهید دەڵێ: ئیبنو عەباس پێی گوتم: ئەی موجاهید ، بۆخوات خۆش بوێ، بۆ خوا رقت لێ بێتەوە، دۆستایەتی بۆ خوا بکە، دوژمنایەتی بۆ خوا بکە، بەوکارە دەگەیتە ئەوەی لای خوایە (واتە: بەهەشت و رەزامەندی ئەو) بەراستی بەندە شیرینی ئیمان ناچێژێ ، بە زۆری نوێژ و رۆژوو ، تاکو وانەبی کە گوتم ، ئەمڕۆ برایەتی خەڵکی یان بەگشتی هەر لە دونیایە، هیچی پێ ناکرێ بۆ کەس وکاری خۆی لە قیامەت ، دوای ئیبنو

عەباس ئـەو ئايەتـەى خوێنـدەوە (الْأَخِلَّاءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ) دوايـش ئـەم ئايەتـەى خوێنـدەوە (لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ)

******************

# وتاری ژماره (١١٢) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (الحشر) :

ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژمارە(٥٩)یە و ژمارەی ئایەتەکانی (٢٤)ئایەتە.

ئەم سورەتە لە مەدینە دابەزیوە ، باسی موسڵمانان دەکات لەگەڵ جوولەکەکانی (بنو النضیر) بۆیە ئیبنو عەباس بەم سورەتەی دەگوت سورەتی (سورة بن النضیر)

ئەم سورەتە باسی ئەوە دەکات کە هەموو شتێك تەسبیحاتی خوا دەکات وشاهێدی گەورەی خوا لێ دەدات ، وەك فەرموویەتی (سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١ ) الحشر

واتە: هەموو شتێ پاکیی و بێ عەیبی خوا دەڵێ: (بسم الله الرحمن الرحیم ( سبح لله ما في السموات وما في الأرض) هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدایە سەرجەم تەسبیح بۆخوا دکەن، واتە: لەژێر فەرمان و دەسەڵاتی ئەودا دەجولێنەوە، وەك لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ۗ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا (الإسراء: ٤٤).

واتە: ستایشی خوا دەکەن هەر حەوت ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە ناویاندایە وە هیچ شتێك نیە کە سوپاسی ئەو ستایش نەکات بەڵام ئێوە تێ ناگەن لە تەسبیحاتەکەیان بەڕاستی خوا هەمیشە پەلەنەکەری لێبوردەیە.

وهو العزیز الحکیم هەر ئەو خوایەیە دەستەڵاتداری کارجوان و کاردروستە.(ڕامان)

وەباسی موسڵمانە کۆچکردوەکان دەکات لە پیناوی خوا و وە پشتیوانان چۆن باوەشیان گرتوە بۆ براکانیان وەك دەفەرموێ :(لِلۡفُقَرَآءِ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأَمۡوَٰلِهِمۡ يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ٨ ) واتە: ئەو دەسکەوتەی لە بەنی نەضیر گیرا بۆ نەدارانی کۆچکەرانە

ئەوانەی کە دەرکران لەماڵیان و سامانیان هەوڵی بەهرەی خـوا و ڕەزامەنـدی ئـەو دەدەن وە یارمەتی خوا و پێغەمبەری خوا دەدەن هەر ئەوانن ڕاستگۆیان.

-وەباسی خـۆ ئامـادەکردن دەکـات بـۆ ڕۆژی سـەختی قیامـەت وەك دەفـەرموێت (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٨ ) واتـە : ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە، خوانـاس و پارێزکـاربن و لـە سنوورەکانی مەترازێن، با هەموو کەسێك سـەرنج بـدات و بزانێـت چـی بـۆ سـبەی دەسـت پێشکەری کردووە، هەوڵ بدەن هەمیشەو بەردەوام پارێزکارو دیندارو خواناس بن، چونکە بەڕاستی خوا زۆر ئاگایە بەهەموو ئەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

-لە کۆتایدا باسی چەند ناوێکی جوان و سیفەتە بەرزەکانی خـوا دەکـات ، کـە زۆر جـوان هاورێکـە لەگـەڵ سـەرەتای سـوڕەتەکە .( هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۖ هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ٢٢ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٢٣ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٢٤ )

واتە : خوا هەر ئەو زاتەیە هیچ شایانی پەرستن نی یە بێجگـە ئـەو زانـای هـەموو نهـێنی و ئاشکراکانە هەر ئەوە بەخشندەی میهرەبانە.

## ئایا ئەم سوڕەتە دەربارەی کێ دابەزیوە؟

وەلاٚم (عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: سُورَةُ التَّوْبَةِ، قَالَ: آلتَّوْبَةِ قَالَ: (بَلْ هِيَ الْفَاضِحَةُ مَا زَالَتْ تَنْزِلُ، وَمِنْهُمْ وَمِنْهُمْ حَتَّى ظَنُّوا أَنْ لَا يَبْقَى مِنَّا أَحَدٌ، إِلَّا ذُكِرَ فِيهَا)، قَالَ: قُلْتُ: سُورَةُ الْأَنْفَالِ، قَالَ: (تِلْكَ سُورَةُ بَدْرٍ) قَالَ: قُلْتُ: فَالْحَشْرُ قَالَ: (نَزَلَتْ فِي بَنِي النَّضِيرِ) متفق عليه

واتـه: لـه سـهعیدی کـوڕی جـوبێرەوە هـاتووە دەڵـێ: گوتمـه ئیبنـو عـهباس دەربـارەی سورەتی (التوبه) چی دەڵێی ، گوتی: (سورەتی التوبه ئابڕۆبەرە(واته: ئابروی مونافیقانی برد) بەردەوام دادەبەزی ، تێدا ئەوان و ئەوان و تاکو گومانبردرا هیچ کەس لە ئێمە پازنەدات مەگەر باسی بکات) ئەڵێ گوتم: چی دەڵێی دەربارەی سورەتی (الانفال) گوتی : ئەوە پێ دەگوترێ (سورەتی بەدەر) دەڵێ: گوتم: ئەدی دەربارەی سورەتی (الحشر) چی دەڵێ ، ئەڵێ گوتی: (دەربارەی بەنی نەزیر دابەزیوە)

ئایا بۆچی پێ دەگوترێ (الحشر)؟ چونکه ووشـەی (الحشـر) تێدا بـەکارهاتوو ، واتـه : یەکەم کۆبونەوە و دەرپەراندنی جوولەکان وەك فەرموویەتی(....**هُوَ ٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمۡ لِأَوَّلِ ٱلۡحَشۡرِ**.....)(١) واته: ئـەو خوایـه ئـەو زاتەیـه، ئەوانەی بێ باوەڕ بوون لە خاوەنانی کتێب، هەڵیکەندن لە شوێنەواریان و ناچاری کۆچی کردن لە یەکەم دەست پێکردنی کۆکردنەوەو دەرکردنیاندا.....)

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١-٤) سورەتی (الحشر)

**(سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمۡ لِأَوَّلِ ٱلۡحَشۡرِۚ مَا ظَنَنتُمۡ أَن يَخۡرُجُواْۖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمۡ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنۡ حَيۡثُ لَمۡ يَحۡتَسِبُواْۖ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعۡبَۚ يُخۡرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيۡدِيهِمۡ وَأَيۡدِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ٢ وَلَوۡلَآ أَن كَتَبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡجَلَآءَ لَعَذَّبَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابُ ٱلنَّارِ ٣ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۖ وَمَن يُشَآقِّ ٱللَّهَ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٤ )** الحشر

واته : هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە بە پاکی یادی خوا دەکات وە تـەنها ئـەو زاڵـی کاردروستە. (١) خوا زاتێکە بێ باوەڕانی خاوەن کتێبی دەرکرد لە ماڵ و شـوێنی خۆیـان بۆ یەکەم کۆبوونەوە بە تـەما نـەبوون (ئـەی موسـوڵمانینە) کـە (لـە قـەڵاکانیان) دەربچـن

خۆشیان وایان دەزانی کە قەڵاکانیان دەیانپارێزێ لە (سزای) خوا بۆیە (سزای) خوایان بۆهات لە شوێنێکەوە کە گومانیان بۆی نەدەچوو وە خوا ترسێکی خستە ناو دڵیانەوە کە خانوەکانی خۆیانیان وێران دەکرد بەدەستی خۆیان و بەدەستی ئیمانداران ئینجا پەند وەرگرن ئەی خاوەنانی بیرو هۆش. (٢) ئەگەر خوا دەربەدەری لەسەر بڕیار نەدانایە بێگومان لە دنیادا سزای دەدان لە ڕۆژی دواییشدا بۆ ئەوان هەیە سزای ئاگری دۆزەخ. (٣)

ئەم سزایە بەهۆی ئەوەوە بوو دژایەتی خوا و پێغەمبەریان کرد وە هەر کەسێك دژایەتی خوا بکات ئەوە بەڕاستی خوا تۆڵە سەندنی بەتینە. (٤)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَتْ غَزْوَةُ بَنِي النَّضِيرِ وَهُمْ طَائِفَةٌ مِنَ الْيَهُودِ عَلَى رَأْسِ سِتَّةِ أَشْهُرٍ مِنْ وَقْعَةِ بَدْرٍ وَكَانَ مَنْزِلُهُمْ وَنَخْلُهُمْ بِنَاحِيَةِ الْمَدِينَةِ، فَحَاصَرَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى نَزَلُوا عَلَى الْجَلَاءِ، وَعَلَى أَنَّ لَهُمْ مَا أَقَلَّتِ الْإِبِلُ مِنَ الْأَمْتِعَةِ وَالْأَمْوَالِ إِلَّا الْحَلْقَةَ، يَعْنِي السِّلَاحَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِمْ (سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ) إِلَى قَوْلِهِ (لِأَوَّلِ الْحَشْرِ مَا ظَنَنْتُمْ أَنْ يَخْرُجُوا) (الحشر: ٢) فَقَاتَلَهُمُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى صَالَحَهُمْ عَلَى الْجَلَاءِ، فَأَجْلَاهُمْ إِلَى الشَّامِ وَكَانُوا مِنْ سِبْطٍ لَمْ يُصِبْهُمْ جَلَاءٌ فِيمَا خَلَا وَكَانَ اللَّهُ قَدْ كَتَبَ عَلَيْهِمْ ذَلِكَ وَلَوْلَا ذَلِكَ لَعَذَّبَهُمْ فِي الدُّنْيَا بِالْقَتْلِ وَالسَّبْيِ، وَأَمَّا قَوْلُهُ (لِأَوَّلِ الْحَشْرِ) (الحشر: ٢) فَكَانَ جَلَاؤُهُمْ ذَلِكَ أَوَّلَ حَشْرٍ فِي الدُّنْيَا إِلَى الشَّامِ ) رواه الحاكم وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ ووافقه الذهبي

واتە:لە عائیشەی دایکی ئیمانداران هاتووە خوا لێ ڕازی بێ دەڵێ: شەڕی بەنی نەزیر کە ئەوان کۆمەڵێك بوون لە جوولەکە شەش مانگ پاش شەڕی بەدر بوو ، ماڵیان وخۆرمایان لە نزیك مەدینە بوو ، پێغەمبەر گەمارۆی دان تاکو دابەزین بۆ دەرکرنیان، و ئەبێ تەنها

باری وشترێك لەگەڵ خۆیان ببن جگە لە چەك، جا خـوا دابەزانـد دەربارەیـان (سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ) تاكو دەگاتە(لِأَوَّلِ الْحَشْرِ مَا ظَنَنْتُمْ أَنْ يَخْرُجُوا) (الحشر: ٢) پێغەمبەر شەڕی لەگەڵ كردن تاكو صولح كرا لەسـەر ڕۆیشتنیان،ڕۆیشـتن بـۆ شـام ...جـا خوا ئەوەی لەسەر نوسی بوون ، ئەگەر ئەوە نەبوایە خوا لە دونیاو قیامەت عـازابی دەدان ، بەكوشتن ودیل بـوون ،وە فەرمایشـتی خـوا (لِأَوَّلِ الْحَشْرِ) واتـە : دەركردنیـان ویەكـەم كۆبونەوەیان لە دونیا بۆ شام.

٢-( قَالَ الْمُفَسِّرُونَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ فِي بَنِي النَّضِيرِ، وَذَلِكَ: أن النبي صلى اللّه عليه وسلم لَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ صَالَحَهُ بَنُو النَّضِيرِ عَلَى أَنْ لَا يُقَاتِلُوهُ وَلَا يُقَاتِلُوا مَعَهُ، وَقَبِلَ رسول اللّه صلى اللّه عليه وسلم ذَلِكَ مِنْهُمْ. فَلَمَّا غَزَا رسول اللّه صلى اللّه عليه وسلم بَدْرًا وَظَهَرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ، قَالَتْ بَنُو النَّضِيرِ: وَاللَّهِ إِنَّهُ النَّبِيُّ الَّذِي وَجَدْنَا نَعْتَهُ فِي التَّوْرَاةِ، لَا تُرَدُّ لَهُ رَايَةٌ. فَلَمَّا غَزَا أُحُدًا وَهُزِمَ الْمُسْلِمُونَ، نَقَضُوا الْعَهْدَ، وَأَظْهَرُوا الْعَدَاوَةَ لرسول اللّه صلى اللّه عليه وسلم وَالْمُسْلِمِينَ. فَحَاصَرَهُمْ رسول اللّه صلى اللّه عليه وسلم، ثُمَّ صَالَحَهُمْ عَلَى الْجَلَاءِ مِنَ الْمَدِينَةِ) اخرجه الواحدي في اسباب النزول

واتە:توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەم ئایەتە دابەزیوە بۆ بەنی (النَّضِيرِ) ئـەوەش ئـەوەبوو كاتێ پێغەمبەر چووە مەدینە ئاشتی لەگەڵ كردن نەشەڕی لە دژ بكەن ونە لەگـەڵی بچـنە شەڕ ، پێغەمبەر ئەوەی قەبول كرد، كە پێغەمبەر شەڕی بەدری كـرد و سـەركەوت بەسـەر موشریكان ، بەنو نەزیر گوتیان : سوێند بەخوا ئەوە ئەو پێغەمبەریە كـە وەسـفی هـاتووە لە تەوراتدا، ئەگەر ئاڵاكەی نیەتی خوارەوە ، كاتێ شەڕی ئوحد كرا و موسڵمانان شـكان ، پەیمانیان هەڵوەشاندوە، دوژمنایەتیان راگەیاند بۆ پێغەمبەر و موسڵمانان ، پێغەمبـەریش دەوری دان ، دوای صولحی لەگەڵ كردن كە مەدینە چوول بكەن.

**********************

## وتاری ژماره (١١٣) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٥-٧) سورەتی (الحشر)

(مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِيَ ٱلْفَٰسِقِينَ ٥ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ٦ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ٧) الحشر

واته : ئەوی بڕیتان له دار خورما یا لێی گەڕان بە وێستاوی لەسەر بنەکانیان ئەوه به فەرمانی خوا بووه وه بۆ سەر شۆڕکردنی لە سنوور دەرچووان بوو. (٥) ئەو (دەستکەوتانه) که خوا سەندیەوه بۆ پێغەمبەرەکەی لە ماڵی (بەنی نەچیر) ئێوه بۆ بەدەست هێنانی هیچ ئەسپ و حوشترێکیان تاو نەداوه بەڵکو خوا پێغەمبەرانی زاڵ دەکات بەسەر هەر کەس دا که بیەوێت وه خوا بە سەر هەموو شتێکدا به دەسەڵاته. (٦) ئەوەی خوا دەست پێغەمبەری خست له (سەروەت و سامانی) دێهاتی یەکان ئەوه بۆ خوا و بۆ پێغەمبەره(صلى الله عليه وسلم) وه بۆ خزمان و هەتیوان وه بۆ هەژاران و ڕێبواران تا دەست بە دەستی پێ نەکرێ لەناو دەوڵەمەندەکانتاندا و بەس وه ئەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێ ی دان وەریبگرن وه ئەوەی لێتانی قەدەغه کرد وازی لێ بێنن وه لەخوا بترسن بێگومان خوای گەوره سزای سەختە. (٧)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ حَرَّقَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ وَقَطَعَ وَهِيَ الْبُوَيْرَةُ فَنَزَلَتْ مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ )(رواه البخاري ) معاني الكلمات ( حرق نخل بني النضير وقطع) أي أكثر إحراقها بالنار وقطع بعضها وبنو النضير طائفة من اليهود

(البويرة) موضع نخل بني النضير

(لينة) هي أنواع التمر كلها إلا العجوة وقيل كرام النخل وقيل كل النخل وقيل كل الأشجار للينها وأصله لونة فقلبت الواو ياء لكسرة اللام)

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە خوا لەخۆی وباوکی رازی بێ: دەڵێ : پێغەمبەر دارخورماکانی بەنی نەزیری سوتاندو بڕینی لە شوێنی دارەکانیان.

وفي رواية -( عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، فِي قَوْلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ: (مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا) (الحشر: ٥) قَالَ: (اللِّينَةُ النَّخْلَةُ)، وَلِيُخْزِيَ الفَاسِقِينَ قَالَ: (اسْتَنْزَلُوهُمْ مِنْ حُصُونِهِمْ)، قَالَ: أُمِرُوا بِقَطْعِ النَّخْلِ فَحَكَّ فِي صُدُورِهِمْ. فَقَالَ المُسْلِمُونَ: قَدْ قَطَعْنَا بَعْضًا وَتَرَكْنَا بَعْضًا، فَلَنَسْأَلَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَلْ لَنَا فِيمَا قَطَعْنَا مِنْ أَجْرٍ؟ وَهَلْ عَلَيْنَا فِيمَا تَرَكْنَا مِنْ وِزْرٍ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ( مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ ) (الحشر: ٥) (الْآيَةَ) رواه الترمذي قال الالباني صحيح الاسناد

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: دەربارەی فەرمایشتی خوا (مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا) دەڵێ(اللِّينَةُ النَّخْلَةُ) واتە: دارخورما وە (وَلِيُخْزِيَ الفَاسِقِينَ) دەڵێ: سەر شۆرکران لە قەڵاکانیان ، دەڵێ: فەرمانکرا بە هاوەڵان بۆ بڕینی دارخورماکان لەسەر دڵان قورس بوو ، موسڵمانان گوتیان: هەندێکمان بڕین وهەندێکمان هێشتنەوە ، گوتیان پرسیار لە پێغەمبەر دەکەین، ئایا پاداشتمان دەگاتێ لەوەی بڕیمانە وە

گوناحمان دەگاتێ لەوەی نەمان بڕیوە؟ جا خوا ئـەم ئایەتەیدابەزندوفـەرمووی (مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ)

واتە: ئەو دارخورمایانەی بڕیتانن یان وازتان لیٚ هێنان هـەردوو حاڵـەتی بـە فـەرمانی خـوا بوون.

## چۆنیەتی دەرکردنی بەنو نەزیر:

هەر لە سەرەتاوە جوولەکەکان دژایـەتی ئیسـلام و موسـڵمانانیان دەکـرد، پـاش شـەڕی بـەدر هەنـدێك تـەمێ بـوون، بـەڵام پـاش شکسـتی شـەڕی ئوحـدو روداوی رەجیـع وبـیری مەعونە سەریان دەرهێنایەوە ، پەیوەندیان بە موشریکانی مەککە و مونافیقان دەکرد، جا پاش ئەوەی(عەمری کـوڕی ئومەییـەی زەمـری) کـەهاوەڵێکی پێغەمبـەر بـوو، دوو کەسـی کوشـتبوون بـە هەڵـە لـە هـۆزی (عـامر) پێغەمبـەر خـوێنی دان ، بـۆ یارمـەتی چـووە لای جوولەکـەکانی بـەنی نـەزیر، ئەوانـە لەگـەل بـەنی عـامر هاوپیمـان بـوون ، وە بـەپێ ئـەو پیمانەش کە لەگەڵ پێغەمبەر هەیان بوو، پێویست بوو یارمـەتی بـدەن، بـەڵام ویسـتیان ، باگوردانی بەسەردا بردنەوە بیکوژن ، گوتیان باش رێك کەوتووە ، (عەمری کوڕی جحـاش کوڕی کعب) ئامادەی خۆی نیشاندا بۆ ئەم کارە، بـەڵام خـوا پێغەمبـەری ئاگـادار کـردوە، یەکسەر گەرایەوە (ابوبکر و عمر علـی) لەگـەڵ بـوون، جـا پێغەمبـەر (١٠)رۆژ مۆڵـەتی دان مەدینە چۆڵ بکەن، ئەوانیش خۆیان کۆکردەوە، بەڵام عبدالله کوڕی ئوبەی کوڕی سـەلول ، هەواڵی بۆ ناردن کە نەڕۆن ئەو بەرگریان لیٚ دەکات، ئەوانیش مانەوە، دوای کـە مۆڵـەت تـەواو بـوو ، پێغەمبـەر ئابلوقـەی دان بـۆ مـاوەی (٦) رۆژان، هەنـدێك داریـان بـڕین و هەندێکیان سـوتاندن ، تـاکو نـەتوانن بـەکاریان بێـنن بـۆ شـەرکردن، دوای وریـان روخـاو رۆیشتن ، بەو مەرجەی رێگایان درا تـەنها بـاری یـەك وشـتر لەگـەڵ خۆیـان ببـەن، هـەموو رۆیشـتن ، زۆر لـە خانوەکـانی خۆیـان بەدەسـتی خۆیـان سـوتاند، وە کەسـیان موسـڵمان

نەبوون جگە لە(یامین کوڕی عەمیر و ئەبو سەعیدی کوڕی وەهەب) ئەوانە لەسەر ماڵی خۆیان مانەوە، ئەوانی دیکەش چوونە شام و خیبر، لەساڵی چوارەمی کۆچی.

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی (٩) سوڕەتی (الحشر)

**﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلۡإِيمَٰنَ مِن قَبۡلِهِمۡ يُحِبُّونَ مَنۡ هَاجَرَ إِلَيۡهِمۡ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمۡ حَاجَةٗ مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤۡثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ وَلَوۡ كَانَ بِهِمۡ خَصَاصَةٞۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٩﴾** الحشر

واتە : پشتیوانان ئێرەیی بە کوچبەران نابەن: ئینجا خوا ستایشی پیاوەتیی و چاکەی یارمەتیدەرەکان ئەکات، پاش ئەوەی کە دەستکەوتی (بەنی نەزیر) درا بەکۆچکەران و ئەوان هیچ دڵگرانی و گلەییەکیان نیشان نەدا، بۆیە ئەفەرمووێ: و ئەوکەسانەی نیشتەجێی (دار الهجرە) و (دارالإیمان) ببوون، واتە: پشتیوانان لە پێش کۆچی کۆچەریەکان کۆچەریەکانیان خۆش دەوێن و، بەشێك لەدارایی خۆیانیان ئەدەنێ ودڵخۆشیان دەکەن و هیچ شتێکیان لە دڵدا نیە سەبارەت بەوەی بە کۆچەریەکان درا لەفەیئی بەنینەزیر، چونکە پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەو هەموو دەستکەوتە تەنها بەشی سێ کەسیانیدا، لەگەڵ ئەوەیشدا کەسێك نەبوو پێناخۆش بێت و ئیساری کۆچەریەکان دەکەن بە سەرخۆیاندا لە سەروەت و ساماندا، ئەگەرچی خۆیشیان نیازیان پێی هەبێو هەژاربن، واتە: بەخشینەکەیان لەبەر دەوڵەمەندیان نیە، بەڵکو سروشتی ئیمان و باوەڕیان بەرزە ومن یوق شح نفسە و هەرکەسێ لەسیفەتی رژدی دەروونی بپارێزرێ، واتە: هەرکەسێ خوا بیپارێزێ لە چرووکی دەروونی جا ئەوانەن برەوەکان. تێبینی: مەبەست بە سەخاوەت ئەوە نیە هەرچی ماڵ و سامانی هەیە بیبەخشێ، نەخێر، چونکە ئەوەتە (ئەنەس) ئەڵێ: پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ئەو کەسەی زەکات بدات، میوانداریی بکات، لەکاتی بەڵاو نەهامەتدا ببەخشێ.. ئەوە لەرژدیی و چروکی دەرچووە (ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبَعَثَ إِلَى نِسَائِهِ فَقُلْنَ مَا مَعَنَا إِلَّا الْمَاءُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ يَضُمُّ أَوْ يُضِيفُ هَذَا فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ الْأَنْصَارِ أَنَا فَانْطَلَقَ بِهِ إِلَى امْرَأَتِهِ فَقَالَ أَكْرِمِي ضَيْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ مَا عِنْدَنَا إِلَّا قُوتُ صِبْيَانِي فَقَالَ هَيِّئِي طَعَامَكِ وَأَصْبِحِي سِرَاجَكِ وَنَوِّمِي صِبْيَانَكِ إِذَا أَرَادُوا عَشَاءً فَهَيَّأَتْ طَعَامَهَا وَأَصْبَحَتْ سِرَاجَهَا وَنَوَّمَتْ صِبْيَانَهَا ثُمَّ قَامَتْ كَأَنَّهَا تُصْلِحُ سِرَاجَهَا فَأَطْفَأَتْهُ فَجَعَلَا يُرِيَانِهِ أَنَّهُمَا يَأْكُلَانِ فَبَاتَا طَاوِيَيْنِ فَلَمَّا أَصْبَحَ غَدَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ ضَحِكَ اللَّهُ اللَّيْلَةَ أَوْ عَجِبَ مِنْ فَعَالِكُمَا فَأَنْزَلَ اللَّهُ (وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمْ الْمُفْلِحُونَ ) صحيح البخاري

واتە: لە ئەبی هوریرەوە هاتووە خوا لێ رازی بێ دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (واتە: میوانی بوو) ، ئەویش ناردیە لای خێزانەكانی بزانێ چییان هەیە، ئەوانیش وەلآمیان دایەوە گوتیان : هیچمان نیە جگە لە ئاو، پێغەمبەریش فەرمووی : كێ ئەم میوانە دەباتەوە، پیاوێكی ئەنصار (ابو تەلحە) گوتی: من دەیبمەوە، جا بردیەوە ماڵەوە، گوتیە خێزانەكەی رێزبگرە لە میوانی پێغەمبەری خوا، ژنەكەی گوتی:هیچمان نیە جگە لە خواردنی منداڵەكە، پێ گوت: خواردنەكە ئامادەبكە، چراكەش داگیرسێنەو منداڵەكەش بنوێنە، ئەویش وایكرد كە هەستا خۆی بە چراكە مەشغول كرد وكوژاندیەوە، واخۆیان پیشاندا كە ئەوان خواردن دەخۆن،خۆی وخێزانی بە برسیەتی خەوتن ، كەبەیانی داهات ، خوی ومیوانی چوونەوە لای پێغەمبەری خوا، پێی فەرموون : ئەم شەو خوا بەكارەكەی ئێوە پێكەنی(واتە: رازی بوو) یان سەرسام بوو، جا دەربارەی ئەم میوانداریە خوا ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە(وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمْ الْمُفْلِحُونَ) واتە: وە باوی ئەوان ئەدەن بەسەر خۆیاندا با خۆشیان زۆر پێویست بن پێ ی وە ئەو كەسەی خۆی لە رژدی دەروونی بپارێزێت (بەڕاستی) هەر ئەوانن سەر فرازان.

شرح: (رجل) هو أبو طلحة زيد بن سهل الأنصاري رضي الله عنه. (أصبحي) أوقدي ونوري. (يريانه) من الإراءة أي يتظاهران بذلك. (ضحك) أي رضي. (يؤثرون) يختارون ويفضلون. (خصاصة) حاجة. (يوق شح نفسه) يخالف هواها ويغلبها على ما أمرته بتوفيق الله وعونه من الوقاية وهي الحفظ والشح البخل والحرص

## چيرۆكێك دەربارەی ئەبو تەلحە :

( أنَس بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ اشْتَكَى ابْنٌ لِأَبِي طَلْحَةَ قَالَ فَمَاتَ وَأَبُو طَلْحَةَ خَارِجٌ فَلَمَّا رَأَتْ امْرَأَتُهُ أَنَّهُ قَدْ مَاتَ هَيَّأَتْ شَيْئًا وَنَحَّتْهُ فِي جَانِبِ الْبَيْتِ فَلَمَّا جَاءَ أَبُو طَلْحَةَ قَالَ كَيْفَ الْغُلَامُ قَالَتْ قَدْ هَدَأَتْ نَفْسُهُ وَأَرْجُو أَنْ يَكُونَ قَدْ اسْتَرَاحَ وَظَنَّ أَبُو طَلْحَةَ أَنَّهَا صَادِقَةٌ قَالَ فَبَاتَ فَلَمَّا أَصْبَحَ اغْتَسَلَ فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ أَعْلَمَتْهُ أَنَّهُ قَدْ مَاتَ فَصَلَّى مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ أَخْبَرَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَا كَانَ مِنْهُمَا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يُبَارِكَ لَكُمَا فِي لَيْلَتِكُمَا قَالَ سُفْيَانُ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ الْأَنْصَارِ فَرَأَيْتُ لَهُمَا تِسْعَةَ أَوْلَادٍ كُلُّهُمْ قَدْ قَرَأَ الْقُرْآنَ ) رواه البخاري

وفي رواية-(بَارَكَ اللَّهُ لَكُمَا فِي لَيْلَتِكُمَا) قَالَ: فَوَلَدَتْ غُلَامًا كَانَ اسْمُهُ عَبْدَ اللَّهِ، فَذُكِرَ أَنَّهُ كَانَ خَيْرَ أَهْلِ زَمَانِهِ )

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە دەڵێ: کوڕێکی (ابو تەلحە) نەخۆش بوو ومرد، وە ئەبو تەلحەش لە ماڵ نەبوو، خێزانەکەی منداڵەکەی لەلایەکی ماڵەکەی شاردەوە ، کاتێ ئەبو تەلحە گەڕایەوە گوتی: منداڵەکە چۆنە؟ گوتی : دڵی ئارامە وئومیدەوارم ئیسراحەتی کردبێ، ئەبو تەلحە وایزانی بەراستیتی ، کە شەو بەیەکەوە مانەوەو بەیانی خۆی شوشت ، ویستی بڕوات ، ئنجا پێ گوت: پیاوەکە منداڵەکمان مردوە، ئەویش ڕۆیشت نوێژی لەگەڵ پێغەمبەر کرد و هەواڵەکەی بە پێغەمبەر ڕاگەیاند وکەچی کردوە،ئەویش فەرمووی : ئومێد وایە خوا بەرەکەت بخاتە ئەو شەوەتان ) سوفیان دەڵێ:

پیاوێکی ئەنصار گوتی: بەچاوی خۆم دیتم خوا نۆ منداڵی حافز قورئانی دانیێ، لە ریوایەتیکدا فەرمووی (بَارَكَ اللَّهُ لَكُمَا فِي لَيْلَتِكُمَا) دەڵێ بەهۆی ئەم دوعایە منداڵیێکیان بوو بەناوی (عبدالله) کە چاکترین پیاوی زەمانی خۆی بوو .

## ئایا مارەی ام سلیم چی بوو؟

(عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: خَطَبَ أَبُو طَلْحَةَ أُمَّ سُلَيْمٍ، فَقَالَتْ لَهُ: مَا مِثْلُكَ يَا أَبَا طَلْحَةَ يُرَدُّ وَلَكِنِّي امْرَأَةٌ مَسْلِمَةٌ، وَأَنْتَ رَجُلٌ كَافِرٌ، وَلَا يَحِلُّ لِي أَنْ أَتَزَوَّجَكَ، فَإِنْ تُسْلِمْ فَذَلِكَ مَهْرِي لَا أَسْأَلُكَ غَيْرَهُ، فَأَسْلَمَ، فَكَانَتْ لَهُ فَدَخَلَ بِهَا، فَحَمَلَتْ فَوَلَدَتْ غُلَامًا صَبِيحًا، وَكَانَ أَبُو طَلْحَةَ يُحِبُّهُ حُبًّا شَدِيدًا، فَعَاشَ حَتَّى تَحَرَّكَ فَمَرِضَ، فَحَزِنَ عَلَيْهِ أَبُو طَلْحَةَ حُزْنًا شَدِيدًا حَتَّى تَضَعْضَعَ، قَالَ: وَأَبُو طَلْحَةَ يَغْدُو عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَيَرُوحُ، فَرَاحَ رَوْحَةً وَمَاتَ الصَّبِيُّ، فَعَمَدَتْ إِلَيْهِ أُمُّ سُلَيْمٍ، فَطَيَّبَتْهُ وَنَظَّفَتْهُ وَجَعَلَتْهُ فِي مِخْدَعِنَا، فَأَتَى أَبُو طَلْحَةَ، فَقَالَ: كَيْفَ أَمْسَى بُنَيَّ؟ قَالَتْ: بِخَيْرٍ مَا كَانَ مُنْذُ اشْتَكَى أَسْكَنَ مِنْهُ اللَّيْلَةَ، قَالَ: فَحَمِدَ اللَّهَ وَسُرَّ بِذَلِكَ، فَقَرَّبَتْ لَهُ عَشَاءَهُ، فَتَعَشَّى ثُمَّ مَسَّتْ شَيْئًا مِنْ طِيبٍ، فَتَعَرَّضَتْ لَهُ حَتَّى وَاقَعَ بِهَا، فَلَمَّا تَعَشَّى وَأَصَابَ مِنْ أَهْلِهِ، قَالَتْ: يَا أَبَا طَلْحَةَ رَأَيْتَ لَوَ أَنَّ جَارًا لَكَ أَعَارَكَ عَارِيَّةً، فَاسْتَمْتَعْتَ بِهَا، ثُمَّ أَرَادَ أَخْذَهَا مِنْكَ أَكُنْتَ رَادَّهَا عَلَيْهِ؟ فَقَالَ: إِي وَاللَّهِ، إِنِّي كُنْتُ لَرَادُّهَا عَلَيْهِ، قَالَتْ: طَيِّبَةً بِهَا نَفْسُكَ؟ قَالَ: طَيِّبَةً بِهَا نَفْسِي، قَالَتْ: فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ أَعَارَكَ بُنَيَّ وَمَتَّعَكَ بِهِ مَا شَاءَ، ثُمَّ قُبِضَ إِلَيْهِ، فَاصْبِرْ وَاحْتَسِبْ، قَالَ: فَاسْتَرْجَعَ أَبُو طَلْحَةَ وَصَبَرَ، ثُمَّ أَصْبَحَ غَادِيًا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَحَدَّثَهُ حَدِيثَ أُمِّ سُلَيْمٍ كَيْفَ صَنَعَتْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ(بَارَكَ اللَّهُ لَكُمَا فِي لَيْلَتِكُمَا)، قَالَ: وَحَمَلَتْ تِلْكَ الْوَاقِعَةَ فَأَثْقَلَتْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِأَبِي طَلْحَةَ( إِذَا وَلَدَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ فَجِئْنِي بِوَلَدِهَا)، فَحَمَلَهُ أَبُو طَلْحَةَ فِي خِرْقَةٍ، فَجَاءَ بِهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: فَمَضَغَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَمْرَةً، فَمَجَّهَا فِي فِيهِ فَجَعَلَ الصَّبِيُّ يَتَلَمَّظُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِأَبِي

طَلْحَةَ: (حِبُّ الْأَنْصَارِ التَّمْرَ) فَحَنَّكَهُ وَسَمَّى عَلَيْهِ، وَدَعَا لَهُ، وَسَمَّاهُ عَبْدَ اللَّهِ) رواه ابن حبان قال الالباني صحيح

## ٣-هۆی دابەزینی ئایەتی (١٦) سوڕەتی (الحشر)

(كَمَثَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ إِذۡ قَالَ لِلۡإِنسَٰنِ ٱكۡفُرۡ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٦) الحشر

واتە : نموونەی ئەم ناپاکانە وەك شەیتان وایە کە بە مرۆڤی وت: بێ بڕوابە جا کە بێ بڕوا بوو (شەیتان) وتی: بەڕاستی من بەریم لە تۆ بێگومان من لە خوای پەروەردگاری جیهانیان دەترسم.(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ رَاهِبٌ يَتَعَبَّدُ فِي صَوْمَعَةٍ وَامْرَأَةٌ زَيَّنَتْ لَهُ نَفْسَهَا فَوَقَعَ عَلَيْهَا فَحَمَلَتْ فَجَاءَهُ الشَّيْطَانُ، فَقَالَ: اقْتُلْهَا فَإِنَّهُمْ إِنْ ظَهَرُوا عَلَيْكَ افْتَضَحْتَ فَقَتَلَهَا فَدَفَنَهَا، فَجَاءُوهُ فَأَخَذُوهُ فَذَهَبُوا بِهِ فَبَيْنَمَا هُمْ يَمْشُونَ إِذْ جَاءَهُ الشَّيْطَانُ، فَقَالَ: أَنَا الَّذِي زَيَّنْتُ لَكَ فَاسْجُدْ لِي سَجْدَةً أُنْجِيكَ فَسَجَدَ لَهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (كَمَثَلِ الشَّيْطَانِ إِذْ قَالَ لِلْإِنْسَانِ اكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِنْكَ) (الحشر: ١٦) الْآيَةَ) رواه الحاكم وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ ووافقه الذهبي

واتە: لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە هاتووە خوا لێ رازی بێ دەڵێ: راهیبێك هەبوو خواپەرستی دەکرد لە دێرەکەی ، ئافرەتێك خۆی بۆ رازاندەوە ، توشی بوو و ئاوسی کرد، شەیتان هاتە ناو مێشکی گوتی : بیکوژە ، دوای لێت ئاشکرابێ ئابروت دەچێ، کوشتی و شاردیەوە، هاتن گرتیان وبردیان دەرۆیشتن لە رێگا شەیتان هات گوتی: من بۆم

رازاندیەوە سوجدەیەکم بۆ ببە ، رزگارت دەکەم ، ئـەویش لـە تـاوی روحـی سـوجدەی بـۆ برد، جا خـوا ئـەم ئایەتـەی دابەزندوفـەرمووی (كَمَثَلِ الشَّيْطَانِ إِذْ قَالَ لِلْإِنْسَانِ اكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِنْكَ)

## ئایا رۆژی قیامەتێ شەیتان چی دەڵێ :

(وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِي ۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِيَّ ۖ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ٢٢) ابراهيم

واتە: جا شەیتان دەڵێ کاتێ کە کار تەواو دەبێ بێگومان خوا بەڵێنی پێدان بـە بـەڵێنێکی هەق و ڕاست و منیش بەڵێنم پێدان بەڵام درۆم کرد لەگەڵتان وە من نـەم بـوو بەسـەرتاندا هیچ زۆرو دەسەڵاتێك تەنها ئـەوە نـەبێ کـە بـانگم کـردن (بـۆ گـومڕایی) ئـیتر ئێـوەش بـە دەنگمەوە هاتن (و بەگوێتان کردم) کەواتە لۆمەی من مەکەن بەڵکو لۆمـەی خۆتـان بکـەن بەڕاستی مـن نـاتوانم بـێم بـە هـاواری ئێـوەوە و ئێـوەش نـاتوانن بـێن بـە هـاواری منـەوە بەڕاستی من بڕوام نەبوو بەوەی کە پێشتر (لە دنیادا) منتان کرد بوو بە هاوبـەش بـۆ خـوا بەڕاستی ستەمکاران سزای سەختیان دەبێت.

********************

# وتاری ژماره (١١٤) له هۆیەكانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (الممتحنه)

ئەم سورەته له ریزبەندا ژماره(٦٠) وه ژمارەی ئایەتەكانی (١٣)ئایەته.

ئەم سورەته له مەدینه دابەزیوه ، جەخت لەسەر گرنگی بابەتی (خۆشویستن و رق لێ بونەوه دەكات بۆ خوا) وه چیرۆكی حاتەبی كوری بەلتەحە باس دەكات كه خوا سەرزنشتەی دەكات.

-باسی ئەوه دەكات خزم و كەس و برادەر سوودی نیه رۆژی قیامەت مەگەر ئیمان و كردەوەی چاكی لەگەڵ نەبێ وەك فەرموویەتی :

(لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ ۚ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ٣)

واته : نه خزمانتان و نه منداڵانتان سوودتان پێ ناگەیەنن له رۆژی دوایی دا (خوا ئێوه و خزمەكانتان) له یەك جیادەكاتەوه وه خوا بینایه بەوەی كه دەیكەن.

-باسی ئیمانی ابراهیم وشوێنكەوتوانی دەكات ، كەچۆن ئیمانیان پارستووه ،و بەرائەتی خۆیان بۆ كافران دەربڕیوه وەك دەفەرمووی :

(قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِيٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُواْ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا.... ٤)

واته: بەڕاستی بۆ ئێوه هەیه سەر مەشقێكی جوان و چاك له ئیبراهیم و ئەوانەی له گەڵیدا بوون كه به گەلەكەی خۆیانیان وت بەڕاستی ئێمه بێزار و بەرین له ئێوه وه لەو شتانەش كه دەیان پەرستن له جیاتی خوا ئێمه باوەڕمان نی یه به (ئایینی) ئێوه وه پەیدا بوو له

نێوان ئێمە و ئێوەدا دوژمنایەتی و کینە بۆ هەمیشە تا کاتێك کە بڕوا بەخوای تەنیا دەهێنن .

–باسی حوکمی ئەو کافرانە دەکات کە لەگەڵ موسڵمانان شەڕ ناکەن و بێ کێشەن

(لَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِي ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ٨

واتە : خوا ڕێتان لێ ناگرێ لەگەڵ ئەوانەی کە جەنگیان لەگەڵ نەکردوون لەسەر ئەم دینە وە دەریان نەکردوون لە جێگەو شوێنەکانتان کە چاکەیان لەگەڵ بکەن وە دادیان لەگەڵ بنوێنن بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش ئەوێ کە دادگەرن.

وە باسی حوکمی ئەو کافرانە دەکات کە شەڕفرۆشن بە موسڵمانان

(إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمْ فِي ٱلدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ وَظَٰهَرُواْ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٩ )

واتە : بێگومان خوا ڕێگریتان لێ دەکات تەنها لەوانەی کە جەنگیان لەگەڵ کردوون لەسەر دین وە دەریان کردوون لە جێگەو شوێنەوارتاندا وە یارمەتی یان داوە لەسەر دەرکردنتان (بەرگریتان دەکات) لەوەی کە دۆستایەتی یان لەگەڵ بکەن و بەدۆستیان دابنێن وە هەر کەسێك دۆستایەتیان بکات ئا ئەوانە خۆیان ستەمکارن.

–وەروونی دەکاتەوە دەفەرموێ ئەگەر ئافرەتانی ئیماندار کۆچیان لەبەر دەستی کافران کرد تاقیان بکەنەوە ، مەیانگێرنەوە ژێر دەستی کافران .

–باسی بیعەتی ئافرەتان دەکات لەگەڵ پێغەمبەر:

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ١٢ )

واتە : ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەر کاتێك ئافرەتانی ئیماندار هاتن بۆ لات کە پەیمانت لەگەڵ ببەستن لەسەر ئەوەی کە دانەنێن بە هاوبەشی خوا هیچ شتێك و دزیی و داوێن پیسی نەکەن و منداڵانی خۆیان نەکوژن هیچ جۆرە بوختانێك هەڵنەبەستن لە نێوان دەست و پێ یاندا وە بێ فەرمانیت نەکەن لە کاری چاکدا ئەوسا پەیمانیان لەگەڵ ببەستە وە لە خوا داوای لێ خۆشبوونیان بۆ بکە بەڕاستی خوا لێ خۆشبووی میهرەبانە.

–لە کۆتایدا دووبارە ئاگادارمان دەکاتەوە کە ئیمانداران دۆستایەتی بێ باوەران نەکەن

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَوَلَّوۡاْ قَوۡمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ قَدۡ يَئِسُواْ مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِ كَمَا يَئِسَ ٱلۡكُفَّارُ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡقُبُورِ ١٣ )

واتە: ئەی ئەوکەسانەی کە باوەڕتان هێناوە کەسانێك کە خوا غەزەبی لێ گرتوون مەیکەن بە دۆستی (گیانی) تان بەڕاستی ئەوان بێ هیوا بوون لە (پاداشتی) ڕۆژی دوایی هەر چۆن بێ بڕوایان بێ هیوان لە مردووی ناو گۆڕستان.

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١-٢) سورەتی (الممتحنه)

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ تُلۡقُونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلۡحَقِّ يُخۡرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمۡ أَن تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمۡ إِن كُنتُمۡ خَرَجۡتُمۡ جِهَٰدٗا فِي سَبِيلِي وَٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِيۚ تُسِرُّونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعۡلَمُ بِمَآ أَخۡفَيۡتُمۡ وَمَآ أَعۡلَنتُمۡۚ وَمَن يَفۡعَلۡهُ مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ١ إِن يَثۡقَفُوكُمۡ يَكُونُواْ لَكُمۡ أَعۡدَآءٗ وَيَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ وَأَلۡسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ وَوَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ ٢) الحشر

واتە : ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە دوژمنانی من و خۆتان مەکەن بەدۆستی خۆتان دۆستایەتی خۆتانیان بۆ دەنێرن لە کاتێکدا دڵنیاشن ئەوان بێ باوەڕن بەو ئایینە ڕاستەی کە بۆتان هاتووە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و ئێوەش دەردەکەن (لە بەرئەوەی) کە باوەڕ دەهێنن بە خوای پەروەردگارتان جا ئەگەر دەرچوون لە وڵاتی

خۆتان بۆ جەنگ کردن لە ڕێ ی منا وە بۆ داواکردنی خۆشنوودی مـن (دۆسـتایەتی ئـەوان مەکەن) ڕازو نهێنی یان پێ دەڵێن بـە دۆسـتایەتی لـە کاتێکدا مـن پـێ ی ئـەزانم بـەوەی شاردتانەوە و بەوەی ئاشکراتان کرد وە هەر کەسێك لـە ئێـوە دۆسـتایەتیان بکـات ئـەوە بێگومان ڕێ ی ڕاستی ون کردووە.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عـن عَلِيّ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْـهُ يَقُـولُ بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ أَنَـا وَالزُّبَيْـرَ وَالْمِقْدَادَ فَقَالَ انْطَلِقُوا حَتَّى تَأْتُوا رَوْضَـةَ خَاخٍ فَإِنَّ بِهَا ظَعِينَـةً مَعَهَا كِتَابٌ فَخُذُوا مِنْهَا قَالَ فَانْطَلَقْنَا تَعَادَى بِنَا خَيْلُنَا حَتَّى أَتَيْنَا الرَّوْضَةَ فَإِذَا نَحْنُ بِالظَّعِينَةِ قُلْنَا لَهَا أَخْرِجِي الْكِتَابَ قَالَتْ مَا مَعِي كِتَابٌ فَقُلْنَا لَتُخْرِجِنَّ الْكِتَابَ أَوْ لَنُلْقِيَنَّ الثِّيَابَ قَالَ فَأَخْرَجَتْهُ مِنْ عِقَاصِهَا فَأَتَيْنَا بِهِ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإِذَا فِيهِ مِنْ حَاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ إِلَى نَاسٍ بِمَكَّةَ مِنْ الْمُشْرِكِينَ يُخْبِرُهُمْ بِبَعْضِ أَمْرِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا حَاطِبُ مَا هَذَا قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَا تَعْجَلْ عَلَيَّ إِنِّي كُنْتُ امْرَأً مُلْصَقًا فِي قُرَيْشٍ يَقُولُ كُنْتُ حَلِيفًا وَلَمْ أَكُنْ مِنْ أَنْفُسِهَا وَكَانَ مَنْ مَعَكَ مِنْ الْمُهَاجِرِينَ مَنْ لَهُمْ قَرَابَاتٌ يَحْمُونَ أَهْلِيهِمْ وَأَمْوَالَهُمْ فَأَحْبَبْتُ إِذْ فَاتَنِي ذَلِكَ مِنْ النَّسَبِ فِيهِمْ أَنْ أَتَّخِذَ عِنْدَهُمْ يَدًا يَحْمُونَ قَرَابَتِي وَلَمْ أَفْعَلْهُ ارْتِدَادًا عَنْ دِينِي وَلَا رِضًا بِالْكُفْرِ بَعْدَ الْإِسْلَامِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَا إِنَّهُ قَدْ صَدَقَكُمْ فَقَالَ عُمَرُ يَا رَسُولَ اللَّهِ دَعْنِي أَضْرِبْ عُنُقَ هَذَا الْمُنَافِقِ فَقَالَ إِنَّهُ قَدْ شَهِدَ بَدْرًا وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللَّهَ اطَّلَعَ عَلَى مَنْ شَهِدَ بَدْرًا فَقَالَ اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ فَأَنْزَلَ اللَّهُ السُّورَةَ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُمْ مِنْ الْحَقِّ إِلَى قَوْلِهِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ )(رواه البخاري)

واتە:لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە هاتووە خوا لێ ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر مـن و زوبـێرو میقدای ناردین ، فەرمووی : بڕۆن تاکو دەگەنە (رَوْضَةَ خَاخٍ) کە کەوتۆتـە نێـوان مەککـە و

مەدینە ، ئافرەتێك لە رێگایە نامەیەكی پێیە لێی بستێنن ، دەڵێ: ئێمەش چووین تاكو گەیشتینە ئەم شوێنە وئافرەتەكەمان دۆزیەوە ، گوتمان : نامەكەمان بدەرێ ، گوتی : هیچ نامەمم پێ نیە، گوتمان ئەگەر نامەكەمان نەدەیتێ جل وبەرگت لەبەر دەكەین، جا نامەكەی دەرهێنا لە ناو پرچی سەری دانا بوو ، نامەكە (حاتب) بۆ موشریكانی مەككەی نووسی بوو، هەواڵی چەند ئیشیكی پێغەمبەری بۆ موشریكان تێدابوو، پێغەمبەر فەرمووی : ئەی حاتب ئەوە چییە؟ گوتی: ئەی نێرراوی خوا پەلەم لێ مەكە، ویستم چاكێك بكەم لەگەڵ قوریش ، بەلاَم من لەوان نیم، ئەوەی لەگەڵ تۆدایە لە موهاجیرەكان خزمایەتی هەیە لەگەڵ ئەوان ماڵ ومنداڵیان دەپارێزن لەمەككە ، جا چونكە لەگەڵ من خزم نین لە پشتێ ، ویستم شتێكم لەگەڵ هەبن تاكو ماڵ ومنداڵم بپارێزن ، ئەوەشم كە كردوە لەبەر كافربوون و هەڵگەرانەوە نەبووە لە ئایینەكەم ،پێغەمبەر فەرمووی : ئەو لەگەڵتان راست دەكات ، (عمر) گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا لێم گەرێ لە ملی ئەو مونافیقە دەدەم، فەرمووی : نەخێر ئەو بەشداری بەدری كردوە، چونكە خوا تەماشای ئەهلی بەدری كردو فەرمووی : چی دەكەن بیكەن من لە ئێوە خۆش بوویمە، جا دەربارەی ئەو كارەی (حاتب) ئەم ئایەتە دابەزی (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ) مانای :(ظعینة )واتە: ژن ، كەژاوە، وشتری بارهەڵگری بەهێز) فەرهەنگی سەرچاوە

## ئەمەش رووداوەكە ( حاتب ) بە درێژی :

(قَالَ جَمَاعَةٌ مِنَ الْمُفَسِّرِينَ: نَزَلَتْ فِي حَاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ وَذَلِكَ أَنَّ سَارَةَ مَوْلَاةَ أَبِي عَمْرِو بْنِ صَيْفِيِّ بْنِ هَاشِمِ بْنِ عَبْدِ مَنَافٍ أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – مِنْ مَكَّةَ إِلَى الْمَدِينَةِ وَرَسُولُ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – يَتَجَهَّزُ لِفَتْحِ مَكَّةَ فَقَالَ لَهَا: "أَمُسْلِمَةً جِئْتِ؟ قَالَتْ: لَا، قَالَ: فَمَا جَاءَ بِكِ؟ قَالَتْ: أَنْتُمْ كُنْتُمُ الْأَهْلَ وَالْعَشِيرَةَ وَالْمَوَالِيَ، وَقَدِ احْتَجْتُ حَاجَةً شَدِيدَةً فَقَدِمْتُ عَلَيْكُمْ لِتُعْطُونِي وَتَكْسُوَنِي، قَالَ لَهَا: فَأَيْنَ أَنْتَ مِنْ شَبَابِ أَهْلِ مَكَّةَ، وَكَانَتْ مُغَنِّيَةً، قَالَتْ: مَا طُلِبَ مِنِّي شَيْءٌ بَعْدَ وَقْعَةِ بَدْرٍ فَحَثَّ رَسُولُ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ - بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَكَسَوْهَا وَحَمَلُوهَا وَأَعْطَوْهَا، فَأَتَاهَا حَاطِبُ بْنُ أَبِي بَلْتَعَةَ وَكَتَبَ مَعَهَا إِلَى أَهْلِ مَكَّةَ وَأَعْطَاهَا عَشَرَةَ دَنَانِيرَ عَلَى أَنْ تُوَصِّلَ الْكِتَابَ إِلَى أَهْلِ مَكَّةَ، وَكَتَبَ فِي الْكِتَابِ: مِنْ حَاطِبٍ إِلَى أَهْلِ مَكَّةَ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ - صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - يُرِيدُكُمْ فَخُذُوا حِذْرَكُمْ، فَخَرَجَتْ سَارَةُ وَنَزَلَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ، فَأَخْبَرَ النَّبِيَّ - صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - بِمَا فَعَلَ حَاطِبٌ، فَبَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ - صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - عَلِيًّا وَعَمَّارًا وَالزُّبَيْرَ وَطَلْحَةَ وَالْمِقْدَادَ بْنَ الْأَسْوَدِ وَأَبَا مَرْثَدٍ وَكَانُوا كُلُّهُمْ فُرْسَانًا، وَقَالَ لَهُمْ: انْطَلِقُوا حَتَّى تَأْتُوا رَوْضَةَ خَاخٍ، فَإِنَّ فِيهَا ظَعِينَةً مَعَهَا كِتَابٌ مِنْ حَاطِبٍ إِلَى الْمُشْرِكِينَ، فَخُذُوهُ مِنْهَا وَخَلُّوا سَبِيلَهَا، فَإِنْ لَمْ تَدْفَعْهُ إِلَيْكُمْ فَاضْرِبُوا عُنُقَهَا، فَخَرَجُوا حَتَّى أَدْرَكُوهَا فِي ذَلِكَ الْمَكَانِ، فَقَالُوا لَهَا: أَيْنَ الْكِتَابُ؟ فَحَلَفَتْ بِاللَّهِ مَا مَعَهَا مِنْ كِتَابٍ، فَفَتَّشُوا مَتَاعَهَا فلم يجدوا معا كِتَابًا، فَهَمُّوا بِالرُّجُوعِ، فَقَالَ عَلِيٌّ: وَاللَّهِ مَا كَذَبْنَا وَلَا كَذَّبْنَا، وَسَلَّ سَيْفَهُ، وَقَالَ: أَخْرِجِي الْكِتَابَ وَإِلَّا وَاللَّهِ لَأُجَرِّدَنَّكِ وَلَأَضْرِبَنَّ عُنُقَكِ، فَلَمَّا رَأَتِ الْجِدَّ أَخْرَجَتْهُ مِنْ ذُؤَابَتِهَا وَكَانَتْ قَدْ خَبَّأَتْهُ فِي شَعْرِهَا، فَخَلَّوْا سَبِيلَهَا وَرَجَعُوا بِالْكِتَابِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ - صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ - صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - إِلَى حَاطِبٍ فَأَتَاهُ، فَقَالَ لَهُ: هَلْ تَعْرِفُ الْكِتَابَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَمَا حَمَلَكَ عَلَى مَا صَنَعْتَ؟ " فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا كَفَرْتُ مُنْذُ أَسْلَمْتُ، وَلَا غَشَشْتُكَ مُنْذُ نَصَحْتُكَ، وَلَا أَحْبَبْتُهُمْ مُنْذُ فَارَقْتُهُمْ، وَلَكِنْ لَمْ يَكُنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ إِلَّا وَلَهُ بِمَكَّةَ مَنْ يَمْنَعُ عَشِيرَتَهُ، وَكُنْتُ غَرِيبًا فِيهِمْ وَكَانَ أَهْلِي بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ، فَخَشِيتُ عَلَى أَهْلِي فَأَرَدْتُ أَنْ أَتَّخِذَ عِنْدَهُمْ يَدًا وَقَدْ عَلِمْتُ أَنَّ اللَّهَ يُنْزِلُ بِهِمْ بَأْسَهُ وَأَنَّ كِتَابِي لَا يُغْنِي عَنْهُمْ شَيْئًا. فَصَدَّقَهُ رَسُولُ اللَّهِ - صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - وَعَذَرَهُ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ السورة: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ) فَقَامَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فَقَالَ: دَعْنِي يَا رَسُولَ اللَّهِ أَضْرِبُ عُنُقَ هَذَا الْمُنَافِقِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ - صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - "وَمَا يُدْرِيكَ يَا عُمَرُ لَعَلَّ اللَّهَ قَدِ اطَّلَعَ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ لَهُمْ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ) اسباب النزول القران للواحدي

## (حاطب) ناچێته ناو ئاگر :

(عَنْ جَابِرٍ، أَنَّ عَبْدًا لِحَاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ جَاءَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَشْكُو حَاطِبًا فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَيَدْخُلَنَّ حَاطِبٌ النَّارَ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (كَذَبْتَ لَا يَدْخُلُهَا فَإِنَّهُ شَهِدَ بَدْرًا وَالْحُدَيْبِيَةَ) رواه مسلم و الترمذي قال الالباني صحيح

واته:جابیر دەڵێ: بەندەیەکی حاتب هاتە لای پێغەمبەر سکالای لە حاتب کرد ، گوتی : ئەی نێرراوی خوا حاتب دەچێتە ناو ئاگر ، پێغەمبەر فەرمووی : (درۆت کرد ناچێتە ئاگر ، چونکە ئەو بەشداری بەدرو حودەیبیەی کردوە.

## ئەهلی بەدرو حودەبیە ئومید وایە نەچنە ئاگر:

(عَنْ حَفْصَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ لَا يَدْخُلَ النَّارَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ أَحَدٌ شَهِدَ بَدْرًا وَالْحُدَيْبِيَةَ) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلَيْسَ قَدْ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: (وَإِنْ مِنْكُمْ إِلَّا واردها) قَالَ: فَلَمْ تَسْمَعِيهِ يَقُولُ: (ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتقَوا) وَفِي رِوَايَةٍ: ( لَا يَدْخُلُ النَّارَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنْ أَصْحَابِ الشَّجَرَةِ – أَحَدُ – الَّذِينَ بَايَعُوا تحتهَا) رَوَاهُ مُسلم

واتە: لەحەفحەی دایکی ئیمانداران هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی : ئومێدەوارم هیچ کەس لە ئەهلی بەدرو حودەیبیە نەچێتە ئاگر ، دەڵێ: منیش گوتم : ئەدی خوا نافەرموێ (وَإِنْ مِنْكُمْ إِلَّا واردها) فەرموی : ئەدی نابینی خواش فەرموویەتی :( ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتقَوا) لە گێرانەوەی دیکەدا فەرموویەتی: ئەگەر خواحەز بکات ناچنە ئاگرەوە ئەو هاوەڵانەی لە ژێر دارەکە بەیعەتیان دایە پێغەمبەر .

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٨-٩ ) سورەتی ( الممتحنه ) :

(لَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِي ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ٨ إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمْ فِي ٱلدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ وَظَٰهَرُواْ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٩) الحشر

واتە : خوا ڕێتان لێ ناگرێ لەگەڵ ئەوانەی کە جەنگیان لەگەڵ نەکردوون لەسەر ئەم دینە وە دەریان نەکردوون لە جێگەو شوێنەکانتان کە چاکەیان لەگەڵ بکەن وە دادیان لەگەڵ بنوێنن بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش ئەوێ کە دادگەرن.(٨) بێگومان خوا ڕێگریتان لێ دەکات تەنها لەوانەی کە جەنگیان لەگەڵ کردوون لەسەر دین وە دەریان کردوون لە جێگەو شوێنەوارتاندا وە یارمەتی یان داوە لەسەر دەرکردنتان (بەرگریتان دەکات) لەوەی کە دۆستایەتی یان لەگەڵ بکەن و بەدۆستیان دابنێن وە هەر کەسێك دۆستایەتیان بکات ئا ئەوانە خۆیان ستەمکارن.(٩)

### ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عن أَسْمَاء بِنْتُ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَتْ أَتَتْنِي أُمِّي رَاغِبَةً فِي عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ آصِلُهَا قَالَ نَعَمْ قَالَ ابْنُ عُيَيْنَةَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهَا لَا يَنْهَاكُمْ اللَّهُ عَنْ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ ) رواه البخاري

وفي رواية (عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ قَالَتْ قَدِمَتْ عَلَيَّ أُمِّي وَهِيَ مُشْرِكَةٌ فِي عَهْدِ قُرَيْشٍ إِذْ عَاهَدَهُمْ فَاسْتَفْتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدِمَتْ عَلَيَّ أُمِّي وَهِيَ رَاغِبَةٌ أَفَأَصِلُ أُمِّي قَالَ نَعَمْ صِلِي أُمَّكِ ((روا مسلم )

واتە: لە ئەسمای کچی ئەبوبەکر هاتووە خوا لە خۆی وباوکی ڕازی بێ دەڵێ : دایکم سەردانی کردم لە زەمانی پێغەمبەردا ، کە موشریکە بوو ، منیش پرسیارم کرد لە پێغەمبەر ئایا دروستە یان نا؟ فەرمووی : دروستە سیلەی ڕەحمی لەگەڵ جێ بەجێ بکە)

ئیبنو (عُيَيْنَةَ) دەڵێ: خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (لَا يَنْهَاكُمْ اللَّهُ عَنْ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ )

وفي رواية–( عَنْ عَامِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ قَالَ: (قَدِمَتْ قُتَيْلَةُ ابْنَةُ عَبْدِ الْعُزَّى بْنِ سَعْدٍ عَلَى ابْنَتِهَا أَسْمَاءَ بِهَدَايَا ضِبَابٍ وَأَقِطٍ وَسَمْنٍ وَهِيَ مُشْرِكَةٌ فَأَبَتْ أَسْمَاءُ أَنْ تَقْبَلَ هَدِيَّتَهَا وَتُدْخِلَهَا بَيْتَهَا، فَسَأَلَتْ عَائِشَةُ النَّبِيَّ – صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ –، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (لا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ) (الممتحنة: ٨) إِلَى آخِرِ الْآيَةِ، فَأَمَرَهَا أَنْ تَقْبَلَ هَدِيَّتَهَا وَأَنْ تُدْخِلَهَا بَيْتَهَا)رَوَاهُ أَحْمَدُ صحيح الاسناد

واتە:لە عامیری کوڕی عەبدوڵای کوڕی زوبیرەوە هاتووە دەڵێ: (قوتەیلەی کچی عبدالعزی کوڕی سەعد هاتە لای (ئەسما) بە کۆمەڵێك دیاری ، بەلام ئەو موشریکە بوو ، ئەسماش رەتی کردوە دیاریەکان وەرگرێ ، وبچێتە لای ، عائیشەش پرسیاری لە پێغەمبەر کرد ، جا خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند وفەرمووی (لا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ))

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی (١٠) سورەتی (الممتحنه)

(﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ فَٱمۡتَحِنُوهُنَّۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّۖ فَإِنۡ عَلِمۡتُمُوهُنَّ مُؤۡمِنَٰتٖ فَلَا تَرۡجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلۡكُفَّارِۖ لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّۖ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّۚ وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ وَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقۡتُمۡ وَلۡيَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقُواْۚ ذَٰلِكُمۡ حُكۡمُ ٱللَّهِ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡۖ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ١٠﴾)

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر ئافرەتانی ئیماندار هاتن بۆ لاتان بە کۆچ کەری تاقی یان بکەنەوە خوا بە باوەڕی ئەوان زاناترە ئینجا ئەگەر زانیتان ئەو (ئافرەتانە) باوەڕدارن ئەوە مەیانگێڕنەوە بۆ لای (مێردە) بێ بڕواکانیان نە ئەو ئافرەتانە حەڵاڵن بۆ ئەو مێردە بێ بڕوایانە وە نە ئەو مێردانەش بۆ ئەو ئافرەتانە حەڵاڵن وە ئەوەی

(مێردەکـان) خـەرجیان کـردووە، بیاندەنـەوە هـیچ گوناهێکتـان لەسـەر نـی یـە کـە ئـەم ئافرەتانە مارە بکەن ئەگەر مارەییەکانیان بدەنێ ژنە کـافرە (بـێ نامـە) کـان لای خۆتـان ڕامەگرن ئێوە داوای ئەوە بکەنەوە کە خەرجتان کردووە(بۆ ژنـە کافرەکانتـان کـە ئێسـتە چـوونەتە لای کـافران) ئـەوانیش بـا داوای ئـەوە بکـەن کـە خـەرجیان کـردووە (بـۆ ژنـە موسوڵمان بوەکانیان کە هاتونەتە لای ئێوە) ئەمە فەرمانی خوایە بڕیار ئەدا لە نێوانیانـدا وە خوا زانای کاربەجێ یە.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

عن عُرْوَةَ بْنُ الزُّبَيْرِ أَنَّهُ سَمِعَ مَرْوَانَ وَالْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يُخْبِرَانِ عَنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَمَّا كَاتَبَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو يَوْمَئِذٍ كَانَ فِيمَا اشْتَرَطَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ لَا يَأْتِيكَ مِنَّا أَحَدٌ وَإِنْ كَانَ عَلَى دِينِكَ إِلَّا رَدَدْتَهُ إِلَيْنَا وَخَلَّيْتَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُ فَكَرِهَ الْمُؤْمِنُونَ ذَلِكَ وَامْتَعَضُوا مِنْهُ وَأَبَى سُهَيْلٌ إِلَّا ذَلِكَ فَكَاتَبَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى ذَلِكَ فَرَدَّ يَوْمَئِذٍ أَبَا جَنْدَلٍ إِلَى أَبِيهِ سُهَيْلِ بْنِ عَمْرٍو وَلَمْ يَأْتِهِ أَحَدٌ مِنْ الرِّجَالِ إِلَّا رَدَّهُ فِي تِلْكَ الْمُدَّةِ وَإِنْ كَانَ مُسْلِمًا وَجَاءَتْ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ وَكَانَتْ أُمُّ كُلْثُومٍ بِنْتُ عُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ مِمَّنْ خَرَجَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَئِذٍ وَهِيَ عَاتِقٌ فَجَاءَ أَهْلُهَا يَسْأَلُونَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَرْجِعَهَا إِلَيْهِمْ فَلَمْ يَرْجِعْهَا إِلَيْهِمْ لِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِنَّ إِذَا جَاءَكُمْ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ إِلَى قَوْلِهِ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ قَالَ عُرْوَةُ فَأَخْبَرَتْنِي عَائِشَةُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَمْتَحِنُهُنَّ بِهَذِهِ الْآيَةِ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمْ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ إِلَى غَفُورٌ رَحِيمٌ قَالَ عُرْوَةُ قَالَتْ عَائِشَةُ فَمَنْ أَقَرَّ بِهَذَا الشَّرْطِ مِنْهُنَّ قَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ بَايَعْتُكِ كَلَامًا يُكَلِّمُهَا بِهِ وَاللَّهِ مَا مَسَّتْ يَدُهُ يَدَ امْرَأَةٍ قَطُّ فِي الْمُبَايَعَةِ وَمَا بَايَعَهُنَّ إِلَّا بِقَوْلِهِ)

رواه البخاري

************************

# وتاری ژماره (١١٥) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (الصف)

ئەم سورەتە له ریزبەندا ژمارە(٦١) وە ژمارەی ئایەتەکانی (١٤)ئایەتە.

ئەم سورەتە له (مەدینە) دابەزیوە ، باسی ئەحکامی شەریعەت دەکات و باسی تێکۆشان لە پێناوی خوا بۆ بەرزبونەوەی ئایینی خوا دەکات ، هەربۆیەش ناونراوە (الصف) واتە بە ریزوپۆل راوەستاون لە پێناوی خوا ، وەك فەرموویەتی:

(إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٌ مَّرۡصُوصٌ ٤)

واتە: بەڕاستی خوا کەسانێکی خۆش دەوێ کە بەیەك ڕیزە دەجەنگن لە ڕێی خوادا ئەڵێیت کۆشکێکی قایمی چەسپیوون.

-لەسەرتادا پێمان دەڵێ هەموو شتێك تەسبیحاتی خوا دەکات ، و ئیماندارانیش ئاگادار دەکاتەوە کە قسەو کردەوەیان یەك بێ ، بێ وەفا نەبن ، و پێچەوانەی بەڵێن نەکەن ، وەك فەرموویەتی

(سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ٢) واتە بە پاکی و بێگەردی یادی خوا دەکات هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەوی دایە وە ئەو زاڵی کاربەجێ یە.(١) ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە بۆچی ئەوی ئەیڵێن ئەنجامی نادەن (٢)

-باسی هەڵوێستی خراپی جوولەکە دەکات بەرامبەر هەردوو پێغەمبەر (موسی و عیسی) وە کو دڵدانەوەی پێغەمبەرمان کاتێ کافرانی قوریش هەڵوێستان چەند خراپ بوو بەرامبەری

﴿وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ لِمَ تُؤۡذُونَنِي وَقَد تَّعۡلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡۖ فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ٥﴾

واته : بیر بکەرەوە کاتێك کە مووسا بە گەلەکەی وت ئەی گەلەکەم بۆچی ئازارم دەدەن لە کاتێکدا بێگومان دەزانن کە من نێردراوی خوام بۆ لای ئێوە جا کاتێك لایان دا لەهەق خواش دڵی وەرگێڕان وە خوا سنوور نموونی گەلی لە ڕێ دەرچوو ناکات.

–باسی ئەوە دەکات سوننەتی خوایە ، خوا ئایین و پێغەمبەران و دۆستانی خۆی سەر دەخات ، هەر چەند کەسانێ هەبن بیانەوێ نوری خوا بکوژێنەوە وەك فەرموویەتی:

﴿يُرِيدُونَ لِيُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ٨﴾

واتە: دەیانەوێ ڕووناکی دینی خوا بکوژێننەوە بە (فوی) دەمیان وە خوا ڕووناکی خۆی تەواو دەکات با بێ باوەڕانیش پێ یان ناخۆش بێ.

–بانگی موسڵمانان دەکات و هانیان دەدات بۆ بازرگانێکی پڕخێر و بەرەکەت ، ئەویش بریتییەلە رزگاربوون و شادبوون بەبەهەشتی پان وبەرین و سەرکەوتن ، وەك دەفەرموێ

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ تِجَٰرَةٖ تُنجِيكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ١٠ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ١١ يَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ وَيُدۡخِلۡكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١٢ وَأُخۡرَىٰ تُحِبُّونَهَاۖ نَصۡرٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتۡحٞ قَرِيبٞۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٣﴾

واته : ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هێناوە ئایا بازرگانیەکتان نیشان بدەم کە ڕزگارتان بکات لە سزایەکی پڕ لە ئازار.(١٠) بازرگانیەکەش ئەمەیە باوەڕ بێنن بە خواو پێغەمبەرەکەی وە تێبکۆشن لە ڕێ ی خوادا بە سامان و گیانی خۆتان ئەمەتان باشترە بۆ خۆتان ئەگەر ئێوە بزانن.(١١) ئەوسا خوا لە گوناهەکانتان خۆش دەبێ وە (لە ڕۆژی دوایی دا) دەتان خاتە باخاتێکەوە کە جۆگەی ئاوی زۆر بەژێریاندا دەڕوات (وە دەتان خاتە) خانوو کۆشکی زۆری پاك و خۆشەوە لە بەهەشتانی هەتا هەتایی دا ئەمەیە

سەرکەوتنی گەورە.(١٢) وەشتێکی تر کە حەزی لێ دەکەن (کە بریتی لە) یارمەتی دانە لە خواوە، وە ڕزگار کردنێکی نزیك (گرتنی شاری مەککە) وە (بەمە) مژدە بدە بە ئیمانداران.(١٣)

–لە کۆتاییدا سورەتەکەدا خوای گەورە داوامان لێ دەکات ئاییني خوا سەربخەین ، هەروەك چۆن کاتی خۆی حەواریەکانی شوێن کەوتەی (عیسی) دینی خوایان سەرخست ، وەك فەرموویەتی :

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُوٓاْ أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞۖ فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ ١٤ الصف

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ببن بە یارمەتی دەرانی (ئاییني) خوا هەروەك عیسای کوڕی مەریەم وتی بە هاوڕێ تایبەتیەکانی خۆی کێ یارمەتی دەری منە بۆ لای خوا هاوڕێکانی وتیان ئێمە یارمەتی دەرانی (دینی) خواین ئینجا دەستەیەك لە نەوەی ئیسرائیل باوەڕیان هێنا وە دەستەیەکیشیان بێ باوەڕ بوون ئێمەش پشتیوانی ئەوانەمان کرد کە باوەڕیان هێنا لە بەرانبەر دوژمنەکانیاندا بۆیە سەرکەوتن و زاڵ بوون.

### ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١) سورەتی الصف

(سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ٢) الصف

واتە: واتە بە پاکی و بێگەردی یادی خوا دەکات هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەوی دایە وە ئەو زاڵی کاربەجێ یە.(١) ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە بۆچی ئەوی ئەیڵێن ئەنجامی نادەن (٢)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ، قَالَ: قَعَدْنَا نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَتَذَاكَرْنَا، فَقُلْنَا: لَوْ نَعْلَمُ أَيَّ الأَعْمَالِ أَحَبَّ إِلَى اللَّهِ لَعَمِلْنَاهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَهُوَ العَزِيزُ الحَكِيمُ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ)، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ: (فَقَرَأَهَا عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: ( فَقَرَأَهَا عَلَيْنَا ابْنُ سَلَامٍ) قَالَ يَحْيَى: (فَقَرَأَهَا عَلَيْنَا أَبُو سَلَمَةَ) قَالَ ابْنُ كَثِيرٍ: ( فَقَرَأَهَا عَلَيْنَا الأَوْزَاعِيُّ) قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: (فَقَرَأَهَا عَلَيْنَا ابْنُ كَثِيرٍ) رواه الترمذي والحاكم في المستدرك و الوادعي في الصحيح المسند من اسباب النزول قال الالباني صحيح الاسناد

واتە:لە عەبدولاّی کوڕی سەلامەوە هاتووە دەڵێ: ئێمە وەکو هاوەڵانی پێغەمبەر چەند کەسێك دانیشتین باسی ئەوەمان کرد، ئەگەر بمانزانیبایە چ کردەوەیەك خێرە ئەنجامان دەدا، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی(سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَهُوَ العَزِيزُ الحَكِيمُ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ) عبدالله ی کوڕی سەلام دەڵێ ، پێغەمبەر بەسەر ئێمەیدا خوێندنەوە، ئەبو سەلەمە دەڵێ: عبدالله ی کوڕی سەلام بەسەر ئێمەیدا خوێندینەوە،(یحیی) دەڵێ: ئەبو سەلەمە بەسەر ئێمەیدا خوێندینەوە ، ئیبنو کەسیر دەڵێ ئەوزاعی بەسەر ئێمەیدا خوێندینەوە ، عبدالله دەڵێ: ئیبنو کەسیر بەسەر ئێمەیدا خوێندینەوە.

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی (١٤) سورەتی الصف

((......فَآمَنَت طَّآئِفَةٌ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞۖ فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ ١٤ الصف

واتە: ئینجا دەستەیەك لە نەوەی ئیسرائیل باوەڕیان هێنا وە دەستەیەکیشیان بێ باوەڕ بوون ئێمەش پشتیوانی ئەوانەمان کرد کە باوەڕیان هێنا لە بەرانبەر دوژمنەکانیاندا بۆیە سەرکەوتن و زاڵ بوون.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: لَمَّا أَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَرْفَعَ عِيسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ إِلَى السَّمَاءِ خَرَجَ إِلَى أَصْحَابِهِ وَهُمُ اثْنَا عَشَرَ رَجُلًا مِنْ غَيْرِ الْبَيْتِ وَرَأْسُهُ يَقْطُرُ مَاءً، فَقَالَ لَهُمْ: أَمَا إِنَّ مِنْكُمْ مَنْ سَيَكْفُرُ بِي اثْنَتَيْ عَشْرَةَ مَرَّةً بَعْدَ أَنْ آمَنَ بِي، ثُمَّ قَالَ: أَيُّكُمْ سَيُلْقَى عَلَيْهِ شَبَهِي فَيُقْتَلُ مَكَانِي وَيَكُونُ مَعِي فِي دَرَجَتِي، فَقَامَ شَابٌّ مِنْ أَحْدَثِهِمْ سِنًّا فَقَالَ: أَنَا، فَقَالَ عِيسَى: اجْلِسْ، ثُمَّ أَعَادَ عَلَيْهِمْ فَقَامَ الشَّابُّ فَقَالَ: أَنَا، فَقَالَ: نَعَمْ أَنْتَ ذَاكَ، قَالَ: فَأُلْقِيَ عَلَيْهِ شَبَهُ عِيسَى، قَالَ: وَرُفِعَ عِيسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ مِنْ رَوْزَنَةٍ كَانَتْ فِي الْبَيْتِ إِلَى السَّمَاءِ، قَالَ: وَجَاءَ الطَّلَبُ مِنَ الْيَهُودِ فَأَخَذُوا الشَّبِيهَ فَقَتَلُوهُ ثُمَّ صَلَبُوهُ، وَكَفَرَ بِهِ بَعْضُهُمُ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ مَرَّةً بَعْدَ أَنْ آمَنَ بِهِ، فَتَفَرَّقُوا ثَلَاثَ فِرَقٍ، قَالَ: فَقَالَ فِرْقَةٌ: كَانَ فِينَا اللَّهُ مَا شَاءَ، ثُمَّ صَعِدَ إِلَى السَّمَاءِ، وَهَؤُلَاءِ الْيَعْقُوبِيَّةُ وَقَالَتْ فِرْقَةٌ: كَانَ فِينَا ابْنُ اللَّهِ مَا شَاءَ ثُمَّ رَفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ، وَهَؤُلَاءِ النَّسْطُورِيَّةُ، وَقَالَتْ فِرْقَةٌ: كَانَ فِينَا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ رَفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ وَهَؤُلَاءِ الْمُسْلِمُونَ، فَتَظَاهَرَتِ الْكَافِرَتَانِ عَلَى الْمُسْلِمَةِ فَقَاتَلُوهَا فَقَتَلُوهَا، فَلَمْ يَزَلِ الْإِسْلَامُ طَامِسًا حَتَّى بَعَثَ اللَّهُ مُحَمَّدًا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيْهِ (فَآمَنَتْ طَائِفَةٌ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ) (الصف: ١٤) يَعْنِي الطَّائِفَةَ الَّتِي آمَنَتْ فِي زَمَنِ عِيسَى، (وَكَفَرَتْ طَائِفَةٌ) (الصف: ١٤) يَعْنِي الطَّائِفَةَ الَّتِي كَفَرَتْ فِي زَمَنِ عِيسَى (فَأَيَّدْنَا الَّذِينَ آمَنُوا) (الصف: ١٤) فِي زَمَانِ عِيسَى (عَلَى عَدُوِّهِمْ) (الصف: ١٤) بِإِظْهَارِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دِينَهُمْ عَلَى دِينِ الْكُفَّارِ (فَأَصْبَحُوا ظَاهِرِينَ) (الصف: ١٤) رواه ابن ابي شيبة والنسائي في سنن الكبرى (رَوْزَنَةٍ اي نافذة )

واتە:لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: کاتێ خوا ویستی (عیسی) کوڕی مەریم سەلامی خوای لەسەر بێ بەرزبکاتەوە بۆ ئاسمان ،(عیسی) هاتە ناو هاوەڵانی ، کە (١٢) پیاو بوون ، سەری ئاوی لێ دەچۆڕایەوە، پێی گوتن: کێ لە ئێوە لە داهاتوو کافربێ بێ بەمن دوازدە جاران ، پاش ئەوەی ئیمانی پێ هێناوم ، دوای گوتی: هەر یەك لە ئێوە شێوەی منی بکەوێتە سەر ، لە جێگای من دەکوژرێ و دەگاتە پلەی من ، یەکێ لە لاوەکان هەستاو گوتی: من ئامادەم، (عیسی) گوتی: دانیشە، قسەکەی بۆ دووبارە کردنەوە ،

دووباره لاوەکە گوتی : من، عیسی گوتی: باشە تۆدەبیتە ئەو کەسە، دەڵێ: شێوەی (عیسی) کەوتە سەر ، دەڵێ: جا عیسی بەرزکرایەوە، لە پەنجەرەوە بۆ ئاسمان، دەڵێ: جا جوولەکە هاتن بۆ گرتنی (عیسی) جا کەسەکەی هاوشێوەی (عیسی)یان گرت و کوشتیان و لە سێ داریان دا،جا لەدوای خۆی دوازدە جاران کوفریان پێ کرد، پاش ئەوەی ئیمانیان پێ هێنابوو ، بونە سێ تاقم ، یەکیان گوتی : خوامان لەناو بوو تاکو حەزی کرد دوای چویەوە ئاسمان، ئەوانە یەعقوبینە (الْيَعْقُوبِيَّةُ)، تاقمێکی دیکە گوتیان: کوڕی خوامان لەناو بوو ، دوای خوا بەرزی کردوە(پەنا بەخوا لەقسەی ئەوان) ئەوانەش سەنتورینە (وَهَؤُلَاءِ النَّسْطُورِيَّةُ) تاقمێکی دیکە گوتیان: عەبدی خوا و پێغەمبەری خوامان لەناو بوو، تاکو حەزی کرد دوای بەرزی کردوە ئەوانە موسڵمانەکانیان بوون (وَهَؤُلَاءِ الْمُسْلِمُونَ،) جا دوو تاقمە کافرەکە سەرکەوتن بەسەر تاقمە موسڵمانەکە لەگەل یەك شەڕیان بوو، ئیسلام(تاقمی راست) دوورخرابویەوە تاکو خوا (محمد) نارد، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی :

(فَآمَنَتْ طَائِفَةٌ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ) (الصف: ١٤) يَعْنِي الطَّائِفَةَ الَّتِي آمَنَتْ فِي زَمَنِ عِيسَى، (وَكَفَرَتْ طَائِفَةٌ) (الصف: ١٤) يَعْنِي الطَّائِفَةَ الَّتِي كَفَرَتْ فِي زَمَنِ عِيسَى (فَأَيَّدْنَا الَّذِينَ آمَنُوا) (الصف: ١٤) فِي زَمَانِ عِيسَى (عَلَى عَدُوِّهِمْ) (الصف: ١٤) بِإِظْهَارِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دِينَهُمْ عَلَى دِينِ الْكُفَّارِ (فَأَصْبَحُوا ظَاهِرِينَ) (الصف: ١٤) رواه ابن ابي شيبة والنسائي في سنن الكبرى

**************************

# وتاری ژماره (١١٦) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (الجمعە)

ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژمارە (٦٢) وە ژمارەی ئایەتەکانی (١١) ئایەتە.

–ئایا بۆچی ناوی لێ نراوە (الجمعە) ؟ چونکە باسی نوێژی هەینی دەکات .

ئەم سورەتە لە (مەدینە) دابەزیوە ، حوکمی شەرعی نوێژی هەینی روون دەکاتەوە ، کە خوا فەرزی کردوە لەسەر موسڵمانان ، وەك فەرموویەتی

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٩ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ١٠) الجمعە

واتە : ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە کاتێك کە بانگ درا بۆ نوێژ لە ڕۆژی هەینی دا بە پەلە بڕۆن بۆ یادی خوا (و نوێژە هەینی) و واز لە کڕین و فرۆشتن بهێنن ئا ئەوە بۆ ئێوە چاکترە ئەگەر بزانن و تێ بگەن.(٩) جا کاتێك کە نوێژی هەینی تەواو بوو ئیتر بڵاو ببنەوە بەسەر زەوی دا وە داوای ڕزق و ڕۆزیی خوا بکەن زۆر یادی خوا بکەن بۆ ئەوەی ڕزگار و سەرفراز ببن.(١٠)

–وەباسی ناردنی پێغەمبەری رەحمەت دەکات و لەگەڵ (٤) ئەرکی گرنگی پێغەمبەر وەکو دەفەرموێت

(هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٢) الجمعە

واتە: خوا ئەو زاتەیە کە ناردوویەتی لە ناو نەخوێندەواراندا (عەرەبەکاندا) پێغەمبەرێك لە خۆیان دەخوێنێتەوە بە سەریاندا نیشانەکانی خوا پاکیان دەکاتەوە وە قورئان و فەرمودەی (پڕ سوود) یان فێر دەکات هەرچەند ئەوان لە مەوپێش لە گومڕایەکی ئاشکرادا بوون.

–باسی مردن دەکات و دەفەرموێت ئەومردنەی ئێوە لەبەری رادەکەن پێتان دەگات

(قُلْ إِنَّ ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمْ ۖ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ٨) الجمعه

واتە : بڵێ بەڕاستی ئەو مردنەی کە لێ ی ڕادەکەن بێگومان پێتان دەگات و تووشتان دەبێ لەپاشان دەگەڕێنرێنەوە بۆ لای خوای زانا بەئاشکراو نهێنی ئینجا هەواڵتان پێ دەدات بەوەی کە دەتان کرد

–وە باسی ئەوە دەکات کڕین وفرۆشتن لە کاتی نوێژی هەینی حەرامە ، ئەبێ خەڵکی بەرەومزگەوتەکان برۆن

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْاْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلْبَيْعَ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ٩ ) الجمعه

واتە: واتە : ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە کاتێك کە بانگ درا بۆ نوێژ لە ڕۆژی هەینی دا بە پەلە بڕۆن بۆ یادی خوا (و نوێژە هەینی) و واز لە کڕین و فرۆشتن بهێنن ئا ئەوە بۆ ئێوە چاکترە ئەگەر بزانن و تێ بگەن

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١١) سورەتی الجمعه

((وَإِذَا رَأَوْا۟ تِجَٰرَةً أَوْ لَهْوًا ٱنفَضُّوٓا۟ إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمًا ۚ قُلْ مَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ مِّنَ ٱللَّهْوِ وَمِنَ ٱلتِّجَٰرَةِ ۚ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ١١) الجمعه

واتە: هەر کارێکی بازرگانی یا کارێکی بێ هوودە ببینن بڵاوەی لێ ئەکەن بۆ لای ئەو بازرگانی یە وە تۆ بەجێ دێڵن بە ڕاوەستاوی (لەسەر دوانگە) (ئەی موحەممەد(صلی اللە علیە وسلم)) بڵێ ئەوەی لای خوایە چاکترە لە شتی بێ هوودەو بازرگانی وە خوا باشترینی ڕۆزی دەرانە.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ بَيْنَمَا نَحْنُ نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذْ أَقْبَلَتْ عِيرٌ تَحْمِلُ طَعَامًا فَالْتَفَتُوا إِلَيْهَا حَتَّى مَا بَقِيَ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَّا اثْنَا عَشَرَ رَجُلًا فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انْفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا ) (رواه البخاري )

واتە: لە جابیرەوە هاتووە خوا لە خۆی وبابی رازی بێ دەڵێ: لە ڕۆژی هەینی نوێژمان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەردا ، لەو کاتدا کاروانێك گەرایەوە خواردنی پێ بوو ، خەڵکی رویان تێ کرد وبۆی چوون، تاکو تەنها (١٢) کەس مایەوە لە مزگەوت لە دەوری پێغەمبەر ، جا بەو بۆنەوە ئەم ئایەتە دابەزی وفەرمووی(وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انْفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا) واتە: کاتێ بازرگانیان بینی بۆی چوون تۆیان بە پێوە بەجێ هێشت.

وفي رواية لمسلم -( عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَقَدِمَتْ سُوَيْقَةٌ قَالَ فَخَرَجَ النَّاسُ إِلَيْهَا فَلَمْ يَبْقَ إِلَّا اثْنَا عَشَرَ رَجُلًا أَنَا فِيهِمْ قَالَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ( وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انْفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا إِلَى آخِرِ الْآيَةِ ) (رواه مسلم )

**دەرس و وانەکانی سورەتی هەینی :**

**١-گەورەیی رۆژی هەینی:**

**١-کۆبونەوەی گشتی موسڵمانانە.**

**٢-(شەحن بونەوەی ئیمان.**

**٣-(رۆژی هەینی چەژنی موسڵمانانە.**

**٢-پاداشتی ڕۆژی هەینی :**

*************************

# وتاری ژماره (١١٧) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## ١-سورەتی (المنافقون)

ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژمارە (٦٣)یە، وە ژمارەی ئایەتەکانی (١١) ئایەتە.

–ئایا بۆچی ناوی لێ نراوە (المنافقون) ؟ چونکە باسی ترسناکی نیقاق و مونافیقان دەکات و پەردە لەسەر فرت و فێڵەکانیان لادەبات و ئابڕۆیان دەبات .

–لە سەرەتای ئەم سورەتە خوا باسی درۆی مونافیقان دەکات ، وەدەفەرموێ دەرەو و ناوەوەیان وەك یەك نییە ، بۆیەش سزایان خواروی دۆزەخە ، وەك دەفەرموێت:

(إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمۡ نَصِيرًا ١٤٥) النساء

واتە: با بزانن بەڕاستی دووڕووەکان لە خانەو تەبەقی هەرە ژێرەوەی ئاگردان وە هەرگیز ڕزگار کەرێکت بۆ ئەوان دەست ناکەوێت.

بەڵێ بۆ بەهەشت دەرەجات هەیە ، واتە بەرزبونەوە ، بەڵام بۆ جەهەنەم دەرەکات هەیە واتە : نزم بونەوە

–مونافیقان لوتیان بەرزە ..................

(وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ يَسۡتَغۡفِرۡ لَكُمۡ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوۡاْ رُءُوسَهُمۡ وَرَأَيۡتَهُمۡ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسۡتَكۡبِرُونَ ٥) المنافقون

واتە : (پشتیان لەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کردو گەمارۆشیان لەسەر موسڵمانان دانا ! : ئیمامی (بوخاریی) لە (زەید)ـەوە ئەڵێ: کاتێ (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی) لە(ئوحود) گەڕایەوەو جەنگەکەی بەجێهێشت، وە لە سوپاکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خەڵکێکی زۆری پەشیمانکردەوەو گێڕایەوە، بەو بۆنەیەوە موسڵمانەکان ڕکیان لێهەڵگرت

و بەئاشکرا قسەیان پێدەوت، ئەوجا کە خزمەکانی زانییان وا پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) زۆر تورەیە پێیان گوت: چاك وایە تۆخۆت بڕۆی بۆلای پەیامبەر (صلی اللە علیە وسلم) داوای لێبووردنی لێبکەیت، تا لێتخۆش ببێ و، لەخواش داوای لێخۆش بوونت بۆ بکات، ئەویش بەتوڕەییەکەوە سەری باداو وتی: نە دەچم بۆلایی و، نەئەیشمەوێ داوای لێخۆش بوونم بۆ بکا، جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو فەرمووی: کاتێ پێیان بگوترێ: وەرن بۆ لایپەیامبەری خوا داوای لێبوردنتان بۆ بکات سەریان با ئەدەن و گاڵتەیان لێدێ! و دەیانبینی پشت هەڵئەکەن و،– لەبەر کیبرو دەعیەیان–خۆشیان بە گەورە دەزانن بێنە لای پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم))(رامان)

–هەڵوێستی جوامێرانەی (عبدالله) کوڕی سەرۆکی مونافیقان (عبدالله کوڕی ئەبی سەلول

(يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ۚ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ٨ ) المنافقون

واتە: دووڕووەکان دەڵێن سوێند بێ ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە بێگومان دەسەڵاتدار و بەڕێزەکان لات و بێ ڕێزەکان لە مەدینە دەردەکەن ڕێزو گەورەیی تەنها بۆ خواو بۆ پێغەمبەری خواو بۆ باوەڕدارانە بەڵام دووڕوان نازانن.

–لە کۆتایی ئەم سوڕەتەدا خوا هۆشیاری دەداتە موسڵمانان ، کە سەرقاڵ نەبن بە زینەتی دونیا و پشت بکەنە عیبادەت ، وە چۆن مونافیقان وادەکەن ، وەك فەرموویەتی :

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ٩)

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ماڵ و منداڵانتان بێ ئاگاتان نەکەن لە یادی خوا هەر کەسێك وابکات ئا ئەوانە خۆیان خەسارۆمەندن.

### ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١-٨) سورەتی المنافقون

﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ١ ..............يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ۚ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ٨﴾ المنافقون

واتە: نالەباری دووڕووەکان: کاتێ دوو ڕووەکان هاتن بۆلات ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەڵێن: شایەتی ئەدەین کە بەراستی تۆ پەیامبەری خوایت لەحاڵێکدا خوا خۆی ئەزانێ کە تۆ پەیامبەری ئەویت وە خوا گەواهیی ئەدات کە ئەو دووڕووانە درۆدەکەن کە ئەڵێن تۆ پەیامبەری خوایت(١) (يقولون لئن رجعنا إلى المدينه دووڕووەکان (واتە:عەبدوڵڵاو شاگردەکانی)ئەڵێن: سوێند بێ بە خوا، ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینەو، لەم جەنگەی (بەني مصطلق) ڕزگارمان بوو (ليخرجن الأعز منها الأذل) دەبێ دەسەڵاتدارو بەڕێز، واتە: ئەوان، خەڵکە رووت ولاتەکەی لێدەرکەن، واتە: پێغەمبەرو هاوەڵانی لە مەدینە وەدەرنێن! جا کە کوڕەکەی (سەلوول) ئەوەی گوت: کوڕەکەی خۆی - (عەبدوڵڵا) کە موسڵمانێکی دڵسۆز بوو- چوو لەدەرگای (مەدینە)دا شیرەکەی بەدەستەوە گرت و وەستا، جاکاتێ دیتی وا باوکی هات، چووەپێش و پێی گوت: بگەڕە دواوە، ئەمەش سوێندی بێت تانەڵێیت پەیامبەر عەزیز و سەربەرزە! ئێمە زەلیل و پەست و ریسواین، نابێ بڕۆیتە نێوشارەوە، ئەویش بەناچارییێی لێناو، ئەویش ڕێگەی بۆکردەوە بۆ ناوشار، پاشان عەبدوڵڵا هات بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وتی: بیستوومە کە ئەتەوێ ئەی پێغەمبەری خوا! باوکم بکوژی، جا ئەگەر نیازێکی وات هەیە و راستە، فەرمان بدە بامن خۆم بیکوژم و هەرئێستایش کەللە سەرەکەیت بۆ دێنم! ئەویش فەرمووی: نا، نایکوژین ڕێز و عیززەت و گەورەیی هەر بۆ خواو بۆ پەیامبەرەکەی و بۆ باوەڕدارانە بەڵام دووڕووەکان نازانن، چونکە ڕێی راستیان لێچەواشە بووە(٢)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ قَالَ كُنْتُ فِي غَزَاةٍ فَسَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيٍّ يَقُولُ لَا تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا مِنْ حَوْلِهِ وَلَئِنْ رَجَعْنَا مِنْ عِنْدِهِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَمِّي أَوْ لِعُمَرَ فَذَكَرَهُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدَعَانِي فَحَدَّثْتُهُ فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ وَأَصْحَابِهِ فَحَلَفُوا مَا قَالُوا فَكَذَّبَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَصَدَّقَهُ فَأَصَابَنِي هَمٌّ لَمْ يُصِبْنِي مِثْلُهُ قَطُّ فَجَلَسْتُ فِي الْبَيْتِ فَقَالَ لِي عَمِّي مَا أَرَدْتَ إِلَى أَنْ كَذَّبَكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَقَتَكَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ فَبَعَثَ إِلَيَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَرَأَ فَقَالَ إِنَّ اللَّهَ قَدْ صَدَّقَكَ يَا زَيْدُ) رواه البخاري

واتە: واتە: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە هاتووە دەڵێ: لە غەزایەك بووین ، گوێم لە (عبدالله کوڕی ئوبەی) بوو گوتی : شت مەدەنە ئەوانەی لە دەوری پێغەمبەرن تاکو دەوری چۆل بکەن ، (یقولون لئن رجعنا إلى المدينه دووڕووەکان (واتە:عەبدوڵڵاو شاگردەکانی)ئەڵێن: سوێند بێ بە خوا، ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینەو، لەم جەنگەی (بە ني مصطلق) ڕزگارمان بوو (ليخرجن الأعز منها الأذل) دەبێ دەسەڵاتدارو بەڕێز، واتە: ئەوان، خەڵکە رووت ولاتەکەی لێدەرکەن، واتە: پێغەمبەرو هاوەڵانی لە مەدینە وەدەرنێن ، دەڵێ منیش ئەوەم بۆ مامم یان بۆ (عمر) گێرایەوە، ئەویش بۆ پێغەمبەری گێرایەوە و ئەویش بانگی کردم و منیش بۆ پێغەمبەرم گێرایەوە ، ئەویش لە دوای عبدالله وهاوەلانی نارد ئەوانیش سوێندیان بۆ پێغەمبەر خوارد، منیش لەلای پێغەمبەر بە درۆکەوتمەوە وبەویشی بڕواکرد ، توشی نارەحتێکی زۆر هاتم هەرگیز بەم جۆرە توشی نەبووم لە پێشتر ، لەماڵ دانیشتم، مامم پێ گوتم : هەر دەت ویست وا پێغەمبەر بە درۆزن لە قەلەمت بدات و لێت تورەبێ، جا خوا ئەم ئایەتانەی دابەزاندوفەمووی (إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ) پێغەمبەر لە دوای ناردم و ئایەتەکانی بۆ خوێندمەوە فەرمووی :( بێگومان ئەی زید خوا تۆی بەراست دانا) واتە: خوا تۆی بەراست دانا و موونافیقانیش بە درۆزن

**ئەمەش روداوەکە بە درێژی کە واحیدی لە اسباب النزول هێناویەتی :**

( قـال أَهْـلُ التَّفْسِـيرِ وَأَصْـحَابُ السِّـيَرِ: غَـزَا رَسُـولُ اللَّـهِ – صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ – بَنِـي الْمُصْطَلِقِ، فَنَزَلَ عَلَى مَاءٍ مِنْ مِيَاهِهِمْ يُقَالُ لَهُ: الْمُرَيْسِيعُ ، فَوَرَدَتْ وَارِدَةُ النَّاسِ وَمَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ أَجِيرٌ لَهُ مِنْ بَنِي غِفَارٍ يُقَالُ لَهُ: جَهْجَاهُ بْنُ سَعِيدٍ يَقُودُ فَرَسَهُ، فَازْدَحَمَ جَهْجَاهٌ وَسِنَانٌ الْجُهَنِيُّ حَلِيفُ بَنِي عَوْفٍ مِنَ الْخَزْرَجِ عَلَى الْمَاءِ، فَاقْتَتَلَا، فَصَرَخَ الْجُهَنِيُّ: يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ، وَصَرَخَ الْغِفَارِيُّ: يَا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ، فَأَعَانَ جَهْجَاهًا رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ يُقَالُ لَهُ (جُعَالٌ)؛ وَكَانَ فَقِيرًا. فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ: وَإِنَّكَ لَهُنَاكَ! فَقَالَ: وَمَا يَمْنَعُنِي أَنْ أَفْعَلَ ذَلِكَ؟! وَاشْتَدَّ لِسَانُ جُعَالٍ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ. فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: وَالَّذِي يُحْلَفُ بِهِ لَأَذَرَنَّكَ، وَيَهُمُّكَ غَيْرُ هَذَا شَيْءٌ؟. وَغَضِبَ عَبْدُ اللَّهِ، فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا مَثَلُنَا وَمَثَلُهُمْ إِلَّا كَمَا قَالَ الْقَائِلُ: سَمِّنْ كَلْبَكَ يَأْكُلْكَ، إِنَّا وَاللَّهِ لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ. يَعْنِي بِالْأَعَزِّ نَفْسَهُ، وَبِالْأَذَلِّ رَسُولَ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ –. ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى مَنْ حَضَرَهُ مِنْ قَوْمِهِ، فَقَالَ: هَذَا مَا فَعَلْتُمْ بِأَنْفُسِكُمْ، أَحْلَلْتُمُوهُمْ بِلَادَكُمْ، وَقَاسَمْتُمُوهُمْ أَمْوَالَكُمْ؛ أَمَا وَاللَّهِ لَوْ أَمْسَكْتُمْ عَنْ جُعَالٍ وَذَوِيهِ فَضْلَ الطَّعَامِ، لَمْ يَرْكَبُوا رِقَابَكُمْ، وَلَأَوْشَكُوا أَنْ يَتَحَوَّلُوا عَنْ بِلَادِكُمْ؛ فَلَا تُنْفِقُوا عَلَيْهِمْ حَتَّى يَنْفَضُّوا مِنْ حَوْلِ مُحَمَّدٍ.

قَالَ زَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ – وَكَانَ حَاضِرًا وَيَسْمَعُ ذَلِكَ –، فَقَالَ: أَنْتَ وَاللَّهِ الذَّلِيلُ الْقَلِيلُ

الْمُبَغَّضُ فِي قَوْمِكَ، وَمُحَمَّدٌ فِي عِزٍّ مِنَ الرَّحْمَنِ، وَمَوَدَّةٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ؛ وَاللَّهِ لَا أُحِبُّكَ بَعْدَ كَلَامِكَ هَذَا. فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: اسْكُتْ، فَإِنَّمَا كُنْتُ أَلْعَبُ. فَمَشَى زَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – فَأَخْبَرَهُ الْخَبَرَ، وَعِنْدَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ. فَقَالَ: دَعْنِي أَضْرِبْ عُنُقَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ: إِذَنْ تَرْعَدُ لَهُ أُنُفٌ كَثِيرَةٌ بِيَثْرِبَ. فَقَالَ عُمَرُ: فَإِنْ كَرِهْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْ يَقْتُلَهُ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ، فَمُرْ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ أَوْ مُحَمَّدَ بْنَ مَسْلَمَةَ، أَوْ عُبَادَةَ بْنَ بِشْرٍ – فَلْيَقْتُلُوهُ. فَقَالَ: إِذَنْ يَتَحَدَّثُ النَّاسُ أَنَّ مُحَمَّدًا يَقْتُلُ أَصْحَابَهُ .وَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ فَأَتَاهُ، فَقَالَ لَهُ: "أَنْتَ صَاحِبُ هَذَا الْكَلَامِ الَّذِي

بَلَغَنِي؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: وَالَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مَا قُلْتُ شَيْئًا مِنْ هَذَا قَطُّ، وَإِنَّ زَيْدًا لَكَاذِبٌ. وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ فِي قَوْمِهِ شَرِيفًا عَظِيمًا؛ فَقَالَ مَنْ حَضَرَ مِنَ الْأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ شَيْخُنَا وَكَبِيرُنَا، لَا تُصَدِّقْ عَلَيْهِ كَلَامَ غُلَامٍ مِنْ غِلْمَانِ الْأَنْصَارِ عَسَى أَنْ يَكُونَ وَهِمَ فِي حَدِيثِهِ فَلَمْ يَحْفَظْ. فَعَذَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ –.وَفَشَتِ الْمَلَامَةُ فِي الْأَنْصَارِ لِزَيْدٍ وَكَذَّبُوهُ، وَقَالَ لَهُ عَمُّهُ: مَا أَرَدْتَ إِلَّا أَنْ كَذَّبَكَ رَسُولُ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – والمسلمون ومَقَتُوك. فاستحيَى زَيْدٌ بَعْدَ ذَلِكَ أَنْ يَدْنُوَ مِنَ النَّبِيِّ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ –. فَلَمَّا ارْتَحَلَ رَسُولُ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – لَقِيَهُ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ، فقال له: أَوَ مَا بَلَغَكَ مَا قَالَ صَاحِبُكُمْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ؟ قَالَ: وَمَا قَالَ؟ قَالَ: زَعَمَ أَنَّهُ إِنْ رَجَعَ إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ. قَالَ أُسَيْدٌ: فَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ – وَاللَّهِ تُخْرِجَنَّهُ إِنْ شِئْتَ، هُوَ وَاللَّهِ الذَّلِيلُ، وَأَنْتَ الْعَزِيزُ. ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ارْفُقْ بِهِ، فَوَاللَّهِ لَقَدْ جَاءَ اللَّهُ بِكَ وَإِنَّ قَوْمَهُ لَيَنْظِمُونَ لَهُ الْخَرَزَ لِيُتَوِّجُوهُ؛ وَإِنَّهُ لَيَرَى أَنَّكَ سَلَبْتَهُ مُلْكًا. وَبَلَغَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ مَا كَانَ مِنْ أَمْرِ أَبِيهِ، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – فَقَالَ: إِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّكَ تُرِيدُ قَتْلَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ لِمَا بَلَغَكَ عَنْهُ؛ فَإِنْ كُنْتَ فَاعِلًا فَمُرْنِي بِهِ، فَأَنَا أَحْمِلُ إِلَيْكَ رَأْسَهُ! فَوَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمَتِ الْخَزْرَجُ مَا بِهَا رَجُلٌ أَبَرَّ بِوَالِدَيْهِ مِنِّي، وَأَنَا أَخْشَى أَنْ تَأْمُرَ بِهِ غَيْرِي فَيَقْتُلَهُ، فَلَا تَدَعُنِي نَفْسِي أَنْظُرُ إِلَى قَاتِلِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ يَمْشِي فِي النَّاسِ، فَأَقْتُلَهُ، فَأَقْتُلَ مُؤْمِنًا بِكَافِرٍ، فَأَدْخُلَ النَّارَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – بَلْ نُحْسِنُ صُحْبَتَهُ مَا بَقِيَ مَعَنَا.وَلَمَّا وَافَى رَسُولُ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – الْمَدِينَةَ، قَالَ زَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ: جَلَسْتُ فِي الْبَيْتِ لِمَا بِي مِنَ الْهَمِّ وَالْحَيَاءِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى سُورَةَ الْمُنَافِقِينَ فِي تَصْدِيقِي وَتَكْذِيبِ عَبْدِ اللَّهِ فَلَمَّا نَزَلَتْ أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – بِأُذُنِ زَيْدٍ، فَقَالَ: يَا زَيْدُ، إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى صَدَّقَكَ وَأَوْفَى بِأُذُنِكَ ، وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ بِقُرْبِ الْمَدِينَةِ، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَدْخُلَهَا جَاءَ ابْنُهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ حَتَّى أَنَاخَ عَلَى مَجَامِعِ طُرُقِ الْمَدِينَةِ. فَلَمَّا أَنْ جَاءَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ قَالَ ابْنُهُ: وراءك، قال: مالك؟ وَيْلَكَ. قَالَ: لَا وَاللَّهِ لَا تَدْخُلُهَا أَبَدًا إِلَّا بِإِذْنِ رَسُولِ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – وَلْتَعْلَمِ الْيَوْمَ مَنِ الْأَعَزُّ مِنَ الْأَذَلِّ، فَشَكَا عَبْدُ اللَّهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

- مَا صَنَعَ ابْنُهُ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ "أَنْ خَلِّ عَنْهُ حَتَّى يَدْخُلَ" فَقَالَ: أَمَا إِذْ جَاءَ أَمْرُ النَّبِيِّ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ فَنَعَمْ، فَدَخَلَ، فَلَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ السُّورَةُ وَبَانَ كَذِبُهُ قِيلَ لَهُ: يَا أَبَا حُبَابٍ إِنَّهُ قَدْ نَزَلَتْ فِيكَ آيٌ شِدَادٌ فَاذْهَبْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ - صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - لِيَسْتَغْفِرَ لَكَ، فَلَوَى رَأْسَهُ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ: (وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ) الْآيَةَ)
اسباب النزول القران للواحدي

ئايا مونافيق كێيه؟ ئەو كەسەیە لەسەرەوە خۆی بە موسڵمان پیشان دەدات لە ژێرەوەش باوەڕی نیه

## مونافيق له قورئاندا :

٢-خوای گەورە لە قورئان نزیکەی (١٠٠) سیفەتان باس دەکات ، بۆ نموونە خوای گەورە لە سەرەتای سوڕەتی البقره بە (٥) ئایەت باسی ئەهلی ئیمان دەکات ، وە بە (٢) ئایەت باسی کافران دەکات ، بەڵام بە (١٣) ئایەت باسی مونافیقان دەکات واتە دوو هێندەی ئیمانداروکافران ئەوەش لەبەر ترسانکی و خراپییان ئەوانە.

## نيشانەكانى مونافيق له فەرموودە :

-وە لەبارەی دووڕوو پێغەمبەر فەرموویەتی :

(أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا خَالِصًا، وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ حَتَّى يَدَعَهَا، إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتە: چوار سیفەت هەن ئەوەی لێی بینەجێ ئەوە مونافیقی تەواوە، ئەوەی یەك سیفەتی لەو سیفەتانە تێدابێ ، ئەوە سیفەتێکی نیفاقی تێدایە تاکو وازی لێ دێنێ، ئەگەر قسەی

کرد درۆ دەکات ، ئەگەر پەیمانیدا  نایباتە سەر ، وە ئەگەر بەلێنیدا نایباتە سەر ، وە ئەگەر کێشەی  هەبوولەگەڵ کەسێ  سنوور دەبەزێنێ.

شرح : أربع من كن فيه) الذي قاله المحققون والأكثرون وهو الصحيح المختار أن معناه إن هذه الخصال خصال نفاق وصاحبها شبيه بالمنافقين في هذه الخصال ومتخلق بأخلاقهم لا أنه منافق في الإسلام فيظهره وهو يبطن الكفر (كان منافقا خالصا) معناه شديد الشبه بالمنافقين بسبب هذه الخصال (وإذا خاصم فجر) أي مال عن الحق وقال الباطل والكذب قال أهل اللغة وأصل الفجور الميل عن القصد)

## ئایا کافر جێگای  ناخۆشترە یان مونافیق لە دۆزەخ؟

**وەڵام : بەدەقی ئایەت مونافیق جێگای ناخۆشترە ، وەك خوا فەرموویەتی:**

(إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمۡ نَصِيرًا ١٤٥)

واتە:  با بزانن بەڕاستی دووڕووەکان لە خانەو تەبەقی هەرە ژێرەوەی ئاگردان وە هەرگیز ڕزگار کەرێکت بۆ ئەوان دەست ناکەوێت.

## پێغەمبەر سوڕەتی ( المنافقون ) لە نوێژی بەیانی  هەینی دەخوێند:

عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ الم تَنْزِيلُ السَّجْدَةِ وَهَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ حِينٌ مِنْ الدَّهْرِ وَأَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْجُمُعَةِ سُورَةَ الْجُمُعَةِ وَالْمُنَافِقِينَ) رَوَاهُ مُسْلِمٌ

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر لە ڕۆژی هەینی لە نوێژی بەیانی سوڕەتی (السجده) و (الانسان) دەخوێند، بەڵام لە ڕۆژی هەینی لە نوێژی هەینی سورەتی (الجمعه) و(المنافقون) دەخوێند

ئایا حیکمەت چی بوو لە خوێندنی ئەم دوو سورەتە؟

قيل: الحكمة من قراءة سورة الجمعة وسورة المنافقون في صلاة الجمعة هي أن الجمعة مشتملة على ذكر شيء من أحكام الجمعة، وفيها تذكير بالجمعة وبالذكر بعد الجمعة وابتغاء فضل الله بعد الجمعة.

وأما سورة المنافقون فقيل: يقرأ بها ليسمع المنافقين الذين يحضرون الجمعة، ففي هذه السورة فضحهم وبيان مخازيهم وبيان ما هم عليه من الشر، وما أصابهم من البلاء العظيم في وقوعهم في النفاق.

واتە: گوتراوە حیکمەت لەوەی پێغەمبەر رۆژی هەینی سورەتی (الجمعه) خوێندوە ئەوەیە باسی ئەحکامی نوێژ هەینی و باسی هەینی و زیکری خوا کردن لە دوای هەینی و داواکردنی فەزل وکەرەمی لە دوای نوێژی هەینی ، بەلأم خوێندنی سورەتی(المنافقون) گوتراوە: تاکو مونافیقان گوێیان لێ بێ و کە خوا چۆن ئابروی بردوون ، و چەندە خراپن و توشی بەلأیەکی زۆر گەورە بوینە کە نیفاقە.

-( عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (يَقْرَأُ فِي الْجُمُعَةِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى وَهَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ وَإِذَا اجْتَمَعَ الْجُمُعَةُ وَالْعِيدُ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ قَرَأَ بِهِمَا جَمِيعًا فِي الْجُمُعَةِ وَالْعِيدِ) السنن الصغير للبهقي

-( عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، قَالَ: (كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِي الْعِيدَيْنِ، وَفِي الْجُمُعَةِ بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى، وَهَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ)، قَالَ: (وَإِذَا اجْتَمَعَ الْعِيدُ وَالْجُمُعَةُ، فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ، يَقْرَأُ بِهِمَا أَيْضًا فِي الصَّلَاتَيْنِ) رَوَاهُ مُسْلِمٌ

********************

# وتاری ژماره (١١٨) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (التغابن)

ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژمارە (٦٤)ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (١٨) ئایەتە.

-ئەم سورەتە لە شاری مەدینە دابەزیوە و باسی تەشریعات دەکات ، بەڵام بارودۆخەکەی بە هی مەککە دەچی

-باسی گەوریی خوا و شوێنەواری هێزو توانای ئەو زاتە دەکات

-باسی چەند نموونەیەك لەگەلانی رابردوو دەکات ، لەبەر ئەوەی پێغەمبەرانیان بە درۆزانی، خوا تەفروتونای کردن

-وە فەرمان دەکات بە گوێرایەڵی خوا و پێغەمبەر ، وە هۆشیاری دەدات لە رەت کردنەوەی بانگەوازی خوا ، وەك فەرموویەتی :

(وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ ۚ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ١٢)

واتە: فەرمانبەریی خواو فەرمانبەری پێغەمبەر بکەن ئەوسا ئەگەر پشتان تێ کرد جا ئەوەی لەسەر پێغەمبەری ئێمەیە هەر گەیاندنی ڕوون و ئاشکرای ئایینە.

-باسی ئەوە دەکات خوا هەموو شتێکی ئاشکراو نهینی دەزانی

-(يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ٤ ) التغابن .

واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە خوا دەیزانێ وە شارەزایە بەوەی دەیشارنەوە وە بەوەی ئاشکرای دەکەن وە خوا زانایە بەوەی لە ناو دڵ و دەروونداییە.

–لە کۆتایدا فەرمان دەکات بە بەخشین لە پێناوی خوا ، وە هۆشیاری دەدات لە رەزیلی و چروکی

(فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ وَٱسْمَعُواْ وَأَطِيعُواْ وَأَنفِقُواْ خَيْرًا لِّأَنفُسِكُمْ ۗ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ١٦ واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە خوا دەیزانێ وە شارەزایە بەوەی دەیشارنەوە وە بەوەی ئاشکرای دەکەن وە خوا زانایە بەوەی لە ناو دڵ و دەروونداییە.

–وەباسی کۆبونەوەی ڕۆژی قیامەت دەکات .

(يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ ٱلْجَمْعِ ۖ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلتَّغَابُنِ ۗ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ٩ ) واتە: پاداشتان دەداتەوە لە ڕۆژێکدا کە کۆتان دەکاتەوە بۆ ڕۆژی کۆکردنەوە ئەو ڕۆژە ڕۆژی زیانباری یە وە هەر کەسێك بڕوا بێنێ بەخوا وە کردەوەی چاك بکات خوا چاو پۆشی دەکات لە گوناهەکانی وە دەیخاتە ناو بەهەشتانێکەوە کە جۆگە ئاوی زۆر بەژێریاندا دەڕوات تیا دەمێننەوە بە هەمیشەیی ئەوەیە بردنەوە و سەرکەوتنی گەورە.

ئایا بۆچی ناوی ئەم سورەتە نراوە (التغابن)؟

وەڵام: چونکە ڕۆژی قیامەت خەڵکی کۆدەکرێتەوە بۆ لێپرسینەوەو لێك جیاکردنەوە ، وشەی (التغابن) واتە زیانباری ، موسڵمان خۆی پێ زیانبارە چونکە حەزی دەکرد زیاتر کردەوەی هەبوایە ، کافریش خۆی پێ زیانبارە چونکە حەزی دەکرد ئیمانی هێنابایە.

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١٤) سورەتی التغابن

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡۚ وَإِن تَعۡفُواْ وَتَصۡفَحُواْ وَتَغۡفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ١٤) التغابن

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتـان هێنـاوە.. هەنـدێك لـە هاوسـەرانتان یـان هەنـدێك لـە ڕۆڵـەو نەوەكانتان دوژمنتانن.. جا ئێوەش وریابن و خۆتان بپارێزن لێیان، جـا ئەگـەر چاوپۆشـی لە هەڵەیان بكەن و واز لـە ئازاردانیـان بهێـنن و لێیـان ببـورن، ئـەوە چـاك بـزانن كـە خـوا لێخۆسبووە و میهرەبانە (تەفسیر ئاسان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ (إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ) (التغابن: ١٤) فِي قَوْمٍ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ أَسْلَمُوا وَأَرَادُوا أَنْ يَأْتُوا النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَبَى أَزْوَاجُهُمْ وَأَوْلَادُهُمْ أَنْ يَدْعُوهُمْ، فَأَتَوْا الْمَدِينَةَ، فَلَمَّا قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَوْهُمْ قَدْ فَقِهُوا فَهَمُّوا أَنْ يُعَاقِبُوهُمْ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (وَإِنْ تَعْفُوا وَتَصْفَحُوا) (التغابن: ١٤) الْآيَةَ) رواه الحاكم في المستدرك وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ ووافقه الذهبي ، وراه الترمذي وقال الالباني حسن

واتە: لە عەبدولاَی كوڕی عەباسەوە هاتووە خوا لەخۆی وبابی ڕازی بێ، دەڵێ ئـەم ئایەتـە دابەزی (إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ) دەربـارەی كەسـانێك لـە خـەڵكی مەككـە كـە موسـڵمان ببـوون ، دەیانویسـت بێنـە مەدینـە بـۆ لای پێغەمبـەر ، خێـزان و منداڵیان ڕازی نەدەبوون ، دوایی كە هاتنـە مەدینـە بینیـان خـەڵكی مەدینـە و موسـڵمانان بەگشـتی چـاك فێـری ئـایین بوینـە و ئـەوانیش بـەجێ مـاون ، ویسـتیان ئـازاری منـداڵ و خێزانیان بدەن چونكە ئەوان هۆكاربوون بۆ نەزانینی ئەوان ، جا خوا ئەو ئایەتەی دابەزاند فەرمووی (وَإِنْ تَعْفُوا وَتَصْفَحُوا) واتە : عەفویان بكەن و چاوپۆشیان لێ بكەن.

## پاراستنی خێزان و منداڵ فەرمانی خوایە:

خوای گەورە فەرموویەتی :

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ (التحريم:٦)

واتە: ئەی ئەو کاسانەی کە باوەڕتان هێناوە خۆتان و کەسوکارتان بپارێزن لە ئاگرێك کە سووتەمەنیەکەی خەڵکی و بەردە، سەرپەرشتیاری ئەو دۆزەخ و ئاگرە، جۆرە فریشتەیەکن کە زۆر دڵڕەق و توندو تیژن، نافەرمانی خوا ناکەن لە هیچ شتێکدا کە فەرمانیان پێ بدات و هەرچی فەرمانێکیان پێ بدرێت ئەنجامی دەدەن.(ئاسان

وە پێغەمبەر فەرموویەتی :

(مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلَّا يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ وَيُنَصِّرَانِهِ وَيُمَجِّسَانِهِ كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ) رواه البخاري

واتە : هەموو منداڵێك بە پاکی و لەسەر فیترەت لە دایك دەبێت ، بەڵام دایك و باوکی دەیکەنە جوولەکە یان گاور یان ئاگر پەرست ، وەك چۆن ئاژەڵ بێچوەکەی بەساغ و سەلامەتی دەبێ و هیچ نەنگی و عەیبێکی لێ بەدی ناکرێ .

<u>**ئیمامی غەزالی دەفەرموێت**</u> (منداڵ ئەمانەتە لای دایك و باوك ،دڵی گەوهەرێکی پاکە ، هیچ نەخش و وێنەی تێدا نیە، ئامادە سازە بۆ هەموو نەخشێك ، ئەگەر ڕاهێنرا لەسەر چاکە و فێر کرا بەم شێوە گەشە دەکا ، دایك و باوکی لە دونیا و قیامەت پێی سەربەرزە و لە چاکەیان بەشدارە ،بەڵام ئەگەر لەسەر شەڕ و خراپە ڕاهێنرا و وەکو ئاژەڵ پشت گوێ خرا ، نا لەبار و تیاچوو و دۆڕاوە ، گوناح و تاوانەکانیشی لە ئەستۆی دایك و باوکیەتی )

## ئەبێ منداڵ فێری نوێژو عەقیدەیەکی چاك و پاك بکرێت:

(مُرُوا أَوْلَادَكُمْ بِالصَّلَاةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرِ سِنِين وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ) رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ قال الالباني حسن

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : فەرمان بکەن بە منداڵەکانتان نوێژ بکەن لە تەمەنی حەوت ساڵی، لە دە ساڵی لێیان بدەن ئەگەر نوێژیان نەکرد ، وە جێگایان لێك جیا بکەنەوە .

بەرهەمی چاکەکانی منداڵ دایك وباوك لێ بەشداران:

(إِذَا مَاتَ الْإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثَةٍ: مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، وَعِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، وَوَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ) رواه النسائي قال الالباني صحيح

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : هەر کاتێ ئینسان مرد کردەوەکانی دەبرێتەوە، مەگەر لە سێ رێگای نەبێ ١-منداڵی صالیح کە دوعا بۆ دایك وباوکی بکات، ٢- خێرێکی نەبراوە (پرۆژەی چاك و بەسوود بۆ خەڵکی ٣-زانستێکی چاك کەخەڵکی فێرکردبێ .

(لَا يَتَمَنَّى أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ وَلَا يَدْعُو بِهِ قَبْلَ أَنْ يَأْتِيَهُ، إِنَّهُ إِذَا مَاتَ انْقَطَعَ عَمَلُهُ، وَإِنَّهُ لَا يَزِيدُ الْمُؤْمِنَ عُمُرُهُ إِلَّا خَيْرًا) رواه مسلم وابن جبان

-( قال رسول الله – صلى الله عليه وسلم – (إنَّ اللهَ لَيَرْفَعُ ذُرِّيَّةَ الْمُؤْمِنِ إليه في درجته، وَإِنْ كَانُوا دُونَهُ فِي الْعَمَلِ لِتَقَرَّ بِهِمْ عَيْنُهُ ، ثم قرأ (والذين آمنوا وأتبعتهم ذريتهم بإيمان) الآية ثم قال: وما نقصنا الآباء بما أعطينا البنين) إسناده صحيح رواه البزار. قال الالباني صحيح

-( قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ذُرِّيَّةُ الْمُؤْمِنِ فِي دَرَجَتِهِ وَإِنْ كَانُوا دُونَهُ فِي الْعَمَلِ لِتَقَرَّ بِهِمْ عَيْنُهُ). ثُمَّ قَرَأَ (وَالَّذِينَ آمَنُوا وَأَتْبَعْنَاهُمْ ذُرِّيَّاتِهِمْ بِإِيمَانٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّاتِهِمْ وَمَا أَلَتْنَاهُمْ مِنْ عَمَلِهِمْ مِنْ شَيْءٍ) قَالَ: (مَا نَقَصْنَا الْآبَاءَ بِمَا أَعْطَيْنَا الْبَنِينَ) حلية الاولياء

منداڵ فێری قورئان بکەن : پێغەمبەر فەرموویەتی :

(يَجِيءُ الْقُرْآنُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَالرَّجُلِ الشَّاحِبِ، يَقُولُ لِصَاحِبِهِ: هَلْ تَعْرِفُنِي؟ أَنَا الَّذِي كُنْتُ أُسْهِرُ لَيْلَكَ، وَأُظْمِئُ هَوَاجِرَكَ، وَإِنَّ كُلَّ تَاجِرٍ مِنْ وَرَاءِ تِجَارَتِهِ، وَأَنَا لَكَ الْيَوْمَ مِنْ وَرَاءِ كُلِّ تَاجِرٍ، فَيُعْطَى الْمُلْكَ بِيَمِينِهِ، وَالْخُلْدَ بِشِمَالِهِ، وَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ تَاجُ الْوَقَارِ، وَيُكْسَى وَالِدَاهُ حُلَّتَانِ، لَا يَقُومُ لَهُمَا الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، فَيَقُولَانِ: يَا رَبُّ، أَنَّى لَنَا هَذَا؟ فَيُقَالُ لَهُمَا: بِتَعْلِيمِ وَلَدِكُمَا الْقُرْآنَ، وَإِنَّ صَاحِبَ الْقُرْآنِ يُقَالُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: اقْرَأْ، وَارْقَ فِي الدَّرَجَاتِ، وَرَتِّلْ كَمَا كُنْتَ تُرَتِّلُ فِي الدُّنْيَا، فَإِنَّ مَنْزِلَكَ عِنْدَ آخِرِ آيَةٍ مَعَكَ) رواه الطبراني قال الالباني صحيح

## دوو شتی زۆر کاریگەر:

لەکاتی نووسینی ئەم پەرتووکە دوو شت زۆر کاریان تیَ کردم دەربارەی مندالّ و خیَزان

یەکەم: دکتۆر (یوسف) کوڕی مامۆستا (بهاء الدین)ی خەتیَ پۆستیَکی نووسی بوو ، ویَنەیەکی مامۆستای باوکی لەگەلّ دانابوو، دەلّیَ گوتم بابە ئەو سەری سالّە (واتە : سالّی ٢٠٢٠) چ قسەیەکت هەیە؟ ئەویش گوتی: شوکری خوای دەویَ پیَنج فەرزە دەگەمە مزگەفتیَ.

ئەلّیَ: گوتم ئەدی بۆ من چ ئامۆژگاریەکت هەیە؟

ئەویش گوتی : نەخۆش ئەگەر جوینیشت بداتیَ هەر بەسەبرو تەحەممول بە، هەر نەخۆشەکیش مرازەکی هەبیَت لۆی پیَك بینە. (من دەلّیَم : ئەوەیە پیاوی چاك و مندالّی چاك ، وپەروەردەی چاك)

دووەم: مەلّبەندی (٣) ی هەولیَری کۆمەلّ و لقی هەولیَری زانایان کۆڕیکیان بۆ بەریَز دکتۆر (ملکو ئەسعد) سازکرد لە هەولیَر لە ژیَر ناونیشانی (بەرەو خیَزانیَکی سەرکەوتوو) جەنابی دکتۆر لە یەکیَ لە قسەکانیدا گوتی: ئەگەر شوشەی پەنجەرە بشکیَ ، جامیَك دەکری چاك دەبیَتەوە ، بەلاَم ئەگەر خیَزان شکەستی هیَنا و شکا بەهیچ شتیَك چاك نابیتەوە

# وتاری ژماره (١١٩) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (الطلاق)

ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژمارە (٦٥)ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (١٢) ئایەتە

–ئەم سورەتە لە شاری مەدینە دابەزیوە و باسی تەشریعات دەکات ، بەتایبەتی ئیش وکاری ژن و مێرد ، وەك روونکردنەوەی (عیددە و خەرجی و نیشتەجێ بوون و کرێی شیرپێدان )

–لەسەرەتادا باسی حوکمەکانی تەلاق دەکات وەك (تەلاقی سونی و تەلاقی بیدعی) وەفەرمان دەکات بە شێوەیەکی راست و شەرعی ژنان تەلاق بدەن ،وە با لەکاتی پاکی دابن

–وە پێمان رادەگەینێ ئەگەر لەبەر ناچاری نەبێ ژنان تەلاق نەدەین ، چونکە خێزان لە پاڵ یەکدی هەڵدەوەشێنێتەوە ، داوا دەکات سنوری خوا پێ شێل نەکرێت

–لە کاتی جێ بەجێ کردنی حوکمە شەرعییەکان ، داوامان لێ دەکات پارێز لە خوا بکەین ، واتە تەقوای خوامان هەبێ و ژن و مێرد زوڵم لە یەکدی نەکەن

–لەگەڵ (٣) بابەتی جیا (٣) جاران باسی تەقوا دەکات

(وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥ.......... ) الطلاق

-( وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ٤ ) الطلاق

-(.... وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرۡ عَنۡهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعۡظِمۡ لَهُۥٓ أَجۡرًا ٥ ) الطلاق

پاش بەکارهێنانی وشەی تەقوا دەفەرموێت:

(وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَٰهَا عَذَابًا نُّكْرًا ٨ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ٩ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا ١٠) الطلاق

واتـه: زۆر لـه دێهـاتی (وشـاری) یـەكان سەرپێچـی یـان كـرد لـه فـەرمانی پـەروەردگار و پێغەمبەرەكانی ئێمەش پرسینەوەمان لەگەڵ كردن بە پرسینەوەیەكی سەخت وە سـزامان دان بـە سـزایەكی دژوار.(٨) ئـیتر ئاكـامی كـردەوەی خۆیانیـان چەشـت وە سـەرئەنجامی كاریـان بـوو بـە زیانبـاریی و خەسارۆمەندی.(٩) خـوا ئامـادەی كـردووە بۆیـان سـزایەكی سەخت كەواتە لەخوا بترسن ئەی خاوەنانی ژیری ئەوانەی باوەڕیان هێناوە بێگومـان خـوا قورئانی بۆ دابەزاندوون.(١٠)

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١-٣) سورەتی الطلاق

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا۟ ٱلْعِدَّةَ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ ۖ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ ۚ لَا تَدْرِى لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ١ .........)

واتە: ژن دەبێ لە هەیدەی خۆیدا تەڵاق بدرێت: ئەی پەیامبەر !(صلی الله علیه وسلم) بـە ئوممەتەكەت بڵێ: كـاتێ ویسـتتان ژنـەكانتان تـەڵاق بـدەن جـا لـەكاتی دەسـت پێكردنـی عیددەیاندا تەڵاقیان بدەن، واتە: لە حەیز پاك بن و،لەو پاكیەشـدا مێـرد لەگـەڵیا دروسـت نەبووبێت. لەفەرموودەیەكدا هاتووە: ( فليطلقها طاهرا قبل أن يمسها، فتلك العدة التي أمر الله تعالي أن يطلق لها النساء ) بوخاریی وموسلیم: واتە: ئەگـەر ژنـت تـەڵاقـدا، لەپاكیـدا و پێش چوونەلای تەڵاقی بدە، هەر ئەوەیشە كـە خـوا فـەرمووێ: ژنـان لـەكاتی عیددەیانـدا تەڵاق بدەن. حیسابی سەرەتاو كۆتایی عیددەیان بەوردیی بژمێرن، تا لێتـان تێك نەچـێو

ژنەکەیش بە عیددەوە زۆر نەمێنێتەوە، نەوەك تووشی زیان ببێ وەلە خوای گەورەو پەروەردگارتان بترسن و سنوورەکانی مەشکێنن و گوێرایەڵبن لا تخرجوهن من بیوتهن لەخانووەکانیاندا دەریان مەکەن پاش تەڵاقدان، تا عیددەیان تەواو ئەبێت، واتە: لەپێش تەڵاقداندا لەکوێ دەژییان با هەر لەوێ بمێننەوە ژنەکانیش بۆخۆیان بەبێ ڕەزامەندیی لەماڵ دەرنەچن، چونکە هێمان بەسراونەتەوە بەپیاوەوە مەگەر کارێکی خراپی ئاشکرا بکەن .(ئیبن عەباس) و هەندێ لەهاوەڵانیتر ئەڵێن: مەبەست بە (فاحیشە) زیناو، هەموو جۆرە ڕەفتارێکی تری درێوو نەگونجاوی ئەو ژنەیە.ئیمامی (شافیعی) ئەڵێ: مەبەست بەو (فاحیشە)یە، جنێوو دەم درێژی ژنەکەیە لەگەڵ خزم و کەس و کاری مێردەکەیدا. ئەو کاتە با لەوێ نەمێنن و بچن بۆ ماڵی مەحرەمی خۆیان. و ئەمەیە بەرنامەو سنوورەکانی خوا لەبارەی تەڵاقەوە هۆشیاربن! دەست درێژی نەکەن هەرکەسێك لە بەرنامەو سنوورەکانی خوا تێپەڕێ، بێگومان ستەمی لە خۆیکردووەو سنوری خوای بەزاندووە تۆ چووزانی دوای تەڵاقدانەکە چیدەبێ؟ لەوانەیە خوای کارزان کارێ تازەپێش بێنێت: ژن و پیاوەکە پەشیمان ببنەوە بۆ یەکتر، ئەو کاتە دەست بکەنەوە بەژن و مێردی خۆیان و ژیانێکی نوێ، بۆیە دەڵێین: با لە خانووەکانی خۆیاندا بمێننەوەو دەرنەچن.(ڕامان)

ئەم فەموودە لەم بارەوە هەیە

(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَةً لَهُ وَهِيَ حَائِضٌ فَذَكَرَ عُمَرُ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَتَغَيَّظَ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ – صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – ثُمَّ قَالَ: لِيُرَاجِعْهَا ثُمَّ يُمْسِكْهَا، ثُمَّ تَحِيضُ فَتَطْهُرُ، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ) وَفِي رِوَايَةٍ: (مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا ثُمَّ لْيُطَلِّقْهَا طَاهِرًا أَوْ حَامِلًا) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

## ئايا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( خُوطب النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوَّلًا تَشْرِيفًا وَتَكْرِيمًا، ثُمَّ خَاطَبَ الْأُمَّةَ تَبَعًا فَقَالَ: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ) وَقَالَ ابْنُ أَبِي حَاتِمٍ (عَنْ أَنَسٍ قَالَ: طَلَّقَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَفْصَةَ، فَأَتَتْ أَهْلَهَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ، عَزَّ وَجَلَّ: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ) فَقِيلَ لَهُ: رَاجِعْهَا فَإِنَّهَا صَوَّامَةٌ قَوَّامَةٌ، وَهِيَ مِنْ أَزْوَاجِكَ وَنِسَائِكَ فِي الْجَنَّةِ) اخرجه ابن كثير

واتە: ئەم ئایەتە رووی دوانگەی لە پێغەمبەرە یەکەم جار وەکو ڕێزێك ، دوای رووی لە هەموو ئومەتە و دەفەرمووێ(يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ) وە ئیبنو ئەبی حاتەم دەڵێ : لە ئەنەسەوە هاتووە دەڵێ (پێغەمبەر حەفصەی تەلاقدا و چوویەوە ماڵی خۆی ، خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ) بە پێغەمبەر گوترا بیگێرەوە لای خۆت چونکە ئافرەتێکە زۆر بە ڕۆژوو دەبێ و زۆر شەونوێژ دەکات ، وە ئەوە لە بەهەشت لە ریزی خێزانەکانی تۆدایە.

وەپێغەمبەر لەم بارەوە فەرموویەتی :

(قَالَ لِي جِبْرِيلُ: رَاجِعْ حَفْصَةَ فَإِنَّهَا صَوَّامَةٌ قَوَّامَةٌ وَإِنَّهَا زَوْجَتُكَ فِي الجَنَّةِ) رواه الحاكم قال الالباني حسن

واتە: پێغەمبەر دەفەرمووێ جوبریل پێگوتم : حەفصە بگێرەوە لای خۆت چونکە ئەو ئافرەتێکی زۆر نوێژکەرو ڕۆژووگرە، وە ئەو خێزانی تۆیە لە بەهەشت .

وە دەربارەی ژنی حیزدار وتەلاقدانی پێغەمبەر فەرموویەتی :

(عن عَبْد الرَّحْمَنِ بْنَ أَيْمَنَ، مَوْلَى عَزَّةَ، يَسْأَلُ ابْنَ عُمَرَ، وَأَبُو الزُّبَيْرِ يَسْمَعُ ذَلِكَ، كَيْفَ تَرَى فِي رَجُلٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ حَائِضًا؟ فَقَالَ: طَلَّقَ ابْنُ عُمَرَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَسَأَلَ عُمَرُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: إِنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لِيُرَاجِعْهَا)، فَرَدَّهَا، وَقَالَ: (إِذَا

طَهُرَتْ فَلْيُطَلِّقْ، أَوْ لِيُمْسِكْ) ، قَالَ ابْنُ عُمَرَ: وَقَرَأَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ( يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ فِي قُبُلِ عِدَّتِهِنَّ ) رَوَاهُ مُسْلِمٌ

واتە: ئیبنو عومەر خێزانی خۆی تەلاق دا لە کاتی حەیز، ئیمامی عومەر لەم بارەوە پرسیاری لە پێغەمبەر کرد، ئەویش فەرمووی : با بیگێریتەوە تاکو پاك دەبێتەوە، جا یان با تەلاقی بدات یان بیگێریتەوە.

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی (٤) سورەتی الطلاق

﴿وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ٤﴾ الطلاق

واتە: ژنانی مەیووس لە عوزرو، ئەوانەشیان عوزر ناشۆن: ئینجا پاش ئەوە لەسوورەتی (بەقەرە)دا عیددەی ئەو ژنانەی باسکرد حەیزیان هەیەو دەکەونە بێ نوێژی، ئیستا دێتە سەرباسی عیددەی ئەو ژنانە هێشتای بەتەمەن مندالّن، وەیان پیرن و حەیزیان نەماوە، ئەو ژنانەتان کە بێهیوا دەبن لە بەر پیری لە تێکەوتنی (حەیز)، ئەگەر گومانتان هەبوو لەئەندازەی عیددەکەیاندا ئەوا عیددەیان سێ مانگە وەعیددەی ئەوانەش کەهێشتا حەیزیان نەبینیوە لەبەر بالّق نەبوون، یان هەر هۆیەکی تر، هەر سێ مانگە ،عیددەی ئەوژنانەش دووگیانن، ئەوکاتەیە مندالّەکەیان دادەنێن، ئیتر تەلّاق درابن، یان مێردیان مردبێت وەهەر کەسێك خۆ بپارێزێ لەبێ فەرمانی خوا، ئەویش کاروباری بۆ ئاسان ئەکات(رامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ : لَمَّا نَزَلَتْ عِدَّةُ النِّسَاءِ فِي سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي الْمُطَلَّقَةِ وَالْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا قَالَ قَالَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ : يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أُنَاسًا مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ يَقُولُونَ قَدْ بَقِيَ مِنَ النِّسَاءِ مَا لَمْ يُذْكَرْ فِيهِ شَىْءٌ قَالَ : (وَمَا هُوَ). قَالَ الصِّغَارُ وَالْكِبَارُ وَذَوَاتُ الْحَمْلِ قَالَ فَنَزَلَتْ (وَاللاَّئِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ وَاللاَّئِي لَمْ يَحِضْنَ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلاَثَةُ أَشْهُرٍ وَأُولاَتُ الأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ) جماع أَبْوَابِ عِدَّةِ الْمَدْخُولِ بِهَا) السنن الكبرى للبيهقي

واتە: لە ئەبی عوسمانەوە هاتووە دەڵێ: کاتێ ئەو ئایەتەی سورەتی (البقرە) دابەزی وباسی عیددی ئافرەتانی کرد ، لەتەلاقدراو مێردمردوو ، دەڵێ، ئوبەی کوڕی کەعب گوتی: ئەی نێرراوی خوا هەندێ خەڵکی مەدینە دەڵێن : هەندێك ئافرەت ماون باسیان نەکراوە ، فەرمووی کامیان؟ گوتی: منداڵ وبەتەمەنەکان وسکپڕ، دەڵێ جا ئەم ئایەتە دابەزی (وَاللاَّئِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ وَاللاَّئِي لَمْ يَحِضْنَ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلاَثَةُ أَشْهُرٍ وَأُولاَتُ الأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ)

## کاریگەی ئەم ئایەتە :

-(عَنْ أَبِي السَّلِيلِ ضُرَيْبِ بْنِ نَقِيرٍ الْقَيْسِيِّ قَالَ: قَالَ أَبُو ذَرٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتْلُو هَذِهِ الْآيَةَ (وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ) (الطلاق: ٣) قَالَ: فَجَعَلَ يُرَدِّدُهَا حَتَّى نَعَسْتُ فَقَالَ: (يَا أَبَا ذَرٍّ، لَوْ أَنَّ النَّاسَ أَخَذُوا بِهَا لَكَفَتْهُمْ) رواه الحاكم و هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ ووافقه الذهبي

واتە: لە ئەبی سەلیلەوە هاتووە دەڵێ: ئەبو زەڕ خوا لێ رازی بێ گوتی : پێغەمبەر ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە (وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ) هەر دووبارەی دەکردەوە تاکو پۆرژام ، فەرمووی : ئەی ئەبو زەڕ ، ئەگەر خەڵکی ئەو ئایەتە کارپێ بکەن و وەربگرن بەسیانە.

-ئایا بۆچی تەلاق دانراوە؟ وەڵام دواین چارەسەرە بۆ رزگاربوونی هەردوولا

## ئایا زیانەکانی تەلاق چینە؟

وەڵام: ١- هۆکارە بۆ هەڵوشاندنەوەی خێزان

٢-بێ نازبوونی منداڵەکان کە مرۆڤی دوارۆژن

٣-ئەو ژن و پیاوەی لێك جیا دەبنەوە پێگەیان لاواز دەبێ لە ناو کۆمەڵگا.

٤-کێشەی کۆمەڵاتی و ئابووری وسایکۆلۆژی لێدەکەوێتەوە

-ئایا هۆکارەکانی تەلاق چینە؟ وەڵام

١-هەڵبژاردنی نادروست

٢-جیاوازی تەمەن

٣-گرنگی نەدان بە ئەرك ومافەکانی یەکتر

٤-کەم قەناعەتی و رازی نەبوون بەوەی هەیانە

٥-بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای سەردەم بە شێوەیەکی خراپ بەتایبەت مۆبایل کە ئامارێکدا هاتووە دەڵێ تەنها لە ساڵی(٢٠١١) لە هەولێر (١٩١٠) ولە سلیمانی (١٣٣٩) و لە گەرمیان (٥٥٥) لە دهۆك (٧١٢) حاڵەتی تەلاق هەبوو بەهۆی موبایلەوە

٦-دەست تێوەردانی کەسی سێیەم بۆ ناوکاروباری خێزان.(وتاری سەردەم / م . ئەحمەدی قامیشی.

## شەیتان دەوری زۆرە لە تەلاق وخرا پەکان:

(عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: (إِذَا أَصْبَحَ إِبْلِيسُ بَثَّ جُنُودَهُ، فَيَقُولُ: مَنْ أَضَلَّ الْيَوْمَ مُسْلِمًا أَلْبَسْتُهُ التَّاجَ، قَالَ: فَيَخْرُجُ هَذَا، فَيَقُولُ: لَمْ أَزَلْ بِهِ حَتَّى طَلَّقَ امْرَأَتَهُ، فَيَقُولُ: أَوْشَكَ أَنْ يَتَزَوَّجَ، وَيَجِيءُ هَذَا فَيَقُولُ: لَمْ أَزَلْ بِهِ حَتَّى عَقَّ وَالِدَيْهِ، فَيَقُولُ: أَوْشَكَ أَنْ يَبَرَّ، وَيَجِيءُ هَذَا، فَيَقُولُ: لَمْ أَزَلْ بِهِ حَتَّى أَشْرَكَ فَيَقُولُ: أَنْتَ أَنْتَ، وَيَجِيءُ، فَيَقُولُ: لَمْ أَزَلْ بِهِ حَتَّى زَنَى فَيَقُولُ: أَنْتَ أَنْتَ، وَيَجِيءُ هَذَا، فَيَقُولُ: لَمْ أَزَلْ بِهِ حَتَّى قَتَلَ فَيَقُولُ: أَنْتَ أَنْتَ، وَيُلْبِسُهُ التَّاجَ) رواه ابن حبان في صحيحه قال الالباني وارنوؤط صحيح

واتە: لە ئەبی موساوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی : کاتێ بەیانی داهات شەیتان سەربازەکانی بڵاودەکاتەوە ، دەڵێ کێ ئەمڕۆ موسڵمانێك گومرا دەکات تاکو تاجی لەسەر بنێم ، جا یەکێك لە سەربازەکانی دەڵێ : ئەمڕۆ رانەوەستام تاکو وام لە موسڵمانێك کرد خێزانی خۆی تەلاق بدات ، شەیتان پێ گوت باشە ودەست خۆشی لێکرد، بەلام کابرا ژنێکی دیکە مارە دەکاتەوە ، سەربازێکی دیکە هات گوتی : ئەمڕۆ رانەوەستام تاکو وام لە کەسێك کرد دایك وباوکی ئازار بدات ، شەیتان گوتی : باشە بەلام دوور نیە دوای چاکەیان لەگەڵ بکاتەوە، یەکی دیکە هات گوتی : وام لە کەسێ کرد شرك بکات ، گوتی : عافیە ئەتۆ ئەتۆ کارێکی چاکت کرد، یەکی دیکە هات گوتی : وام لە کەسێ کرد زینا بکات ، گوتی : ئافەرین هەرتۆ هەرتۆ، یەکی دیکە هات گوتی : وام لە کەسێ کرد کەسێك بکوژێ ، شەیتان گوتی : ئافەرین هەرتۆ هەرتۆ شایەستەی تاجی ، تاجی لەسەر دەنێ.

******************

# وتاری ژماره (١٢٠) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (التحريم)

ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژمارە (٦٦)ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (١٢) ئایەتە.

–ئەم سورەتە لە شاری مەدینە دابەزیوە و باسی تەشریعات دەکات ،

–باسی ئەو حوکمانە دەکات کە پەیوەستە بە ناو ماڵی پێغەمبەر و بەدایکانی ئیمانداران ، وە باسی دروست کردنی ماڵێکی موسڵمانانە دەکات لە کۆمەڵگادا.

–باسی ئەوە دەکات کە پێغەمبەر جاریەکەی (مارەی قیبتی ) لە خۆی حەرام دەکات بۆ رەزامەندی هەندێ لە خێزانەکانی ، بەڵام خوا بە شێویەکی نەرم رێگری لێ دەکات ، وەك فەرموویەتی:

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ١ ) واتە : ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆچی شتێك لە خۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوویت تۆ ڕەزامەندی ژنەکانت دەوێ لە کاتێکدا خوا لێخۆشبووی میهرەبانە.

–باسی بلاًوکردنەوەی ترسناکی نهێنی نێوان ژن و مێرد دەکات ، کە پێغەمبەر هەندێ نهێنی لەلای (حفصە) باس کرد ئەویش لای (عائشە)ی گێرایەوە ، دواتر لە ناو خەڵکی بلاًوبویەوە، پێغەمبەر توڕەبوو ، زۆر نەبابوو هەندێ لە ژنەکانی تەلاًق بدا ، وەك لەم ئایەتدا هاتووە

(وَإِذۡ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعۡضِ أَزۡوَٰجِهِۦ حَدِيثٗا فَلَمَّا نَبَّأَتۡ بِهِۦ وَأَظۡهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ عَرَّفَ بَعۡضَهُۥ وَأَعۡرَضَ عَنۢ بَعۡضٖۖ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِۦ قَالَتۡ مَنۡ أَنۢبَأَكَ هَٰذَاۖ قَالَ نَبَّأَنِيَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ٣ ) واتە کاتێك کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەنهێنی لای هەندێ لە

ژنەکانی قسـەیەکی درکانـد ئینجـا کـە ئـەو (ژنـە) قسـەکەی کـرد (بـۆ هەوێکـەی) خـواش پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) ئاگادار کرد (پێغەمبەر(صلى الله عليـه وسـلم)) هەنـدێك (لە قسەکان) ی باسکرد و بیّ دەنگ بوو لە هەندێکی تری ئینجا کـە پـێ ی وت (ژنەکـەی) وتی: کێ ئەمەی پێ گەیانـدی فـەرمووی خـوای زانـای ئاگـادار پـێ ی گەیانـدم.(پوختـەی تەفسیر)

–باسی ئەوە دەکات ئەگەر پێغەمبەر خێزانەکانی تـەلاق بـدات ، خـوا وەك پیشـگیری بـۆ پێغەمبەر دەفەرموێت خوا خێزانی چاکتری پێ دەبەخشێ

(عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ مُسْلِمَٰتٍ مُّؤْمِنَٰتٍ قَٰنِتَٰتٍ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٍ سَٰٓئِحَٰتٍ ثَيِّبَٰتٍ وَأَبْكَارًا ٥ ) واتە : دڵنیابن ئەگەر ئێوە تـەڵاق بـدات پـەروەردگاری لـەباتی ئێـوە ژنـانێکی باشـتر لـە ئێـوەی دەداتـێ موسـوڵمانانی، بڕوادارانـی، نزاکـارانی، تەوبەکارانی، خواپەرستانی، ڕۆژووگران لە بێوەژنان و کیژان.

–لە کۆتایدا خوا دوو نموونە باس دەکات : یەکەم نموونەی ئافرەتێکی (کافر) کە خێزانی پیاوێکی صالحی ئیمانداره ، دووەم : نموونەی ئافرەتێکی ئیماندار کـە خێزانـی پیـاوێکی کافرو سەرکەشە ، ئەوەش بـۆ ئەوەیـە پێمـان بڵـێ کـەس فریـای کـەس ناکـەوێ لـە ڕۆژی قیامەت تەنها ئیمان و کردەوەی چاك نەبێ .

نموونە یەکـەم : (ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ ۖ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ١٠ ) واتـە: خـوا بـۆ بـێ بـاوەڕان ژنـی نـووح و ژنـی لـووکی بەنموونە هێنایەوە کە لەژێر (نیکاحی) دوو بەندەدا بوون لە بەندە چـاکەکانی ئێمـە ئینجـا خیانەتیان لەگەڵ کردن کەچی (مێردەکانیان) نەیانتوانی شتێك لە سزای خوایـان لـێ دوور بخەنەوە وە پێیان وترا کە بڕۆنە ناو ئاگرەوە لەگەڵ ئەوانەی کە دەڕۆنە ناویەوە.

نموونە دووەم :

(وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِي عِندَكَ بَيْتًا فِي ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِي مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ١١ ) واته : هەروا خوا نموونەیەکی تری هێنایەوە بۆ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە (بە) ژنی فیرعەون کاتێك کە وتی پەروەردگارم بۆم دروست بکە لای خۆت ماڵێك لە بەهەشتدا وە ڕزگارم بکە لە فیرعەون و کردەوەکانی وە ڕزگارم بکە لە گەلی ستەمکاران.(پوختەی تەفسیر)

## تێبینی :ئایا بۆچی ئافرەت داوای ماڵی خۆی دەکات؟

وەلاّم : لەو ئایەتەی سەرەوە وەردەگیرێ کە خێزانی فرعون داوا لە خوا دەکات ماڵێکی بدات لە بەهەشت ، واتە : ئافرەت ئاواتی ماڵ وحاڵی خۆیەتی بۆیە زۆر جاران گرفتی گەورە دروست دەبێ ناهێڵن ماڵ وحاڵی خۆی هەبێ لە ئەنجامدا سەردەکێشێ بۆ تەلاق و کێشە

–هەر لەم سوڕەتە ئاگادارمان دەکاتەوە ، کە خۆمان وخێزان و منداڵەکانمان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزین ، وەك فەرمویەتی

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ٦ )

واتە : ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە خۆتان و کەس و کارتان بپارێزن لە ئاگرێك کە سووتەمەنی یەکەی ئادەمی و بەردە سەرپەرشتی ئەو (ئاگری دۆزەخەن) چەند فریشتەیەکی دڵ ڕەقی توند و تیژی وا کە نافەرمانی خوا ناکەن لەوەی کە فەرمانیان پێ بدات وە چ فەرمانێکیان پێ بدرێ دەیکەن. (پوختەی تەفسیر)

تێبینی: ئاگر هەر ئاگری دۆزەخ نیە بەس، بەڵکو پەروەردەکردنی خێزان بە نادروستی ئاگرە، منداڵ بونە شەقاوە و چەقو کێش ئاگرە، دوکان دزین وبرین ئاگرە، خیانەتی زەوجی ئاگرە........)

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١-٢) سورەتی (التحريم)

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١ قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡ ۚ وَٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡ ۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ٢)

واتە : ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆچی شتێك لە خۆت حەرام دەكەیت كە خوا بۆی حەڵاڵ كردوویت تۆ ڕەزامەندی ژنەكانت دەوێ لە كاتێكدا خوا لێخۆشبووی میهرەبانە (١) بێگومان خوا دایناوە بۆتان هەڵوەشاندنەوەی سوێندەكانتان خوا كارساز و دۆستی ئێوەیە وە ئەو زانای كاردروستە (٢)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عن عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَمْكُثُ عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ وَيَشْرَبُ عِنْدَهَا عَسَلًا فَتَوَاصَيْتُ أَنَا وَحَفْصَةُ أَنَّ أَيَّتَنَا دَخَلَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلْتَقُلْ إِنِّي أَجِدُ مِنْكَ رِيحَ مَغَافِيرَ أَكَلْتَ مَغَافِيرَ فَدَخَلَ عَلَى إِحْدَاهُمَا فَقَالَتْ لَهُ ذَلِكَ فَقَالَ لَا بَلْ شَرِبْتُ عَسَلًا عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ وَلَنْ أَعُودَ لَهُ فَنَزَلَتْ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ إِلَى إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ لِعَائِشَةَ وَحَفْصَةَ وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ لِقَوْلِهِ بَلْ شَرِبْتُ عَسَلًا) متفق عليه

واتە: لە عائیشەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر لەلای (زینب كچی جەحش) دەمایەوە وشەربەتی هەنگوێنی دەخواردەوە ، دەڵێ من و حەفصە ریككەوتین لە نێوان خۆمان ، گوتمان ئەگەر پێغەمبەر هاتە لامان پێی بڵێین بۆنی مەغافیرت لێ دێ، و خواردۆتەوە ، جا كە چوو لای یەكێكیان گوتیە پێغەمبەر بۆنی مەغاقیرەت لێ دێ ، فەرمووی : نەخێر شەربەتی هەنگوێنم خواردۆتەوە لەلای (زینب) جاریكی دیكە ناخۆمەوە ، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندو فەرمووی : ئەی پێغەمبەر بۆچی شتێك لە خۆت حەرام دەكەی كە خوا بۆی حەلاَل كردوی ، تاكو دەگاتە (إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ) واتە: عائیشەو حەفصحە ، پێغەمبەر

قسەکەی بە نهێنی لـەلای هەنـدێ خێزانـەکانی کـرد ، واتـە : فـەرمووی (بـەڵکو شـەربەتی هەنگوینم خواردۆتەوە.

## بەم گێرانەوەش هاتووە :

٢-(عن أَنَسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَتْ لَهُ أَمَةٌ يَطَؤُهَا فَلَمْ تَزَلْ بِهِ عَائِشَةُ وَحَفْصَةُ حَتَّى حَرَّمَهَا عَلَى نَفْسِهِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ إِلَى آخِرِ الْآيَةِ )رواه النسائي و الحاكم قال الالباني صحيح الاسناد

واتە: لە ئەنەسەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبـەر جاریـەکی هـەبوو سـەرجێی لەگـەڵ دەکـرد ، عائیشـەو حەفصـحە زۆر دەیـانگوت تـۆ دەچـیە لای ئـەو جاریـە ، پێغەمبـەریش تۆڕەبـوو فەرمووی : ئەم جاریە لەمن حەرام بێ ، جا خوا ئـەم ئایەتـەی دابەزاندوفـەرمووی (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ)

## زانایان دەڵێن: ئەم ئایەتە بۆ هەردوو روداوەکە دابەزیوە ( هەنگوین و ماریە ):

(وأخرج الهيثم بن كليب في مسنده كما في تفسير ابن كثير عن ابن عمر قال النبي صلى الله عليه وعلى آله وسلم لحفصة (لا تخبري أحدا، وإن أم إبراهيم علي حرام) فقالت: أتحرم ما أحل الله لك. قال: (فوالله لا أقربها). قال فلم يقربها حتى أخبرت عائشة، قال فأنزل الله تعالى: (قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ) قال الحافظ ابن كثير بعد ذكره بسنده: وهذا إسناد صحيح ولم يخرجه أحد من أصحاب الكتب الستة وقد اختاره الحافظ الضياء المقدسي في كتابه المستخرج.

قال الحافظ في الفتح يحتمل أن تكون الآية نزلت في السببين معا أي بسبب تحريمه العسل وتحريمه جاريته. وقال الشوكاني في تفسيره فهذا سببان صحيحان لنزول الآية، والجمع

ممكن بوقوع القصتين: قصة العسل وقصة مارية، وأن القرآن نزل فيهما جميعا وفي كل واحد منهما أنه أسر الحديث إلى بعض أزواجه) الصحيح المسند من اسباب النزول

## سوێندەکانتان بشکێنن ئەگەر خێرە لەوەدابوو:

١-(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا فِي قَوْلِهِ: (قَدْ فَرَضَ اللهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ) (التحريم: ٢) أَمَرَ اللهُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالْمُؤْمِنِينَ إِذَا حَرَّمُوا شَيْئًا مِمَّا أَحَلَّ اللهُ أَنْ يُكَفِّرُوا عَنْ أَيْمَانِهِمْ بِإِطْعَامِ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ أَوْ كِسْوَتِهِمْ أَوْ تَحْرِيرِ رَقَبَةٍ وَلَيْسَ يَدْخُلُ فِي ذَلِكَ طَلَاقٌ) السنن الكبرى للبيهقي

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە خوا لە خۆی وبابی رازی بێ دەڵێ: فەرمایشتەی خوا (قَدْ فَرَضَ اللهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ) خوا فەرمانی کرد بە پێغەمبەر و ئیمانداران ئەگەر شتێکیان لە خۆیان حەرام کرد کە خوا حەلالی کردوە ، ئەوە با کەفارەت بدەن ، دە هەژار نان بدەن یان جل وبەرگیان بۆ بکەن، بەلاَم ئەو کەفارەتە بۆ تەلاق نابێ .

٢-(وَعَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَنِّي وَاللَّهِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ لَا أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا إِلَّا كَفَّرْتُ عَنْ يَمِينِي وَأَتَيْتُ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : جاری وایە سوێند دەخۆم ، بەلاَم دەبینم خێر لەوە دایە سوێندەکەم بشکێنم ، دەیشکێنم و کەفارەت دەدەم.

## ئەم ئایەتە باسی کەفارەتی سوێندەکات:

(لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ ۖ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ۖ

فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍۚ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيۡمَٰنِكُمۡ إِذَا حَلَفۡتُمۡۚ وَٱحۡفَظُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٨٩ المائده

واته : خوا لێتا ن ناگرێ ئەو سوێندانەتان كە نیـازی دڵـی لـە گەڵـدا نـی یـە بـەڵام لـێ تـان ئەگرێ (بە گوناهبارتان دادەنێ) بە (شكاندنی) سوێندێ كە بە نیازی دڵ داتـان بەسـتبێت جا كەفارەتی (سڕینەوەی شكاندنی) ئەو سوێندانە خۆراك دانی دە هەژارە لە خۆراكێ مام ناوەندی كە دەرخواردی منداڵ و خێزانی خۆتـانی دەدەن یـا پۆشـاكی دە هـەژار یـا ئـازاد كردنی بەندەیەك جا ئەوەی دەستی نەكەوت هیچ كام لەمانە ئەوە سێ ڕۆژ بـە ڕۆژوو بێـت ئەوە(ی باسكرا) كەفارەتی سـوێندەكانتانە كـاتێ كـە سـوێندتان خـوارد(و سـوێندەكەتان شكاند) وە سوێندەكانتان بپارێزن بەو جۆرە خوا ئایەتەكانی خۆی بە ڕوونی باسی ئەكات بۆتان بۆ ئەوەی سوپاسی بكەن.

## ٢-هۆی دابەزینی ئـایەتـی (٥) سورەتـی (التحریم)

(عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبۡدِلَهُۥٓ أَزۡوَٰجًا خَيۡرًا مِّنكُنَّ مُسۡلِمَٰتٖ مُّؤۡمِنَٰتٖ قَٰنِتَٰتٖ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٖ سَٰٓئِحَٰتٖ ثَيِّبَٰتٖ وَأَبۡكَارٗا ٥ )

واته : دڵنیابن ئەگـەر ئێـوە تـەڵاق بـدات پـەروەردگاری لـەباتی ئێـوە ژنـانێكی باشـتر لـە ئێـوەی دەداتـێ موسـوڵمانانی، بڕوادارانـی، نزاكـارانی، تەوبـەكارانی، خواپەرسـتانی، ڕۆژووگران لە بێوەژنان و كیژان.(پوختەی تەفیسر)

وە لە ئایەتی (٤) جوان ڕوونی دەكاتەوە:

(إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوۡلَىٰهُ وَجِبۡرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ٤ )

واتە: ژنان نابێ شـووەكانیان تەنگەتاو بكـەن: پـاش ئەوەكـە پێغەمبـەر ئـازارو بێزارێكـی زۆردرا لـە لایـەن هاوسـەرەكانیەوە، خـوای میهرەبـان ڕێگـای تەوبـەو پەشـیمانی دەخاتـە

بەردەم خێزانەکانی و پێیان دەفەرموێ: (إن تتوبا إلى الله) ئەگەر ئێوە (ئەی حەفصەو، عائیشە!) تەوبە بکەن لای خواو لەو هەڵس و کەوتەیە پەشیمان ببنەوە، دیارە کارێکی باشتان ئەنجامداوەو، خۆتان لە تووڕەیی خوا لاداوە چونکە بەراستی بەرامبەر بەدڵسۆزی بۆ پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) دڵتان لە هەق وە ئەگەر پشتگیری یەکتر بکەن لە دژی پێغەمبەر، چاك بزانن کە هیچتان پێناکرێ و دەرەقەتی نایەن فإن الله هو مولاه ئەو بەراستی خوا خۆی پشتیوانیەتی وجبريل وصالح المؤمنين هەروا جبريل و بڕوادارە چاکەکانیش، وەکو (ئەبوبەکرو عومەر) و فریشتەکانیش – سەرەڕای خواو جوبرەئیل و ئەبوبەکرو عومەر– هەر هاوکار و پشتیوانن بۆی (ڕامان)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(عَنْ أَنَسٍ قَالَ قَالَ عُمَرُ وَافَقْتُ اللَّهَ فِي ثَلَاثٍ أَوْ وَافَقَنِي رَبِّي فِي ثَلَاثٍ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ اتَّخَذْتَ مَقَامَ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى وَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ يَدْخُلُ عَلَيْكَ الْبَرُّ وَالْفَاجِرُ فَلَوْ أَمَرْتَ أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ بِالْحِجَابِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ آيَةَ الْحِجَابِ قَالَ وَبَلَغَنِي مُعَاتَبَةُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْضَ نِسَائِهِ فَدَخَلْتُ عَلَيْهِنَّ قُلْتُ إِنْ انْتَهَيْتُنَّ أَوْ لَيُبَدِّلَنَّ اللَّهُ رَسُولَهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَيْرًا مِنْكُنَّ حَتَّى أَتَيْتُ إِحْدَى نِسَائِهِ قَالَتْ يَا عُمَرُ أَمَا فِي رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا يَعِظُ نِسَاءَهُ حَتَّى تَعِظَهُنَّ أَنْتَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبَدِّلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ مُسْلِمَاتٍ الْآيَةَ) رواه البخاري

واتە:لە ئەنەسەوە هاتووە دەڵێ: عومەر خوا لێ ڕازی بێ دەڵێ: لە سێ شوێنان قسەم لەگەڵ قسەی خوا تێك دەکاتەوە (واتە : لەسەر قسەی من قورئان دابەزی) گوتم ئەی نێرراوی خوا خۆزگە مەقامی ئیبراهیمان دەکرد نوێژگا ، خوا ئایەتی دابەزاند وە گوتم : ئەی نێرراوی خوا چاك وخراپ دێتە ماڵت خۆزگە پەردەت دادەنا لە نێوان میوان و خێزانەکانت ، خوا ئایەتی حیجابی دابەزاند، وە بیستم خێزانەکانی پێغەمبەر نارەزای

دەدەبرن بەرامبەر پێغەمبەر ، منیش چووم پێ گوتن ئەگەر ئێوە پێغەمبەر ئازاربدەن خوا ئافرەتانی لە ئێوە چاکتر بە قیسمەت پێغەمبەر دەکات ، خوا ئـەم ئایەتـەی (عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبَدِّلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ مُسْلِمَاتٍ )

تێبینی: ئەم دوو ئافرەتە (حفحەو عائیشە) بوون

********************************

# وتاری ژماره (١٢١) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سوڕەتی (القلم)

ئەم سوڕەتە لە ریزبەندا ژمارە (٦٨)ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (٥٢)ئایەتە.

-ئەم سوڕەتە لە شاری (مەککە) دابەزیوە ، باسی بنچینەکانی ئیمان دەکات .

-ئەم سوڕەتە باسی (٣) بابەتی گرنگ دەکات : ١-پەیامی پێغەمبەر وگومانی کافرانی قوریش دەربارەی پێغەمبەر

٢-چیرۆکی خاوەن باخەکە ، کە چۆن کوفریان کرد بە نیعمەتی خوا ، و سەرنجام باخەکەیان نەماوسوتا

٣-باسی ڕۆژی قیامەت و ناخۆشیەکان و پاداشتی چاکەکاران و سزای خراپەکاران دەکات .

-لەسەرەتادا خوا باسی بەرزی پلەوگەورەیی پێغەمبەر دەکات ، و رەتی تۆمەتەکان دەکاتەوە کە ئاراستەی پێغەمبەر دەکران وەك شێت و کاهین و ساحیر.

وەك خوا دەفەرموێت (نٓ ۚ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ١ مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ٢ وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ ٣ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ٤ ) القلم

واتە : بە (نوون) دەخوێنرێتەوە، سوێند بە پێنووس و بەو دێڕانەی دەینوسن.(١) تۆ لە سایەیی بەخششی خواوە شێت نیت.(٢) وە بێگومان پاداشتی نەبڕانەوە هەیە بۆ تۆ.(٣) وە بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و خویەکی ئێجگار بەرزو گەورەیت.(٤)

-باسی موقیفی تاونباران دەکات بەرامبەر بانگەوازی پێغەمبەر ، وەچۆن سزایان بۆ ئامادەکراوە

﴿فَلَا تُطِعِ ٱلْمُكَذِّبِينَ ٨ وَدُّواْ لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ٩ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ١٠ هَمَّازٍ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٍ ١١ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ١٢ عُتُلٍّۭ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ١٣ ﴾

واته : فەرمان بەری ئەوانە مەكە كە قسەكانت بە درۆ دەزانن. (٨) حەزیان دەكرد كە تۆ نەرمی نیشان بدەیت ئەوسا ئەوانیش نەرمیی (بەرانبەرت) دەنوێنن. (٩) فەرمانبەریی مەكە بۆ هیچ سوێند خۆرێكی پەست و ڕیسوای درۆزن. (١٠) پیتك گری ئامشۆكەر بۆ قسە هێنان و بردن. (١١) زۆر بەرگری كەر لە چاكە ستەمكاری گوناهكار. (١٢) دڵ ڕەقی كەللە شەق دوای ئەوە زۆڵ. (١٣)

–باسی كافران قوریش دەكات كە ڕێزی نیعمەتی پێغەمبەر ناگرن ، وەك چۆن خاوەن باخەكە ڕێزی نیعمەتی باخەكەیان نەگرت ماف هەژارانیان نەدا زەرەریان كرد ، وەك دەفەرموێت

﴿إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُواْ لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ ١٧ وَلَا يَسْتَثْنُونَ ١٨ فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَآئِمُونَ ١٩ فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ ٢٠ فَتَنَادَوْاْ مُصْبِحِينَ ٢١ أَنِ ٱغْدُواْ عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰرِمِينَ ٢٢ فَٱنطَلَقُواْ وَهُمْ يَتَخَٰفَتُونَ ٢٣ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا ٱلْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ ٢٤ وَغَدَوْاْ عَلَىٰ حَرْدٍ قَٰدِرِينَ ٢٥ فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوٓاْ إِنَّا لَضَآلُّونَ ٢٦ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ٢٧ قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ ٢٨ قَالُواْ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ٢٩ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَلَٰوَمُونَ ٣٠ قَالُواْ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ ٣١ ﴾ واتە: ئێمە تاقیمان كردنەوە هەروەك لەمەوپێش خاوەنانی ئەو باخەمان تاقی كردەوە كە (لە شەوا) سوێندیان خوارد كە لەدەمی بەیانا (بەرەكەی) بڕنن تا هەژاران نەزانن. (١٧) هیچی (بۆ هەژاران) لێ دەرنەكەن. (١٨) ئینجا بەڵایەك لە لایەن پەروەردگارتەوە سوڕایەوە بە سەر باخەكەدا لە كاتێكدا كە ئەوان خەوتبوون. (١٩) ئەوسا وەك باخێكی ڕنراوی لێ هات. (٢٠) لە شەبەقدا بانگی یەكتری یان كرد. (٢١) كە هەستن بچن بۆ سەر باخەكەتان ئەگەر ئەتانەوێ بیڕنن. (٢٢) ئینجا كەوتنە ڕێ وە ئەوان بەچرپە بە یەكتریان ئەووت. (٢٣) ئەمڕۆ هیچ هەژارێك نەیێ بەسەرتاندا لە ناو باخەكەدا. (٢٤) دەمەو بەیان ڕۆین

لایان وابوو كه دهتوانن بیٚ بهشیان بكهن. (٢٥) كه باخهكهیان دیی (به سوتاوی) وتیان ئێمه ڕیٚ مان ون كردووه ئهمه باخهكهی ئێمه نی یه. (٢٦) نهو بهڵكو بهش بڕاو كراوین. (٢٧) برا ناوهنجی یهكهیان (له ژیریدا) وتی مهگهر پێم نهووتن؟ بۆ چ یادو سوپاسی خوا ناكهن. (٢٨) ههموو وتیان: پاك و بێگهردی بۆ پهروهردگارمانه (ستهم لهكهس ناكات) بێگومان ئێمه خۆمان ستهم كارین. (٢٩) ئینجا ڕوویان كرده یهكتری به سهرزهنشت كردن. (٣٠) وتیان: ئهی وای بۆ خۆمان بهڕاستی له خوا یاخی بووین. (٣١)

–باسی ئهوه دهكات چۆن (موسڵمان و تاوانبار) وهك یهك حیساب دهكریٚ (واته: شتی وا نابیٚ)

(أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ٣٥ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ٣٦ ) واته چۆن ئێمه موسولْمان و بهدكاران وهك یهك لیٚ دهكهین؟.ئهوه چیتانه چۆن بڕیارێك دهدهن.

–باسی ڕۆژی قیامهت دهكات و داوا له تاوانباران دهكرێت سوجده ببهن بهڵام ناتوانن ، وهك دهفهرموێت (يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ٤٢ )ی

واته: له ڕۆژێكدا كه داوێنی لیٚ ئهكریٚ بهلادا وه (به تهوسهوه) بانگ دهكرێن بۆ نوێژكردن و سوژده بردن و ناتوانن بی بهن.

–له كۆتایدا ئهم سوڕهته داوا له پێغهمبهر دهكات ئارام بگریٚ بهرامبهر قهومهكهی ، وهكو (یونس) پێغهمبهر نهكهی ، پێش ئهوهی موڵهت له خوا وهربگریٚ ، قهومهكهی بهجیٚ هێشت.

(فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلْحُوتِ إِذْ نَادَىٰ وَهُوَ مَكْظُومٌ ٤٨ ) واته : ئهی موحهممهد(صلى الله عليه وسلم) دان به خۆتا بگره و چاوهڕوانیی فهرمانی خوات بكه وهك هاوڕیٚ ی نههەنگهكه مهبه (كه یونس پێغهمبهره(عليه السلام)) كاتێك كه بانگی (خوای) كرد وه ئهو پیشی خواردبۆوه له بیٚ بڕوایی گهلهكهی.

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١٠-١٦) سورەتی (القلم)

(وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ١٠ هَمَّازٍ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٍ ١١ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ١٢ عُتُلٍّۭ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ١٣ أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ ١٤ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ١٥ سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلْخُرْطُومِ ١٦)

واتە : و گوێرایەڵی لە هیچ سوێند خۆرێکی درۆزن و بێ باوەر مەکە (١٠)زۆر پلارگری بشێون و تێکدەر بە قسە هێنان و قسە بردن (لەنێوان مەردومدا) پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ئەفەرموێ: (لا يدخل الجنه قتات ) ئەحمەد، ترمزی، نەسائی، ئەبووداود. لەڕیوایەتێکی تردا (لا يدخل الجنه نمام ).پێشەوا ئەحمەد. واتە: قسە هێن و، قسە بەر ناچێتە بەهەشت. (١١)رژدو چرووك بۆ بەختكردنی ماڵ و سامان لە رێی خوا دەست درێژكاری گوناهبار، هەرچی بێتە بەر دەستی سڵی لێ ناكاتەوە (١٢)بەدخوو، لە دوای ئەوەش پیس و نارەسەن و باوك نادیار. لە فەرموودەدا هاتووە: (ألا أنبئكم بأهل النار؟ كل عتل جواظ مستكبر ). متفق عليه . خاوەنی (في ظلال القرآن) دەڵێت: (زنيم) بەكەسێك دەوترێت كە نەژادی گومان لێكراوبێت، وە یامرۆیەكی پیس و خراپكارو، شەڕ فرۆش و گێرەشێوێن بێت. جا پێ دەچێ بۆ پیاوێكی وەك (وەلید) ئەم مانای دواییە: (دڵڕەق و كەللە ڕەق و شەڕ فرۆش) دەس بدا، خوا خۆیشی چاكتر ئەزانێ. راڤەكەرانی قورئان دەڵێن: ئەمە ببێ و نەبێ تەنها (وەلیدی كوڕی موغیرە)یە، چونكە باوكی ئەو نادیار بوو، وە لەپاش هەژدە ساڵ لەتەمەنی موغیرە، ئەوجا (وەلید) كردوویەتی بەكوڕی خۆی. واتە تۆ ئەی پێغەمبەر! (صلى الله عليه وسلم) هەرگیز بەگوێی نامەردێكی ئاوا نەكەیت (١٣)لە بەرئەوەی كە داراو كوڕدار بوو (١٤)كاتێ كە ئایەتەكانی ئێمەی بەسەرا بخوێنرێنەوە بێباكانە ئەڵێ: ئەمە ئەفسانەو قسەی باتڵ و پوچی پێشینانە. ! لەباتی ئەوە كە ،سوپاسگوزار بێت لەپاش ئەو هەموو سامان و كوڕانەوە، كەچی ئەوەندە نەفامە بەگژ تۆدا دێ.. ! ! (١٥)بە تەئكید بەم نزیكانە لووتی نیشان دەكەین و پۆزەی ئەشكێنین. (خرطوم) لە بنەڕەتا بەلووتی بەرازی كەژیی و و شكانی دەڵێن، چونكە (وەلید) پیاوێكی

لووت بەرزو دەعیە چی بوو، بۆیە خواش بەوشێوەیە ناوی دەباو سەر لووتی ڕەش دەکات، دیارە مەبەست ئەوەیە: کە دەبێ ریسوای بکەین. بەڵێ.. پاش دە دوازدە ساڵ، لە (بەدر)دا مافی خۆی وەرگرت و پۆزەی دیاریکرا، تا مرد پێوەی دیار بوو. (١٦) (تەفسیری ڕامان)

(عن ابن عباس قال نزلت على النبي صلى الله عليه وسلم ولا تطع كل حلاف مهين هماز مشاء بنميم فلم نعرفه حتى نزل عليه بعد ذلك زنيم فعرفناه له زنمة كزنمة الشاة) لباب المنقول للسيوطي

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: دابەزی بۆ سەر پێغەمبەر (ولا تطع كل حلاف مهين هماز مشاء بنميم) نەمان دەزانی تاکو ئەم ئایەتە دابەزی نیشانکرا وەك نیشان کردنی ئاژەڵ

(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عُتُلٍّ بَعْدَ ذَلِكَ زَنِيمٍ قَالَ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ لَهُ زَنَمَةٌ مِثْلُ زَنَمَةِ الشَّاةِ ) رواه البخاري

واتە:لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە خوا لە خۆی وبابی رازی بێ دەڵێ: (عُتُلٍّ بَعْدَ ذَلِكَ زَنِيمٍ) دەڵێ پیاوێکی قوریش بوو نیشانکرا وەك نیشانکردنی ئاژەڵ .( ئەڵێن ئەو پیاوەش (ولیدی کوری موغیرە بوو) وەك لەم دەقەی خوارەوە هاتووە.

رجل من قريش: هو الوليد بن المغيرة، وقيل غيره. له زنمة: في عنقه. مثل زنمة الشاة: وهي الهنة – أي القطعة – التي تتعلق بعنقها، قال ابن عباس: وما كنا نعرف المشار إليه حتى نزلت فعرفناه، وقيل معناه دعي في قريش، لأن الوليد ادعاه أبوه بعد/ ثماني عشرة سنة، قال ابن عباس: ( لا نعلم أن الله وصف أحدا بما وصفه به من العيوب، فألحق به عارا لايفارقه أبدا) الفجر الساطع على الصحيح الجامع

(ڕاڤەکەرانی قورئان دەڵێن: ئەمە ببێ و نەبێ تەنها (وەلیدی کوڕی موغیرە)یە، چونکە باوکی ئەو نادیار بوو، وە لەپاش هەژدە ساڵ لەتەمەنی موغیرە، ئەوجا (وەلید)

کردوویەتی بەکوڕی خۆی. واتە تۆ ئەی پێغەمبەر! (صلى الله عليه وسلم) هەرگیز بەگوێی نامەردێکی ئاوا نەکەیت) ڕامان

## چەند فەرموودەیەك لەسەر خۆبەزلزانین (تكبر):

(أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِأَهْلِ الْجَنَّةِ؟ كُلُّ ضَعِيفٍ مُتَضَعِّفٍ، أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِأَهْلِ النَّارِ؟ كُلُّ عُتُلٍّ جَوَّاظٍ مُسْتَكْبِرٍ) رواه ابن ماجه وقال صحيح

(أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ الْجَنَّةِ كُلُّ ضَعِيفٍ مُتَضَعِّفٍ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لَأَبَرَّهُ أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ النَّارِ كُلُّ جَوَّاظٍ زَنِيمٍ مُتَكَبِّرٍ) رواه مسلم

(أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ الْجَنَّةِ كُلُّ ضَعِيفٍ مُتَضَعِّفٍ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لَأَبَرَّهُ أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ النَّارِ كُلُّ عُتُلٍّ جَوَّاظٍ مُسْتَكْبِرٍ) رواه البخاري

(شرح على صحيح مسلم (كل ضعيف متضعف) ضبطوا قوله متضعف بفتح العين وكسرها المشهور الفتح ولم يذكر الأكثرون غيره ومعنا

يستضعفه الناس ويحتقرونه ويتجبرون عليه لضعف حاله في الدنيا يقال تضعفه واستضعفه وأما رواية الكسر فمعناها متواضع متذلل خامل واضع من نفسه قال القاضي وقد يكون الضعف هنا رقة القلوب ولينها وإخباتها للإيمان والمراد أن أغلب أهل الجنة هؤلاء كما أن معظم أهل النار القسم الآخر وليس المراد الاستيعاب في الطرفين (لو أقسم على الله لأبره) معناه لو حلف يمينا طمعا في كرم الله تعالى بإبراره لأبره وقيل لو دعاه لأجابه يقال أبررت قسمه وبررته والأول هو المشهور (كل عتل جواظ مستكبر) العتل الجافي الشديد الخصومة بالباطل وقيل الجافي الفظ الغليظ وأما الجواظ فهو الجموع المنوع وقيل الكثير اللحم المختال في مشيته وقيل القصير البطين وقيل الفاخر وأما المستكبر فهو صاحب الكبر وهو بطر الحق وغمط الناس) شرح مسلم

((متضعف) بكسر العين متواضع لين هين وروي بفتح العين أي يستضعفه الناس ويحتقرونه. (أقسم) حلف يمينا طمعا في كرم الله تعالى. (لأبره) لحقق له ما أقسم عليه ولأجاب طلبه ودعاءه. (جواظ) شديد الصوت في الشر متكبر مختال في مشيته)(شرح البخاري

**خۆبەزلزان فێرى زانست نابێ:**

وقال مجاهد : (إِنَّ هَذَا الْعِلْمَ لَا يَتَعَلَّمُهُ مُسْتَحٍ وَلَا مُتَكَبِّرٌ)حلية الاليا ء

قال ابو العالية (لَا يَتَعَلَّمُ مُسْتَحٍ وَلَا مُتَكَبِّرٌ) حيلة الاولياء

-( عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ( ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ، وَلَا يُزَكِّيهِمْ: شَيْخٌ يَزْنِي ، وَمَلِكٌ كَذَّابٌ ، وَعَائِلٌ مُسْتَكْبِرٌ ) رَوَاهُ مُسْلِمٌ

*************************

# وتاری ژماره (١٢٢) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (المعارج)

ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژمارە (٧٠)ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (٤٤) ئایەتە.

–ئەم سورەتە لە شاری (مەککە) دابەزیوە ، باسی بنچینەکانی ئیمان دەکات

–ئەم سورەتە لە سەرەتادا باسی سەرپێچی خەڵکی مەککە دەکات ، کە ئینکاری ڕۆژی قیامەت دەکەن ، بەتایبەتی (النضر کوڕی حارس) کە داوای دەکرد عەزاب بێ بۆ سەریان لە دونیا پێش قیامەت ، خوا لەم بارەوە فەرمووی:

(سَأَلَ سَآئِلُۢ بِعَذَابٖ وَاقِعٖ ١ لِّلۡكَٰفِرِينَ لَيۡسَ لَهُۥ دَافِعٞ ٢ مِّنَ ٱللَّهِ ذِي ٱلۡمَعَارِجِ ٣....)

واتە: داواکارێك داوای سزایەکی (خوایی) کرد کە (ئەو سزایە) هەر ڕوو دەدات. (١) بۆ بێ بڕوایان نی یە هیچ پاڵ پێوەنەرێك کە بیان پارێزێت. (٢) لە (سزای) خوای خاوەن پلەو پایەی زۆر بەرز. (٣)

–باسی ئەوە دەکات ئەوان دەڵێن قیامەت دوورە بەلآم لای ئێمە نزیکە

(فَٱصۡبِرۡ صَبۡرٗا جَمِيلًا ٥ إِنَّهُمۡ يَرَوۡنَهُۥ بَعِيدٗا ٦ وَنَرَىٰهُ قَرِيبٗا ٧ )

واتە: کەوا بوو خۆت ڕابگرە (ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بە خۆڕاگرتنێکی چاك و جوان. (٥) بەڕاستی ئەو بێ بڕوایانە ئەو ڕۆژە بە دوور دەبینن. (٦) ئێمەش زۆر بە نزیکی دەبینین. (٧)

–باسی بارودۆخی بێ باوەڕان دەکات لە ڕۆژی قیامەت

(يَوۡمَ تَكُونُ ٱلسَّمَآءُ كَٱلۡمُهۡلِ ٨ وَتَكُونُ ٱلۡجِبَالُ كَٱلۡعِهۡنِ ٩ وَلَا يَسۡـَٔلُ حَمِيمٌ حَمِيمٗا ١٠ يُبَصَّرُونَهُمۡۚ يَوَدُّ ٱلۡمُجۡرِمُ لَوۡ يَفۡتَدِي مِنۡ عَذَابِ يَوۡمِئِذِۭ بِبَنِيهِ ١١ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَأَخِيهِ ١٢ وَفَصِيلَتِهِ ٱلَّتِي تُـٔۡوِيهِ ١٣ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ثُمَّ يُنجِيهِ ١٤)

واتــه: ئــەو ڕۆژەی كــە ئاسمــان وەك مســی تــواوە (یــان خڵتــەی زەیــتی) لــێ دێ. (٨) كەژەكانیش وەك خوری شی كراوەیان لێ دێ. (٩) وە هیچ كەسێك ناپرسێتەوە لە هیچ كەسێكی خۆشەویستی خۆی. (١٠)كە نیشانی یەكتری دەدرێن تاوانبار ئاوات دەخوازێ كە بیدایە لەباتی ڕزگار بوونی خۆی لە سزای ئەو ڕۆژە بە كوڕانیەوە. (١١) بەژنی یەوە بە برایەوە. (١٢) بە هۆزەكەشیەوە كە پەنایان دەدا. (١٣) وە بە هەرچی كەس لەسەر زەوی یە (هەمووی بدایە و) لەپاشان هەر خۆی ڕزگاری ببێ. (١٤)

–باسی سروشتی ئینسان دەكات كە لەكاتی خۆشی ناخۆشی چۆنە؟

(إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ١٩ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعٗا ٢٠ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلۡخَيۡرُ مَنُوعًا ٢١

واتە : بێگومان ئادەمی دروست كراوە بە چاو چنۆكێكی تەنگەتیلكە. (١٩) كە ناخۆشی یەكی تووش ببێ هاوارو ناڵە دەست پێ دەكات. (٢٠) كە سامانیش ڕووی تێ بكات ئەی گرێتەوە لە خەڵكی. (٢١) مەگەر نوێژكەران.

–باسی سیفاتی ئیماندارān دەكات و جیایان دەكاتەوە لە سیفەتی شپێرەزەیی و تەنگەتاوی

(إِلَّا ٱلۡمُصَلِّينَ ٢٢ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَاتِهِمۡ دَآئِمُونَ ٢٣ وَٱلَّذِينَ فِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ مَّعۡلُومٞ ٢٤ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ ٢٥)

واتە : مەگەر نوێژكەران. (٢٢) ئەوانە كە بەردەوامن لەسەر نوێژەكانیان. (٢٣) ئەوانەی كە بەشێكی دیاری كراو لە دارایی یاندا هەیە. (٢٤) بۆ هەژاری داواكەر و بێ نەوای داوانەكەر. (٢٥)

-له کۆتایی ئەم سورەتدا خوا سوێند دەخوات کە ڕۆژی قیامەت دێت و هیچ گومانی تێدا نیە

﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِرَبِّ ٱلۡمَشَٰرِقِ وَٱلۡمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ ٤٠ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَمَا نَحۡنُ بِمَسۡبُوقِينَ ٤١ فَذَرۡهُمۡ يَخُوضُواْ وَيَلۡعَبُواْ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي يُوعَدُونَ ٤٢﴾

واتە: جا سوێند بە پەروەردگاری ڕۆژهەڵاتەکان و ڕۆژئاواکان بێگومان ئێمە بە دەسەڵاتین. (٤٠) لە سەر ئەوەی کە بیانگۆڕین و باشتر لەوان بهێنن وە کەس لە دەستمان دەرناچێ. (٤١) ئینجا وازیان لێ بێنە، با قسەی هیچ و پووچ و گاڵتەی خۆیان بکەن تا دووچاری ئەو ڕۆژەی خۆیان دەبن کە بەڵێنیان پێ دراوە. (٤٢)

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١-٢) سورەتی (المعارج)

﴿سَأَلَ سَآئِلُۢ بِعَذَابٖ وَاقِعٖ ١ لِّلۡكَٰفِرِينَ لَيۡسَ لَهُۥ دَافِعٞ ٢ مِّنَ ٱللَّهِ ذِي ٱلۡمَعَارِجِ ٣﴾

واتە : خوانەناس بەتالووکەی سزایە، تۆش بە ئارامبە: بسم الله الرحمن الرحيم ، سأل سائل بعژاب واقع پرسیارکەرێك لە بێ باوەڕەکانی مەککە (نەزری کوڕی حارس) داوای سزای کرد بێتە سەریان، خۆ هیچ گومانێك نیە هەر بۆیان دێ و پێش دێت، گەلێ جار بە بانگەوازەکەی پەیامبەرو بە ڕۆژی دوایی گاڵتەی ئەکرد، تەنانەت ئەیوت: ( اللهم إن كان هذا هو الحق فأمطر علينا حجارة من السماء ..). جا بەو بۆنەیەوە - وەك تەبەری دەڵێ- ئەم سوورەتی (معاريج)ـە دابەزی.(١) بۆ بێ بڕوایان نی یە هیچ پاڵ پێوەنەرێك کە بیان پارێزێت.(٢)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( نَزَلَتْ فِي (النَّضْرِ بْنِ الْحَارِثِ) حِينَ قَالَ: (وَإِذْ قَالُوا اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ) (الْأَنْفَالِ:٣٢)

) الْآيَةَ. فَدَعَا عَلَى نَفْسِهِ وَسَأَلَ الْعَذَابَ، فَنَزَلَ بِهِ مَا سَأَلَ يَوْمَ بَدْرٍ فَقُتِلَ صَبْرًا. وَنَزَلَ فِيهِ: سَأَلَ سَائِلٌ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ ... الْآيَةَ.) الواحدي في اسباب النزول

واتە: دابەزیوە دەربارەی (نەزری کوڕی حاریس) کاتێ گوتی: (وَإِذْ قَالُوا اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ) (الْأَنْفَالِ:٣٢) جا دوعای لە خۆ کرد و داوای عەزابی کرد و هاتە سەری ، ڕۆژی بەدر وکوژرا، جا ئەم ئایەتەی بۆ دابەزی (سَأَلَ سَائِلٌ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ)

وفي رواية-( عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، (سَأَلَ سَائِلٌ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ لِلْكَافِرِينَ لَيْسَ لَهُ دَافِعٌ مِنَ اللَّهِ ذِي الْمَعَارِجِ) (المعارج: ٢) ذِي الدَّرَجَاتِ (سَأَلَ سَائِلٌ) (المعارج: ١) قَالَ: هُوَ النَّضْرُ بْنُ الْحَارِثِ بْنِ كَلَدَةَ قَالَ: (اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ، فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِنَ السَّمَاءِ) رواه الحاكم وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ ووافقه الذهبي

## لەم بابەتە ئەم دەرسە فێردەبین بەهیچ شێوەیەك دوعا لە خۆمان نەكەین:

(لَا تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ وَلَا تَدْعُوا عَلَى أَوْلَادِكُمْ وَلَا تَدْعُوا عَلَى خَدَمِكُمْ وَلَا تَدْعُوا عَلَى أَمْوَالِكُمْ لَا تُوَافِقُوا مِنْ اللَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى سَاعَةَ نَيْلٍ فِيهَا عَطَاءٌ فَيَسْتَجِيبَ لَكُمْ) ابو داود قال الالباني صحيح

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : دوعا لە خۆتان مەکەن، دوعا لە منداڵەکانتان مەکەن، دوعا لە خزمتکارەکانتان مەکەن، دوعا لە ماڵ وسامانتان مەکەن، چونکە کاتێك هەیە دوعا بکەن قەبول دەبێ.

# وتاری ژماره (١٢٣) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سوڕەتی (الجن)

ئەم سوڕەتە لە ریزبەندا ژمارە (٧٢)ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (٢٨) ئایەتە

-ئەم سوڕەتە لە شاری (مەککە) دابەزیوە ، تەوەری سەرەکی ئەم سوڕەتە باسی جنۆکە دەکات ، لەگەڵ بابەتی عەقیدە وەك سوڕەتەکانی دیکەی مەککە.

-باسی ئەوە دەکات کاتێ هەندێ جنۆکە گوێیان لە قورئان دەبێ ، یەکسەر ئیمانی پێ دێنن و خەڵکی خۆیان بۆ ئیمان هێنان بەم قورئان بانگ دەکەن ، وەك دەفەرموێت:

(قُلۡ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسۡتَمَعَ نَفَرٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَقَالُوٓاْ إِنَّا سَمِعۡنَا قُرۡءَانًا عَجَبٗا ١ يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلرُّشۡدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦۖ وَلَن نُّشۡرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدٗا ٢ ) واتە: ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بڵێ: نیگام بۆ کرا کە بێگومان چەند کەسێك لە جنۆکە گوێیان گرت (لە قورئان خوێندنەوەم) ئینجا وتیان: بەڕاستی ئێمە قورئانێکی سەر سوڕهێنەرمان بیست.(١) ڕێنموونیی دەکات بۆ ڕێ ی ڕاست ئێمەش باوەڕمان پێ کرد وە هەرگیز کەس ناکەین بە هاوبەشی پەروەردگارمان.(٢)

-باسی ئەوە دەکات کە جنەکان چۆن خوا بە پاك رادەگرن و هاوبەشی بۆ بریار نادەن، وەك فەرموویەتی (وَأَنَّهُۥ تَعَٰلَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا ٱتَّخَذَ صَٰحِبَةٗ وَلَا وَلَدٗا ٣ ) واتە: وە بەڕاستی - بڵندە گەورەیی پەروەردگارمان لە شتی ناشایستە - هیچ هاوسەرو منداڵێکی بۆ خۆی دانەناوە.

-باسی ئەوە دەکات پاش دابەزینی قورئان بۆ پێغەمبەر جنەکان وەك جاران ناتوانن گوێ بۆ هەواڵی ئاسمان بگرن چونکە پڕە لە پاسەوانی مەلائیکەت ، ئەگەر گوێ بگرن

ئاگرباران دەكرێن بۆیە گوتیان ئەبێ شتێك روویدا بێ ، ئەوجا زانیان بەهۆی دابەزینی قورئانە ، ئەم پاسەوانییە، وەك فەرموویەتی (وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ٨ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمْعِ ۖ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ٩ ) واتە: وە بێگومان ئێمە جاران دادەنیشتین لە چەند شوێنێك لە ئاسمان بۆ گوێ گرتن بەڵام هەر كەسێك ئێستا كە بە دواوە گوێ بگرێ تیرێكی ئەستێرە دەبینێ لە بۆسەی دایە.

–لە تەوەریەكی دیكدا باسی دابەشبونی جن دەكات بۆ دوو بەش : ١– كافر ٢–موسڵمان (وَأَنَّا مِنَّا ٱلْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا ٱلْقَٰسِطُونَ ۖ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ تَحَرَّوْا۟ رَشَدًا ١٤ وَأَمَّا ٱلْقَٰسِطُونَ فَكَانُوا۟ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ١٥ ) واتە:وە بێگومان ئێمە هێندێكمان موسوڵمانین و هێندێكمان ستەمكار ئینجا ئەوانەی موسوڵمان بوون ئەوە ئەوانە ڕێ ی ڕاستیان دۆزیوەتەوە.(١٤) بەڵام لە ڕێ ی ڕاست لادەران – ستەم كارەكان – دەبنە سووتەمەنی دۆزەخ.(١٥)

–باسی ئەوە دەكات چۆن جنەكان لەدەوری پێغەمبەر كۆبونەوە گوێیان بۆ گرت.

(وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا۟ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ١٩ قُلْ إِنَّمَآ أَدْعُوا۟ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِهِۦٓ أَحَدًا ٢٠ )

واتە: وە بەندەی خوا (موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) كە هەستا لە خوا بپاڕێتەوە (و بیپەرستێ) (بێ بڕواكانی مەككە) نزیك بوو دابارن بە سەریدا.(١٩) بڵێ: دڵنیا بن من هەر خوای خۆم دەپەرستم وە كەس ناكەم بە هاوبەشی.(٢٠)

–لە كۆتایدا باسی ئەوە دەكات زانینی غەیب تەنها لای خوایە ، هیچ كەس نازانێ ، مەگەر خوا بۆ خۆی هەندێ زانیاری بە پێغەمبەران دەدات .

(عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ٢٦ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا ٢٧)

واتە: هەر خوایە زانا بـە نهێنیـەکان وە کـەس ئاگـادار ناکـات بەسـەر نهـێنی خۆیـدا.(٢٦) مەگەر پێغەمبەرێکی کە لێی ڕازی بێ جا بێگومان خوا دەنێرێ لە بەردەمی و پشتی یـەوە پاسەوان لە فریشتە.(٢٧)

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١-٦ ) سورەتی (الجن )

**﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَقَالُوٓاْ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ١ يَهْدِيٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا ٢ وَأَنَّهُۥ تَعَٰلَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا ٱتَّخَذَ صَٰحِبَةً وَلَا وَلَدًا ٣ وَأَنَّهُۥ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى ٱللَّهِ شَطَطًا ٤ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن تَقُولَ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ٥ وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ٦ ﴾**

**واتە** : جن گوێیان بۆ قورئان گرت و ئیمانیان پـێ هێنـا: ئـەی پێغەمبـەر (صـلی اللـه علیـە وسـلم) بڵـێ: لەلایـەن پەروەردگارمـەوە وەحـیم بـۆ کـراوە کـە چـەند کەسـێك لەجنیـەکان گوێیان ڕاگرت بۆ قورئان خوێندنەکەم جاوتیان: بێگومان ئێمە گوێمـانگرت بـۆ قورئـانێکی سـەیرو سـەمەرە لـەڕووی هۆنینـەوەو، ڕەوانبێـژیی و، خۆشـخوانیەوە، واتـە: هەقـە عەرەبەکانیش پتر تیژڕەوییان کردبا بۆ بڕواهێنان پێـی، چـونکە بـەزمانی ئـەوان هـاتووە، چاك تێئەگـەن و دەزانـن کـە چـەندە ڕەوانبێـژە... کەچـی لەگـەڵ ئەوەشـدا هـەر ئـەمرۆو سبەینێ ئەکەن ! بەڵام جینیەکان هەر ئەو دەمەی کە بیسـتیان موسـڵمان بـوون ([1])ئـەو قورئانە، هیدایەت و ڕێنمایی دەکات بۆ ڕێـی ڕاسـت و هـەق، ئێمـەش بڕوامـان پێهێنـا ولـن نشـرك بربنـا أحـدا وهـەرگیز هـیچ کەسـێك ناکەینـە شـەریك و هاوبەشـیی پـەروەردگارمان ([2])وە بەڕاسـتی گـەورەیی و مـەزنی پـەروەردگارمان بـەرزو بڵنـدە نـە هـیچ ژن و نـەهیچ منالێکی بۆ خۆی دانەناوە، چونکە ئەوانە بۆ پێویستین، خواش لەهەموو شتێك بێ نیـازە، قسـەی ئـەم جنیانـەش بـۆ بەدرۆخسـتنەوەی عەرەبەکانـە کـە ئـەوان پێیـان وابـوو خـوا لەجنۆکەکان ژنی هێناوەو، فریشتەکان لەو ژنەن ([3])وە بەڕاستی هەرزەکـەمان (ئیبلـیس)

قسەی ناپەسەند و نابەجێی دەربارەی خوا دەکرد: بە وەسفکردنی شەریك و هەبوونیژن و منالّی هەیە ! (٤)وەئێمە یەقینمان بوو کە هەرگیز دەستەی ئادەمیی و، جنیی درۆ لە بۆ خوا هەڵنابەسن.. کەچی کاتێ قورئانمان بیست زانیمان زیادە ڕەوی زۆریانکردووە (٥)بێگومان پیاو گەلێك لەئادەمیی پەنایان دەبرد بەپیاوانی لەجینیان، لە سەفەریاندا بەشەو تا لەوشتانەی کەمەترسییان هەبوو بیانپارێزن.؟! جا جینیەکانیش ئەوەیان قۆزتەوەو زیاتر گومڕاوو سەر لێشێواو و ماندوویان کردن. (ئەبوو سەعوود) ئەڵێ: ئەگەر پیاوێك ڕێی کەوتبا جێگایەکی چۆڵەوانیەوەو شەوی بەسەردا هاتباو ترسی لێ نیشتبا لەپێش ئیسلامدا هەرکاتێ عەرەبەکان لە دۆڵ وشیوێکدا شەویان بەسەرا بهاتایە، زۆر ئەترسان لە جنۆکەی ئەو دۆڵ و شیوە ، ئینجا پەنایان دەبردە بەر گەورەکەیان تا پەنایان بدات لە زیانی جنۆکەی ئەو ناوەیە، وە ئەیان گوت: (أعوذ بسید هذا الوادي من سفهاء قومه) ! پەنا دەبەمە بەرسەرۆکی جنۆکەی ئەم دۆڵ وشیوە، تا نەفامەکانی ئازارم نەدەن. وە یان ئەگەر نەخۆش بکەوتنایە نووشتەیان ئەکرد بەخۆیانا، یان پارچە دارێك، یان پەڕۆی سەرگۆڕێکیان هەڵ ئەگرت.... وە یان زۆر کەس لەمرۆڤەکان پەنایان ئەبردە بەر چەند مرۆڤێکی تر (وەك جوکیی و، جا دوگەرو، فالچیی.. وە داوای نوشتەی دێوە بەندیان لێ ئەکردن تا بیانپارێزن لەزیانی جنۆکە.. ئینجا ئەوانە بۆ گەرمکردنی بازاڕی خۆیان ئەوەندەی تر ئەیانترساندن لە دێوو جنۆکە (٦)وە بەڕاستی ئەوانیش گومانیان وابوو وەك ئێوە گومانتان وابوو کە ئیترخوا هیچ کەسیك زیندوو ناکاتەوە دوای مردن، یان هیچ پێغەمبەرێك نانێرێ، وا ئێستا حاڵی بووین و ئەزانین کە خوا مردوان زیندوو دەکاتەوەو پێغەمبەریش دەنێرێ (٧)وەبەڕاستی ئێمە بەرەو ئاسمان کشاین بۆ زانینی هەواڵ و، دەنگ و باس جا بینیمان پڕە لە پاسەوانی بەهێزو پریشکی ئاگری سوتێنەر. مامۆستا (شیخ موحەممەدی خاڵ) دەڵێت: دەبێ ئەو پاسەوانانە غەیری (شهب) بن و لە ئاسمانیشدا بن، واتە: لەو بۆشایەدا بن کە لە دەوری زەویدایە. جا ئەم پاسەوانانە بەهەر مادەیەکا – لە ئاسمانەوە بێت – هەڵ تەقین، خێرا لەناوی دەبەن، لەوەیش ئەچێ کەهەر پارچە ئەستێرەیەك لە بۆشایی دەرەوەی ئاسمانەوە بێت و ڕوو بکاتە سەر زەوی خێرا

جۆره (پرۆتۆنێکی سارد) پیا هەڵ ئەتەقێ و ئەیسوتێنێ و نایەڵێ بگاتە زەویی، مەبەست لە (شهب)یش ئەو پارچە ئەستێرانەن –خوایش چاکتر ئەزانێ– کە لەگەڵ زەویدا بەدەوری رۆژا ئەسورێنەوە، وەلەبەر بچووکی خۆیان بەئاسمانەوە نابینرێن، وە بەملیۆن و بلیۆن لەکۆمەڵەی رۆژی ئێمەدا بڵاو بوونەتەوە، وە لەشوێن خۆیان ئەترازێن و رووەو زەویی ئەکشێن (٨)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١–( عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ انْطَلَقَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي طَائِفَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ وَقَدْ حِيلَ بَيْنَ الشَّيَاطِينِ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ وَأُرْسِلَتْ عَلَيْهِمْ الشُّهُبُ فَرَجَعَتْ الشَّيَاطِينُ إِلَى قَوْمِهِمْ فَقَالُوا مَا لَكُمْ فَقَالُوا حِيلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ وَأُرْسِلَتْ عَلَيْنَا الشُّهُبُ قَالُوا مَا حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ إِلَّا شَيْءٌ حَدَثَ فَاضْرِبُوا مَشَارِقَ الْأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا فَانْظُرُوا مَا هَذَا الَّذِي حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ فَانْصَرَفَ أُولَئِكَ الَّذِينَ تَوَجَّهُوا نَحْوَ تِهَامَةَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ بِنَخْلَةَ عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ وَهُوَ يُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ صَلَاةَ الْفَجْرِ فَلَمَّا سَمِعُوا الْقُرْآنَ اسْتَمَعُوا لَهُ فَقَالُوا هَذَا وَاللَّهِ الَّذِي حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ فَهُنَالِكَ حِينَ رَجَعُوا إِلَى قَوْمِهِمْ وَقَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى نَبِيِّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنْ الْجِنِّ وَإِنَّمَا أُوحِيَ إِلَيْهِ قَوْلُ الْجِنِّ ) رواه البخاري

واتە: لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە هاتووە خوا لەخۆی وبابی رازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر و هەندێك لە هاوەڵانی بەرەو بازاری عوکازە رۆیشتن ، لەو کاتدا بەربەستێك دروست ببوو لە نێوان شەیتانەکان و هەواڵی ئاسمان، پرۆشکەی ئاگریان بۆ دەهات، شەیتانەکان گەرانەوە لای قەومی خۆیان گوتیان : چیتانە ، گوتیان : بەربەستێك پیدابوو لە نێوان

ئێمەو هەواڵی ئاسمان ، مەگەر شتێك روویداوە ، برۆن بۆ لای ڕۆژهەڵات و رۆژئاوا، بزانن بۆچی ئەم بەربەستە دروست بووە، جا ئەو جنانە چوونە ناوچەی (تیهامە) بۆ لای پێغەمبەر کە لەو کاتە لە بن دار خورمایەك بوو بەرەو بازاری عوکاوە دەرۆیشت ، لەوکاتدا نوێژی بەیانی بۆ هاوەڵان دەکرد ، کاتێ گوێیان لە قورئان بوو ، گوتیان سوێند بەخوا ئەمەیە بەربەستەکە کە ناهێڵێ هەواڵی ئاسمان بزانین ، جاکاتێ گەرانەوە گوتیان : ئەی گەلی ئێمە گوێمان لە قورئانێکی سەرسورهێنەر بووە، ورێنمایمان دەکات بۆ رێگای راست ، ئێمەش ئێمانمان پێ هێناو هیچ هاوەبەشێك بۆ خوا بریارنادەین، جا خوا ئەم ئایەتەی بۆ سەر پێغەمبەر دازاندو فەرمووی (قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنْ الْجِنِّ وَإِنَّمَا أُوحِيَ إِلَيْهِ قَوْلُ الْجِنِّ)

## دروستکراوەکان ( ٣ ) جۆرن :

( عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (خُلِقَتِ الْمَلَائِكَةُ مِنْ نُورٍ، وَخُلِقَ الْجَانُّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ، وَخُلِقَ آدَمُ مِمَّا وُصِفَ لَكُمْ) رواه مسلم

واتە: لە عائیشەی دایکی ئیمانداران هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی : فریشتەکان لە نور دروست کراون ، وە جنۆکە لەبلێسەی ئاگر دروستکراوە، وە ئادەمیش بەم شێوەی بۆتان وەسفکراوە (واتە: لە خۆڵ)

–(جنۆکە کافرو موسڵمانی هەیە.

–(سروشتی مرۆڤ خێرو شەڕی تێدا هەیە ، شەیتان تەنها شەڕە هیچ خێری نیە ، فریشتە تەنها خێریان هەیە)

## دەرسێك لە جنۆكە فێردەبین:

(وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ٦ )

واتە: بەڕاستی پیاوانێك لە ئادەمیی پەنایان دەبردە بەر پیاوانێك لە جنۆکە (کە بیان پارێزن) کەچی زۆرتر ماندوویان دەکردن. کەواتە: (با ئێمە هەندە نەترسین لە سیحرو فالچی و....)

## شەیتان دەسەلاتی نیە بەسەر ئەو کەسانەی پشت بەخوا دەبەستن:

(إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ (النحل:٩٩)

واتە: بە ڕاستی ئەو (شەیتان) دەسەڵاتی نی یە بەسەر ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و تەنها پشتیان بە پەروەردگاریان دەبەستن.

دەستەلاتی هەیە بەسەر ئەوانەی شەیتان دەکەنە دۆسیتی خۆی وهاوبەش بۆ خوا بریاردەدەن.

(إِنَّمَا سُلْطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ١٠٠) النحل

واتە: تەنها دەسەڵاتی بەسەر ئەوانەدا هەیە کە ئەو (شەیتان) دەکەنە دۆست پشتیوانی خۆیان و ئەوانەی بە هۆیەوە بوونەتە هاوەڵ دانەر.

************************

# وتاری ژماره (١٢٤) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (المزمل)

ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژمارە (٧٣)ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (٢٠)ئایەتە.

–ئەم سورەتە لە شاری (مەککە) دابەزیوە

چەند تەوەرێکی گرنگی ئەم سورەتە :

١–تەوەرەی سەرەکی ئەم سورەتە باسی پێغەمبەر دەکات ، هەر لەبەر ئەوەش ناونراوە (المزمل) واتە : ئەو کەسەی خۆی پێچاوە .

–لەسەرەتای ئەم سورەتە باسی خۆماندوکردنی پێغەمبەر دەکات لە عیبادەت و خواپەرستی

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ١ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ٢ نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا٣ أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ٤ ) واتە : ئەی ئەو کەسەی کە خۆت داپۆشیووە. (١) شەو هەستە (شەو نوێژ بکە) مەگەر کەمێکی نەبێت. (٢) نیوەی یا کەمێ لە نیوەی کەم بکەرەوە. (٣) یا کەمێ لێ ی زیاد بکە وە دەوری قورئان بکەرەوە بە لەسەر خۆیی واتە بە ڕێك و پێکی (٤)

٢–لە تەوەرەکی دیکەدا باسی قورسی وەحی دەکات ، کە خوا فەرمانی کردوە بە پێغەمبەر رایبگەیەنێ ، ئەمەش بە ئامادەکردنی ڕوحە بەشەونوێژو بیرکردنەوە و خواپەرستی ، وەك دەفەرمووێ

(إِنَّا سَنُلۡقِي عَلَيۡكَ قَوۡلٗا ثَقِيلًا ٥ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـٔٗا وَأَقۡوَمُ قِيلًا ٦ إِنَّ لَكَ فِي ٱلنَّهَارِ سَبۡحٗا طَوِيلٗا ٧)

واتە: بێگومانم ئێمە لەمەولا بۆت دەنێرینە خوارەوە گوفتاری (قورئان) ی قورس و گران. (٥) بەڕاستی هەستانی شەو دوای خەو (بۆ خوا پەرستی) قورسترەو گرانترە لە ڕووی کردارەوە (لە هی ڕۆژ بەهێزترە بۆ دڵ) دروسترە لە ڕووی وتنەوە. (٦) بەڕاستی تۆ لە ڕۆژدا لە هاتوو چۆکردنێکی زۆردایت. (٧)

٣–تەوەری سێیەم خوا فەرمان بە پێغەمبەر دەکات ئارام بگرێ ، پشت هەڵگرێ لە هاوبەشدانەران بە شێوەیەکی جوان ، تاکو خوا تۆڵەیان لێ دەکاتەوە.

(وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ١٠ وَذَرْنِي وَٱلْمُكَذِّبِينَ أُوْلِي ٱلنَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا ١١)

واتە : دان بە خۆتدا بگرە لەسەر ئەو قسانەی کە دەیڵێن وە وازیان لێ بێنەو لێیان گەڕێ بە واز لێهێنانێکی جوان. (١٠) واز بێنە لە من و ئەو خاوەن ناز و نیعمەتانەی کە ئاییني من بە درۆ دەزانن وە کەمێك مۆڵەتیان بدە. (١١)

٤–خوا بەڵێن بە کافران دەدات لە ڕۆژی قیامەت تۆڵەیان لێ بکاتەوە ، ئەو ڕۆژەی منداڵ لەبەر ناخۆشیەکانی ئەم ڕۆژە سەری سپی دەبێ

(إِنَّ لَدَيْنَآ أَنكَالًا وَجَحِيمًا ١٢ وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا ١٣ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ وَكَانَتِ ٱلْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا ١٤ ) واتە : بێگومان لای ئێمە هەیە کۆت و زنجیری قورس و گران وە ئاگری هەڵ گیرساو. (١٢) وە خواردنی گەرو گیر هەروەها سزای پڕ لە داخ و دەرد. (١٣) لەڕۆژێکدا کە زەوی و چیاکان دێنە لەرزە وە کێوەکان دەبن بە گردۆڵکە لە لمی هەڵڕژاو. (١٤)
٥–لە کۆتایی ئەم سوڕەتە خوا شەونوێژ لەسەر پێغەمبەر و موسڵمانان سووك دەکات ، تاکو بە هەندێ شتی دیکەی ژیان سەرقاڵ بن وەك (زانست و جیهاد و بازرگانی و دەوڵەتداری......)

﴿إِنَّ رَبَّكَ يَعۡلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدۡنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيۡلِ وَنِصۡفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَۚ وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحۡصُوهُ فَتَابَ عَلَيۡكُمۡۖ فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرۡضَىٰ وَءَاخَرُونَ يَضۡرِبُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَبۡتَغُونَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنۡهُۚ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗاۚ وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنۡ خَيۡرٖ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيۡرٗا وَأَعۡظَمَ أَجۡرٗاۚ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمُۢ ٢٠)

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٢٠) سورەتی (المزمل)

﴿إِنَّ رَبَّكَ يَعۡلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدۡنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيۡلِ وَنِصۡفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَۚ وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحۡصُوهُ فَتَابَ عَلَيۡكُمۡۖ فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرۡضَىٰ وَءَاخَرُونَ يَضۡرِبُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَبۡتَغُونَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنۡهُۚ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗاۚ وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنۡ خَيۡرٖ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيۡرٗا وَأَعۡظَمَ أَجۡرٗاۚ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمُۢ ٢٠))

واتە : واتە: بێگومان پەروەردگاری تۆ دەزانێ (ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)) کە تۆ هەڵ دەسیت (بۆشەو نوێژ) نەختێك کەمتر لە دووبەش لە سێ بەشی شەوو نیوەی یاسێ یەکی وە دەستەیەك لەوانەی کە لە گەڵتان وە خوا ئەندازەی شەو و ڕۆژ دیاری دەکات (خوا) زانی کە ئێوە ناتوانن ئەندازەی شەو نوێژ ڕابگرن لە بەرئەوە لێتان خۆش بوو دەی ئەوەندەی بۆتان ئاسانە لە قورئان دەوری بکەنەوە (خوا) زانی کە لەمەولا نەخۆشتان زۆر دەبێ وەهی تری واتان ئەبێ کەڕێ دەکەون بە زوویدا بە شوێن ڕۆزیی خوادا دەگەڕێن وەهی تری واتان دەبن کە دەجەنگن لە ڕێ ی خوادا ئینجا بخوێننەوە لە قورئان ئەوەندەی کە بۆتان ئاسانە وە نوێژ بکەن و زەکات بدەن وە قەرز بدەن بەخوا بە قەرزێکی چاك هەر چاکەیەك پێش بخەن بۆ خۆتان لای خوا دەستان دەکەوێت ئەوەی لای

خوا چاكتر و گەورەترە لە ڕووی پاداشەوە وە داوای لێخۆش بوون بکەن لە خـوا بەڕاسـتی خوا لێخۆش بوویەکی میهرەبانە. (٢٠)(پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ أَوَّلُ الْمُزَّمِّلِ كَانُوا يَقُومُونَ نَحْوًا مِنْ قِيَامِهِمْ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ حَتَّى نَزَلَ آخِرُهَا وَكَانَ بَيْنَ أَوَّلِهَا وَآخِرِهَا سَنَةٌ ) رواه ابو داود قال الالباني صحيح

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: کاتێ سـەرەتای (المزمـل) دابـەزی ، موسـڵمانان هەڵدەستانەوە بۆ شەونوێژ وەکو ڕەمەزان تاکو کۆتایی سوڕەتەکە دابەزی ئنجا شـەونوێژ سووك کرا ، وە نێوان سەرەتای سوڕەتەکەو کۆتایی سوڕەتەکە یەك ساڵ بوو.

وفي رواية (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ كَانَ بَيْنَ أَوَّلِ الْمُزَّمِّلِ وَآخِرِهَا سَنَةٌ قَالَ قَوْلُهُ (إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَى مِنْ ثُلُثَيِ اللَّيْلِ وَنِصْفَهُ) الْآيَةَ قَالَ كَانُوا يَقُومُونَ كَنَحْوٍ مِنْ قِيَامِ شهر رَمَضَان حَتَّى نـزل (فـاقرؤوا مَـا تيَسّـر مِنْـهُ) الكتـاب: الأحاديـث المختـارة أو المسـتخرج مـن الأحاديـث المختارة مما لم يخرجه البخاري ومسلم في صحيحيهما

وفـي روايـة -(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، فِي قَوْلِهِ: (قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا نِصْفَهُ أَوِ انْقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلًا) (المزمل: ٣) فَأَمَرَ اللَّهُ نَبِيَّهُ وَالْمُؤْمِنِينَ بِقِيَامِ اللَّيْلِ إِلَّا قَلِيلًا، فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ، ثُمَّ خُفِّفَ عَنْهُمْ فَرَحِمَهُمْ، وَأَنْزَلَ اللَّهُ بَعْدَ هَذَا: (عَلِمَ أَنْ سَيَكُونُ مِنْكُمْ مَرْضَى وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ) (المزمل: ٢٠) إِلَى قَوْلِهِ: (فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ) فَوَسَّعَ اللَّهُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَلَمْ يُضَيِّقْ) الطبري في تفسيره

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەربـارەی فەرمایشـتی خـوا (قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا نِصْفَهُ أَوِ انْقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلًا) خـوا فـەرمان دەکـات بـە پێغەمبـەر و ئیمانداران شەونوێژ بکەن شەوان مەگەر کەمێك نەبێ، ئەوش قورس بوو لە سەر ئیمـاداران ، دوای بۆیان سووك کراو ڕەحمیان پێکرا، لەپاشان ئـەوەیان بـۆ دابـەزی (عَلِمَ أَنْ سَيَكُونُ

مِنْكُمْ مَرْضَى وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ) تـاكو دەگاتـە (فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ) خـوا بـۆی فراوان كردن الحمد لله وە نارحەتی نەكردن.

## گرنگی شەونوێژ:

١–خوا مەدح وستايشی ئەو كەسانە دەكات كە شەونوێژ دەكەن

(تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ١٦) السجده واتە : تەنشتيان دوور ئەكەوێتەوە لە جێگای خـەوتنيان (لەخـەو هەڵدەسـن شەو نوێژ دەكەن) هاوارو نزا لە پەروەردگاريان دەكەن( بـەترس و هيـواوە )و لـەو ڕۆزی و سامانەی پێمان داون دەبەخشن.

٢– ئەوانەی شەونوێژ دەكەن خوا بەچاكە كار باسيان دەكات :

(إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِي جَنَّـٰتٍ وَعُيُونٍ ١٥ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ١٦ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ١٧ الذاريات (ءَاخِذِينَ)(وەريدەگرن)

واتە: بێگومان پارێزكاران وان لە باخات و كەناری سەرچەشمەی ڕەواندا.(١٥) ئەوەی خـوا پـێ ی داوون وەری دەگـرن (چـونكە) بێگومـان ئـەوان لـەوەوپێش چـاكە كـاربوون.(١٦) ئەوانە كەمێك لە شەودا دەخەوتن واتە شەو نوێژيان دەكرد.(١٧) (پوختەی تەفسير)

٣– خوا بەندە چاكەكان ناويان دەبات:

وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَـٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَـٰمًا ٦٣ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَـٰمًا ٦٤) الفرقان

واتە: بەندە تايبەتی يەكانی خوای ميهرەبان كەسـانێكن بـە ويقـارو نـەرمی دەڕۆن بەسـەر زەوی دا (بێ لووت بەرزی و كەشخە و فيز كردن) وە كـاتێ نـەزان و نەفامـەكان (بـە وتـەی

ناشرین) لەگەڵیان بدوێن وتەیەك دەڵێن پێیان گوناح نەبێت.(٦٣) وە کەسانێکن لە شـەودا بۆ پەروەردگاریان سوژدە بەرن و شەو نوێژ دەکەن.(٦٤) (پوختەی تەفسیر)

## چەند فەرموودەیەك لەسەر گەورەیی شەو نوێژ:

١-عَلَيْكُمْ بِصَلَاةِ اللَّيْلِ وَلَوْ رَكْعَةً وَاحِدَةً) رواه الطبراني في الكبير والاوسط

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی : دەست بگرن بە شەونوێژ ئەگەر یەك رکعەتیش بێ.

٢-عَنْ عَبْدِ اللهِ قَالَ: ذُكِرَ رَجُلٌ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا زَالَ نَائِمًا حَتَّى أَصْبَحَ، مَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ، فَقَالَ ذَاكَ رَجُلٌ بَالَ الشَّيْطَانُ فِي أُذُنَيْهِ، أَوْ قَالَ: فِي أُذُنِهِ ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ و مُسْلِمٌ

واتە: لە عەبدولڵاوە هاتووە دەڵێ: باسی پیاوێك کرا لەلای پێغەمبەر ، گوتیان تاکو بـەیانی دەخەوێ هەڵناسێ بۆ نوێژ ، فەرمووی : ئەو شەیتان میزی کردۆتە گوێیەکانی .

٣-سێ کەس خوا خۆشی دەوێن وبەڕویان پێدەکەنێ وموژدەیان پێ بەخەڵکی دەدات:

(ثلاثةٌ يحبُهُمُ اللهُ ويَضْحَكُ إليهم ويَستَبْشِرُ بهم، الذى إذا انكشفتْ فِئةٌ قاتَلَ وَراءَها بنفسهِ للهِ فإمَّا أن يُقتَلَ وإمَّا أن يَنْصُرَهُ اللهُ ويَكْفِيَهُ فيقول أُنْظُروا إلى عبدى هذا كيف صَبَرَ لى بنفسه، والذى له امرأةٌ حَسَنَةٌ وفِراشٌ لَيِّنٌ حَسَنٌ فيقومُ من الليل فيقول يَذَرُ شَهْوتَهُ فَيَذْكُرُنى ولو شاءَ رَقَدَ، والذى إذا كان فى سفرٍ وكان معه رَكْبٌ فَسَهِروا ثم هَجَعُوا فقام من السَّحَرِ فى سَرَّاءٍ وضَرَّاءٍ (رواه الطبرانى والحاكم عن أبى الدرداء قال المنذرى إسناده حسن . وقال الهيثمى (قال الالباني حسن في السلسلة الصحيحة)

(فَسَهِروا ثم هَجَعُوا )(واتە پاش حەوانەو: پال دەدەنەوە)

واتە: سێ کەس خوا خۆشـی دەوێـن وبـەدەمیان پێدەکـەنێ و موژدەیـان پـێ بـە خـەڵکی دەدات، ١-کاتێ سوپای موسڵمانان دەشکێ ، ئەو دەگەرێتەوە شەڕدەکات یان دەکوژرێ

یان سەردەکەوی ، ئەوەی بەسە خوا دەفەرمووێ: سەیری بەندەکەم بکەن چۆن لە پێناوی مندا بەئارامە بەگیانی خۆی. دووەم: پیاوێکە ئافرەتێکی جوان و ناوجێگایەکی خۆشی هەیە ، بەلاّم شەوان هەڵدەستێتەوە بۆ شەونوێژ و یادی خوا دەکات و واز لە ئارەزووەکانی خۆی دێنێ ، سێیەم: کەسێکە لەگەلّ کۆمەلێك لەسەرفدایە، پاش ئیسراحەت ئەوان لەخەودان وپاڵیان داوەتەوە، ئەویش کاتی بەرەبەیان هەڵدستێتەوە شەونوێژ دەکات.

وفی روایه(عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (عَلَيْكُمْ بِقِيَامِ اللَّيْلِ فَإِنَّهُ دَأْبُ الصَّالِحِينَ قَبْلَكُمْ وَهُوَ قُرْبَةٌ لَكُمْ إِلَى رَبِّكُمْ وَمَكْفَرَةٌ لِلسَّيِّئَاتِ وَمَنْهَاةٌ عَنِ الْإِثْمِ) رَوَاهُ التِّرْمِذِيّ قال الالباني في المشكاة المصابيح (حسن بشواهده)

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی :(دەست بگرن بە شەونوێژەوە ، چونکە پیشەی صالیحانی پێش ئێوەیە، وە لەخواتان نزیك دەکاتەوە ، وە گوناحان دەسرێتەوە ، وە قەدەغەتان دەکات لە گوناحان.

٤-(أَيُّهَا النَّاسُ أَفْشُوا السَّلَامَ وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ وَصِلُوا الْأَرْحَامَ وَصَلُّوا بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ بِسَلام) رَوَاهُ التِّرْمِذِيّ وَابْن مَاجَه والدارمي

واتە: لە عەبدولاّی کوڕی سەلامەوە هاتووە دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر تەشریفی هاتە مەدینە، منیش چووم بزانم کەسێکی چۆنە، کاتێ سەیری دەم وچاوم کرد ، زانیم دەم وچاوی ئەو هی درۆزنان نیە، وە یەکەمین قسە کە کردی فەرمووی (ئەی خەڵکینە سەلام بلاّوبکەنەوە زۆر سەلام لە یەکدی بکەن، وە خواردن بەخەڵکی بدەن ، وە سیلەی رەحم جێ بەجێ بکەن، وە هەستن شەوان شەونوێژ بکەن ، کەسانێك لەو کاتدا خەوتوون ، ئنجا بەسەلام و ئاشتی دەچنە بەهەشتەوە.

# وتاری ژماره (١٢٥) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## ١-سورەتی (المدثر)

ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژمارە (٧٤)ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (٥٦) ئایەتە

-ئەم سورەتە لە شاری (مەککە) دابەزیوە

چەند تەوەرێکی گرنگی ئەم سورەتە :

١-تەوەرەی سەرەکی ئەم سورەتە باسی پێغەمبەر دەکات ، هەر لەبەر ئەوەش ناونراوە (المدثر) واتە : ئەو کەسەی خۆی پێچاوە .

٢- پێغەمبەر ئاگادار دەکاتەوە ، هەستێ بانگەواز بکا و بێ باوەران ئاگادار بکاتەوە ، وئارامیش بگرێ بەرامبەر ئازاری بێ باوەڕان. وەك دەفەرموێت

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ٤ وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ ٥ وَلَا تَمۡنُن تَسۡتَكۡثِرُ ٦ وَلِرَبِّكَ فَٱصۡبِرۡ ٧﴾

واتە: پاش سوورەتی (إقرأ) ئەم ئایەتانە هاتن: ئەی ئەوەی جلکی خەوت بەخۆوە پێچاندووە ! ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ([1]) (قم فأنذر) هەستە، لە ناو نوێنەکەت خەڵکی بێباوەڕ بێدار بکەرەوەو بترسێنە لەسزای خوا. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەئەشکەوتی (حیرا)دا بوو کاتێ کە وەحیی بۆ هات و بەئایەتی: ( اقرأ باسم ربك الذي خلق ...) دەستی پێکرد، جا چونکە هێشتای یەکەمجاری بوو جۆرە ترسێکی لێ نیشت و موچرکە ئەیگرت و بەدەم لەرزەوە بە پەلە هاتەوە بۆماڵەوەو فەرمووی: (دثروني، دثروني...) واتە: داپۆشن، داپۆشن، جا ئیتر پاش ئەوەی کە سەرەتای سوورەتی قەڵەمی بۆ هات.. دوو ساڵ و نیو سروش راگیراو نەهات، ئیتر پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) حاڵەتە پێشووەکەی جارانی نەماو، دیسانەوە ئارەزووی وەحیی

کردەوەو گەلیٚ بۆی بیٚ تاقەت بوو، جا ئیتر لەو ماوەیەدا فریشتەی سروش بەیناو بەین خۆی نیشان ئەداو، ئەمیش بەدەم لەرزەوە دەگەڕێتەوە ماڵەوەو دەفەرمویٚ دامپۆشن. ئەم ماناو مەبەستە ئیمامی (بوخاریی و ئیمامی ئەحمەد) ریوایەتی دەکەن. ([٢]) وربك فکبر وە پەروەردگاری خۆت بەگەورە بگرە، چونکە تەنها ئەو خاوەنی گەورەیی و (کبریا)یە، کەوابوو رووی دڵت هەر لەو بکە، ئیتر بیٚ بڕواکان بڕوا دێنن یان ناهێنن گرنگ نیە ([٣])وە بەرگ و کاڵاَت، خاوێن بکەرەوە، واتە: دڵ و دەروونت، کارو کردارت هەمووی بەخاوێن رابگرە (چونکە موسڵمان دەبیٚ گرنگی بە دیوی دەرەوەو ناوەوەی بدات ([٤])لە هەموو گوناح و جۆرە کارێکی ناپوخت و ناپەسەند گەڕیٚ . ئەم ئایەتانە مانایان ئەوە نییە کە خوا نەخواستە رۆژیٚ پەیامبەر (صلى الله عليه وسلم) لەهێڵ لای دابێت.. نەخێر. بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ئوممەتەکەی تەمیٚ بیٚ و خۆیشی لەسەر ڕەوشتە بەرزەکانی بەردەوام بێت ([٥])وەشتێك مەبەخشە بۆ ئەوەی زۆرترت دەسکەوێت، واتە: منەت بەسەریانداو مەکە و، چاوەڕوانی زۆریان لیٚ مەکە ([٦])و لە بەر رەزامەندی پەروەردگارت خۆگربە لەبەرامبەر ئازاروهەڕەشەی هۆزەکەتدا ([٧])

– ئەم سورەتە ئاگارداری تاوانباران دەکاتەوە ڕۆژێکی سەختیان لە پێشە وەك فەرموویەتی :

﴿فَإِذَا نُقِرَ فِي ٱلنَّاقُورِ ٨ فَذَٰلِكَ يَوۡمَئِذٖ يَوۡمٌ عَسِيرٌ ٩ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ غَيۡرُ يَسِيرٖ ١٠ ﴾

(ئینجا کاتیٚ فوو دەکریٚ بەصووردا بۆ زیندوو بوونەوە. پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویٚ: چۆن دڵم خۆش بیٚ و، بەخۆشی رابوێرم لەکاتێکدا خاوەن شەیپوورەکە (ئیسرافیل) دەمی بە (قەرن)ەکەوە ناوەو تەوێڵ و ناوچاوی نەویکردووە، چاوەنوارە کەی فەرمانی پیٚ بکەن، فووی پیا بکات، هاوەڵانی وتیان: جا لەو کاتەدا ئێمە چ بکەین و چ بڵێین ؟! فەرمووی: بڵێن: (حسبنا الله ونعم الوكيل، على الله توكلنا ) پێشەوا ئەحمەد. ([٨])جا ئەو رۆژە، رۆژێکی زۆر گران و سەختە ([٩]) على الكافرين غير يسير لە سەر

خوانەناس و بێ بڕوایان سووك و ئاسان نیە، چونکە لێپرسینەوەو حیساب و لێکۆڵینەوە هەیە. (١٠)

ئەم سوڕەتە هەڕەشە لە (وەلیدی کوڕی موغیرە) دەکات چونکە حەقی ناسیوەو دژایەتی دەکات، وەك دەفەرمووێ :

﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ١١ وَجَعَلْتُ لَهُۥ مَالًا مَّمْدُودًا ١٢ وَبَنِينَ شُهُودًا ١٣ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمْهِيدًا ١٤ ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ ١٥ كَلَّآ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ لِـَٔايَٰتِنَا عَنِيدًا ١٦ سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا ١٧ إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ١٨ فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ١٩ ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ٢٠ ثُمَّ نَظَرَ ٢١ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ٢٢ ثُمَّ أَدْبَرَ وَٱسْتَكْبَرَ ٢٣ فَقَالَ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ٢٤ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ ٢٥ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ٢٦﴾

واتە: خوا بەو کەسە دەڵێ قورئان جادووە: لە من و لەو کەسە گەڕێ دروستم کردووە بە تەنیا خۆی، واتە: تا لەسکی دایکیا بوو نەماڵ، نەمناڵ، نەهێز نە دەسەڵاتی هەبوو، کەچی ماڵ و کوڕیشم دایەو هەر بڕوای نەهێناو چوو بە گژ پەیامبەرەکەیشدا. راڤەکەرانی قورئان دەڵێن: مەبەست بەو کەسە (وەلیدی کوڕی موغیرە)یە، خوا دەسەڵاتێکی زۆر چاکی دایە، کەچی لەباتی سوپاسگوزاریی یاخی بوو! وەك ئەفەرمووێ: (١١)ماڵ و دارایییەکی زۆرم پێبەخشی (مەڕو ماڵات، باخ و بێستانی جوان و دڵگیر) (١٢) وبنین شهودا وەکوڕانی هەمیشە ئامادەو بەردەست (لەگەڵیا، واتە: لە هەموو کاتێکی خۆشیی و ناخۆشییدا ئامادەبوون، ئەویش خۆی پێ هەڵ ئەکێشا (١٣)وە دونیام بۆ راخستبوو بە راخستنێکی تەواو، واتە: بە ئارەزووی خۆی (دونیام ڕشت بەسەریا) (١٤)پاشان ئەوەندە تەماعکارە هەر بەتەمایە بۆی زیاد بکەم.. (لەگەڵ ئەوەیشدا کە خوانەناس و بێ بڕوایە..!) (١٥)نەخێر ئەو چاو چنۆکە با بەتەما نەبێ ، چونکە ئەو بەرامبەر بە ئایەتەکانمان هەر سەرکەش و سەر سەختە (١٦)بە تەئکیدمنیش سزایەکی قورس و گران و سەخت بەسەریا ئەدەم (زۆر ماندوو هیلاکی دەکەم، بەناو بەرزایی کێوەکانی دۆزەخدا هەڵی دەگێڕم (١٧)إنه فکر وقدر چونکە بەڕاستی بیری کردەوەو ئەندازەگیری کرد چی بڵێ دەر بارەی قورئان، بەڵام بەهەڵەدا چوو و ملکەچی حەق نەبوو! (١٨) فقتل کیف

قدر ده بەكوشتچىٚ (و خوا ريسواى بكات) چ جۆره مەزەنەو ئەندازەيەكى گرت (ئەو نەفامە، پاش هەموو بىر كردنەوەيەكى ئەوجار دەڵێت: قورئان جادووه..!! (١٩) ثم قتل كيف قدر پاشان بەكوشتچىٚ، چۆن مەزەنەو ئەندازەگيرى كرد؟!. راڤەكەران دەڵێن: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كاتىٚ كە نوێژى ئەكردو قورئانى ئەخوێندەوه (وەليد) بەلايا تێپەڕى و گوێى بۆ گرت و چاك چاك دڵى دايه، دوايش كە گەڕايەوە بۆ ناو هۆزو گەلەكەى وتى: ئێستا گوێم لە (موحەممەد)ەوه بوو قورئانى ئەخوێند،.. سوێندم بەخوا ئەوه ئەو دەيخوێند نە وتەى ئادەمى بوو، نەوتەى جنيى بوو.. جا كاتىٚ ئەو قسەيە گەيشتەوه قورەيش، دەنگ و باس بڵاو بوويەوه كە وەليد چووەتە سەر ئايينى (موحەممەد)، ئەگەر ئەوه وابێت قورەيش هەموو شوێنى ئەكەون.. جا (ئەبووجەهل) رۆيشت بۆ لايى و وتى: دەڵێن دواى موحەممەد كەوتووى تا بەڵكو پاروه نانێكت بداتىٚ، ئەويش ڕقى هەڵساو وتى: جا موحەممەد نانى لە كوىٚ بوو، تا من بۆنان دواى ئەو بكەوم؟ خۆت چاك ئەزانى كە من مرۆڤێكى لات و هەژار نيم، پاشان وەليد وتى: باشه ئێوه پێتان وايه موحەممەد شێته.؟ ده ئايا تا ئێستا بيستووتانه كارى شێتانه بكات..؟ لاتان وايه كە فاڵچى بێت.. بيستووتانه فالىٚ بگرێتەوه..؟ پێتان وايه شاعيره.. تا ئێستا هيچ شيعرێك بەدەميا هاتووه..؟! پێتان وايه كابرايەكى درۆزنه، قەت درۆتان لەو بيستووه..؟! لەوەڵامى هەموو پرسيارەكاندا وتيان نەخێر. جا قوورەيش وتى: ئەى تۆ چۆن بيرى لىٚ ئەكەيتەوەو هەڵى دەسەنگێنى..؟ وەليد وتى: جادووه ! كوڕ لەباوك ئەكاو، باوك لەكوڕ.. بۆ ئەمەيه كە قورئان ئەفەرمووىٚ: ( إنه فكر وقدر.. فقتل كيف قدر ).. (٢٠)پاشان سەيرى كرد چى بڵىٚ (٢١)لە پاشا ناو چاوانى هێنايەوه يەك و رووى گرژكرد (٢٢)پاشان پشتى هەڵكرد لە ئيمان بە قورئان و خۆى بە زلزانى دواى پێغەمبەر كەوىٚ! وە لەباتى ئەوه كە قسەيەكى گونجاو بكات كەچى (٢٣)جاوتى: ئەم قورئانه هەر جادووه لەخەڵكێكى ترەوه وەرئەگيرىٚ، واته: محمد (لە بابيلى و، ئاشوريى و، ميسريى و، هينديیەكانەوه)! (٢٤)ئەمە هەر قسەى مرۆڤه، لە قسەى خوا ناچىٚ ! (٢٥)لە مەوپاش ئەيخەمە ناو سەقەرەوه (٢٦)

–باسی حیواری نیوان موسڵمان و تاوانباران دەکات لە ڕۆژی قیامەت ئایا بۆچی توشی دۆزەخ بووینە؟ ، وەك فەرموویەتی :

(إِلَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلۡيَمِينِ ٣٩ فِي جَنَّٰتٖ يَتَسَآءَلُونَ ٤٠ عَنِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ٤١ مَا سَلَكَكُمۡ فِي سَقَرَ ٤٢ قَالُواْ لَمۡ نَكُ مِنَ ٱلۡمُصَلِّينَ ٤٣ وَلَمۡ نَكُ نُطۡعِمُ ٱلۡمِسۡكِينَ ٤٤ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلۡخَآئِضِينَ ٤٥ ) واتە: مەگەر هاوەڵانی دەستی ڕاست واتە چاکەکاران. (٣٩) کە لە باخاتی بەهەشتدا پرسیار لە یەکتری دەکەن. (٤٠) لە (حاڵی) تاوان باران. (٤١) هەر لە بەهەشتی یەکان وەڵام ئەداتەوە کە دیومانن و پێمان وتوون چی ئێوەی خستووەتە دۆزەخەوە. (٤٢) ئەوانیش وتیان: ئێمە لە نوێژ کەران نەبووین. (٤٣) وە خۆراکمان نەدەدا بە هەژاران. (٤٤) وەڕۆ دەچووین لەگەڵ ئەوانەی کە ڕۆ دەچوون لە قسەی خراپەو بێ شەرعی دا. (٤٥)

## ئایا بۆچی ئەمانە چونە دۆزەخ؟

وەڵام: بەهۆی (٣) شت چوونەتە دۆزەخ :

١–نوێژنەکردن

٢–ماڵ نەبەخشین بۆ هەژاران

٣–تێکەڵاوی لەگەڵ ئەوانەی ڕۆوودەچن لەگەڵ خراپەکاران (قسەی خراپ و بێ شەرعی)

–لەکۆتایی ئەم سوڕەتدا باسی ئەوە دەکات هۆکاری پشتکردنی کافران لە ئیسلام ، ئەوەیە ئینکاری ڕۆژی قیامەت دەکەن، وەك فەرموویەتی :

(كَلَّاۖ بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلۡأٓخِرَةَ ٥٣ كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذۡكِرَةٞ ٥٤ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ٥٥ وَمَا يَذۡكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ هُوَ أَهۡلُ ٱلتَّقۡوَىٰ وَأَهۡلُ ٱلۡمَغۡفِرَةِ)(٥٦)

واتە: با چاوەڕوانی ئەوە نەبن بەڵكو هەر ناترسن لە ڕۆژی دوایی.(٥٣) با پەشیمان بنەوە بە ڕاستی قورئان پەندوو ئامۆژگاریە.( با پەشیمان بنەوە بە ڕاستی قورئان پەندوو ئامۆژگاریە.(٥٤) ئینجا هەر كەسێك بیەوێ با پەندی لێ وەرگرێ.(٥٥) ئامۆژگاری قورئان وەرناگرن مەگەر خوا بیەوێت خوا شیاوی لێ ترسانە وە شیاوی لێ خۆشبوونە.(٥٦)

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١-٢) سوڕەتی (المدثر)

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ٢ )

واتە: ئەی ئەو كەسەی كە خۆت پێچاوەتەوە.(١) هەستە (خەڵكی) بێدار كەرەوە(٢).

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

(عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ سَأَلْتُ أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ أَوَّلِ مَا نَزَلَ مِنْ الْقُرْآنِ قَالَ يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ قُلْتُ يَقُولُونَ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ فَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ سَأَلْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ ذَلِكَ وَقُلْتُ لَهُ مِثْلَ الَّذِي قُلْتَ فَقَالَ جَابِرٌ لَا أُحَدِّثُكَ إِلَّا مَا حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ جَاوَرْتُ بِحِرَاءٍ فَلَمَّا قَضَيْتُ جِوَارِي هَبَطْتُ فَنُودِيتُ فَنَظَرْتُ عَنْ يَمِينِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا وَنَظَرْتُ عَنْ شِمَالِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا وَنَظَرْتُ أَمَامِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا وَنَظَرْتُ خَلْفِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَرَأَيْتُ شَيْئًا فَأَتَيْتُ خَدِيجَةَ فَقُلْتُ دَثِّرُونِي وَصُبُّوا عَلَيَّ مَاءً بَارِدًا قَالَ فَدَثَّرُونِي وَصَبُّوا عَلَيَّ مَاءً بَارِدًا قَالَ فَنَزَلَتْ يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ قُمْ فَأَنْذِرْ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ )(رواه البخاري (جاور: سكن فيه ، جاور المسجد: اقام فيه)

واتە:لە یەحیای كوڕی ئەبی كەسیر هاتووە دەڵێ: پرسیارم لە ئەبا سەلەمەی كوڕی عبدالرحمن كرد، دەربارەی یەكەم شت كە لە قورئان دابەزیوە ، گوتی : (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ)ە ئەڵێ گوتم دەڵێن ( اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ) یە ، ئەبو سەلەمە گوتی : لە جابیری كوڕی

عبدالله م پرسی خوا لەخوی وبابی رازی بێ لەوبارەوە ،تۆچیت بەمن گوت منیش هەمان شتم بەو گوت، جابیر گوتی: هیچ قسەیەکت بۆ ناکەم مەگەر پێغەمبەر بۆ ئێمەی کردبێ، فەرمووی : لە ئەشکەوتی (حیرا) جیابومەوە ماوەکەم تەواوکرد دابەزیم ، بانگیان کردم ، تەماشای لای راست و چەپ و پێشەوەو دواوەم کرد هیچ شتێکم نەبینی ، سەری خۆم بەرزکردوە شتێکم بینی ، هاتمەوە لا (خدیجە) گوتم دامپۆشن وە ئاوی سارد بەسەردام بکەن، فەرمووی : دایانپۆشیم و ئاوی ساردیان بەسەردا کردم، فەرمووی : دابەزی (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ قُمْ فَأَنْذِرْ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ)

وفي رواية(عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ أَوَّلِ مَا نزل من الْقُرْآن؟ قَالَ: (يَا أَيهَا المدثر) قلت: يَقُولُونَ: (اقْرَأ باسم ربِّك) قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: سَأَلْتُ جَابِرًا عَنْ ذَلِكَ. وَقُلْتُ لَهُ مِثْلَ الَّذِي قُلْتَ لِي. فَقَالَ لِي جَابِرٌ: لَا أُحَدِّثُكَ إِلَّا بِمَا حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: جَاوَرْتُ بِحِرَاءٍ شَهْرًا فَلَمَّا قَضَيْتُ جِوَارِي هَبَطْتُ فَنُودِيتُ فَنَظَرْتُ عَنْ يَمِينِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا وَنَظَرْتُ عَنْ شِمَالِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا وَنَظَرْتُ عَنْ خَلْفِي فَلَمْ أَرَ شَيْئًا فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَرَأَيْتُ شَيْئًا فَأَتَيْتُ خَدِيجَةَ فَقُلْتُ: دَثِّرُونِي فَدَثَّرُونِي وصبُّوا عليَّ مَاء بَارِدًا فَنزلت: (يَا أَيهَا الْمُدَّثِّرُ. قُمْ فَأَنْذِرْ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ. وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ. وَالرجز فاهجر) وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ تُفْرَضَ الصَّلَاةُ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ (الجِوار: اي العهد، الامان ، غار، الكهف)

دەرسەکانی ئەم ئایەتە ئەوەیە :

١-هەستان بەبانگەوازی ئایینی خوا.

٢-ئارام بگرین و ماندوو نەبین.

**********************

# وتاری ژماره (١٢٦) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (القیامة)

ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژمارە (٧٥)ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (٤٠) ئایەتە.

-ئەم سورەتە لە شاری (مەککە) دابەزیوە.

چەند تەوەرێکی گرنگی ئەم سورەتە :

١-باسی رۆژی قیامەت دەکات ، کە روکنێکی ئیمانە ، هەربۆیەش ناونراوە (القیامە)

٢-لە سەرەتادا خوا سوێند دەخوات بە رۆژی قیامەت و ئەو نەفسەی لۆمەی خۆی دەکات ، کە بێ گومان رۆژی زیندوبونەوە راستە ، وەك فەرموویەتی :

(لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ١ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ٢ أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجۡمَعَ عِظَامَهُۥ ٣ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ٤ )

واتە : سوێند دەخۆم بە رۆژی قیامەت. (١) وە سوێند دەخۆم بە نەفسی لۆمەکەر لەسەر خراپە. (٢) ئایا مرۆڤ وا دەزانێ کە ئێسقانە (رزیوەکانی) کۆ ناکەینەوە. (٣) بەلێ : بە توانایین لە سەر رێك خستنەوەی (نەقشی) سەر پەنجەکانی. (٤)

٣-ئەوجا هەندێك روداوی ئەم رۆژە باس دەکات ، کە مانگ رودەچێ و مرۆڤ سەری سوردەمێنێ ، هەموو خەڵك کۆدەکرێتەوە بۆ پاداشت و سزا، وەك دەفەرموێت :

(فَإِذَا بَرِقَ ٱلۡبَصَرُ ٧ وَخَسَفَ ٱلۡقَمَرُ ٨ وَجُمِعَ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ ٩ يَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذٍ أَيۡنَ ٱلۡمَفَرُّ ١٠ كَلَّا لَا وَزَرَ ١١ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡمُسۡتَقَرُّ ١٢ يُنَبَّؤُاْ ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذِۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ١٣ ) واتە : کاتێ: کە چاو ئەبڵەق بوو ؟. (٧) وە مانگ گیراو

تاريك بوو. (٨) وە ڕۆژ و مانگ کۆ کرانەوە. (٩) ئەوکاتە مرۆڤ دەڵێ: دەربازگە لە کوێ وەیە. (١٠) نەخێر هیچ پەناگەیەك نی یە. (١١) لەو ڕۆژەدا ئارامگا هەر لای پەروەردگاری تۆیە. (١٢) لەو ڕۆژەدا ئادەمیی هەواڵی پێدەدرێت لەوەی کە پێشی خستووە و دوای خستووە لە چاکەو خراپە. (١٣)

٤-باسی پێغەمبەر دەکات کە زۆر گرنگی بە قورئان لەبەرکردن دەدات ، پەلەی دەکرد کاتێ جوبریل وەحی بۆ دەهێنا، وەك فەرموویەتی :

(لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ١٦ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ١٧ فَإِذَا قَرَأْنَـٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ١٨ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ١٩ )

واتە: زمانت مەجوڵێنە بە خوێندنەوەی سرووش تا پەلەی تیا بکەیت. (١٦) بە ڕاستی (وەك بەڵێنمان داوە) بێگومان لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوەی لە سنگتداو خوێندنەوەی. (١٧) ئینجا کاتێ کە قورئانمان بۆ خوێندیتەوە (بە هۆی جبرییلەوە) تۆش شوێن خوێندنەوەی ئەو بکەوە. (١٨) لە پاشان دڵنیابە ڕوون کردنەوەشی لەسەر ئێمەیە. (١٩)

٥-باسی ئەوە دەکات ڕۆژی قیامەت خەڵکی دەبن بە دوو چین ، چنێك دەم وچاوێکی روناك و جوان وخۆش بەخت ، دەماشای خوای گەورە دەکەن ، چینێك دەم وچاوێکی تاریك وبەدبەخت ، وەك فەرموویەتی :

(وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ٢٢ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ٢٣ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍۭ بَاسِرَةٌ ٢٤ تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ ٢٥ ) واتە: زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا گەشاوەن. (٢٢) تەماشای پەروەردگاریان دەکەن. (٢٣) وە زۆر ڕووخساریش لەو ڕۆژەدا گرژو تاڵن. (٢٤) دەزانن کە سزای پشت شکێن دەدرێن. (٢٥)

٦-باسی کاتی روح کێشان دەکات ، بەتایبەتی ئەوانەی حیساب بۆ قیامەت ناکەن، وەك دەفەرموێت

(كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ ٢٦ وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ ٢٧ وَظَنَّ أَنَّهُ ٱلۡفِرَاقُ ٢٨ وَٱلۡتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ ٢٩ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡمَسَاقُ ٣٠ فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ٣١ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ٣٢ ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ يَتَمَطَّىٰٓ ٣٣

واتـه: پەشـیمان ببنـەوە ! کاتێـك کـە گیـان گەیشـتە قورقوڕاگـە واتـە گـەرو. (٢٦) جـا دەووترێت: کێ یە چارەکەر. (٢٧) وە (نەخۆشەکە) دڵنیایە ئەوە (ی تووشی بووە مـردن و) جیابوونەوەیە. (٢٨) وە قاچ و لوولاق بەیەکدا ئاڵا. (٢٩) ڕاپێچ کـردن لـەو ڕۆژەدا بـۆ لای پەروەردگارتە. (٣٠) جا (کافر) نە بڕوای هێناو نە نوێـژی کـرد. (٣١) بـەڵکو ئـاییـنی بەدرۆ دەزانی و پشتی تێ دەکرد. (٣٢) لەپاشان بە کەشخەو فییـزەوە گەڕایـەوە بـۆ لای ماڵ و منداڵی. (٣٣)

٧–لە کۆتایدا بەبەڵگەی عەقڵی دەیسلمێنێ ، کە ڕۆژی قیامەت ڕاستە و گومانی تێدا نیە، وەك فەرموویەتی :

(أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَن يُتۡرَكَ سُدًى ٣٦ أَلَمۡ يَكُ نُطۡفَةٗ مِّن مَّنِيّٖ يُمۡنَىٰ ٣٧ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةٗ فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ٣٨ فَجَعَلَ مِنۡهُ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰٓ ٣٩ أَلَيۡسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحۡـِۧيَ ٱلۡمَوۡتَىٰ (٤٠))واتە : ئایا مـرۆڤ وا دادەنـێ کـە هـەروا بـەرەڵا دەکرێ و پشـت گـوێ دەخرێ. (٣٦) ئایا نوتفەیەك نەبوو لـە تـۆو کـە دەڕژێنـرا (یـە منداڵدان) دوە. (٣٧) لـە پاشان بوو بە خوێنی پارەیەك ئینجا دروستی کرد و ڕێکی خست. (٣٨) ئینجا لـەو تـۆوە دوو جۆری دروست کرد نێر و مێ. (٣٩)ئایـا ئـەو زاتـە توانـای نـی یـە بەسـەر ئـەوەدا کـە مردووان زیندوو بکاتەوە (٤٠).

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١٦-١٧ ) سورەتی ( القیامە )

﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ١٦ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ١٧ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ١٨ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ١٩ ﴾

واتە : پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە جبریلەوە قورئانی وەرگرت: ئیمامی (بوخاریی) و (موسلیم) و جگە لەوانیش دەڵێن: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆر سوور و بەهەوڵ بوو بۆ وەرگرتنی قورئان لەدەم جوبریلەوە، بۆیە پەلەی بۆوەگرتنی ئەکرد پێش ئەوەی جبریل لێ بێتەوە ! تا خوای گەورە پێی فەرمووو: زمانت بەقورئان خوێندن مەجووڵێنە، واتە: پەلە مەکە بۆ لەبەر کردنی (١٦) بەڕاستی کۆکردنەوەو لەبەر کردنی و ئیسپاتی خوێندنەوەی لە سەر زمانت لەسەر ئێمەیە (١٧) جا کاتێ ئێمە لەڕێگەی (جوبریل)ەوە بۆت دەخوێنینەوە تۆ شوێنی خوێندنەوەکەی ئەو بکەوەو دوای ئەو بیڵێو پەیڕەوی لەو بکە (١٨) لەپاش خوێندنەوەو لەبەر کردنیشی، رونکردنەوەی ماناکەیشی هەر لەسەر ئێمەیە. (ئیبن کەسیر) دەڵێ: پەیامبەر (صلى الله عليه وسلم) بەشێوەیەك هەوڵی دەداو سوور بوو بۆ لەبەر کردنی قوورئان، گەلێ جار لە خوێندنەوەیدا پێش (جبریل) دەکەوت.. ئینجا خوای کارجوان فەرمانی پێکرد لەسەرخۆبێت و پەلە نەکات لەخوێندنەوەیدا، چونکە ئەو خۆی ماناو مەبەستەکەی بۆ ڕوون ئەکاتەوە. (١٩)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فِي قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ: (لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ) (القيامة: ١٦) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَالِجُ مِنَ التَّنْزِيلِ شِدَّةً ، وَكَانَ يُحَرِّكُ شَفَتَيْهِ فَقَالَ لِي ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ، أَنَا أُحَرِّكُهُمَا لَكَ كَمَا كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحَرِّكُهُمَا ، قَالَ سَعِيدٌ: وَأَنَا أُحَرِّكُهُمَا كَمَا كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يُحَرِّكُهُمَا ، فَحَرَّكَ شَفَتَيْهِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ) (القيامة: ١٧) ، قَالَ: جَمْعُهُ فِي صَدْرِكَ ، ثُمَّ تَقْرَؤُهُ: (فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ) (القيامة: ١٨) قَالَ: فَاسْتَمِعْ لَهُ وَأَنْصِتْ ، (ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا) (القيامة: ١٩) أَنْ تَقْرَأَهُ ، قَالَ: فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَتَاهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ اسْتَمَعَ ، فَإِذَا انْطَلَقَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ قَرَأَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَمَا أَقْرَأَهُ ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ وَمُسْلِمٌ

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبیرەوە هاتووە، ئەویش لە ئیبنو عەباسەوە خوا خۆی ویابی ڕازی بێ، دەربارەی فەرمایشتی خوای گەورە (لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ) دەڵێ: پێغەمبەر زۆر بەتوندی چارسەری لەبەرکردنی قورئانی دەکرد کاتێ بۆی دادەبەزی، و لیوەکانی دەجولاند ، ئیبنو عەباس پێ گوتم لیوەکانم بۆت دەجولێنم ، هەروەك پێغەمبەر لیوانی دەجولاند ، سەعید دەڵێ : منیش لیوەکانم دەجولێنم هەروەك ئیبنو ئیبنو عەباس دەیجولاندن ، جا کە پێغەمبەر لیوەکانی دەجولاند تاکو زوو قورئان لە جوبریل وەرگرێ ولەبەری بکات، خوا ئەم ئایەتەی بۆ دابەزاند (لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ) دەڵێ: خوا کۆی دەکاتەوە لە سینگدا، دوای دەیخوینیتەوە (فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ) دەفەرموێ: گوێبگرە وبێ دەنگ بە، (ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا) واتە: دەیخوێنینەوە، دەڵێ: پێغەمبەر کاتێ جوبریلی دەهاتە لا گوێ بۆ دەگرت، کاتێ جوبریل دەرۆیشت دەیخوینتەوە وەك چۆن بۆی دەیخوێنرایەوە

## ٢-هۆی دابەزینی ئایەتی (٣٤-٣٥) سوڕەتی (القیامه)

﴿أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ٣٤ ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰٓ ٣٥﴾

واتە: ئەی بێ باوەڕی خراپەکار! وەیل و تیاچوون بۆ تۆ ... ئەم فەرمایشتە بۆ ترساندن و هەڕەشە لێکردن بەکار دێت، واتە: خودا دووچاری ئەوەت بکات کە خۆت زۆرت پێ ناخۆشە.(٣٤) لێرەدا هەمان فەرمایشت دووبارە دەکاتەوە، بۆ زیادە هەڕەشە لێکردن و ترساندن و مسۆگەربوونی سەرەنجامی ناخۆش و ترسناك... دەفەرموێت: ئەی بێ باوەڕی خراپەکار! وەیل و تیاچوون بۆ تۆ.(٣٥)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

( عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: لَقِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَبَا جَهْلٍ، لَعَنَهُ اللَّهُ فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى أَمَرَنِي أَنْ أَقُولَ لَكَ: (أَوْلَى لَكَ فَأَوْلَى، ثُمَّ أَوْلَى لَكَ فَأَوْلَى)، قَالَ، فَنَزَعَ ثَوْبَهُ مِنْ يَدِهِ وَقَالَ: مَا تَسْتَطِيعُ لِي أَنْتَ وَلَا صَاحِبُكَ مِنْ شَيْءٍ، وَلَقَدْ عَلِمْتَ أَنِّي أَمْنَعُ أَهْلِ الْبَطْحَاءِ، وَأَنَا الْعَزِيزُ الْكَرِيمُ. قَالَ: فَقَتَلَهُ اللَّهُ تَعَالَى يَوْمَ بَدْرٍ وَأَذَلَّهُ، وعَّيره بِكَلِمَتِهِ، وَأَنْزَلَ: (ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ العزيز الكريم) اخرجه ابن كثير في تفسيره

واتە:لە عیکرمەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر گەیشتە (ابوجهل) لەعنەتی خوا لێ بێ ، پێی فەرموو : خوا فەرمانی پێ کردوم پێت بڵێم (أَوْلَى لَكَ فَأَوْلَى، ثُمَّ أَوْلَى لَكَ فَأَوْلَى) دەڵێ: ئەویش جل وبەرگی راکێشا بەدەستی وگوتی : تۆ و خاوەنەکەت هیچتان پێ ناکرێ دەربارەی من ، وە تۆ دەزانی من دەتوانم هەموو خەڵکی مەککە قەدەغە بکەم ، وەمن کەسێکی بەهێزو بەرێزم

دەڵێ : خوا لە ڕۆژی (بەدر) کوشتی و ریسوای کرد ،بەو قسەی کە کردی خوا عەیبداری کرد ئەو ئایەتەی دابەزاند(ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ العزيز الكريم) واتە : دەبخۆ نەدەگوت من بەهێزم

وفي رواية( عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: (أَوْلَى لَكَ فَأَوْلَى) (القيامة: ٣٤) أَشَيْءٌ قَالَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْ شَيْءٌ أَنْزَلَهُ اللَّهُ؟ قَالَ: (قَالَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ أَنْزَلَهُ اللَّهُ) رواه الحاكم في المستدرك وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ ووافقه الذهبي

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبیرەوە هاتووە دەڵێ: گوتمە ئیبنو عەباس خوا لێ رازی بێ ئەو رستە(أَوْلَى لَكَ فَأَوْلَى) ئایا پێغەمبەر فەرمووی یان ئایەتە بوو خوا دایبەزاند؟ ئەویش گوتی پێغەمبەر فەرمووی ، دوایش خوا دابەزاند بە شێوەی ئایەت.

## دەرسەکانی ئەم سوڕەتە :

١-بەڕاستی ئینسان نابێ یەك چرکەش قیامەتی لە بیربچێ.

چونکە خوا قیامەت بەبەیانی ناو دەبات هێندە نزیکە وەك فەرموویەتی :

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٨) الحشر

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن وە هەموو کەسێك با سەرنج بدات (بزانێ) چی پێش خۆی ناردووە بۆ پاشەڕۆژی وە لە خوا بترسن بەڕاستی خوا شارەزایە بەوەی کە دەیکەن.

٢-هەرگیز دژایەتی دینی خوا نەکەین .

**************************

# وتاری ژماره (١٢٧) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (المرسلات)

ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژمارە (٧٧)ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (٥٠) ئایەتە.

-ئەم سورەتە لە شاری (مەککە) دابەزیوە ، وەکو سورەتەکانی دیکەی مەککە باسی بابەتی عەقیدە دەکات و لەگەڵ رۆژی دوایی.

چەند تەوەرێکی گرنگی ئەم سورەتە :

١- لە سەرەتای ئەم سورەتدا باسی (با) دەکات و خوا سوێند بە جۆرەکانی مەلائیکە دەخوات ، کە کاروباری بۆنەوەریان پێ سپێردراوە ، وە دەڵێ قیامەت راستەو لەناوچونی بێ باوەڕانیش شتێکی مسۆگەرە.وەك فەرموویەتی:

(وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا ١ فَٱلْعَٰصِفَٰتِ عَصْفًا ٢ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشْرًا ٣ فَٱلْفَٰرِقَٰتِ فَرْقًا ٤ فَٱلْمُلْقِيَٰتِ ذِكْرًا ٥ عُذْرًا أَوْ نُذْرًا ٦ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٌ ٧) المرسلات

واتە: سوێند بە بای ڕەوانە کراوی، یەك لە دوای یەك. (١) وە بەو با توندانەش هەڵ دەکەن بە هەڵکردنێکی قایم. (٢) وە بەو بایانەی کە هەور دەبەن و بڵاوی دەکەنەوە. (٣) سوێندیش بەو (فریشتانە) ی بەچاکی حەق لە ناحەق جیا دەکەنەوە. (٤) ئینجا سوێند بەو (فریشتانە) ش پەیامی (خوا بە پێغەمبەران) دەگەیەنن. (٥) بۆ (نەهێڵانی) بەهانە (لێخۆش بوونیان) یا بۆ ترساندن. (٦) بەڕاستی ئەوەی کە بەڵێنتان پێ دراوە (لە هاتنی ڕۆژی دوایی) دێتە دی. (٧)

٢-دوای باسی ئەوە دەکات بەڵێن دراوە بە تاوانباران سزا دەدرێن لە کاتی خۆی ، وەك فەرموویەتی :

﴿فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتۡ ٨ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتۡ ٩ وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ نُسِفَتۡ ١٠ وَإِذَا ٱلرُّسُلُ أُقِّتَتۡ ١١ لِأَيِّ يَوۡمٍ أُجِّلَتۡ ١٢ لِيَوۡمِ ٱلۡفَصۡلِ ١٣ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ ١٤ ﴾

المرسلات

واته: ئینجا کاتێك كه ئەستێرەکان تاريك بوون. (٨) وه دەمێك كه ئاسمان كەلێنی تێ بوو. (٩) وه کاتێك کێوەکان له بێخ هێنران و تەخت کران. (١٠) وه ساتێك كه كاتی واده دانرا بۆ پێغەمبەران لەگەڵ ئوممەتەکانیاندا. (١١) بۆ چ ڕۆژێ دوا خراوه؟. (١٢) بۆ ڕۆژی جیاکردنەوه. (١٣) تۆ چووزانیت ڕۆژی جیاکردنەوه چی یه؟. (١٤)

٣–دوای باسی دەستەڵاتی خوا دەکات ، کە بەئاسانی لە دوای مردن ، مرۆڤ زیندو دەکاتەوە ، وەك فەرموویەتی :

﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ١٥ أَلَمۡ نُهۡلِكِ ٱلۡأَوَّلِينَ ١٦ ثُمَّ نُتۡبِعُهُمُ ٱلۡأٓخِرِينَ ١٧ كَذَٰلِكَ نَفۡعَلُ بِٱلۡمُجۡرِمِينَ ١٨ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ١٩ أَلَمۡ نَخۡلُقكُّم مِّن مَّآءٖ مَّهِينٖ ٢٠ ﴾

واته: وای بۆ بێ بڕوایان لەو ڕۆژەدا. (١٥) ئایا گەلانی پێشینانمان له ناو نەبرد. (١٦) له پاشان گەلانی دوای ئەوانمان وەك ئەوان لێ نەکرد. (١٧) هەر بەو جۆرەش دەکەین به گوناهباران. (١٨) وای بۆ بێ بڕوایان لەو ڕۆژەدا. (١٩)ئایا ئێوەمان دروست نەکردووه له ئاوێکی بێ نرخ؟.(٢٠)

٤–باسی بێ خەمی تاونباران دەکات بۆ ڕۆژی دوای ، بەڵام سزاو تۆڵەیان بۆ ئامادەکراوه ، وەك فەرموویەتی :

﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ٢٨ ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ٢٩ ٱنطَلِقُوٓاْ إِلَىٰ ظِلّٖ ذِي ثَلَٰثِ شُعَبٖ ٣٠ لَّا ظَلِيلٖ وَلَا يُغۡنِي مِنَ ٱللَّهَبِ ٣١ إِنَّهَا تَرۡمِي بِشَرَرٖ كَٱلۡقَصۡرِ ٣٢ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٞ صُفۡرٞ ٣٣﴾

واتە: بەم بێ بڕوایانە دەوترێت وای بۆ بێ بڕوایان لەو ڕۆژەدا. (٢٨) بڕۆن بۆ لای ئەو دۆزەخەی کە بە درۆتان دەزانی. (٢٩) بڕۆن بۆ لای سێبەری دوکەڵێکی سێ بەش. (٣٠) نە سێبەرێکی فێنکەو نە شتێك لە گڕەی (دۆزەخ) بەرگری دەکات. (٣١) بەڕاستی دۆزەخ پزیسکی وەك کۆشك دەهاوێژێ. (٣٢) بەرەودوا دەڕۆن ئەڵێ ی کاروانی حوشتری زەردن. (٣٣)

٥–پاش باس کردنی سزای تاوانباران ، باسی پاداشتی پارێزکاران دەکات کە چۆن ڕێزیان لێ دەگیرێ و نازونیعمەتی زۆریان بۆ ئامادەکراوە ، وەك فەرموویەتی :

(إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي ظِلَٰلٖ وَعُيُونٖ ٤١ وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشۡتَهُونَ ٤٢ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٤٣ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٤٤ )

واتە: بێگومان پارێزکاران لە سێبەرو (قەراغی) کانیاوی زۆران. (٤١) وە لەناو میوەهاتێکدان کە حەزی لێ دەکەن. (٤٢) پێیان دەڵێن بخۆن و بخۆنەوە نۆشتان بێ بەهۆی ئەوەی کە دەتان کرد. (٤٣) بێگومان ئێمە ئاوا پاداشتی چاکان دەدەینەوە. (٤٤)

٦–لە کۆتایدا باسی هۆکاری خوا نەپەرستی کافران دەکات ، کە بریتیە لە سەرکەشی و خۆبەزل زانین ، وەك فەرموویەتی :

(وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ٤٥ كُلُواْ وَتَمَتَّعُواْ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجۡرِمُونَ ٤٦ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ٤٧ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرۡكَعُواْ لَا يَرۡكَعُونَ ٤٨ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ٤٩ فَبِأَيِّ حَدِيثِۢ بَعۡدَهُۥ يُؤۡمِنُونَ ٥٠ ) المرسلات

واتە: وای بۆ بێ بڕوایان لەو ڕۆژەدا. (٤٥) ئەی کافران بخۆن و بەهرەمەند ببن ماوەیەکی کەم (لە دنیادا) بەڕاستی ئێوەن تاوانباران. (٤٦) وای بۆ بێ بڕوایان لەو ڕۆژەدا. (٤٧) وە کاتێك پێیان بوترێ (لەخوا بترسن و) کڕنوش بەرن کڕنوش نابەن. (٤٨) وای بۆ بێ

بڕوایان لەو ڕۆژەدا. (٤٩) ئەگەر ئەوان باوەڕ بە قورئان نەکەن ئیتر بـە چ فەرمودەیـەکی تر بڕوا دەهێنن دوای قورئان؟. (٥٠)

## پرسیار ئایا کەی و لە کوێ ئەم سوڕەتە دابەزی؟

وەڵام : لە شەوی مارەکە دابەزیوە وەك لەم دەقاندا هاتووە :

(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَارٍ بِمِنًى إِذْ نَزَلَ عَلَيْهِ وَالْمُرْسَلَاتِ وَإِنَّهُ لَيَتْلُوهَا وَإِنِّي لَأَتَلَقَّاهَا مِنْ فِيهِ وَإِنَّ فَاهُ لَرَطْبٌ بِهَا إِذْ وَثَبَتْ عَلَيْنَا حَيَّةٌ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اقْتُلُوهَا فَابْتَدَرْنَاهَا فَذَهَبَتْ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وُقِيَتْ شَرَّكُمْ كَمَا وُقِيتُمْ شَرَّهَا) رواه البخاري

واتە: لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە هاتووە خوای لێ ڕازی بێ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر بووین لە ئەشکەوتێك لە مینا لەو کاتە سوڕەتی (المرسلات)ی بۆ دابەزی ، ئەو خوێندیەوە منیش لە دەمی موبارەکی ئەوم وەرگرت کە هێشتا دەمی هەر تەڕبوو (واتە: هەر زوو زوو لەبەرم کرد یەکسەر) دەڵێ لەو کاتدا مارێك هاتە دەر پێغەمبەر فەرمووی : پەلەبکەن بیکوژن ، بەڵام خێرا مارەکە ڕۆیشت فریا نەکەوتین بیکوژین ، فەرمووی: لە دەستان قورتار بوو ، وەك چۆن ئێوە لە شەڕی ئەو قورتاربوون.

وفي رواية(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَارٍ وَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا فَنَحْنُ نَأْخُذُهَا مِنْ فِيهِ رَطْبَةً إِذْ خَرَجَتْ عَلَيْنَا حَيَّةٌ فَقَالَ اقْتُلُوهَا فَابْتَدَرْنَاهَا لِنَقْتُلَهَا فَسَبَقَتْنَا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَاهَا اللَّهُ شَرَّكُمْ كَمَا وَقَاكُمْ شَرَّهَا) رواه مسلم

وفي رواية(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ نَزَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا لَيْلَةَ الْحَيَّةِ قَالَ فَقُلْنَا لَهُ وَمَا لَيْلَةُ الْحَيَّةِ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِحِرَاءٍ لَيْلًا خَرَجَتْ عَلَيْنَا حَيَّةٌ مِنْ الْجَبَلِ فَأَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقَتْلِهَا فَطَلَبْنَاهَا فَأَعْجَزَتْنَا فَقَالَ دَعُوهَا عَنْكُمْ فَقَدْ وَقَاهَا اللَّهُ شَرَّكُمْ كَمَا وَقَاكُمْ شَرَّهَا (رواه احمد ) ٤٣٧٧قال الشيخ شعيب الأرناؤوط : صحيح ، وهذا إسناد حسن

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی ( ٤٨ ) سورەتی ( المرسلات )

(وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرْكَعُواْ لَا يَرْكَعُونَ ٤٨

واتە: (وإذا قيل لهم اركعوا لا يركعون) خۆ کاتێ چ لەدونیادا، چ لەقیامەتدا پێیان بگوترێ : کڕنوش و رکوع ببەن بۆخوا، رکوع و سوژدە نابەن، واتە: نوێژی بۆ ناکەن کاتێ کە لەدونیاد بوون بەعەیبیان دەزانی رکوع و سوژدە بەرن! دیارە لەولایش -واتە: رۆژی قیامەت- ناتوانن بچەمێنەوە

(عَن مُجَاهِد فِي قَوْله: (وَإِذا قيل لَهُم ارْكَعُوا لَا يَرْكَعُونَ) قَالَ: نزلت فِي ثَقِيف) الدر المنثور ولباب المنقول

واتە:لە موجاهیدەوە هاتووە دەڵێ : فەرمایشتی خوای گەورە (وَإِذا قيل لَهُم ارْكَعُوا لَا يَرْكَعُونَ) دابەزیوە دەربارەی هۆزی سەقیف

-(قال مجاهد: (اركعوا) (الحج: ٧٧): (صلوا)، (لا يركعون) (المرسلات: ٤٨): (لا يصلون) البخاري

واتە: موجاهید دەڵێ: (اركعوا) واتە نوێژبکەن ، وە (لا يركعون) واتە: نوێژ ناكەن

## دەرسەكانی ئەم ئایەتە :

١- گرنگی نوێژ لە ئیسلامد

٢-بیركردنەوە لە مردن و قیامەت

## كاریگەری ئەم سورەتە لەسەر پێغەمبەر :

( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ شِبْتَ. قَالَ: (شَيَّبَتْنِي هُودٌ وَالْوَاقِعَةُ وَالْمُرْسَلَاتُ وَعَمَّ يَتَسَاءَلُونَ وَإِذَا الشَّمْسُ كورت) (رواه الترمذي و الحاكم) صحيح

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: ئەبوبەكر گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا وا پیر بووی ، ئەویش فەرمووی : ئەو سورەتانە پیریان كردم ١-هود ٢- الواقیعە ٣-المرسلات ٤- وَعَمَّ يَتَسَاءَلُونَ ٥- وَإِذَا الشَّمْسُ كورت .

وفی روایە(عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ، قَالَ: قَالُوا لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نَرَاكَ قَدْ شِبْتَ. قَالَ: (شَيَّبَتْنِي هُودٌ وَأَخَوَاتُهَا) رواه الطبراني قال الالباني صحيح

ئایا دەزانن بۆچی ئەم سورەتانە كاریان لە پێغەمبەر كردوە ؟ چونكە باسی قیامەت دەكەن ، بەتایبەتی سورەتی (هود) باسی ئیستقامەت دەكات وەك فەرموویەتی :

(فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْاْ ۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ١١٢) هود

واتە: مەردانە خۆت راگرە: دەسا خۆتو ئەوانە لەگەڵ تۆدان و تەوبەیان لەشیرك و كردەوەی خراپكردووە، بەوجۆرە خوا فەرمانی پێكردون بەراست و رێك خۆڕاگرە و لەسنوورو یاسای خوا تێمەپەڕن چونكە هەركارو كردەوەیە دەكەن خوا دەیبینێ و دەیزانێ . (ڕامان)

وەهەروەها لەم سورەتە دەفەرمووێ مەیلی دڵتان بۆ لای زاڵمان نەچێ

﴿وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ١١٣﴾ هود

واتە: بەهیچ شێوەیەك مەیل مەكەن بۆلای ئەوانەی ستەمیان كردووە، واتە: پاڵیان پێوەمەدەن و پشتگیرییان لێ مەكەن و، بەكردەوەیان رازیی مەبن دەنا ئاگر ئەوقەتان ئەبێ و دەسووتێن. شێخی (بەیزاویی) لەمانای (ركون)دا دەڵێت: (هو المیل الیسیر. أي لا تمیلوا إلیهم أدني میل فتمسكم النار بركونكم إلیهم، وإذا كان الركون الیسیر إلي من وجد منه میل ما یسمي ظلما كذلك، فما ظنك بالركون إلی الظالمین الموصوفین بالظلم، والمیل إلیهم كل المیل) واتە: (ركون) بەكەمترین مەیل و پاڵ پێوەدان دەڵێن، جا ئەگەر مرۆڤ بەكەمترین مەیلدان بەلای موشریكان و زاڵمانەوە، بسووتێ و گیرۆدە ببێت، دەبێ حاڵی زاڵمان خۆیان و ئەوانەی وا بەتەواوی هاوكارییان دەكەن چۆن بێ؟(قەتادە) ئەڵێ: مانای ئەم ئایەتە ئەوەیە كەناهەقكاران و ستەمكارانتان خۆش نەوێ و، بەقسەشیان مەكەن. (ڕامان)

ئایا كێ بیر لە قیامەت ومردن دەكاتەوە؟ تەنها ئینسانی عاقڵ وەك پێغەمبەر فەرموویەتی :

(عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَامَ فَتًى فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ الْمُؤْمِنِينَ أَكْيَسُ؟ قَالَ: (أَكْثَرُهُمْ لِلْمَوْتِ ذِكْرًا، وَأَحْسَنُهُمْ لَهُ اسْتِعْدَادًا قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ بِهِ، أُولَئِكَ الْأَكْيَاسُ) حلية الاولياء

واتە: گەنجێك هەستا گوتی : ئەی نێرراوی خوا ئاقڵترین ئیماندار كێیە؟ فەرمووی : كێ زۆر یادی مردن بكات و خۆی بۆ ئامادە بكات.

وفي رواية(عَنْ ابْنِ عُمَرَ أَنَّهُ قَالَ كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَاءَهُ رَجُلٌ مِنْ الْأَنْصَارِ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الْمُؤْمِنِينَ أَفْضَلُ قَالَ أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا قَالَ فَأَيُّ الْمُؤْمِنِينَ أَكْيَسُ قَالَ أَكْثَرُهُمْ لِلْمَوْتِ ذِكْرًا وَأَحْسَنُهُمْ لِمَا بَعْدَهُ

اسْتِعْدَادًا أُولَئِكَ الْأَكْيَاسُ) ابن ماجه قال الالباني حسن (أَكْيَسُ: أي أعقل. كاس يكيس كيسا. الكيس الثقل)

## یادی مردن دڵ نەرم دەکات :

( كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنِ زِيَارَةِ الْقُبُورِ أَلاَ فَزُورُوهَا فَإِنَّهَا تُرِقُّ الْقَلْب وَتُدْمِعُ الْعَيْنَ وَتُذَكِّرُ الآخِرَةَ وَلَا تَقُولُوا هُجْرًا) رواه الحاكم قال الالباني صحيح ( (هُجْرًا) اي فحشاً من الصياح والنياح)

واتە: پێشان ڕێگریم لێ کردن بچنە سەر قەبران ، بەڵام ئیستا بڕۆن ، چونکە سەردانی گۆڕستان دڵ نەرم دەکاتەوە ، فرمێسك لە چاوان دێنێ ، قیامەت بیردەخاتەوە

## پێشەوا ( علی ) خوا لێی رازی بێ سەردانی گۆرستان دەکات :

(مر عَليّ بن أبي طَالب رَضِي الله عَنهُ بالمقابر فَوقفَ عَلَيْهَا فَقَالَ السَّلَام عَلَيْكُم أهل الديار الموحشة والمحال المقفرة أَنْتُم لنا سلف وَنحن لكم تبع وبكم عَمَّا قَلِيل لاحقون اللَّهُمَّ اغْفِر لنا وَلَهُم وتجاز عَنَّا وعنهم طُوبَى لمن ذكر الْمَعَاد وَعَمِلَ لِلْحساب وقَنَعَ بالكفاف وَرَضِي فِي جَمِيعِ أَحْوَالِهِ عَن اللهِ تَعَالَى، ثمَّ قَالَ يَا أهل الْقُبُورِ أما الزَّوْجَات فقد نكحتْ وَأما الديار فقد سكنتْ وَأما الْأَمْوَال فقد قسمتْ هَذَا خبر مَا عندنَا فَمَا خبر مَا عنْدكُمْ ثمَّ الْتفت إِلَى أَصْحَابه فَقَالَ أما أَنهم لَو تكلمُوا لقالوا وجدنَا خير الزَّاد التَّقْوَى ) الكتاب : العاقبة في ذكر الموت

واتە: رۆژێك پێشەوا (علی) بەلای گۆڕستانێکدا رابرد، لەسەر قەبران راوەستا، گوتی: سڵاوتان لێ بێ ئەی ئەهلی گۆرستان، ئێوە رۆیشتن ئێمەش لە دوای ئێوە دێنە ئێرە،خوایە لێیان خۆشبە، خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی یادی رۆژی قیامەتی کردوە و ئیشی بۆ لێپچینەوە کردوە، وە لە دونیا لە خوا رازی بووە، دوای گوتی: ئەی ئەهلی گۆرستان خێزانەکان مارەکرانەوە، خانوەکان کەسانی دیکەی تێدا نیشتەجێ یە،

سامانەکان دابەشکران، ئەوە هـەواڵی لای ئێمەیـە، ئـەدی هـەواڵی لای ئێـوە چـییە؟ دوای ئاوری دایەوە لای هـاوەڵانی گـوتی: ئەگـەر ئـەم مردوانـە قسـەیان کردبایـە ، دەیـانگوت : باشترین زاد و زەخیرە تەقوایە.

*********************

# وتاری ژماره (١٢٨) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (النازعات)

ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژمارە (٧٩)یە وە ژمارەی ئایەتەکانی (٤٦) ئایەتە.

–ئەم سورەتە لە شاری (مەککە) دابەزیوە ، وەکو سورەتەکانی دیکەی مەککە باسی بابەتی عەقیدە دەکات و لەگەڵ ڕۆژی دوایی.

(ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُ ۚ بَنَىٰهَا ٢٧ رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّىٰهَا ٢٨ وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَىٰهَا ٢٩ وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ٣٠ أَخْرَجَ مِنْهَا مَآءَهَا وَمَرْعَىٰهَا ٣١ وَٱلْجِبَالَ أَرْسَىٰهَا ٣٢ مَتَٰعًا لَّكُمْ وَ لِأَنْعَٰمِكُمْ ٣٣ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلْكُبْرَىٰ ٣٤ يَوْمَ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ ٣٥ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ٣٦ )

) واتە: ئایا دروست کردنی ئێوە گرانترە یا ئاسمان ؟ دروستی کرد. (٢٧) باڵای بەرز کردەوەو ڕێکی خست. (٢٨) وە شەوی ئەوی تاریك کرد و دەری خست(ڕووناکی) ڕۆژی. (٢٩) لە پاشان زەوی ڕاخست. (٣٠) لێ ی دەرهێنا ئاویی و لەوەڕی. (٣١) وە شاخەکانی پتەو دامەزراند. (٣٢) بۆ بەهرەمەندی خۆتان و ئاژەڵتان. (٣٣) ئینجا کاتێك کە ڕووداوی گەورە هات، مەبەست لە ڕۆژی دوایی یە. (٣٤) ئەو ڕۆژەی کە مرۆڤ کردەوەی خۆی تێدا بیر دەکەوێتەوە. (٣٥) وە دۆزەخ پیشاندرا بۆ هەر کەسێك کە بڕوانێ. (٣٦)

## چەند تەوەرێکی گرنگی ئەم سوڕەتە :

١- لە سەرەتادا سوێند بەفریشتەکان دەخوا ، کە بەنەرمی روحی ئیمانداران دەکێشن ، وە بە توندی روحی تاوانباران دەکێشن ، بە فەرمانی خوا ئەم کارانە جێ بەجێ دەکەن ، وەك فەرموویەتی :

**(وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرۡقٗا ١ وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشۡطٗا ٢ وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبۡحٗا ٣ فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبۡقٗا ٤ فَٱلۡمُدَبِّرَٰتِ أَمۡرٗا ٥ )** **واتە** : سوێند بەو فریشتانەی کە گیانی کافران(لە لەشیان) بە سەختی دەردەهێنن. (١) وە بەو فریشتانەی کە گیانی باوەڕداران بە ئاسانی دەردێنن. (٢) وە سوێند بەو فریشتانەی کە خێرا فەرمانی خوا جێ بەجێ دەکەن. (٣) وە سوێند بەو فریشتانەی کە پێش برکێ دەکەن لە بەجێ هێنانی فەرماندا. (٤) وە سوێند بەو فریشتانەی کە تەگبیری کاروبار دەکەن، واتە سوێند بەمانە ئەوەی بەڵێنتان پێدراوە دێتە دی. (٥)

٢-وێنای هاوبەشدانەران دێنیتەوە لە ڕۆژی قیامەت ، کەبە درۆیان دەزانی ، وەك فەرموویەتی:

**(يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ٦ تَتۡبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ٧ قُلُوبٞ يَوۡمَئِذٖ وَاجِفَةٌ ٨ أَبۡصَٰرُهَا خَٰشِعَةٞ ٩ يَقُولُونَ أَءِنَّا لَمَرۡدُودُونَ فِي ٱلۡحَافِرَةِ ١٠ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا نَّخِرَةٗ ١١ قَالُواْ تِلۡكَ إِذٗا كَرَّةٌ خَاسِرَةٞ ١٢ فَإِنَّمَا هِيَ زَجۡرَةٞ وَٰحِدَةٞ ١٣ فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ ١٤ )**

**واتە** : لە ڕۆژێکدا(فوو دەکرێ بە شەیپوردا) بومەلەرزە زەوی دەلەرزێنێ. (٦) دووبارە فووی پیادەکرێتەوە ، بومەلەرزەیەکی تریشی بەدوادا دێت، مردووان زیندوو دەبنەوە. (٧) زۆر دڵ لەو ڕۆژەدا دەلەرزێ. (٨) چاویان سەر بەرەو ژێر دەبێ. (٩) ئەمڕۆ بەگاڵتەوە دەڵێن ئاخۆ ئێمە(لە پاش مردن) دەگەڕێنرێینەوە بۆ ژیانی پێشوو؟. (١٠) ئایا کە بووین بە ئێسقانی ڕزیو چۆن زیندوو دەبینەوە. (١١) وتیان: ئائەوە ئەگەر وابێ گەڕانەوەیەکی بەزیانە. (١٢) بێگومان ئەو زیندوو بوونەوەیە هەر یەك نەعرەتەیە. (١٣) ئیتر کتوپڕ وان لە دەشتێکی سپی کاکی بە کاکیدا. (١٤)

٣–باسی فرعونی سەرکەش دەکات ، کە داوای خوایەتی دەکرد ، و خواش لەناو دەریادا خنکاندی لەگەڵ شوێنکەوتوانی . وەك فەرموویەتی :

(هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ١٥ إِذۡ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوًى ١٦ ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ١٧ فَقُلۡ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ ١٨ وَأَهۡدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخۡشَىٰ ١٩ فَأَرَىٰهُ ٱلۡأٓيَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰ ٢٠ فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ٢١ ثُمَّ أَدۡبَرَ يَسۡعَىٰ ٢٢ فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ٢٣ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ٢٤ فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلۡأٓخِرَةِ وَٱلۡأُولَىٰٓ ٢٥ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةً لِّمَن يَخۡشَىٰٓ ٢٦ )

**واتە:** ئایا داستانی مووسات پێ گەیشتووە. (١٥) (کاتێك کەپەروەردگاری بانگی کرد لەشیووی پیرۆزی گووا وە. (١٦) پێ ی وت برۆ بۆ سەر فیرعەون(چونکە) بەڕاستی یاخیی بووە. (١٧) وە پێ ی بڵێ: ئایا دەتەوێ پاك ببیتەوە لە گوناه. (١٨) وە رێت نیشاندەم بۆ(ناسینی) پەروەردگارت تا لێی بترسیت. (١٩) ئینجا نیشانە هەرە گەورەکەی نیشان دا. (٢٠) کەچی بە درۆی زانی و سەرپێچی کرد. (٢١) لە پاشان پشتی هەڵکرد و ڕۆی بەپەلە. (٢٢) ئینجا(جادوو گەرانی) کۆکردەوەو بانگی کردن و. (٢٣) وتی: من پەروەردگاری هەرە گەورەتانم. (٢٤) ئینجا خوا گرفتاری کرد بە سزای هەردوو جیهان. (٢٥) بەڕاستی لەم داستانەدا پەند هەیە بۆ کەسێك لەخوا بترسێ. (٢٦)

٤–باسی ئەوە دەکات خەڵکی دەبن بە دوو بەش ، بەشێك خوا دەپەرستن ، وە بەشێك بە دوای نەفس و شیتان دەکەون ، وەك فەرموویەتی :

(فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ٣٧ وَءَاثَرَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ٣٨ فَإِنَّ ٱلۡجَحِيمَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ ٣٩ وَأَمَّا مَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ ٤٠ فَإِنَّ ٱلۡجَنَّةَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ ٤١ )

**واتە :** لەو ڕۆژەدا چاکە و خراپە بەپێ ی کردەوە دابەش دەکرێ ئینجا ئەو کەسەی سەر کەش بووبێ. (٣٧) وە ژیانی دنیای هەڵبژاردبێ. (٣٨) ئەوە بێگومان دۆزەخ جێگایەتی. (٣٩) وە ئەو کەسەی کە ترسابێ لە هەڵوێستگەی بەردەم پەروەردگاری و بەرگری

نەفسی خۆی كردبێ لـە ئـارەزووی خراپـە. (٤٠) ئـەوە بێگومـان بەهەشـت جێگایـەتی. (٤١)

٥-لە كۆتایدا باسی هاتنی ڕۆژی قیامەت دەكات ، كـە كـافران بـە درۆیـان دەزانـی ، وەك فەرموویەتی :

﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ٤٢ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ٤٣ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ٤٤ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا ٤٥ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا ٤٦﴾ **واتە:** پرسیارت لێ دەكەن دەربارەی ڕۆژی دوایی كـەی دەبـێ. (٤٢) تۆ چیت داوە لە بیر لێ كردنەوەی، واتـە تـۆ چـۆن لـەم بـارەوە دەدوێـی؟ . (٤٣) زانینی ئەوە هەر لای پەروەردگارتە . (٤٤) بێگومان تۆ هەر ترسێنەری كەسێكیت كەلـەو ڕۆژە بترسێ. (٤٥) بێ بڕواكان كە ئەو ڕۆژە دەبینن وا دەزانن كە نەماونەتەوە ئێوارەیەك یا چێشتەنگاوێك نەبێ لە دونیادا. (٤٦)

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٤٢-٤٥) سورەتی (النازعات)

﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ٤٢ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ٤٣ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ٤٤ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا ٤٥﴾ النازعات

**واتە** : پرسیارت لێ دەكەن دەربارەی ڕۆژی دوایی كەی دەبێ. (٤٢) تۆ چیت داوە لە بیر لـێ كردنـەوەی، واتـە تـۆ چـۆن لـەم بـارەوە دەدوێـی؟ . (٤٣) زانـینی ئـەوە هـەر لای پەروەردگارتە . (٤٤) بێگومان تۆ هەر ترسێنەری كەسێكیت كەلـەو ڕۆژە بترسـێ. (٤٥) بێ بڕواكان كە ئەو ڕۆژە دەبینن وا دەزانن كـە نەماونەتـەوە ئێوارەیـەك یـا چێشـتەنگاوێك نەبێ لە دونیادا. (٤٦)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

( عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا يَزَالُ يَذْكُرُ شَأْنَ السَّاعَةِ حَتَّى نَزَلَتْ (يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا) (النازعات: ٤٢) إِلَى (مَنْ يَخْشَاهَا) (النازعات: ٤٥) الطبري في تفسيره

واتە: لە تاریقی کوڕی شەهابەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر بەردەوام باسی هاتنی قیامەتی دەکرد تاکو ئەم ئایەتەی بۆ دابەزی (يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا)

واتە: لەبابەت ڕۆژی قیامەتەوە: لێت دەپرسن کە چ کاتێ ڕوو ئەدا ؟ تاکو دەگاتە (مَنْ يَخْشَاهَا)

وفي رواية( عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُسْأَلُ عَنِ السَّاعَةِ حَتَّى أُنْزِلَ عَلَيْهِ (يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا فِيمَ أَنْتَ مِنْ ذِكْرَاهَا إِلَى رَبِّكَ مُنْتَهَاهَا) (النازعات: ٤٣ )رواه الحاكم في المستدرك وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ

واتە: لە عائیشەی دایکی ئیمانداران هاتووە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پرسیاری هاتنی قیامەت لە پێغەمبەر دەکرا تاکو ئەم ئایەتەی بۆ دابەزی (يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا فِيمَ أَنْتَ مِنْ ذِكْرَاهَا إِلَى رَبِّكَ مُنْتَهَاهَا)

واتە: پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ڕۆژی دوایی کەی دەبێ.(٤٤) تۆ چیت داوە لە بیر لێ کردنەوەی، واتە تۆ چۆن لەم بارەوە دەدوێی؟ (٤٥)زانینی ئەوە هەر لای پەروەردگارتە (٤٦)

## ئایا پێغەمبەر دەزانێ کەی قیامەت دادێ؟

وەلاّم : نەخێر پێغەمبەریش لەگەڵ ئەم هەموو مەقامە بەرزە نازانێ چونکە ئەمە بە دەقـی ئایەتە بڕاوتەوە وەك لە کۆتایی سورەتی (لقمان) باسکراوە .

(إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٞ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗاۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرُۢ ٣٤ )لقمان

واتە: هەر خوا زانای گشت باو بارانێکە: ئینجا خوا باسی پێنج شت ئـەکات کەتـەنها هـەر خۆی ئەیانزانێ: ١- (إن الله عنده علم الساعة) بەڕاستی زانیاریی هاتنی ڕۆژی قیامـەت هەرلای خوایـە، جگـە لـەو هـیچ کەسێك نـازانێ قیامـەت کـەی دێت، وەك لـەجێگای تـردا دەفەرموێ: (لا يجليها لوقتها إلا هـو) ٢- (و ينـزل الغيـب) تـەنها ئـەویش بـاران ئـەبارێنی لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا، کەسێکی تر ناتوانێ باران ببـارێنێ. ٣- (ويعلـم مـا في الأرحـام )ئەویش ئەزانێ چی لە منداڵدانەکاندایە، واتە: هەر لەوکاتەوە کـەهێمان ئـاوە، خـوا خـۆی دەزانێ چییە: کوڕە یان کچ، بەختیارو سەرفرازە، یـان لاسـارو بەدبەختـە، بـەژن و باڵـای کورتە، یا..هتد. ٤- **(وما تدري نفس ماذا تكسب غـدا)** ( هـیچ کەسێك – نـە چاکەکار و نەخراپەکار– سەد لەسەد نازانێت سبەینێ چـی دەکـا لەچاك و لـەخراپ. ٥-( ومـا تـدري نفس بأي أرض تموت) هیچ کەسیش نازانێ لە کـام سـەرزەویی ئـەمرێ، واتـە: کـام جێگـا دەبێتـە گۆڕو ئارامگای، هەرچەند لەوانەیە هەوڵیش درابێ بۆ زانـینی ئەمـە ! (إن الله علـيم خـبير) چـونکە هـەر خوایـە زانـا و بەئاگایـە بەتـەواوی ڕووداوەکـان و گشـت نهـێنی و ئاشکرایەکیشی لایەکسانە. (وعنده مفاتح الغيب لا يعلمها إلا هو ..)، هەر بۆ دووپاتی ئـەم ماناو مەبەستەیە.

************************

# وتاری ژماره (١٢٩) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سوڕەتی (عبس)

ئەم سوڕەتە لە ریزبەندا ژمارە (٨٠)یە وە ژمارەی ئایەتەکانی (٤٢) ئایەتە.

–ئەم سوڕەتە لە شاری (مەککە) دابەزیوە ، وەکو سوڕەتەکانی دیکەی مەککە باسی بابەتی عەقیدە دەکات و لەگەڵ ڕۆژی دوایی و دروست کردنی ئینسان وخواردەمەنیەکان

## چەند لایەنەکی ئەم سوڕەتە :

١–لەسەرەتای ئەم سوڕەتە باسی چیرۆکی (عبداللە کوری ئوم مەکتوم) دەکات ، کە هات پرسیاری ئایینی لە پێغەمبەر کرد ، ئەوەیش پشتی تێکرد ، چونکە لەو کاتدا قسەی بۆ سەرکردەکانی قوریش دەکرد ، وبانگی دەکردن بۆ ئیسلام ، بەلاّم خوا گلەیی لە پێغەمبەر کرد و ئایەتی دابەزاندن و فەرمووی

(عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ١ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ٢ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ٣ أَوۡ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكۡرَىٰٓ ٤ أَمَّا مَنِ ٱسۡتَغۡنَىٰ ٥ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ٦ )

واتە: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕووی گرژ کرد و پشتی هەڵکرد. (١) کە کوێرێک هاتە لای. (٢) تۆ چووزانیت ؟ بەڵکو ئەو(کوێرە) بیەوێ پاك ببێتەوە. (٣) یا بیری بکەوێتەوە(ئەوەی کە لە بیری چۆتەوە) ئینجا ئەو بیر کردنەوەیە سوودی پێ بگەیەنێت. (٤) کەچی ئەوی کە خۆی بێ نیاز دەزانێ. (٥) تۆ ڕووی تێ دەکەیت. (٦)

٢–باسی سەرکەشی وکوفری ئینسان دەکات ، لەگەڵ ئەم هەموو نازونیعمەتە ، وەك فەرموویەتی :

﴿قُتِلَ ٱلۡإِنسَٰنُ مَآ أَكۡفَرَهُۥ ١٧ مِنۡ أَيِّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ ١٨ مِن نُّطۡفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ١٩ ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ ٢٠ ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقۡبَرَهُۥ ٢١ ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ ٢٢ كَلَّا لَمَّا يَقۡضِ مَآ أَمَرَهُۥ ٢٣

واتـه: بەكوشـت چـێ(خـراپترین نـەفرینی لـێ بـێ) ئـادەمی، چـەند پـێ نەزانـە. (١٧) بیرناکاتەوە بزانـێ کـە خـوا لـە چـی دروسـتی کـردووە؟ . (١٨) لـەدڵۆپێك ئـاو دروسـتی کردووە و ڕێکی خستووە. (١٩) لەپاشان ڕێگای(چاك و خراپی) بۆ ئاسان کردووە. (٢٠) ئینجـا دەیمـرێنێ و دەیخاتـە گـۆڕەوە. (٢١) لـە پاشـان کـاتێ کـە ویسـتی زینـدووی دەکاتەوە. (٢٢) بەڕاستی ئەوی کە خـوا فـەرمانی پـێ داوە هێشـتا(ئـادەمیی) بـەجێ ی نەهێناوە. (٢٣)

٣-باسی دەستەڵاتی خوا دەکات لەم بونەوەرە ، وە چۆن دانەوێڵە ومیـوەی بـۆ ئینسـان فەراهمهێناوە ، وەك فەرموویەتی :

﴿فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ٢٤ أَنَّا صَبَبۡنَا ٱلۡمَآءَ صَبّٗا ٢٥ ثُمَّ شَقَقۡنَا ٱلۡأَرۡضَ شَقّٗا ٢٦ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبّٗا ٢٧ وَعِنَبٗا وَقَضۡبٗا ٢٨ وَزَيۡتُونٗا وَنَخۡلٗا ٢٩ وَحَدَآئِقَ غُلۡبٗا ٣٠ وَفَٰكِهَةٗ وَأَبّٗا ٣١ مَّتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ ٣٢ ﴾

واتـە: دەبـا مـرۆڤ سـەیری خواردەمەنیەکـەی بکـات. (٢٤) بەڕاسـتی ئێمـە لـە هـەورەوە بارانمان دارژاند چۆن دارژاندنێك. (٢٥) لە پاشان زەوی مان لەت لەت کـرد (بـەگیا) چـۆن لەت کردنێك. (٢٦) ئینجـا ڕووانمـان لـەناوییا دانەوێڵـە. (٢٧) و تـرێ و سـەوزە. (٢٨) و زەیتون و دار خورمـا. (٢٩) و باخـاتی چـڕوپڕو. (٣٠) میـوە و لـەوەڕ. (٣١) بـۆ ژیـانی خۆتان و ئاژەڵتان. (٣٢)

٤-باسی ناخۆشییەکانی ڕۆژی قیامەت دەکات ، کە چـۆن مـرۆڤ لەبـەر سـەختی ئـەم ڕۆژە لەبەر کەس وکاری ڕادەکا وە باسی حـاڵی ئیمانـدار و کـافرانیش دەکـات لـەم ڕۆژە ، وەك فەرموویەتی

﴿فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ ٣٣ يَوْمَ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ٣٤ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ٣٥ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ٣٦ لِكُلِّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ٣٧ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ ٣٨ ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ ٣٩ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ٤٠ تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ ٤١ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَفَرَةُ ٱلْفَجَرَةُ ٤٢﴾

واته: كاتێك كه شاخه و شریخه(ی ڕۆژی دوایی) هات. (٣٣)ئه‌و ڕۆژه‌ی كه مرۆڤ ڕاده‌كات له برای. (٣٤) و دایكی و باوكی. (٣٥) و ژنی و كوڕانی. (٣٦) هه‌موو یه‌كێك له‌وان له‌و ڕۆژه‌دا كارێكی وای هه‌یه كه كه‌س سه‌ر كه‌سی تری نه‌په‌رژێ. (٣٧) زۆر ڕوخسار له‌و ڕۆژه‌دا گه‌ش و جوانن. (٣٨) ده‌م به پێكه‌نین و شادمانن. (٣٩) وه زۆر ڕوخسار له‌و ڕۆژه‌دا، ته‌پوتۆزیان به‌سه‌ره‌وه‌یه. (٤٠) له داماویدا ڕه‌ش داگیرساون. (٤١) ئه‌وانه ئه‌وانه‌ن كه بێ باوه‌ڕ و گوناهكار و تاوانبارن. (٤٢)

## ١-هۆی دابه‌زینی ئایه‌تی (١-٤) سوره‌تی (عبس)

﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ١ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ٢ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ٣ أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ٤﴾

**واته :** پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) ڕووی گرژ كرد و پشتی هه‌ڵكرد. (١) كه كوێرێك هاته لای. (٢) تۆ چووزانیت ؟ به‌ڵكو ئه‌و(كوێره) بیه‌وێ پاك ببێته‌وه. (٣) یا بیری بكه‌وێته‌وه(ئه‌وه‌ی كه له بیری چۆته‌وه) ئینجا ئه‌و بیر كردنه‌وه‌یه سوودی پێ بگه‌یه‌نێت. (٤) كه‌چی ئه‌وی كه خۆی بێ نیاز ده‌زانێ. (٥) تۆ ڕووی تێ ده‌كه‌یت. (٦)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: أُنْزِلَتْ عَبَسَ وَتَوَلَّى فِي ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ الْأَعْمَى فَقَالَتْ: أَتَى إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَعَلَ يَقُولُ: أَرْشِدْنِي، قَالَتْ: وَعِنْدَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ عُظَمَاءِ الْمُشْرِكِينَ، قَالَتْ: فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعْرِضُ عَنْهُ وَيُقْبِلُ عَلَى الْآخَرِ وَيَقُولُ: (أَتَرَى مَا أَقُولُ بَأْسًا) فَيَقُولُ: (لَا) فَفِي هَذَا أُنْزِلَتْ عَبَسَ وَتَوَلَّى) الحاكم في المستدرك ووافقه الذهبي والترمذي وابن حبان قال الالباني صحيح الاسناد

واتە: لە عائیشەی دایکی ئیمانداران هاتووە خوا لێی رازی بێ دەڵێ: (عبس وتولى) دابەزیوە بۆ کوڕی مەکتومی کوێر، دەڵێ : هاتە لای پێغەمبەر گوتی: رێنمایم بکە بۆ شارەزا بوون لە ئایین ، وە لەو کاتدا گەورەکانی موشریکان لە دەوری پێغەمبەر بوون ، لەگەڵ ئەوان قسەی دەکرد، بۆیە پشتی لە عبدالله کرد ، عبدالله ش نەی دەدیت پێغەمبەر سەرقاڵی ئەوەیە ئامۆژگاری سەرانی قوریش دەکات ، لەبەر ئەوە (عبس وتولى) دابەزی.

وفى روايه(بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ قَوْلُهُ تَعَالَى: عَبَسَ وَتَوَلَّى أَنْ جَاءَهُ الْأَعْمَى (١- ٢) (وَهُوَ (ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ) ، وَذَلِكَ أَنَّهُ أَتَى النبيَّ صلى اللَّه عليه وسلم وَهُوَ يُنَاجِي عُتْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، وَأَبَا جَهِلِ بْنَ هِشَامٍ، وَعَبَّاسَ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَأُبَيًّا وَأُمَيَّةَ ابْنَيْ خَلَفٍ، وَيَدْعُوهُمْ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى، وَيَرْجُو إِسْلَامَهُمْ. فَقَامَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ وَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَلِّمْنِي مِمَّا عَلَّمَكَ اللَّهُ، وَجَعَلَ يُنَادِيهِ وَيُكَرِّرُ النِّدَاءَ، وَلَا يَدْرِي أَنَّهُ مُشْتَغِلٌ مُقْبِلٌ عَلَى غَيْرِهِ، حَتَّى ظَهَرَتِ الْكَرَاهِيَةُ فِي وَجْهِ رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم لِقَطْعِهِ كَلَامَهُ، وَقَالَ فِي نَفْسِهِ: يَقُولُ هَؤُلَاءِ الصَّنَادِيدُ: إِنَّمَا أَتْبَاعُهُ الْعُمْيَانُ وَالسِّفْلَةُ وَالْعَبِيدُ فَعَبَسَ رسولُ اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم وَأَعْرَضَ عَنْهُ، وَأَقْبَلَ عَلَى الْقَوْمِ الَّذِينَ يُكَلِّمُهُمْ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الْآيَاتِ. فَكَانَ رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم- بَعْدَ ذَلِكَ- يُكْرِمُهُ، وإذا رآه قال: مَرْحَبًا بِمَنْ عَاتَبَنِي فِيهِ رَبِّي) اسباب النزول للواحدي

## مرۆڤی کوێره له قیامەت پاداشتی زۆره:

خوا بۆی قەرەبوو دەکاتەوە بە بەهەشت

(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: قَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: إِذَا ابْتَلَيْتُ عَبْدِي بِحَبِيبَتَيْهِ ثُمَّ صَبَرَ عَوَّضْتُهُ مِنْهُمَا الْجَنَّةَ يُرِيدُ عَيْنَيْهِ) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ

واته: له ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر بوو فەرمووی: خوا فەرموویەتی : ئەگەر بەندەکەم تاقی کردەوە بە دوو خۆشەویستەکەی (دوو چاوەکانی) ئنجا ئارامی گرت ، منیش لە بەرامبەر ئەوەدا بۆی قەرەبوو دەکەمەوە بە بەهەشت.

–هەندێك چاو ئاگر نابینن کە لەم دەقانەدا هاتووە:

قال رسول الله (لَا يَلِجُ النَّارَ رَجُلٌ بَكَى مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ حَتَّى يَعُودَ اللَّبَنُ فِي الضَّرْعِ، وَلَا يَجْتَمِعُ غُبَارٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَدُخَانُ جَهَنَّمَ) . رواه الترمذي قال الالباني صحيح

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ( عَيْنَانِ لَا تَمَسُّهُمَا النَّارُ: عَيْنٌ بَكَتْ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ وَعَيْنٌ بَاتَتْ تَحْرُسُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ) رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ قال الالبانى صحيح

واته: دوو چاو ئاگر نابینن ، چاوێك بگری لە ترسی خوا،و چاوێك پاسەوانی بکات لە پێناوی خوا.

بەردە رەشەکە (حجر الاسود) چاوی هەیە ڕۆژی قیامەت:

–( قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْحَجَرِ: (وَاللَّهِ لَيَبْعَثَنَّهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَهُ عَيْنَانِ يُبْصِرُ بِهِمَا وَلِسَانٌ يَنْطِقُ بِهِ يَشْهَدُ عَلَى مَنِ اسْتَلَمَهُ بِحَقٍّ) رَوَاهُ التِّرْمِذِيّ وَابْن مَاجَه والدارمي (صَحِيحٌ)

واته: پێغەمبەر دەربارەی بەردە رەشەکە دەفەرموێ: سوێند بەخوا لە ڕۆژی قیامەت خوا ئەم بەردە زیندو دەکاتەوە و دوو چاوی پێ دەبەخشی پێیان دەبینی وە زمانیشی دەبێ وقسەی پێ دەکات و شایەدی دەدات بۆ ئەو کەسەی سڵاوی لێ کردوە.

## وتاری ژماره (١٣٠) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### سورەتی (المطففين)

چەند لایەنەکی گرنگی ئەم سورەتە:

١-ئەم سورەتە لە مەککە دابەزیوە ، لە ریزبەندا ژمارە (٨٣)یە ، وە ژمارەی ئایەتەکانی (٣٦) ئایەتە

٢-لەسەرەتادا هەرەشەیەکی توند ئاراستەی ئەو کەسانە دەکات کە لە کێشان وپیواندا فڕوفێل دەکەن و حیساب بۆ قیامەت ناکەن. وەك فەرموویەتی:

﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ١ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكْتَالُوا۟ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ٢ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ ٣ أَلَا يَظُنُّ أُو۟لَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ ٤ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ ٥ يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ٦ ﴾

واتە: هاوار بۆ تەرازوو بازان. (١) ئەوانەی کە پێوانە بکەن(بۆ خۆیان) لەسەر(ماڵی) خەڵك بەتەواوی وەری دەگرن. (٢) بەڵام کاتێك بۆیان پێوانە یا کێشانە بکەن کەمیان دەدەنێ. (٣) ئایا ئەوانە نازانن کە بێگومان زیندوو دەکرێنەوە. (٤) لە ڕۆژێکی گەورەدا. (٥) ڕۆژێك کە خەڵك لەبەر بارەگای پەروەردگاری جیهانیان دا دەوەستن. (٦)

٣-باسی تاوانباران دەکات کە چۆن ڕۆژی قیامەت بەرەو دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن بە سوك وریسوایی و هەرەش و گورەشەوە ، وەك دەفەرمووێت:

﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٍ ٧ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ ٨ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ٩ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ١٠ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ١١ ﴾

واته : با پەشیمان بنەوە ، چونکە بەڕاستی نامەی تاوانباران لە ناو دەفتەرێکی پەستی ڕەشدایە. (٧) تۆ چوزانییت ئەو دەفتەرە چی یە. (٨) دەفتەرێکی نوسراوە. (٩) هاوار لەو ڕۆژەدا بۆ بێ بڕوایان. (١٠) ئەوانەی کە بڕوا ناکەن بەڕۆژی پاداشت دانەوە. (١١)

٤-پاش تاوانباران ، باسی چاکەکاران دەکات ، کە چۆن ڕێزیان لێ دەگیرێ و بۆ هەتا هەتایی دەکەونە نازو نیعمەت

**﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٍ ٢٢ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ٢٣ تَعۡرِفُ فِي وُجُوهِهِمۡ نَضۡرَةَ ٱلنَّعِيمِ ٢٤ يُسۡقَوۡنَ مِن رَّحِيقٖ مَّخۡتُومٍ ٢٥ خِتَٰمُهُۥ مِسۡكٞۚ وَفِي ذَٰلِكَ فَلۡيَتَنَافَسِ ٱلۡمُتَنَٰفِسُونَ ٢٦﴾**

واته : بێ گومان چاکان لە نازو نیعمەت دان. (٢٢) لەسەر تەخت و بارەگاوە سەیر دەکەن. (٢٣) دەبینیت لە ڕوخساریاندا جوانی و گەشاوەیی خۆشگوزەرانیی. (٢٤) شەرابی پاکی سەر بەمۆریان دەرخوارد دەدرێ. (٢٥) کە دوا قومی بۆنی میسکە، بۆ ئەوە با پێشبڕکێ بکەن پێشبڕکێ کەران. (٢٦)

٥-لە کۆتایدا باسی هەڵوێستی خراپی تاونباران دەکات کە لە دونیا گاڵتە بە ئیماندارن دەکەن

**﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ كَانُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضۡحَكُونَ ٢٩ وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمۡ يَتَغَامَزُونَ ٣٠﴾**

واته : بێگومان ئەوانەی کە بەدکار بوون پێ دەکەنین بەوانەی کە بڕوایان هێنا بوو. (٢٩) وە کاتێك کە بەلایاندا بڕۆشتنایە چاویان لێ دادەگرتن. (٣٠)

بەلاَم لە قیامەت پێچەوانە دەبێتەوە ئیمانداران بەوان پێ دەکەنن ، وەك فەرموویەتی :

**﴿فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ ٣٤﴾**

واته : ئەمڕۆ کە ڕۆژی دوایی یە ئەوانەی کە بڕوادار بوون بە بێ بڕواکان پێ دەکەنن. (٣٤)

تێبینی :

لەم سورەتەدا هاتووە ئینسان مۆری لەسەر دڵ دەدرێ بە گوناح ، وە دڵی پاك دەبێتەوە بە چاكە و عیبادەت وەك لەم دەقدا هاتووە :

( عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّ العَبْدَ إِذَا أَخْطَأَ خَطِيئَةً نُكِتَتْ فِي قَلْبِهِ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ، فَإِذَا هُوَ نَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ وَتَابَ سُقِلَ قَلْبُهُ، وَإِنْ عَادَ زِيدَ فِيهَا حَتَّى تَعْلُوَ قَلْبَهُ، وَهُوَ الرَّانُ الَّذِي ذَكَرَ اللَّهُ) (كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ) (المطففين: ١٤) رواه الترمذي قال الالباني حسن

واتە: لە ئەبوهوریرەوە هاتووە دەڵێ پێغەمبەر فەرموویەتی : (ئەگەر بەندە گوناحێكی كرد لەناو دڵی خاڵێكی رەش پێدا دەبێ، ئەگەر ئەم گوناحەی واز لێ هێنا وتۆبەی كردوگەرایەوە دڵی پاك دەبێتەوە ، بەلأم ئەگەر گەرایەوە سەر گوناحان رەشایەتی لەسەر دڵی زیاد دەكات تاكو هەمووی دەگرێتەوە، ئەوە ئەو مۆرەیە كە خوا باسی كردوە فەرموویەتی (كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ) واتە: نەخێر بەڵكو مۆریان لەسەر دڵیان دراوە ،بەهۆی ئەو گوناحانەی دەیكەن.

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (١) سورەتی (المطففين)

(وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ)

واتە: تیاچوون بۆیاریكەران بە پێوانەو تەرازوو) رامان

١-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ كَانُوا مِنْ أَخْبَثِ النَّاسِ كَيْلًا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ (وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ) (المطففين: ١) فَأَحْسَنُوا الْكَيْلَ بَعْدَ ذَلِكَ) رواه ابن ماجه والحاكم والنسائي وقال الالباني حسن

واتــه: لــه ئیبنــو عه‌باســه‌وه هــاتووه ده‌ڵــێ: كــاتێ پێغه‌مبــه‌ر چــووه‌ مه‌دینــه ، خــه‌ڵكی ئه‌وێنده‌رێ خراپترین كـه‌س بـوون لـه كێشـاندا ، بـه‌لاَم كـه ئـه‌م ئایه‌تـه دابـه‌زی باشـترین كێشانیان ده‌كرد پاش دابه‌زینی ئه‌م ئایه‌ته.

وفی روایــه( عن عَلِيّ بْنِ الْحُسَيْنِ يَقُولُ: أَوَّلُ سُورَةٍ نَزَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – بِمَكَّةَ: (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ) وآخر سورة نزلت عَلَى رَسُولِ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – بِمَكَّةَ: الْمُؤْمِنُونَ، وَيُقَالُ: الْعَنْكَبُوتُ؛ وَأَوَّلُ سُورَةٍ نَزَلَتْ بِالْمَدِينَةِ: (وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ) (سورة المطففين: الآية ١) وَآخِرُ سُورَةٍ نَزَلَتْ فِي الْمَدِينَةِ: (بَرَاءَةٌ) وأول سورة عَلَّمَها رَسُولُ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – بِمَكَّةَ: (وَالنَّجْمِ) ؛ وَأَشَدُّ آيَةٍ عَلَى أَهْلِ النَّارِ (فَذُوقُوا فَلَنْ نَزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا) (سورة النبأ: الآية ٣٠) وَأَرْجَى آيَةٍ فِي الْقُرْآنِ لِأَهْلِ التَّوْحِيدِ (إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ) الْآيَةَ (سورة النساء: الآية ٤٨) . وَآخِرُ آيَةٍ نَزَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – (وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ) (سورة البقرة: الآية ٢٨١) وَعَاشَ النَّبِيُّ – صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – بَعْدَهَا تِسْعَ لَيَالٍ) اخرجه الواحدي في اسباب نزول القران وقال المحقق كمال بسيوني زغلول (مرسل)

یه‌كه‌م سوره‌ت كه دابه‌زیوه له مه‌ككه (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ)بووه

وه‌ئاخیر سوره‌ت كه دابه‌زیوه له مه‌ككه (الْمُؤْمِنُونَ) و ده‌ڵێن (الْعَنْكَبُوتُ) بووه

وه یه‌كه‌م سوره‌ت كه له مه‌دینه دابه‌زیوه (سورة المطففين) بووه

وه ئاخیر سوره‌ت كه له مه‌دینه دابه‌زیوه (بَرَاءَةٌ)

وه‌یه‌كه‌م سوره‌ت كه له مه‌ككه پێغه‌مبه‌ر فێری كردم (النجم) بوو

وه توندترین ئایه‌ته له‌سه‌ر ئه‌هلی ئاگر (فَذُوقُوا فَلَنْ نَزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا) بوو

وه به ئومێد به‌خشترین ئایه‌تـه بـۆ ئـه‌هلی ته‌وحیـد (إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ) بوو

وه ئاخیر ئایـەت کـە دابـەزی بـۆ پێغەمبـەر (وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ) پاشـان (٩) شەوان ژیاو وەفاتی کرد.

## سەرنجێك لەسەر ئەم ئایەتە (يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ) (٦)

واتە : (یوم یقوم الناس لرب العالمین) ئەو رۆژەی هەموو خـەڵکی بـە پێـوە دەوەسـتن بـۆ حوکم و فەرمانی خواوەندی جیهانەکان. عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رەزای خوای لێبی ئـەڵێ: پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەفەرموێ: (یوم یقوم النـاس لـرب العـالمین) حـتي یغیـب أحدهم في رشحه إلی انصاف أذنیه) واتە: ئەو رۆژە ئەوەندە سەختە و خەجاڵـەت هێنـەرە، هەریەکەیان لەنێو ئارەقی خۆیدا تا بنە گوێی ون ئەبێ. متفق علیه.(ڕامان)

( حَدَّثَنِي مَنْ سَمِعَ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ، قَرَأَ (وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ) (المطففين: ١) حَتَّى بَلَغَ (يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ) (المطففين: ٦) قَالَ: فَبَكَى حَتَّى خَرَّ وَامْتَنَعَ مِنْ قِرَاءَةِ مَا بَعْدَهُ) حلية الاولياء

واتە:لە ئیبنو عومەر بستراوە خوا لێی رازی بێ ، کاتێ ئەم سورەتەی خوێندۆتـەوە (وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ) تـاکو گەیشـتۆتە ئایـەتی (يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ) دەڵـێ: گریـاوە تـاکو بەربۆتـەوە و هیچی دیکە نەیتوانی بەردەوام بێ لەسەر قورئان خوێندن .

-( عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ حَتَّى يَغِيبَ أَحَدُهُمْ فِي رَشْحِهِ إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ) رواه البخاري

واتە: لە عەبدولای کوڕی عومەرەوە هاتووە خوا لەخۆی وبابی رازی بـێ دەڵـێ: پێغەمبـەر فەرمووی : (يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ) لەو ڕۆژدا خەڵکی دەکەونە نـاو ئـارەقی خۆیـان لە شەرمەزاریان تاکو بنا گوێیان

( عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا وَسَيُكَلِّمُهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَيْسَ بَيْنَ اللَّهِ وَبَيْنَهُ تُرْجُمَانٌ ثُمَّ يَنْظُرُ فَلَا يَرَى شَيْئًا قُدَّامَهُ ثُمَّ يَنْظُرُ بَيْنَ يَدَيْهِ فَتَسْتَقْبِلُهُ النَّارُ فَمَنْ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَتَّقِيَ النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ)رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ

واته: له عەدى كورِى حاتەمەوه هاتووه دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووى : هيچ كەس له ئێوه نيه، مەگەر خوا قسەى لەگەل دەكات بەبێ وەرگێر (ترجمان) دواى سەير دەكات هيچ شتێك نابينێ له پێش خۆى ، دواى تەماشاى بەردەستى خۆى دەكات ئاگر پێشوازى دەكات ، بۆيە ئەگەر دەتوانن خۆتان بپارێزن له ئاگر ئەگەر به لەتكه خورمايەكيش بى.

**دەرسەكانى ئەم ئايەتە:**

١-مەترسى كێشان و پيوان .

٢-چوونى پێغەمبەر بۆ مەدينه بەرەكەت بوو

٣-بەدابەزينى ئەم ئايەته له خراپەوه بۆنه چاكترين كەس له پێوان و كێشاندا

**************************

## وتاری ژماره (١٣١) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### سورەتی (البروج)

ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژمارە (٨٥)ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (٢٢) ئایەتە.

-ئەم سورەتە لە شاری (مەککە) دابەزیوە ، وەکو سورەتەکانی دیکەی مەککە باسی بابەتی عەقیدە دەکات ، وە بابەتی سەرەکی ئەم سورەتە بریتیە لە چیرۆکی (اصحاب الاخدود) یارانی چاڵە ئاگر

چەند لایەنەکی ئەم سورەتە :

١- لەسەرەتادا خوا چەند سوێندێك دەخوات ، بە ئاسمانی پڕ لە ئەستێرە ، وەبەڕۆژی دوای ، کە بێ گومان قیامەت دێت و تاوانباران تۆڵیان لێ دەکرێتەوە وئەخرێنە ئاگر. وەك فەرموویەتی:

(وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ ١ وَٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودِ ٢ وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ٣ قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ٤ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلْوَقُودِ ٥ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ ٦ وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ ٧) واتە: سوێند بە ئاسمانی خاوەن بورجەکان. (١) وە بەو ڕۆژەی کە بەڵێنی پێدراوە. (٢) وە بەهەموو بینەرو بینراوێك، یا شایەت و شایەتی لەسەر دراو یا ڕۆژی هەینی و ڕۆژی عەرەفە. (٣) بەکوشت چوون خاوەن چاڵەکان واتە لە غەمەکان. (٤) ئەو ئاگرەی خاوەن سوتەمەنی و بڵێسەیە. (٥) کاتێك کە ئەوان دانیشتبوون بەدەوری (ئاگرەکە) دا. (٦) وە ئەوان سەیری ئەوەیان دەکرد کە دەیان کرد بە بڕوادارەکان. (٧) پوختەی تەفسیر

٢-وەخوا بەڵێنی داوە ئەم تاوانبارانە بسوتێنی لە قیامەت ، چونکە ئەوان ئەم کۆمەڵە موسڵمانەیان سوتاند بەناحەق ، وەك فەرموویەتی :

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُواْ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَتُوبُواْ فَلَهُمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمۡ عَذَابُ ٱلۡحَرِيقِ ١٠﴾ واته: بەڕاستی ئەوانەی کە ئازاری پیاو و ژنە بڕوادارەکانیان داو لەپاشان پەشیمان نەبوونەوە ئەوە بۆ ئەوان هەیە سزای دۆزەخ، وە سزای(ئاگری) سوتێنەر. (١٠)

٣-باسی دەستەلاّنی خوا دەکات ، کە تۆڵەی توندە و هەموو شتێك لەلای خوا ئاسانە، وەك فەرموویەنی:

﴿إِنَّ بَطۡشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ١٢ إِنَّهُۥ هُوَ يُبۡدِئُ وَيُعِيدُ ١٣ وَهُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلۡوَدُودُ ١٤ ذُو ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡمَجِيدُ ١٥ فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ١٦﴾

واتە: بەڕاستی دەست وەشاندنی پەروەردگاری تۆ زۆر سەختە. (١٢) بێگومان هەر ئەوە کە لەسەرەتاوە(مرۆڤ) دروست دەکات و(دوای مردن) زیندووی دەکاتەوە. (١٣) وە هەر ئەوە لێخۆشبووی میهرەبان. (١٤) خاوەنی عەرش و بەرزو پایە دار. (١٥) هەرچی بوێ دەیکات. (١٦)

٤-لە کۆتایدا دەفەرموێت (فرعون ) و شوێنەکەوتوانی خوا لەناوی بردن بەهۆی سەرکەشی و سنوور بەزێنی وەك فەرموویەتی:

﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡجُنُودِ ١٧ فِرۡعَوۡنَ وَثَمُودَ ١٨ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي تَكۡذِيبٖ ١٩ وَٱللَّهُ مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطُۢ ٢٠﴾

واتە: ئایا پێت گەیشتووە باس و بەسەرهاتی لەشکرەکانی. (١٧) فیرعەون و سەموود. (١٨) بەڵکو ئەوانەی کە بێ بڕوا بوون هەمیشە لە بە درۆ زانینی (قورئان) دا. (١٩) وە خواش(بە دەسەڵات و زانینی) لە پشتیانەوە دەوری داون. (٢٠)

## ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٤) سورەتی (البروج)

﴿قُتِلَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأُخۡدُودِ﴾

واتە : نەفرەت و غەزەبی خودا بەر ئەو ستەمکارانە بکەوێت، کە خەندەقیان هەڵکەندو ئاگریان تیا کردەوەو، ئەو ئیمانداره بێ تاوانانەیان تێ فرێداو سووتاندنیان.(گوڵشەن)

دەربارەی ئەم ئایەتە دوو ریوایەت هەن:

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-( عن علي قال: كان المجوس أهل كتاب، وكانوا متمسكين بكتابهم وكانت الخمر قد أُحلّت، فتناول منها ملك من ملوكهم فغلبته على عقله فتناول أخته أو بنته فوقع عليها، فلما ذهب عنه السُّكْرُ نَدِمَ، وقال لها: ويحك ما هذا الذي أتيت؟ وما المَخرج منه؟ قالت: المخرج منه أن تخطب الناس فتقول: يا أيها الناس إن الله قد أحل نكاح الأخوات والبنات، فإذا ذهب ذا في الناس، وتناسوه خطبتهم فحرمته، فقام خطيبا فقال: يا أيها الناس إن الله أحل لكم نكاح الأخوات والبنات فقال الناس جماعتهم: معاذ الله أن نؤمن بهذا أو نُقِّرُ به، أو جاءنا به نبي الله أو أنزل علينا في كتاب، فرجع إلى صاحبته، فقال: ويحك إن الناس قد أبوا علي ذلك قالت: فإذا أبوا ذلك فابسط فيهم السَّوط، فبسط فيهم السوط، فأبى الناس أن يقروا، فرجع إليها، فقال: قد بسطت فيهم السوط فأبوا أن يقروا، قالت: فَجَرِّد فيهم السيف فجرد فيهم السيف فأبوا أن يقروا، قالت: خُدَّ لهم الأخدود، ثم أوقد فيها النيران، فمن تابعك فخل عنه، فَخُدَّ لهم أخدودا، وأوقد فيها النيران وعرض أهل مملكته على ذلك، فمن أبى قذفه في النار، ومن لم يأب خلى عنه، فأنزل الله تعالى فيهم: ﴿قُتِلَ أَصْحَابُ الْأُخْدُودِ﴾ إلى قوله ﴿وَلَهُمْ عَذَابُ الْحَرِيقِ﴾ اخرجه عبد بن حميد ،و كنز العمال في سنن الأقوال والأفعال و معرفة السنن والآثار ، وذكره السيوطي في الدر المنثور

واته:له (علی) یەوە هاتووە دەڵێ: ئاگرپەستەکان ئەهلی کیتاب بوون ، وە باش دەستیان گرتبوو بە کیتابی خۆیان ، ئارەق بۆیان حەلاڵ بوو، پاشایەکیان ئارەقی خواردەوە و ئەقڵی خۆی لە دەستدا توشی خوشکی یان کچی خۆی بوو ، کاتێ بەخۆهاتەوە گوتیە ئافرەتەکە ماڵ کاول ئێمە چیمان کرد و چۆن رزگار دەبین لەم ئابڕوو چوونە، ئافرەتەکەش گوتی: واباشە بریاربدەی بە ناو خەڵکیدا بەڵێ خوا مارەکردنی خوشك و کچی حەلاڵ کردوە ، هەندێ لە خەڵکی گوتیان پەنا بەخوا باوەڕ بەوە بکەین ، یان دانی پێدا بنێین ، یان پێغەمبەرێك وایگوتبێ یان شتێك لەم بارە دابەزیبێ بۆ سەرمان، پاشایەکە گەرایەوە لەلای ئافرەتەکە(خوشکی یان کچی) گوتی : خەڵکی ئەوە رەت دەکەنەوە، ئافرەتەکە گوتی: ئەگەر رەتیان کردوە بریاربدە بە قامچی لێیان بدرێ، بریاریدا لێیان دراو ، خەڵکی ئامادەنەبوون دان بەم بریارەدا بنێن، پادشا گەرایەوە لای ئافرەتەکە گوتی : داركاریمان کردن سوودی نەبوو ، ئافرەتەکە گوتی : ئەمجارە شمشێریان لێ راکێشن، بەوەش نەترسان رازی نەبوون ، ئەوجارە ئافرتەکە گوتیە پادشایەکە: چاڵیان بۆ هەڵکەنە وئاگری تیا بکەوە، ئەوەی بەقسەی کردی لێگەرێ، چاڵیان بۆ هەڵکنەرا و ئاگری تیاکرایەوە، ئاگر بۆ خەڵکی ئەم وەلآتە خرایەڕوو، ئەوەی فەرمانی پادشای رەتکردەوە فرێدرایە ناو ئاگر ، ئەوەی رازیش بوو وازیان لێهێنان، خوای گەورە دەرباری ئەوانە ئەم ئایەتەتانەی دابەزاند وفەرمووی (قُتِلَ أَصْحَابُ الْأُخْدُودِ) تاکو دەگاتە (وَلَهُمْ عَذَابُ الْحَرِيقِ)

٢-(كَانَ مَلِكٌ مِنَ المُلُوكِ وَكَانَ لِذَلِكَ المَلِكِ كَاهِنٌ يَكْهَنُ لَهُ، فَقَالَ الكَاهِنُ: انْظُرُوا لِي غُلَامًا فَهِمًا - أَوْ قَالَ: فَطِنًا - لَقِنًا فَأُعَلِّمَهُ عِلْمِي هَذَا، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ أَمُوتَ فَيَنْقَطِعَ مِنْكُمْ هَذَا العِلْمُ، وَلَا يَكُونَ فِيكُمْ مَنْ يَعْلَمُهُ. قَالَ: فَنَظَرُوا لَهُ عَلَى مَا وَصَفَ، فَأَمَرُوهُ أَنْ يَحْضُرَ ذَلِكَ الكَاهِنَ وَأَنْ يَخْتَلِفَ إِلَيْهِ، فَجَعَلَ يَخْتَلِفُ، إِلَيْهِ وَكَانَ عَلَى طَرِيقِ الغُلَامِ رَاهِبٌ فِي صَوْمَعَةٍ - قَالَ مَعْمَرٌ: أَحْسِبُ أَنَّ أَصْحَابَ الصَّوَامِعِ كَانُوا يَوْمَئِذٍ مُسْلِمِينَ - قَالَ: فَجَعَلَ الغُلَامُ يَسْأَلُ ذَلِكَ الرَّاهِبَ كُلَّمَا مَرَّ بِهِ، فَلَمْ يَزَلْ بِهِ حَتَّى أَخْبَرَهُ، فَقَالَ: إِنَّمَا أَعْبُدُ اللَّهَ. قَالَ: فَجَعَلَ الغُلَامُ

يَمْكُثُ عِنْدَ الرَّاهِبِ وَيُبْطِئُ عَنِ الكَاهِنِ، فَأَرْسَلَ الكَاهِنُ إِلَى أَهْلِ الغُلَامِ إِنَّهُ لَا يَكَادُ يَحْضُرُنِي، فَأَخْبَرَ الغُلَامُ الرَّاهِبَ بِذَلِكَ، فَقَالَ لَهُ الرَّاهِبُ: إِذَا قَالَ لَكَ الكَاهِنُ: أَيْنَ كُنْتَ؟ فَقُلْ: عِنْدَ أَهْلِي، وَإِذَا قَالَ لَكَ أَهْلُكَ: أَيْنَ كُنْتَ؟ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّكَ كُنْتَ عِنْدَ الكَاهِنِ. قَالَ: فَبَيْنَمَا الغُلَامُ عَلَى ذَلِكَ إِذْ مَرَّ بِجَمَاعَةٍ مِنَ النَّاسِ كَثِيرٍ قَدْ حَبَسَتْهُمْ دَابَّةٌ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّ تِلْكَ الدَّابَّةَ كَانَتْ أَسَدًا. قَالَ: فَأَخَذَ الغُلَامُ حَجَرًا فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ مَا يَقُولُ الرَّاهِبُ حَقًّا فَأَسْأَلُكَ أَنْ أَقْتُلَهَا. قَالَ: ثُمَّ رَمَى فَقَتَلَ الدَّابَّةَ. فَقَالَ النَّاسُ: مَنْ قَتَلَهَا؟ قَالُوا: الغُلَامُ، فَفَزِعَ النَّاسُ وَقَالُوا: لَقَدْ عَلِمَ هَذَا الغُلَامُ عِلْمًا لَمْ يَعْلَمْهُ أَحَدٌ. قَالَ: فَسَمِعَ بِهِ أَعْمَى، فَقَالَ لَهُ: إِنْ أَنْتَ رَدَدْتَ بَصَرِي فَلَكَ كَذَا وَكَذَا. قَالَ: لَا أُرِيدُ مِنْكَ هَذَا، وَلَكِنْ أَرَأَيْتَ إِنْ رَجَعَ إِلَيْكَ بَصَرُكَ، أَتُؤْمِنُ بِالَّذِي رَدَّهُ عَلَيْكَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَدَعَا اللَّهَ فَرَدَّ عَلَيْهِ بَصَرَهُ، فَآمَنَ الأَعْمَى، فَبَلَغَ المَلِكَ أَمْرُهُمْ، فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ، فَأُتِيَ بِهِمْ، فَقَالَ: لَأَقْتُلَنَّ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْكُمْ قِتْلَةً لَا أَقْتُلُ بِهَا صَاحِبَهُ، فَأَمَرَ بِالرَّاهِبِ وَالرَّجُلِ الَّذِي كَانَ أَعْمَى فَوَضَعَ المِنْشَارَ عَلَى مَفْرِقِ أَحَدِهِمَا فَقَتَلَهُ، وَقَتَلَ الآخَرَ بِقِتْلَةٍ أُخْرَى. ثُمَّ أَمَرَ بِالغُلَامِ، فَقَالَ: انْطَلِقُوا بِهِ إِلَى جَبَلِ كَذَا وَكَذَا فَأَلْقُوهُ مِنْ رَأْسِهِ، فَانْطَلَقُوا بِهِ إِلَى ذَلِكَ الجَبَلِ، فَلَمَّا انْتَهَوْا إِلَى ذَلِكَ المَكَانِ الَّذِي أَرَادُوا أَنْ يُلْقُوهُ مِنْهُ جَعَلُوا يَتَهَافَتُونَ مِنْ ذَلِكَ الجَبَلِ وَيَتَرَدَّوْنَ، حَتَّى لَمْ يَبْقَ مِنْهُمْ إِلَّا الغُلَامُ. قَالَ: ثُمَّ رَجَعَ، فَأَمَرَ بِهِ المَلِكُ أَنْ يَنْطَلِقُوا بِهِ إِلَى البَحْرِ فَيُلْقُونَهُ فِيهِ، فَانْطُلِقَ بِهِ إِلَى البَحْرِ، فَغَرَّقَ اللَّهُ الَّذِينَ كَانُوا مَعَهُ وَأَنْجَاهُ، فَقَالَ الغُلَامُ لِلْمَلِكِ: إِنَّكَ لَا تَقْتُلُنِي حَتَّى تَصْلُبَنِي وَتَرْمِيَنِي وَتَقُولَ إِذَا رَمَيْتَنِي: بِسْمِ اللَّهِ رَبِّ هَذَا الغُلَامِ. قَالَ فَأَمَرَ بِهِ، فَصُلِبَ، ثُمَّ رَمَاهُ، فَقَالَ: بِسْمِ اللَّهِ رَبِّ هَذَا الغُلَامِ. قَالَ: فَوَضَعَ الغُلَامُ يَدَهُ عَلَى صُدْغِهِ حِينَ رُمِيَ، ثُمَّ مَاتَ، فَقَالَ أُنَاسٌ: لَقَدْ عَلِمَ هَذَا الغُلَامُ عِلْمًا مَا عَلِمَهُ أَحَدٌ، فَإِنَّا نُؤْمِنُ بِرَبِّ هَذَا الغُلَامِ. قَالَ: فَقِيلَ لِلْمَلِكِ أَجَزِعْتَ أَنْ خَالَفَكَ ثَلَاثَةٌ، فَهَذَا العَالَمُ كُلُّهُمْ قَدْ خَالَفُوكَ. قَالَ: فَخَدَّ أُخْدُودًا ثُمَّ أَلْقَى فِيهَا الحَطَبَ وَالنَّارَ، ثُمَّ جَمَعَ النَّاسَ. فَقَالَ: مَنْ رَجَعَ عَنْ دِينِهِ تَرَكْنَاهُ، وَمَنْ لَمْ يَرْجِعْ أَلْقَيْنَاهُ فِي هَذِهِ النَّارِ، فَجَعَلَ يُلْقِيهِمْ فِي تِلْكَ الأُخْدُودِ. قَالَ: يَقُولُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِيهِ: (قُتِلَ أَصْحَابُ الأُخْدُودِ النَّارِ ذَاتِ الوَقُودِ) (البروج: ٥) حَتَّى بَلَغَ (العَزِيزِ الحَمِيدِ) قَالَ: فَأَمَّا الغُلَامُ فَإِنَّهُ دُفِنَ " قَالَ: فَيُذْكَرُ أَنَّهُ أُخرِجَ

فِي زَمَنِ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ وَإِصْبَعُهُ عَلَى صُدْغِهِ كَمَا وَضَعَهَا حِينَ قُتِلَ) سنن الترمذي قال الالباني صحيح

واته:پێغەمبەر فەرموویەتی : پادشایەك هەبوو ساحیرێکی هەبوو، ساحیریکە گوتی : منداڵێك پیدا بکەن زیرەك بێ تاکو فێری علیمی سیحری بکەم ، دەترسم بمرم ئەو زانستە بزربێ لێتان،منداڵیان بۆ پیدا کرد ، هاتوو چۆی دەکرد لەسەر ڕێگای ئەم منداڵ راهیبێك هەبوو لە پەرستگایەك ، ئەم منداڵە هەموو جارێ کە دەهاتە لای ساحیر لای دەدا کن راهیب پرسیاری ئایینی لێ دەکرد، لە لای ماوەیەك دەمایەوە ،ساحیر سکالای لێ کرد لە لەلای کەس وکاری گوتی : منداڵەکە لە دەرس دوادەکەوێ، راهیب بەمنداڵەکەی گوت : ئەگەر ساحیر گوتی بۆ دەرنگ هاتی بڵێ لەماڵێ دەرنگ هاتم ، ئەگەر لەماڵ گوتیان بۆچی دەرنگ هاتیەوە بڵێ لەلای ساحیر بووم، منداڵەکە بەم شێوەی دەکرد تاکو بینی ڕۆژێك کۆمەڵە خەڵکێك ڕێگایان لێ گیراوە بەهۆی دەعبایەك، هەندێك گوتیان ئەوە شێرە، منداڵەکە دەستی کردە بەردێك ، گوتی: خوایە ئەگەر ئەم راهیبە راستە بەم بەردە ئەم جانەوەر بکوژم ، وبۆی هاویشت وکوشتی،خەڵکی گوتیان : کێ ئەم جانەوەرەی کوشتوە، گوتیان: ئەم منداڵە گوتیان: فێری زانستێك بووە کەس بەم شێوە نەیزانیوە، پیاوێکی کوێر ئەم روداوەی بیست گوتیە منداڵەکە ئەگەر چاوم چاك کەیەوە چی بڵێ دەدەمێ، گوتی : هیچم ناوێ بەلاَم ئەگەر چاوت چاك بونەوە ئیمان بەوخوایە دێنی کە چاوی تۆی چاك کردۆتەوە ، گوتی بەڵێ، دوعای بۆ کرد چاوی چاك بونەوە، کوێرەکە ئیمانی هێنا، ئەم هەواڵە گەیشتەوە پادشا، لە دوای ناردن، راهیب و ئەوەی کوێر بوو هەردوکی بە مشار کوشتن، دوای فەرمانی دەرکرد بۆ منداڵەکە گوتی ببیەنە سەرچیا وفرێ بدەنە خوارەوە، ویستیان فرێبدەن چیاکە لەرزی سەربازەکان بەربونەوە لەناو چوون تەنها منداڵەکە مایەوە، گەرایەوە، ئەو جارە پادشا فەرمانی دا ببینە ناو دەریا فرێبدەنە ناو ئاو ، وایانکرد خوا هەموو سەربازەکانی غەرق کرد، منداڵەکەش بەسەلامەتی مایەوە، منداڵەکە گوتیە پادشا تۆ ناتوانی من بکوژی تاکو لە سێدار قائیمم نەکەی و تیرم تێبگرە

وبلێ بەناوی خوای ئەم منداڵە ، پادشای فەرمانی کرد بۆ جێ بەجێ کردنی ، لە سێ دارە بەسترایەوە تیری بۆ هاویشت و گوتی : بەناوی خوای ئەم منداڵە ، منداڵەکە کاتێ تیری لێدرا دەستی لەسەر روومەتی دانا وەفاتی کرد، خەڵکی گوتیان: ئەم منداڵە فێری زانستێك بووە هیچ کەس فێری ئەم زانستە نەبووە، بۆیە ئێمە باوەڕمان هێنا بە خوای ئەو منداڵە، گوتیان پادشا تۆ رازی نەبووی سێ کەس پێچەوانت بن ئەوا هەموو خەڵکی پێچەوانت بوون ، دەفەرمووی: پادشا چاڵی هەڵکەندن و سووتەمەنی و ئاگر تیاکردوە ، دوای خەڵکی کۆکردەوە، گوتی : ئەوەی پەشیمان بێتەوە وازی لێ دێنین، ئەوەی پەشیمان نەبێتەوە فرێدەدرێتە ناو ئاگر، جا فرێدانە ناو ئەو چاڵە ئاگرە، وەك خوا فەرموویەتی (قُتِلَ أَصْحَابُ الأُخْدُودِ النَّارِ ذَاتِ الوَقُودِ) تاکو دەگاتە (العَزِيزِ الحَمِيدِ) دەڵێ : منداڵەکە شاردرایەوە باس دەکرێ جەنازەکەی دەرکەوت لە زەمانی (ئیمام عمر) هێشتا دەستی هەر لەسەر روومەتی بوو. وەك چۆن کوژرابوو.

## دەرسەکانی ئەم ئایەتە :

١-ئینسان کە گوناح یان هەڵەی کرد پەشیمان بێتەوە و دان بنێ بە تاوانەکەی نەك وەك ریوایەتی یەکەم پادشای زینای کرد لەگەڵ خوشکی یان کچی ،ئامادە نەبوو تۆبە بکا لە نێوان خۆی و خوا بەڵکو کردیە یاسا خەڵکی ناچار کرد پابەند بن بەم گوناحە.

٢-دروست نیە خەڵکی بە ئاگر ئازار بدرێ، تەنها خوا بۆی هەیە خەڵکی بە ئاگر ئازار بدات کاتێ خراپە دەکەن، وەك پێغەمبەر فەرموویەتی :

(عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ فَانْطَلَقَ لِحَاجَتِهِ فَرَأَيْنَا حُمَرَةً مَعَهَا فَرْخَانِ فَأَخَذْنَا فَرْخَيْهَا فَجَاءَتِ الْحُمَرَةُ فَجَعَلَتْ تَفْرُشُ فَجَاءَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (مَنْ فَجَعَ هَذِهِ بِوَلَدِهَا؟ رُدُّوا وَلَدَهَا إِلَيْهَا) . وَرَأَى قَرْيَةَ نَمْلٍ

قَدْ حَرَّقْنَاهَا قَالَ: (مَنْ حَرَّقَ هَذِهِ؟) فَقُلْنَا: نَحْنُ قَالَ: (إِنَّهُ لَا يَنْبَغِي أَنْ يُعَذِّبَ بِالنَّارِ إِلاَّ ربُّ النَّار) . رَوَاهُ أَبُو دَاوُد ) قال الالبانى صحيح

واته: له عبدالرحمن كورى عبدالله ئەويش له باوكيەوه هـاتووه .........دروسـت نيـه هـيچ شتێك به ئاگر ئازار بدرێت تەنها خوا بۆی هەیه خەڵكی به ئاگر ئازار بدات.

٣–خۆبەزلزانین زۆر خراپە ، خوا خۆبەزلزانینی خۆشناویٚ.

٤–زوڵم شتێكی خراپه و خوا تۆڵە له زاڵمان دەكاتەوه

***************************

# وتاری ژماره (١٣٢) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی ( الاعلى )

<u>تێبینی</u> : ئەم سورەتە هۆی دابەزینی نیە، بەڵام شتی زۆر خۆشی بۆ وتارە

چەند لایەنەکی گرنگی ئەم سورەتە:

١-ئەم سورەتە لە مەککە دابەزیوە ، لە ریزبەندا ژمارە (٨٧)ە ، وە ژمارەی ئایەتەکانی (١٩) ئایەتە

٢-باسی چەند سیفەتێکی خوا دەکات ، کە بەڵگەن لەسەر دەستەڵاتی خوای بێ هاوتا. وەك فەرموویەتی: (سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ١ ٱلَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ٢ وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ٣ وَٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلۡمَرۡعَىٰ ٤ فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحۡوَىٰ ٥ )

واتە: بەپاکی یادی پەروەردگاری هەرە بڵندت بکە. (١) ئەوەی(هەموو شتێکی) دروست کردووەو رێکوپێکی کردووە. (٢) وە ئەوەی کە نەخشەی کێشاوە(بۆ هەموو شتێك) ئینجا شارەزای کردووە. (٣) وە ئەوەی کە لەوەڕی دەرهێناوە. (٤) ئینجا دەیکات بە پوشی ڕەش داگەڕاو. (٥)

٢- باسی ئامۆژگاری چاك دەکات ، کە دڵە زیندوەکان دەکاتەوە ، سوود وەردەگرن ئەوانەی ئەهلی ئیمان و بەختەوەرین . وەك فەرموویەتی :

(فَذَكِّرۡ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكۡرَىٰ ٩ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخۡشَىٰ ١٠ وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلۡأَشۡقَى ١١ ٱلَّذِي يَصۡلَى ٱلنَّارَ ٱلۡكُبۡرَىٰ ١٢ ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ ١٣ )

واتە: ئینجا تۆش هەردەم ئامۆژگاری بکە ئەگەر سوودی گەیاند. (٩) بێگومان ئەوی لە خوا بترسێ پەندی لێ وەردەگرێ. (١٠) وە ئەوەی زۆر خراپیش بێ خۆی لێ دوور

دەخاتەوە. (١١) ئەوی دەچێتە ناو ئاگری هەرە گەورەوە. (١٢) لەپاشان نە دەمرێ تیایدا(تا ڕزگاری بێت) وە نە دەژی تێیدا بە ئاسایی. (١٣)

٣-باسی مژدە ئەكات بۆ پێغەمبەر كە وەحی خوای لە بیر ناچێتەوە كە قورئانە ، وەك فەرموویەتی:

(سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ٦ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلْجَهْرَ وَمَا يَخْفَىٰ ٧ )

واتە: ئەی موحەممەد(صلی اللە علیە وسلم) قورئانت بەسەردا دەخوێنینەوەو هەرگیز بیرت ناچێتەوە. (٦) مەگەر ئەوەی كە خوا بیەوێت بێگومان ئەو بە هەموو شتێكی ئاشكراو پەنهان ئاگادارە. (٧)

٤-لە كۆتایدا باسی ئەوە دەكات هەركەسێ نەفسی خۆی پاك بكاتەوە لە گوناح و تاوان ، ئەو كەسە سەربەرزەو دەباتەوە ، وەك فەرموویەتی :

(قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ١٤) واتە: بەڕاستی سەرفراز بوو ئەوی كە خۆی پاك ڕاگرت.

## چەند فەرموودەیەك دەربارەی ئەم سوڕەتە :

١-( عَن الْبَراء قَالَ: أَوَّلُ مَنْ قَدِمَ عَلَيْنَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ فَجَعَلَا يُقْرِآنِنَا الْقُرْآنَ ثُمَّ جَاءَ عَمَّارٌ وَبِلَالٌ وَسَعْدٌ ثُمَّ جَاءَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فِي عِشْرِينَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ جَاءَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمَا رَأَيْتُ أَهْلَ الْمَدِينَةِ فَرِحُوا بِشَيْءٍ فَرَحَهُمْ بِهِ حَتَّى رَأَيْتُ الْوَلَائِدَ وَالصِّبْيَانَ يَقُولُونَ: هَذَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ جَاءَ فَمَا جَاءَ حَتَّى قرأتُ: (سبِّح اسْم ربِّك الْأَعْلَى ) فِي سُوَرٍ مِثْلِهَا مِنَ الْمُفَصَّلِ. رَوَاهُ البُخَارِيّ

واتە: لە بەرای هاتووە دەڵێ: یەكەمین كەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر هاتنە مەدینە (مصعب كوڕی عمیر و ئوم مەكتوم بوون ، ئەم دووانە قورئانیان پێ دەگوتین، دوای عەمار و بلال وسەعد، دوای ئەوان عمر كوڕی خەتاب و بیست كەس لە هاوەڵان هاتن ، دوای پێغەمبەر

هات ئەم دیوە خەڵكی مەدینە بە هیچ شتێك هێندەی هاتنی پێغەمبەر كەیف خۆش بن، تاكو منداڵیش دەیانگوت ئەوە پێغەمبەری خوایە هات ، نەهات بۆ مەدینە تاكو فێری (سبِّح اسْم ربِّك الْأَعْلَى) بووم لەگەڵ سورەتە مام ناوەندەكانی وەكو ئەو.

٢-( عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: سَأَلْنَا عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا بِأَيِّ شَيْءٍ كَانَ يُوتِرُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَتْ: كَانَ يَقْرَأُ فِي الْأُولَى بِ (سَبِّحِ اسْم رَبك الْأَعْلَى)

وَفِي الثَّانِيَةِ بِ (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ)وَفِي الثَّالِثَةِ بِ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أحد)والمعوذتين وَرَوَاهُ التِّرْمِذِيّ وَأَبُو دَاوُد قال الالباني صحيح

واتە: لە (عبدالعزیز)ی كوڕی جوریجەوە هاتووە دەڵێ: پرسیارمان كرد لە عائیشە خوا لێی رازی ، ئایا پێغەمبەر چی لە ویترەكان دەخوێند؟ گوتی : لە ركعاتی یەكەم (سَبِّحِ اسْم رَبك الْأَعْلَى) لە ركعاتی دووەم (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ) دەخوێند لە ركعاتی سێیەم (قُلْ هُوَ اللَّهُ أحد)و (الفلق و الناس) دەخوێند

٣-( وَعَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ (فسبح باسم رَبك الْعَظِيم) قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اجْعَلُوهَا فِي رُكُوعِكُمْ) فَلَمَّا نَزَلَتْ (سَبِّحِ اسْمَ رَبك الْأَعْلَى) قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ( اجْعَلُوهَا فِي سُجُودِكُمْ) رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَابْن مَاجَه والدارمي قال الالباني حسن

واتە: عوقبەی كوڕی عامیر دەڵێ: كاتێ (فسبح باسم رَبك الْعَظِيم) دابەزی پێغەمبەر فەرمووی : لە ركوع بیخوێنن، وەكاتێ (سَبِّحِ اسْمَ رَبك الْأَعْلَى) فەرمووی : لە سوجدە بیخوێنن .

٤-( عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِي الْعِيدَيْنِ وَفِي الْجُمُعَةِ بِ (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى)و (هَل أَتَاك حَدِيث الغاشية) قَالَ: وَإِذَا اجْتَمَعَ الْعِيدُ وَالْجُمُعَةُ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ قَرَأَ بِهِمَا فِي الصَّلَاتَيْنِ) رَوَاهُ مُسلم

واته: له نوعمانی کوڕی بەشیرەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر له هەردوو چەژنەکان و لە هەینیەکان (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى و هَل أَتَاكَ حَدِيث الغاشية) دەخوێند ، دەڵێ: ئەگەر چەژن و هەینی کەوتبانە یەك ڕۆژ له هەردوو نوێژەکان دەیخوێندن.(واته: له نوێژی چەژن و هەینی)

٥-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كَانَ إِذَا قَرَأَ (سبح اسْم رَبك الْأَعْلَى) قَالَ: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى) رَوَاهُ أَحْمَدُ وَأَبُو دَاوُد قال الالباني حسن

٦-( عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الَّتِي يُوتِرُ بَعْدَهُمَا بِ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى وقُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ وَيَقْرَأُ فِي الْوِتْرِ بِ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ وقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ وقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) رواه الحاكم

واته: له عائیشەی دایکی ئیمانداران هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر لە دوو رکعاتەی پێش ویتر (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى وقُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ) دەخوێند وە لە ویتریش (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ وقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ وقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) دەخوێند

## هاوەڵان سکاڵا دەبنە لای پێغەمبەر بەرامبەر موعاز لەسەر نوێژی درێژ:

(عن جَابِرِ بْن عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ كَانَ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ يَأْتِي قَوْمَهُ فَيُصَلِّي بِهِمْ الصَّلَاةَ فَقَرَأَ بِهِمْ الْبَقَرَةَ قَالَ فَتَجَوَّزَ رَجُلٌ فَصَلَّى صَلَاةً خَفِيفَةً فَبَلَغَ ذَلِكَ مُعَاذًا فَقَالَ إِنَّهُ مُنَافِقٌ فَبَلَغَ ذَلِكَ الرَّجُلَ فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا قَوْمٌ نَعْمَلُ بِأَيْدِينَا وَنَسْقِي بِنَوَاضِحِنَا وَإِنَّ مُعَاذًا صَلَّى بِنَا الْبَارِحَةَ فَقَرَأَ الْبَقَرَةَ فَتَجَوَّزْتُ فَزَعَمَ أَنِّي مُنَافِقٌ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا مُعَاذُ أَفَتَّانٌ أَنْتَ ثَلَاثًا اقْرَأْ وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا وَسَبِّحْ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى وَنَحْوَهَا) رواه البخاري

وفي رواية-( عَنْ جَابِرٍ أَنَّهُ قَالَ: صَلَّى مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ الْأَنْصَارِيُّ لِأَصْحَابِهِ الْعِشَاءَ. فَطَوَّلَ عَلَيْهِمْ فَانْصَرَفَ رَجُلٌ مِنَّا. فَصَلَّى فَأُخْبِرَ مُعَاذٌ عَنْهُ فَقَالَ: إِنَّهُ مُنَافِقٌ فَلَمَّا بَلَغَ ذَلِكَ الرَّجُلَ دَخَلَ عَلَى

رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرَهُ مَا قَالَ مُعَاذٌ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَتُرِيدُ أَنْ تَكُونَ فَتَّانًا يَا مُعَاذُ؟ إِذَا أَمَمْتَ النَّاسَ فَاقْرَأْ بِالشَّمْسِ وَضُحَاهَا، وَسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى، وَاقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ، وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى) رواه مسلم

واته:له جابیرەوە هـاتووە دەڵـێ: موعـازی کـوڕی جەبـەلی ئەنصـاری ئیمامـەتی کـرد بـۆ خزمـانی خـۆی نوێـژی عیشـا، نوێژەکـەی درێـژکردەوە ، پیاوێـك لـە ئێمـە نوێژەکـەی بەجێهێشـت، هـەواڵیان بـە موعـازدا ئـەویش گـوتی : ئـەو کـەس مونافیقـە، ئـەم هەواڵـە گەیشـتەوە پیاوەکـە ، ئـەویش چـووە لای پێغەمبـەر قسـەکەی موعـازی بـۆ گێڕایـەوە ، پێغەمبەر بە موعازی فەرموو : ئەی موعاز دەتەوێ خـەڵکی توشـی بـەلا بکـەی ولـە ئـایین دوورکەونـەوە؟ ئەگـەر پـێش نوێـژیت بـۆ خـەڵکی کـرد ئـەم سـوڕەتانە بخوێنـە (والشَّمْسِ وَضُحَاهَا) و (وَسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى) و(وَاقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الذي خلق) و (وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى)

**دەرسەکانی ئەم سوڕەتە:**

١-ئەبێ ئیمامەکان ڕەچاوی مەئمومەکان بکەن . وەك لەم دەقدا هاتووە

(عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي وَاللَّهِ لَأَتَأَخَّرُ عَنْ صَلَاةِ الْغَدَاةِ مِنْ أَجْلِ فُلَانٍ مِمَّا يُطِيلُ بِنَا فِيهَا قَالَ فَمَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَطُّ أَشَدَّ غَضَبًا فِي مَوْعِظَةٍ مِنْهُ يَوْمَئِذٍ ثُمَّ قَالَ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ فَأَيُّكُمْ مَا صَلَّى بِالنَّاسِ فَلْيُوجِزْ فَإِنَّ فِيهِمْ الْكَبِيرَ وَالضَّعِيفَ وَذَا الْحَاجَةِ) متفق عليه

واتە: لەئەبی مەسعودی ئەنصـاریەوە هـاتووە دەڵـێ: پیاوێـك هاتـە لای پێغەمبـەر گـوتی: سوێند بەخوا ئەی نێرراوی خوا من بەیانیان ناچمە نوێـژی بەکۆمـەڵ لەبـەر فـلان کـەس ، چونکە نوێژ درێژ دەکاتـەوە ، دەڵێ هەرگیز نەم بینیوە پێغەمبەر هێندە توڕەبی لـە کـاتی ئامۆژگاری فەرمووی : ئەی خەڵکینە هەیە لە ئێوە خـەڵکی لـە ئـایین دووردەخاتـەوە، جـا

ئەگەر ئێوە پێش نوێژتان بۆ خەڵكی كرد با كورتی بكاتەوە چونكە لە ناو نوێژخوێنان (پیر و لاواز و خاوەن كار) هەیە.

٢-ئەم سورەتە باسی تسبیحات دەكات واتە: خوا بەپاك و بێ گەرد دانان وزیكر كردنی ، جا پێویستە بەشێك لە ژیانی خۆمان تەرخان بكەین بۆ زیكر چونكە پاداشتی زۆرە. وەك لەم دەقاندا هاتووە .

١-(عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (مَا عَمِلَ آدَمِيٌّ عَمَلاً قَطُّ أَنْجَى لَهُ مِنْ عَذَابِ اللهِ مِنْ ذِكْرِ اللهِ) رواه احمدو مَالِكٌ وَالتِّرْمِذِيُّ وَابْنُ مَاجَهقال الالباني صحيح

واتە: موعازی كوڕی جەبەل خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ كارێك نیە وەچەی ئادەم بە هۆیەوە ڕزگاری ببێ لە سزای خوا، هەرگیز، وەك زیكری خوا، یانی: زیكری خوا لە هەموو كردەوەیەكی بەنی ئادەم زیاتر بە هانایەوە دێ و ڕزگاری دەكات لە سزا

٢-(عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ):(أَلاَ أُخْبِرُكَ بِأَحَبِّ الْكَلاَمِ إِلَى اللهِ ؟ قُلْتُ: يَا رَسُوْلَ اللهِ! أَخْبِرْنِي بَأَحَبِّ الْكَلاَمِ إِلَى اللهِ، فَقَالَ: (إِنَّ أَحَبَّ الْكَلاَمِ إِلَى اللهِ، سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ) رواه مسلم

واتە: ئەبوو زەڕی غەفاری هاتووە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئایا هەواڵت پێنەدەم بە خۆشەویسترینی وشەكان لە لای خوا ؟ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا هەواڵم پێبدە، بە خۆشەویسترینی وشەكان لە لای خوا، فەرمووی: بێگومان خۆشەویسترینی وشەكان لە لای خوا، بریتین لە: (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ).

پایەو پاداشتی گوتنی:

(سُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ للهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَاللهُ اكْبَر)

٣-(عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ):أَحَبُّ الْكَلاَمِ إِلَى اللهِ أَرْبَعٌ: سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، واللهُ أَكْبَرُ، لاَ يَضُرُّكَ بِأَيِّهِنَّ بَدَأْتَ) رواه مسلم

واتە: سەمورەی کوڕی جوندب خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆشەویسترینی وشەکان لای خوا چوارن: (سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُللهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، واللهُ أَكْبَرُ)ن، وە بە هەر کامێکیان دەست پێبکەی زیانی بۆت نیە.

٤-(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (لأَنْ أَقُولَ: سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ) رواه مسلم

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر خوا ﷺ دەیفەرموو: ئەگەر بڵێم: (سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ)، خۆشترە لە لام لە هەموو ئەو شتانەی کە خۆر بەسەریاندا هەڵدێ.

*********************

# وتاری ژماره (١٣٣) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (الليل)

ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژمارە (٩٢)ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (٢١) ئایەتە.

–ئەم سورەتە لە شاری (مەککە) دابەزیوە ، باسی هەولّ و کۆششی ئینسان دەکات

چەند لایەنەکی گرنگی ئەم سورەتە :

١– لەسەرەتادا خوا سوێند بە شەوگار و ڕۆژ دەخوات ، وەك فەرموویەتی:

(وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ ١ وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ٢ وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ٣ إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ ٤ ) واتە: سوێند بەشەو کاتێك کە(زەوی) دادەپۆشێ. (١) وە بەڕۆژ کاتێ کە ڕووناك دەبێتەوە. (٢) وە بەو زاتەی کە نێرو مێ ی دروست کردوە. (٣) بەڕاستی هەولّ و کۆششی ئێوە جۆراو جۆرە. (٤)

٢–دوایی ڕێگای ڕاست روون دەکاتەوە ، بۆ رزگاربوون ، وە ڕێگای چەوتیش دیاری دەکات ، وەك فەرموویەتی :

(فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ٥ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ٦ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ٧ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسْتَغْنَىٰ ٨ وَكَذَّبَ بِٱلْحُسْنَىٰ ٩ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ ١٠ )

واتە: ئینجا ئەو کەسەی(مالّ) ببەخشێ و لەخوا بترسێت و پارێزکاربێت. (٥) وە بڕوای ببێ بەوەی زۆرچاکە(لا اله الا الله) یا بەهەشت. (٦) ئەو زوو یارمەتی دەدەین بۆ ڕێ ی ئاسان(کە چاکە) یە. (٧) وە ئەو کەسەی ڕژدی بکات خۆی بێ نیاز بزانێ. (٨) وە بڕوای

نەبێ بەچاکە(کە لا اله الا الله یە یا بەھەشت) ە. (٩) ئەوە زوو ڕێ ی سەختی بۆ ئاسان دەکەین. (١٠)

٣–باسی ئەوە دەکات ھەندێ کەس ھەندێ پارەیان کۆکردۆتەوە ، ئەم ماڵ وسامانە لە ڕۆژی قیامەت سوودیان نادات ، مادام بەم سامانە دور دەکەونەوە لە ڕێگای خوا. وەك فەرموویەتی:

(وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ ١١ إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ ١٢ وَإِنَّ لَنَا لَلْـَٔاخِرَةَ وَٱلْأُولَىٰ ١٣)

واتە: سەروەت و سامانەکەی قازانجی پێ ناگەیەنێ کاتێك کە تیا دەچێ. (١١) بەڕاستی لەسەر ئێمەیە ڕێنموونیی. (١٢) وە ھەردوو جیھان ھی ئێمەیە. (١٣)

٤–لە کۆتایدا خەڵکی مەککە و سەرجەم خەڵکی ئاگادار دەکاتەوە بۆ تاوانبارو کافران ئاگر ئامادەکراوە ، ئەوەی پشت لە ئیسلام بکاوبەدرۆی بزانی ئەچێتە ناوی وەك فەرموویەتی :

(فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ١٤ لَا يَصْلَىٰهَآ إِلَّا ٱلْأَشْقَى ١٥ ٱلَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ١٦)

واتە: وە من ئێوەم ترساند بە ئاگرێکی بڵێسەدار کە دۆزەخە. (١٤)کەس ناچێتە ناو دۆزەخەوە مەگەر خراپترین کەس. (١٥) ئەو کەسەی کە بڕوای نەبێ و پشتی ھەڵ کردبێ لە ئایینی ڕاست. (١٦)

٥–بەلآم موسڵمانی ڕاستەقینە وماڵ بەخش پارێزراوە لە دۆزەخ وەك فەرموویەتی:

(وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى ١٧ ٱلَّذِي يُؤْتِي مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ١٨ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ ١٩ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ ٢٠ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ٢١)

واتە: وە لێ ی دوور دەخرێتەوە پارێزکارترین کەس. (١٧) ئەوی ماڵی خۆی دەبەخشێ تا (دڵ و دەروونی) پاك ببێتەوە. (١٨) لە کاتێکدا کەس چاکەیەکی وای بەسەریەوە نی

یە کەپاداشت بدرێتەوە. (١٩) تەنها مەبەستی ڕەزامەندی پەروەردگاری بەرزو بڵندە. (٢٠) سوێند بەخوا(ئەو کەسەی وابێت) لەمەولا ڕازی دەبێ بە پاداشتی دوا ڕۆژ. (٢١)

### ١-هۆی دابەزینی ئایەتی (٥-٢١) سورەتی (اللیل)

﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ٥ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ٦ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ٧ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسْتَغْنَىٰ ٨ وَكَذَّبَ بِٱلْحُسْنَىٰ ٩ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ ١٠ وَمَا يُغْنِى عَنْهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ ١١ إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ ١٢ وَإِنَّ لَنَا لَلْءَاخِرَةَ وَٱلْأُولَىٰ ١٣ فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ١٤ لَا يَصْلَىٰهَآ إِلَّا ٱلْأَشْقَى ١٥ ٱلَّذِى كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ١٦ وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى ١٧ ٱلَّذِى يُؤْتِى مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ١٨ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ ١٩ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ ٢٠ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ٢١﴾

واتە : جا ئەوەی (ماڵ و سامان و زانستی و ... هتد) دەبەخشێت و پارێزکار و لە خوانرسە... (٥) بڕوای بتەوی بە پاداشتی چاك و بەنرخی خوایی هەیە... (٦) ئەوە ڕێگەی چاکە و چاکەکاری بۆ ئاسان دەکەین و سەرئەنجام دەیخەینە خێر و خۆشیەوە. (٧) بەڵام ئەوەی ڕەزیل و دەست نوقاو بێت و خۆی بێ نیاز بزانێت (ڕەزامەندی خوایی مەبەست نەبێت)... (٨) بڕوای نەبێت بە پاداشت و بەهرەی چاکی خوایی و بەدرۆی بزانێت... (٩) ئەوە ئێمە ڕێبازی تەنگانە و ناخۆشی بۆ ئاسان دەکەین و سەرئەنجام بە دۆزەخی دەگەیەنین. (١٠) ئەو کاتەی کە دەمرێت و لە گۆڕ دەنرێت، ئەو کاتەش کە فڕێ دەدرێتە دۆزەخەوە ماڵ و سامان هیچ فریای ناکەوێت. (١١) بەڕاستی ڕوون کردنەوەی ڕێبازی هیدایەت و دیاریکردنی بۆ خەڵکی لەسەر ئێمەیە. (١٢) بێگومان دەسەڵاتی بێ سنورمان هەیە بەسەر پاشەڕۆژ و قیامەتدا، هەروەها بەسەر دنیادا. (١٣) جا من ئەوەتە ئاگادارتان دەکەم و دەتانترسێنم لە ئاگرێك کە زۆر بلێسە دەسێنێت. (١٤)ناچێتە ناوی مەگەر کەسانی ناپوخت و دڕندە و خوانەناس نەبێت. (١٥) ئەوەی حەقیقەت و ڕاستی بە درۆ داناوە و پشتی هەڵکردووە (لە بەرنامەی خوا). (١٦) جا خواناس و پارێزکاران لەو سزاو ناگرو ناخۆشیە دوور دەخرێنەوە. (١٧) ئەو جۆرە کەسەی ماڵ و سامانی

دەبەخشێت بەوە دڵ و دەروونی خۆی خاوێن ڕادەگرێت... (١٨) لە کاتێکدا کەکەس چاکەیەکی وای بەسەریەوە نی یە کە پاداشت بدرێتەوە. (١٩) (چونکە) تەنها مەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی پەروەردگاری بەرزو بڵندە. (٢٠) سوێند بەخوا ڕازی و خۆشنوود دەبێت پێی. (٢١) (تەفسیری ئاسان).

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١–(عن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ قَالَ: قَالَ أَبُو قُحَافَةَ لِأَبِي بَكْرٍ: أَرَاكَ تُعْتِقُ رِقَابًا ضِعَافًا فَلَوْ أَنَّكَ إِذْ فَعَلْتَ مَا فَعَلْتَ أَعْتَقْتَ رِجَالًا جَلْدًا يَمْنَعُونَكَ وَيَقُومُونَ دُونَكَ. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا أَبَتِ إِنِّي إِنَّمَا أُرِيدُ مَا أُرِيدُ لِمَا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَاتُ فِيهِ (فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى) ( الليل: ٦) إِلَى قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ (وَمَا لِأَحَدٍ عِنْدَهُ مِنْ نِعْمَةٍ تُجْزَى إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الْأَعْلَى وَلَسَوْفَ يَرْضَى) (الليل: ١٩) رواه الحاكم في المستدرك وقال (هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ

واتە: لە عەبدولڵای کوڕی زوبیرەوە هاتووە دەڵێ: ئەبو قوحافەی باوکی ئەبوبەکر گوتیە ئەبوبەکر : دەبینم زۆر بەندە ئازاد دەکەی ، ئەگەر بەردەوام بی لەسەر ئەوەی دەیکەی ، پیاوانێك ئازاد دەبن ، تۆ قەدەغە دەکەن ، و دوایش لە تۆ بەرزتر دەبنەوە، ئەبوبەکر گوتی: باوکە من ئەوەی دەیکەم دەیکەم ، لەبەر ئەوە ئەو ئایەتانە دەربارەی ئەو دابەزین (فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى) تاکو دەگاتە (وَمَا لِأَحَدٍ عِنْدَهُ مِنْ نِعْمَةٍ تُجْزَى إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الْأَعْلَى وَلَسَوْفَ يَرْضَى)

٢–(عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ كُنَّا فِي جَنَازَةٍ فِي بَقِيعِ الْغَرْقَدِ فَأَتَانَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَعَدَ وَقَعَدْنَا حَوْلَهُ وَمَعَهُ مِخْصَرَةٌ فَنَكَّسَ فَجَعَلَ يَنْكُتُ بِمِخْصَرَتِهِ ثُمَّ قَالَ مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ مَا مِنْ

نَفْسٍ مَنْفُوسَةٍ إِلَّا كُتِبَ مَكَانُهَا مِنْ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ وَإِلَّا قَدْ كُتِبَ شَقِيَّةً أَوْ سَعِيدَةً فَقَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلَا نَتَّكِلُ عَلَى كِتَابِنَا وَنَدَعُ الْعَمَلَ فَمَنْ كَانَ مِنَّا مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى عَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ وَأَمَّا مَنْ كَانَ مِنَّا مِنْ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى عَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ قَالَ أَمَّا أَهْلُ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ السَّعَادَةِ وَأَمَّا أَهْلُ الشَّقَاوَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ الشَّقَاوَةِ ثُمَّ قَرَأَ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى الْآيَةَ ) متفق عليه

واته: له عەلیەوه هاتووه خوا لێی رازی بێ دەڵێ: لەگەڵ جەنازەیەك بوون لە بەقیع ، پێغەمبەر هاتە لامان ودانیشت ئێمەش لە دەووری دانیشتین دارێكی پێ بوو لە زەوی دەخشاند، دوای فەرمووی : هەموو گیانێك جێگایەكەی دیاری كراوه یان بەهەشتە یان دۆزەخ ، وه نوسراوه ئەو كەسە بەدبەختە یان بەختەوەرە، پیاوێك گوتی: ئەی نێرراوی خوا ئایا بۆچی ئێمە لێی پاڵنەدەینەوه ، وه واز لە كردەوه بێنین ، مادام هەریەكێك لە ئێمە ئەهلی بەختەوەری بێ بەرەو بەختەوەر دەڕوا، وه هەر یەكێك ئەهلی بەدبەختی بێ بەرەو بەد بەختی بڕوا، پێغەمبەر فەرمووی: ئەهلی بەختەوەری ئەو كارانە دەكەن كە پێی دەچنە بەهەشت ، ئەهلی بەدبەختی و دۆزەخ ئەو كارانە دەكەن كە پێی دەچنە دۆزەخەوه.، ئنجا ئەم ئایەتەی خوێندەوه.( فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى)

وفي رواية–( عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا مِنْ يَوْمٍ طَلَعَتْ شَمْسُهُ إِلَّا وُكِّلَ بِجَنْبَتَيْهَا مَلَكَانِ يُنَادِيَانِ نِدَاءً يَسْمَعُهُ خَلْقُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ كُلُّهُمْ غَيْرُ الثَّقَلَيْنِ، يَا أَيُّهَا النَّاسُ، هَلُمُّوا إِلَى رَبِّكُمْ عَزَّ وَجَلَّ، إِنَّ مَا قَلَّ وَكَفَى خَيْرٌ مِمَّا كَثُرَ وَأَلْهَى، وَلَا آبَتْ شَمْسٌ إِلَّا وُكِّلَ بِجَنْبَتَيْهَا مَلَكَانِ يُنَادِيَانِ نِدَاءً يَسْمَعُهُ خَلْقُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ كُلُّهُمْ غَيْرُ الثَّقَلَيْنِ: اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقًا خَلَفًا، وَأَعْطِ مُمْسِكًا تَلَفًا، وَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي ذَلِكَ كُلِّهِ قُرْآنًا فِي قَوْلِ الْمَلَكَيْنِ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ هَلُمُّوا إِلَى رَبِّكُمْ فِي سُورَةِ يُونُسَ: (وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَى دَارِ السَّلَامِ وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ) (يونس: ٢٥) وَأَنْزَلَ فِي قَوْلِهِمَا: اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقًا خَلَفًا، وَأَعْطِ مُمْسِكًا تَلَفًا: (وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى، وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّى، وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنْثَى) (الليل: ٢) إِلَى

قَوْلِهِ: (لِلْيُسْرَى) (الليل: ٧) الطبراني في شعب الايمان قال الالباني صحيح في السلسلة الصحيحة

واته:له ئەبی دەرداوه هاتووه دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی : هیچ ڕۆژێك نیە كە خۆری تێدا هەڵبێ مەگەر دوو فریشتە لە تەنیشت ڕۆژەكەوە بانگ دەكەن هەموو دروستكراوەكانی خوا گوێیان لێ دەبێ تەنها جنۆكە و ئادەمی نەبێ،دەڵێن : ئەی خەڵكینە وەرنە لای پەروەردگاری خۆتان ، وە بێگومان ئەوەی هەتانە ئەگەر كەمی حەلاڵتان هە بێ باشترە لە زۆری خراپ ، وە هەر ڕۆژێك خۆر ئاوا دەبێ مەگەر دوو فریشتە لە تەنیشتیەوەن بانگ دەكەن ، هەموو دروستكراوێك گوێی لێ دەبێ تەنها جنۆكە و ئادەمی نەبێ، دەڵێن : خودایە ماڵ ببەخشە بەوانەی دەبەخشن ، وە بگرەوە لەوانەی ماڵ نابەخشن ، جا خوای گەورە دەربارەی هەموو قسەو دوعای ئەم دوو فریشتە قورئانی دابەزاند، كە گوتیان (يَا أَيُّهَا النَّاسُ هَلُمُّوا إِلَى رَبِّكُمْ) لەسورەتی یونس ئەوەی دابەزاند (وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَى دَارِ السَّلَامِ وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ) (يونس: ٢٥)

كە گوتیان (اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقًا خَلَفًا، وَأَعْطِ مُمْسِكًا تَلَفًا) خوا ئەوەی دابەزاند (وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى، وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّى، وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنْثَى) (الليل: ٢) إِلَى قَوْلِهِ: (لِلْيُسْرَى) (الليل: ٧)

## دەرسەكانی ئەم سورەتە :

١–ئەوەی ماڵ ببەخشێ ماڵی كەم ناكات وەك لە دەقاندا هاتوو

خوافەرموویەتی: (وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ (سبا ٣٩))

واتە: وە ئێوە هەر شتێك ببەخشن ئەوە خوا جێگەی پڕ دەكاتەوە وە ئەو (خوا) چاكترینی ڕۆزی دەرانە.

٢–پێغەمبەر فەرموویەتی :

(( ثلاثٌ أُقْسِمُ عَلَيْهِنَّ: مَا نَقَصَ مالٌ قَطُّ مِنْ صَدَقَةٍ فَتَصَدَّقُوا وَلَا عَفا رَجُلٌ عَن مَظْلِمَة ظُلِمَها إلاّ زَادَهُ الله تَعَالَى بِها عزًّا فاعْفُوا يَزِدْكُمْ الله عِزًّا وَلَا فَتَحَ رَجُلٌ على نَفْسِهِ بابَ مَسألَةٍ يَسْأَلُ النَّاسَ إِلَّا فَتَحَ الله عَلَيْهِ بابَ فَقْرٍ ) (رواه ابْن أبي الدُّنْيَا و أحمد والترمذي) عَن عبد الرحمن بن عوف قال الالباني صحيح)

واتە: سێ شت هەن سوێندیان لەسەر دەخۆم : ١–ماڵ بە بەخشین کەم ناکات ٢– ئەوەی لە حەقی خۆی خۆش دەبێ خوا ئەو کەسە سەربەرز دەکات ٣–ئەوەی سوال بکات تێر نابێ هەر برسیە ودەرگای هەژاری لە خۆ کردۆتەوە.

٢–قەزاو قەدەر رکنێکی ئیمانە پێویست نیە، ئینسان زۆر لێبکۆڵێتەوە، ئەم فەرموودە ئەهێنین لەسەر قەدر.

(عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ قَتَادَةَ السُّلَمِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ خَلَقَ آدَمَ وَأَخَذَ الْخَلْقَ مِنْ ظَهْرِهِ، هَؤُلَاءِ فِي الْجَنَّةِ وَلَا أُبَالِي، وَهَؤُلَاءِ فِي النَّارِ وَلَا أُبَالِي فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَلَى مَاذَا الْعَمَلُ؟ قَالَ: (عَلَى مَوَاقِعِ الْقَدَرِ) رواه ابن حبان قال الالباني صحيح

واتە: لەعبدالرحمن کوڕی قەتادەوە هاتووە خوا لێی رازی بێ ، کە یەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەر دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر بوو فەرمووی : خوای گەورە ئادەمی دروست کرد ، دروستکراوەکانی ناو پشتی ئادەمی گرت وفەرمووی : ئەوانە دەچنە بەهەشتن وە باکم بەکەس نیە، وە ئەوانەش بۆ ناو ئاگرن و باکم بەس نیە، پیاوێك گوتی : ئەی نێرراوی خوا مادام ئاوایە بۆچی ئێمە کاروکردوە بکەین؟ فەرمووی : کاروکردەوە بکەن بۆ ئەو قەدەرەی بۆتان دانراوە. واتە: ئەوەی کردوەی چاك بکات بە قەدری خوا دەچێتە بەهەشت، ئەوەی کردوەی خراپ بکات بە قەدری خوا دەچێتە دۆزەخ.

************************

# وتاری ژماره (١٣٤) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (الضحی)

چەند لایەنەکی گرنگی ئەم سورەتە:

١-ئەم سورەتە لە مەککە دابەزیوە ، لە ریزبەندا ژمارە (٩٣)یە ، وە ژمارەی ئایەتەکانی (١١) ئایەتە

٢-باسی گەورەیی کەسایەتی پێغەمبەر دەکات لە دونیاو قیامەت کە نیعمەتێکی زۆر گەورەیە پێویستی بە سوپاسە

٣-خوا سوێند دەخوات کە پێغەمبەر زۆر بەقەدرە و مەزنە ، و بەهیچ شێوەیەك خوا پشتی تێنەکردوە ،وەك بێ باوەڕەکان گومان دەبن ، وەك فەرموویەتی:

(وَٱلضُّحَىٰ ١ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ٢ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ٣ وَلَلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لَّكَ مِنَ ٱلۡأُولَىٰ ٤ )

واتە: سوێند بە چێشتەنگاو. (١) وە سوێند بەشەو کاتێك کە ئارام دەگرێ، واتە بزرنگێتەوە. (٢) پەروەردگارت وازی لێ نەهێناویت و لێت دڵگیر نەبووە. (٣) وە(پاداشتی) دوا ڕۆژ بۆتۆ چاکترە لە دنیا. (٤)

٤-باسی ئەوە دەکات خوا چەندین رێز وتایبەتمەندی بۆ پێغەمبەر داناوە لە قیامەت ، بەتایبەتی تکای گەورە (الشفاعة العظمی) وەك فەرموویەتی :

(وَلَسَوۡفَ يُعۡطِيكَ رَبُّكَ فَتَرۡضَىٰٓ ٥ )

واتە: سوێند بەخوا لەمەولا پەروەردگارت ئەوەندەت پێ دەبەخشێ کە ڕازی ببیت. (٥)

٥-باسی ئەوە دەكات چۆن پێغەمبەر یەتیم وهەژار بووە ، خوا چاودێری كردوە رزگاری كردوە لە هەژاری و وەحی بۆ ناردوە پێشتر لە وەحی بێ ئاگابووە ، وەك فەرموویەتی:

(أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ ٦ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ٧ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ ٨)

واتە: ئایا تۆی نەدیی بەهەتیوو حەوانیتیەوە. (٦) وە تۆی نەدیی بەسەر لێ شێواو رێنموونیی كردیت. (٧) وە تۆی نەدی بەهەژارو دەوڵەمەندی كردیت. (٨)

٦-لە كۆتایدا خوا (٣) ئامۆژگاری پێغەمبەر دەكات ، بەرامبەر ئەو نیعمەتانەی خوا لەگەڵی كردوون ١-بەسۆزبێ لەگەڵ بێ باوكان ٢-بەزەیی بێتەوە بە خەڵكی پێویست ٣-فرمێسكی هەژاران بسرێتەوە ، وەك فەرموویەتی :

(فَأَمَّا ٱلْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ ٩ وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ ١٠ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ١١)

واتە: كەواتە(تۆش) هەتیوو مەچەوسێنەرەوە. (٩) وە هەڵمەشاخێ بە پرسیاركەر (هەژارو سواڵكەر) دا. (١٠) وە نیعمەت و بەخششی پەروەردگارت دەربخە بەیارمەتی هەژاران. (١١)

## ١-هۆی ئایەتی (١-١١) سورەتی (الضحى)

**واتە: هەموو سورەتەكە وەك ئایەتەكانی لەسەرەوە هاتووە.**

١-(عن جُنْدُب بْن سُفْيَان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ اشْتَكَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يَقُمْ لَيْلَتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا فَجَاءَتْ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ يَا مُحَمَّدُ إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ يَكُونَ شَيْطَانُكَ قَدْ تَرَكَكَ لَمْ أَرَهُ قَرِبَكَ مُنْذُ لَيْلَتَيْنِ أَوْ ثَلَاثَةٍ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَالضُّحَى وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى) متفق عليه

واتە: لە جوندوبی كوڕی سوفیانەوە هاتووە خوا لێ رازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر نەخۆش بوو ، دوو سێ شەوان نەیتوانی شەو نوێژ بكات و هەڵسێتەوە، ئافرەتێك هات گوتی : ئەی

(محمد) ئومێدم وایە شەیتانەکەت وازی لێ هێنابی ، چونکە دوو و سێ شەوە نابینم بێتە لات (وا دیارە شەوان قورئانی خوێندەوە لە شەو نوێژ بەلآم لەبەر نەخۆشی دەنگی نەهاتووە ئەم ئافرەتەش وایزانیوە ئەوە شەیتانە دێتە لای ) جا خوا ئەم ئایەتانەی بۆ دابەزاندوفەرمووی (وَالضُّحَى وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى)

٢-( عَنْ عَلِيِّ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْعَبَّاسِ، رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ، قَالَ: عُرِضَ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا هُوَ مَفْتُوحٌ عَلَى أُمَّتِهِ مِنْ بَعْدِهِ كَنْزاً كَنْزاً فَسُرَّ بِذَلِكَ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى (وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى) (الضحى: ٥) قَالَ: فَأَعْطَاهُ فِي الْجَنَّةِ أَلْفَ الف قَصْرٍ فِي كُلِّ قَصْرٍ مَا يَنْبَغِي لَهُ مِنَ الْأَزْوَاجِ وَالْخَدَمِ)اخرجه الوادعي في الصحيح المسند من اسباب النزول وابن كثير في تفسيره

واتە: لە عەلی کوڕی عەبدولآی کوڕی عەباسەوە هاتووە خوا لێیان رازی بێ دەڵێ: پیشانی پێغەمبەر درا لە پاش خۆی گەنجینەکان دەدرێن بە ئومەتەکەی (واتە : سەرکەوتنان بەدەست دێنن وحاڵ وباڵیات خۆش دەبێ) جا پێغەمبەر بەوە دڵ خۆش بوو ، خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند (وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى) واتە: لەمو دوا پەروەردگارت شتێکت پێدەدات رازیت دەکات ، دەڵێ: خوا لە بەهەشت هەزار کۆشکی دەداتێ، هەموو کۆشکەکان ئافرەت و خزمتکاری تێدایە.

وفى روایه(عَنِ الْأَسْوَدِ بْنِ قَيْسٍ، أَنَّهُ سَمِعَ جُنْدُبًا، يَقُولُ: أَبْطَأَ جِبْرِيلُ عَلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ الْمُشْرِكُونَ: قَدْ وُدِّعَ مُحَمَّدٌ، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَالضُّحَى وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى) (الضحى: ٢) رواه مسلم

وفى روایه(عَنْ جُنْدَبٍ البَجَلِيِّ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَارٍ، فَدَمِيَتْ إِصْبَعُهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَلْ أَنْتِ إِلَّا إِصْبَعٌ دَمِيتِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ مَا لَقِيتِ) قَالَ: وَأَبْطَأَ عَلَيْهِ جِبْرِيلُ، فَقَالَ المُشْرِكُونَ: قَدْ وُدِّعَ مُحَمَّدٌ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى) (الضحى: ٣) رواه الترمذي قال الالباني صحيح

-وفي رواية( عَنْ عَلِيِّ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ أَبِيهِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: عُرِضَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا هُوَ مَفْتُوحٌ عَلَى أُمَّتِهِ مِنْ بَعْدِهِ كُفْرًا كُفْرًا، فَسُرَّ بِذَلِكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى) (الضحى: ٥) فَأَعْطَاهُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي الْجَنَّةِ أَلْفَ قَصْرٍ فِي كُلِّ قَصْرٍ مَا يَنْبَغِي لَهُ مِنَ الْأَزْوَاجِ وَالْخَدَمِ) الطبراني في الاوسط وابو نعيم في حيلية الاولياء

وفى روايــه-( عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رسول اللَّه صلى اللَّه عليه وسلم: لَقَدْ سَأَلْتُ رَبِّي مَسْأَلَةً وَدِدْتُ أَنِّي لَمْ أَكُنْ سَأَلْتُهُ. قُلْتُ: يَا رَبِّ! إِنَّهُ قَدْ كَانَتِ الْأَنْبِيَاءُ قَبْلِي مِنْهُمْ مَنْ سَخَّرْتَ لَهُ الرِّيحَ- وَذَكَرَ سُلَيْمَانَ بْنَ دَاوُدَ- وَمِنْهُمْ مَنْ كَانَ يُحْيِي الْمَوْتَى- وَذَكَرَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ- وَمِنْهُمْ وَمِنْهُمْ. قَالَ: فَقَالَ: أَلَمْ أَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَيْتُكَ؟! قَالَ: قُلْتُ: بَلَى (يَا رَبِّ) قَالَ: أَلَمْ أَجِدْكَ ضَالًّا فَهَدَيْتُكَ؟! قَالَ قُلْتُ: بَلَى يَا رَبِّ! قَالَ: أَلَمْ أَجِدْكَ عَائِلًا فَأَغْنَيْتُكَ؟! قَالَ: قُلْتُ: بَلَى يَا رَبِّ! قَالَ: أَلَمْ أَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ، وَوَضَعْتُ عَنْكَ وِزْرَكَ؟! قَالَ: قُلْتُ: بَلَى يَا رَبِّ!) اخرجه الواحدي من اسباب النزول القران قال المحقق: كمال بسيوني زغلول اسناده حسن ، وقال الالباني صحيح في السلسلة الصحيحة

واته: له ویبنو عەباسەوە هـاتووە دەڵـێ: پێغەمبـەر فـەرمووی : داواکـارێکم لـە خـوا کـرد خۆزگە داوام نەکردبایە ، گوتم ئەی پەروەردگاری من هەندێ لە پێغەمبـەرانی پێشـوو بـای بۆ رام کرابوو، وەك سلیمان کوڕی داود، هەندێك مردوویـان زینـدو دەکـردەوە وەك عیسـی کوڕی مەریم، هەر هەندێك لەوان ئەو شتە وشتەیان هەبوو، فەرمووی : خوا پێـی فـەرمووم : ئایا تۆش بێ باوك نـەبووی مـن بەخێوکـەرو جێگـام بـۆ دابـین کـردی؟ گـوتم بـەڵێ ئـەی پەروەردگار، فەرمووی : ئایا بێ ئاگا نـەبووی لـە نێگـاو وەحـی خـوا ، مـن رێگـای راسـتم پیشاندای ؟ گوتم بەڵێ ئەی پـەروەردگار، فـەرمووی ئایـا هـەژار نـەبووی مـن دەوڵەمەنـدم کردی ؟ گوتم بەڵێ ئەی پەروەردگار، فەرمووی : ئایا دڵمان خـۆش و گوشـاد نـەکردی کـە بارت قورس بۆمان سووك کردی ؟ گوتم بەڵێ ئەی پەروەردگار .

یەکێ لەزانابان دەڵێ پێغەمبەر (٣) جاران یەتیم بووە :

یەکەم: هێشتا لە زگی دایکیدایە باوکی وەفات دەکات

دووەم : لەتەمەنی (٦) ساڵی دایکیشی وەفات دەکات

سێیەم : باپیری سەرپەرشتیاری دەکات ، کە تەمەنی دەبێتە (٨) ساڵان ئەویش وەفات دەکات

## سۆزی پێغەمبەر بۆ ئوممەتەکەی:

خوا لەبارەی پێغەمبەر فەرموویەتی : (لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ١٢٨) التوبه

واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی بۆتان هاتووە پێغەمبەرێك لە خۆتان قورس و گرانە بەلایەوە نارەحەتی و ناخۆشی ئێوە زۆر سوورە لەسەر (باوەڕ هێنان) تان بۆ بڕواداران دڵسۆز و میهرەبانە.

## خوا پێغەمبەر رازی دەکات بۆ ئوممەتەکەی :

(عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: تَلَا قَوْلَ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ فِي إِبْرَاهِيمَ: (رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ فَمَنْ تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي) (إبراهيم: ٣٦) الْآيَةَ، وَقَالَ عِيسَى عَلَيْهِ السَّلَامُ: (إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ) (المائدة: ١١٨)، فَرَفَعَ يَدَيْهِ وَقَالَ: (اللهُمَّ أُمَّتِي أُمَّتِي)، وَبَكَى، فَقَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: (يَا جِبْرِيلُ اذْهَبْ إِلَى مُحَمَّدٍ، وَرَبُّكَ أَعْلَمُ، فَسَلْهُ مَا يُبْكِيكَ؟ فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ، فَسَأَلَهُ فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَا قَالَ، وَهُوَ أَعْلَمُ، فَقَالَ اللهُ: يَا جِبْرِيلُ، اذْهَبْ إِلَى مُحَمَّدٍ، فَقُلْ: إِنَّا سَنُرْضِيكَ فِي أُمَّتِكَ، وَلَا نَسُوءُكَ) رواه مسلم

شرح: (إنا سنرضيك) هذا موافق لقول الله عز وجل ولسوف يعطيك ربك فترضى

وفي رواية–( عَنْ أَبِي طَلْحَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَاءَ ذَاتَ يَوْمٍ وَالْبِشْرُ فِي وَجْهِهِ، فَقَالَ: إِنَّهُ جَاءَنِي جِبْرِيلُ، فَقَالَ: إِنَّ رَبَّكَ يَقُولُ: أَمَا يُرْضِيكَ يَا مُحَمَّدُ أَنْ لَا يُصَلِّيَ عَلَيْكَ أَحَدٌ مِنْ أُمَّتِكَ إِلَّا صَلَّيْتُ عَلَيْهِ عَشْرًا، وَلَا يُسَلِّمُ عَلَيْكَ أَحَدٌ مِنْ أُمَّتِكَ إِلَّا سَلَّمْتُ عَلَيْهِ عَشْرًا) ؟ رَوَاهُ النَّسَائِيُّ، وَالدَّارِمِيُّ قال الالباني حسن

دەرسەكانى ئەم سورەتە:

١–گەورەيى پێغەمبەر

٢–بەسۆزى پێغەمبەر بۆ ئوممەتەكەى

٣–گەورەيى ئەم سورەتە.

*****************************

## وتاری ژماره (١٣٥) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### سوڕەتی (العلق) وه پێشی دەگوترێ سوڕەتی (اقرا):

ئەم سورەته له ریزبەندا ژماره (٩٦)ه وه ژمارەی ئایەتەکانی (١٩) ئایەته.

-ئەم سورەته له شاری (مەککه) دابەزیوه

(أَرَءَيۡتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلۡهُدَىٰٓ ١١ أَوۡ أَمَرَ بِٱلتَّقۡوَىٰٓ ١٢ أَرَءَيۡتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ١٣ أَلَمۡ يَعۡلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ١٤)

چەند لایەنەکی گرنگی ئەم سورەته :

١- لەسەرەتادا باسی دابەزینی قورئان دەکات له ئەشکەوتی (حیرا) ئەو کاتەی ئەو خواپەرستی دەکرد لەوێ ، ئەم (٥) ئایەتەی بۆ دابەزین .

(ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ٥ )

واته : ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بخوێنه به ناوی پەروەردگارتەوه که هەموو شتێکی دروست کردووه. (١) مرۆڤی دروست کردوه له خوێنێکی بەستوو. (٢) بخوێنه،پەروەردگاری تۆ(له هەموو کەس )بەخشندەتره. (٣) ئەوەی که(مرۆڤی) فێر(ی نووسین) کردووه بەقەڵەم. (٤) مرۆڤی شارەزا کردووه بەو شتانەی که نەی دەزانی. (٥)

٢-باسی ئینسان دەکات کاتێ خوا مال وسامانی دەداتێ له جیاتی سوپاس خوا ، سەرکەشی وسەرپێچی وتاوان دەکات . وەك دەفەرموێت :

(كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ٦ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ٧ إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجۡعَىٰٓ ٨)

واته: بەڕاستی مرۆڤ یاخی دەبێ. (٦) که خۆی ببینێ وادەوڵەمەند بووه. (٧) بێگومان هەر بۆ لای پەروەردگاری تۆیه گەڕانەوه. (٨)

٣-باسی ئەبو جەهل دەكات كە بە ناوبانگە بە فرعونی ئەم ئوممەتە ، كە چۆن پێغەمبەر قەدەغە دەكات لە نوێژكردن ، وەك فەرموویەتی :

(أَرَءَيْتَ ٱلَّذِي يَنْهَىٰ ٩ عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ١٠ )

واتە: ئایا بینیت ئەو كەسەی كە جڵەوگیریی ئەكات. (٩) لە بەندەیەك كەنوێژ بكات ؟ . (١٠)

٤-لە كۆتایدا هەڕەشەی توند دەكات لە ئەبو جەهل و هاوێنەكانی ئەگەر دەست هەڵنەگرن لە دوژمنایەتی پێغەمبەر وەك فەرموویەتی:

(كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ١٥ نَاصِيَةٍ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ١٦ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُۥ ١٧ سَنَدْعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ١٨ كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب ١٩ )

واتە: وا نی یە (كە بیری لێ دەكاتەوە)بە ڕاستی ئەگەر واز نەهێنێ ڕای دەكێشین (بە قژی) پێشەسەری. (١٥) پێشەسەرێكی درۆزنی بە هەڵەدا چوو. (١٦) ئینجا با ئەو بانگی هاوڕێكانی خۆی بكات. (١٧) ئێمەش بانگی فریشتەی زەبر بە دەست دەكەین. (١٨) نەخێر،بە گوێ ی(ئەو كەسانە)مەكە ،وە كوڕنوش بەرەو (لەخوا)نزیك بكەوەرەوە. (١٩)

## ئایا سەرەتا چۆن وەحی بۆ پێغەمبەر هات؟

١-( ئیمامی بوخاری و ئیمامی موسلیم دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خودا(صلی الله علیە وسلم) لە تەمەنی چل ساڵیدا بوو لە مانگی ڕەمەزاندا لە ئەشكەوتی(حیرا) _ كە لە شاخێكی نزیك شاری مەككەدایە_ بە شێوەیەك خەریكی خودا پەرستیی بوو، جبرائیل( سەلامی خودای لێ بێت) هات بۆ لای و پێی ووت: (اقرأ) واتە: بخوێنە... پێغەمبەری خودایش(صلی الله علیە وسلم) فەرمووی خوێندەوار نیم... جبرائیل بە توندی گرتی و گووشی بەخۆیەوە، ئینجا بەریداو جارێكی تر پێی ووتەوە(اقرأ) ... پێغەمبەری

خودایش(صلى الله عليه وسلم) دووباره فـەرمووی: ئـاخر مـن خوێنـدەوار نـیم... جـارێکی دیکە جبرائیل گرتیەوەو بە توندی گوشـاردی و ئینجـا بەریدایـەوەو دیسـانەوە پێـی ووت: (اقرأ)، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم)، دیسـانەوە فـەرمووی: مـن خوێنـدەوار نـیم... ئینجا جبرائیل_ سەلامی خودای لێ بێت_ بۆ دواجار تونـد گوشـی و بەریدایـەوەو، ووتـی: (اقـرأ باسـم ربـك الـذي خلـق) ... تـا ئایـەتی پێنجـەمی ئـەم سـوورەتە پـیرۆزەی بـۆ خوێندەوە... کە جبرائیل دوور کەوتـەوە، پێغەمبـەری خـودا(صـلى اللـه عليـه وسـلم) بـە پەشۆکاوی یەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە بۆ لای خەدیجەی خێزانی و فەرمووی: (دامپۆشن ... دامپۆشن) پاش ماوەیـەك لـە حەسـانەوەی، پەشـۆکاویەکەی ڕەویـەوە، ئـیتر لـەو ڕۆژەوە پلەی پێغەمبەرێتی خەڵات کرا. پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) ئـەم ڕووداوەی بـۆ خاتوو خەدیجەی هاوسەری گێڕایەوە، خاتوو خەدیجەیش(ڕەزای خودای لەسەر بێت) پێـی ووت: تۆ کەسێکی ڕاستگۆیت، یارمەتی هەژاران و لێقەوماوان دەدەیـت، بەرانبـەر خزمانـت بەسۆزو بە بەزەیی و میهرەبانیت، ڕێزی میوان دەگریت و بـە جـوانیی بـەڕێی دەکـەیت... هەرگیز خودا خراپە نایەنێتە ڕێگای تۆ.(تەفسیری ڕامان)

٢-(عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أَنَّهَا قَالَتْ أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ فِي النَّوْمِ فَكَانَ لَا يَرَى رُؤْيَا إِلَّا جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ ثُمَّ حُبِّبَ إِلَيْهِ الْخَلَاءُ وَكَانَ يَخْلُو بِغَارِ حِرَاءٍ فَيَتَحَنَّثُ فِيهِ وَهُوَ التَّعَبُّدُ اللَّيَالِيَ ذَوَاتِ الْعَدَدِ قَبْلَ أَنْ يَنْزِعَ إِلَى أَهْلِهِ وَيَتَزَوَّدُ لِذَلِكَ ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى خَدِيجَةَ فَيَتَزَوَّدُ لِمِثْلِهَا حَتَّى جَاءَهُ الْحَقُّ وَهُوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ فَجَاءَهُ الْمَلَكُ فَقَالَ اقْرَأْ قَالَ مَا أَنَا بِقَارِئٍ قَالَ فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ اقْرَأْ قُلْتُ مَا أَنَا بِقَارِئٍ فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَةَ حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ اقْرَأْ فَقُلْتُ مَا أَنَا بِقَارِئٍ فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ فَرَجَعَ بِهَا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرْجُفُ فُؤَادُهُ فَدَخَلَ عَلَى خَدِيجَةَ بِنْتِ خُوَيْلِدٍ فَقَالَ زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي فَزَمَّلُوهُ حَتَّى ذَهَبَ عَنْهُ الرَّوْعُ فَقَالَ لِخَدِيجَةَ وَأَخْبَرَهَا الْخَبَرَ لَقَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِي فَقَالَتْ خَدِيجَةُ كَلَّا وَاللَّهِ مَا

يُخْزِيكَ اللَّهُ أَبَدًا إِنَّكَ لَتَصِلُ الرَّحِمَ وَتَحْمِلُ الْكَلَّ وَتَكْسِبُ الْمَعْدُومَ وَتَقْرِي الضَّيْفَ وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ فَانْطَلَقَتْ بِهِ خَدِيجَةُ حَتَّى أَتَتْ بِهِ وَرَقَةَ بْنَ نَوْفَلِ بْنِ أَسَدِ بْنِ عَبْدِ الْعُزَّى ابْنَ عَمِّ خَدِيجَةَ وَكَانَ امْرَأً قَدْ تَنَصَّرَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ وَكَانَ يَكْتُبُ الْكِتَابَ الْعِبْرَانِيَّ فَيَكْتُبُ مِنْ الْإِنْجِيلِ بِالْعِبْرَانِيَّةِ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَكْتُبَ وَكَانَ شَيْخًا كَبِيرًا قَدْ عَمِيَ فَقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ يَا ابْنَ عَمِّ اسْمَعْ مِنْ ابْنِ أَخِيكَ فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ يَا ابْنَ أَخِي مَاذَا تَرَى فَأَخْبَرَهُ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَبَرَ مَا رَأَى فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ هَذَا النَّامُوسُ الَّذِي نَزَّلَ اللَّهُ عَلَى مُوسَى يَا لَيْتَنِي فِيهَا جَذَعًا لَيْتَنِي أَكُونُ حَيًّا إِذْ يُخْرِجُكَ قَوْمُكَ فَقَالَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوَمُخْرِجِيَّ هُمْ قَالَ نَعَمْ لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قَطُّ بِمِثْلِ مَا جِئْتَ بِهِ إِلَّا عُودِيَ وَإِنْ يُدْرِكْنِي يَوْمُكَ أَنْصُرْكَ نَصْرًا مُؤَزَّرًا ثُمَّ لَمْ يَنْشَبْ وَرَقَةُ أَنْ تُوُفِّيَ وَفَتَرَ الْوَحْيُ )رواه البخاري)

## هۆی دبەزینی ئایەتی (٩-١٠) سورەتی (العلق)

﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِي يَنْهَىٰ ٩ عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ١٠﴾

واتە : بە یەکەوەیە، کە دەفەرموێت: (رأيت) واتە: پێم بڵێ، بەڵام لەم ئایەتەدا خودا بە شێوەی سەرسوڕمان دەیفەرموێت، بۆیە مانای (بینین) دەبەخشێت... واتە: ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئایا حاڵ و کردەوەی ئەو کەسەت نەبینی کە ڕێگا لەو کەسە دەگرێت کە نوێژو بەندایەتی خودا دەکات؟. دەڵێن مەبەست لەو کەسە (ئەبو جەهل) ە، کە وتویەتی ئەگەر( محەممەد) ببینم نوێژ بکات، قاچم دەخەمە سەر ملی.(گوڵشەن)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

٢-( عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو جَهْلٍ: هَلْ يُعَفِّرُ مُحَمَّدٌ وَجْهَهُ بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ؟ فَقِيلَ: نَعَمْ. فَقَالَ: وَاللَّاتِ وَالْعُزَّى لَئِنْ رَأَيْتُهُ يَفْعَلُ ذَلِكَ لَأَطَأَنَّ عَلَى رَقَبَتِهِ فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يُصَلِّي – زَعَمَ لِيَطَأَ عَلَى رَقَبَتِهِ – فَمَا فَجِئَهُمْ مِنْهُ إِلَّا وَهُوَ يَنْكُصُ عَلَى عَقِبَيْهِ وَيَتَّقِي بِيَدَيْهِ فَقِيلَ لَهُ مَالك؟ فَقَالَ: إِنَّ بَيْنِي وَبَيْنَهُ لَخَنْدَقًا مِنْ نَارٍ وَهَوْلًا وَأَجْنِحَةً. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ( لَوْ دَنَا مِنِّي لَاخْتَطَفَتْهُ الْمَلَائِكَةُ عُضْواً عُضْواً) رَوَاهُ مُسلم

واتە: لە ئەبو هوریرەوە هاتووە دەڵێ: ئەبو جەهل گوتی : ئایا (محمد) دەم وچاوی خۆی تۆزاوی کرد (مەبەستی ئەوە بوو نوێژی کرد) ، گوتیان بەڵێ : گوتی: سوێند بە لات وعوززا ، ئەگەر ببینم نوێژ بکات دەچمە سەر ملی، پێغەمبەر نوێژی کرد، ویستی بچێتە سەر ملی لەلای ئەوان هات و گەرایەوە وشتی بەدەستەکانی لە خۆ دوور دەخستەوە، پێی گوترا ئەوە چیتە؟ گوتی : لە نێوان من و ئەودا چاڵێکی ئاگرو شتی ناخۆش هەبوو ، لەگەڵ چەند باڵێك ، پێغەمبەر فەرمووی : ئەگەر لە من نزیك بایەوە مەلائیکەت پارچە پارچەیان دەکرد.

## هۆی دابەزینی ئایەتی ( ١٧-١٨ ) سورەتی ( العلق )

﴿فَلْيَدْعُ نَادِيَهُۥ ١٧ سَنَدْعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ١٨﴾

واتە: جا با ئەوکاتە هاوەڵ و هاوڕێ و هاودانیشتووەکانی بانگ بکاو هاواریان بۆ ببات بەڵکو نەهێڵن، (ئیبن عەباس) دەڵێ: ئەگەر هاواری بۆ بردبان، دەستبەجێ فریشتەی سزا دەیگرت و تیادەچوو.(١٧) سندع الزبانیە بە تەئکیدئێمەش دەرگاوانەکانی دۆزەخی بۆ بانگ ئەکەین تا بیگرن، کە بەڕاستی کۆمەڵێکی زەبر بەدەستن. (١٨).

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

( عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي فَجَاءَ أَبُو جَهْلٍ فَقَالَ: أَلَمْ أَنْهَكَ عَنْ هَذَا؟ أَلَمْ أَنْهَكَ عَنْ هَذَا؟ أَلَمْ أَنْهَكَ عَنْ هَذَا؟ (فَانْصَرَفَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَزَبَرَهُ)، فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ: إِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا بِهَا نَادٍ أَكْثَرُ مِنِّي، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ) (العلق: ١٨) فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: (وَاللَّهِ لَوْ دَعَا نَادِيَهُ لَأَخَذَتْهُ زَبَانِيَةُ اللَّهِ) رواه الترمذي قال الالباني صحيح

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر نوێژی دەکرد ، ئەبو جەهل هات گوتی: ئایا پێم نەگوتی نوێژ مەکە؟ ئایا پێم نەگوتی نوێژ مەکە؟ ئایا پێم نەگوتی نوێژ مەکە؟ پێغەمبەریش تێپەری ، ئەبو جەهل گوتی : تۆ دەزانی شوێنی کۆبونەوە زۆر خەڵکی تێدایە کە بانگیان بکەم ، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاندوفەرمووی: (فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ) ئیبنو عەباس دەڵێ: سوێند بەخوا ئەگەر بانگی تاقمی خۆی کردبایە مەلائیکەتیانی خوا دەیانگرت وتیا دەچوو.

## چۆنیەتی کوژرانی ئەبو ( جهل ) رۆژی بەدر:

(عَنْ عَبْدِ اللهِ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ بَدْرٍ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي قَدْ قَتَلْتُ أَبَا جَهْلٍ، فَقَالَ: (وَاللهِ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، أَنْتَ قَتَلْتَهُ؟) فَقُلْتُ: وَاللهِ الَّذِي لَا إِلَهَ غَيْرُهُ، لَأَنَا قَتَلْتُهُ، قَالَ: فَاسْتَخَفَّهُ الْفَرَحُ، فَقَالَ: (مُرُوا بِهِ). قَالَ: فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ حَتَّى وَقَفْتُ بِهِ عَلَى رَأْسِهِ فَقَالَ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَخْزَاكَ، هَذَا فِرْعَوْنُ هَذِهِ الْأُمَّةِ جُرُّوهُ إِلَى الْقَلِيبِ) قَالَ: وَكُنْتُ ضَرَبْتُهُ بِسَيْفِي فَلَمْ يَحُكَّ فِيهِ، فَأَخَذْتُ سَيْفَهُ فَضَرَبْتُهُ بِهِ حَتَّى قَتَلْتُهُ، فَنَفَّلَنِي النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَلَبَهُ) حلية الاولياء

واتە: لە (عبداللە) ی کوری مەسعەدەوە هاتووە دەڵێ: رۆژی بەدر گوتم ئەی نێرراوی خوا ئەبو جەهلم کوشت ، فەرمووی : سوێند بەو خودایەی هیچ پەستراو نین جگە لەو تۆ

کوشتت؟ گوتم : سوێند بەوەی هیچ پەرستراو نین جگە لەو، من کوشتم، ئـەڵێ: پێغەمبـەر دڵ خۆشی دایگرت، فـەرمووی : پیشـانم بدە، بەیەکـەوە چـوون لای ، بردمـە لای سـەری ئەبوجەهل، فەرمووی : سـوپاس بـۆ ئـەو خوایـەی ریسـوای کـردی ، ئـەوە فرعـەونی ئـەم ئوممەتەیە رایکێشن بۆ ئەو چاڵە) دەڵێ : بە شمشێری خۆم لێم دا کاری لـێ نـەکرد، دوای شمشێرەکەی خۆی لێم ساند لێمدا تـاکو کوشـتم، جـا پێغەمبـەر کـەل وپـەلی ئـەوی پـێ بەخشیم.

**************************

# وتاری ژماره (١٣٦) لە هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (الزلزلة)

((إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ١ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ٢ وَقَالَ ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا ٣ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ٤ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ٥ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْاْ أَعْمَٰلَهُمْ ٦ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ٨))

واتە: کاتێ کە زەوی بەتوندی تەکانیداو کەوتە لەرزە لەرزو جوولە جوولێ، بەهەرهۆیەکەوە بێت، (ئیبن عەباس) ئەڵێ: ئەوە لە (نەفخە)ی یەکەمدایە، بە جۆرە لەرزەیەکی وا کەشایستەی ئەوبێت، جائەبێ ئەو حاڵەتە چ رووداوێکی گەورەبێت (١)وزەوی هەرچی باری گران وقوورسی هەبوو فرێی دایە دەرەوە: (مردووان، نەوت و، ئاوو، خەزنەو، هەزاران هەزار شتی تر) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (تقيئ الأرض أفلاذ كبدها أمثال الأسطوان من الذهب والفضة، فيجئ القاتل فيقول: في هذا قَتَلْتُ، ويجئ القاطع فيقول: في هذا قطعت رحمي، ويجئ السارق فيقول: في هذا قطعت يدي، ثم يدعونه فلا يأخذون منه شيئا) مسلم: مەبەست ئەوەیە کە هەرچی زێڕو زیوو نەختینە هەیە لەورۆژەدا بەفەرمانی خوا هەڵی دەداتە دەرێ، ئیتر خەڵکان دەڵێن: بەهۆی ئەمەوە بوو گوناح و تاوانمان دەکرد! . (٢) قیامەت هات زەمین بوومەلەرزە لێیدەداو، مرۆڤ دەڵێ چی قەوماوە؟: و ئەوکاتە ئادەمیی کافر بەسەر سوڕمانێکەوە دەڵێ: زەوی چییەتی وا دەکات..؟ (٣) يومئذ تحدث اخبارها لەو ڕۆژەدا زەوی هەواڵەکانی خۆی چاك و خراپ رادەگەیە نێت و، مەردوم تێ ئەگات کەئەو زەمین لەرزەیە سەرەتای رۆژێکی سەخت و وێران بوونی دونیایە (٤)ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە پەروەردگارت وەحیی و فرمانی

پێکـردووه بـەو زەلزەلەیـە ، واتـە: لەخۆیـەوە نـاتوانێ هـیچ بکـات و هـەردەم لـە ژێـر دەستەڵاتی خوادایـە (٥)لـەو ڕۆژەدا خـەڵکی بەپـەرش و بڵـاوی لـەگۆڕەکانیان دەردەچـن بۆشوێنی بۆئەوەی پـاداش و تۆلـەی کـارو کردەوەکانیـان نیشـان بـدرێت. (٦) تۆزقاڵەیـە (خێـرو شـەڕ) ون نـابێ: ئینجـا هەرکەسـێك کێشـی وردیلەیـەك چـاکەی ئەنجامـدابێت، پاداشـەکەی دەبینێتـەوە (٧)و کەسـێکیش کێشـی وردیلەیـەك شـەرو خراپـەی کردبێـت ، تۆڵەکەی دەبینێتەوە، مەگەر خوا قەڵەمی عـەفوو بـێنی بەسـەریا، کـەوابوو بـا هـەموومان هۆشیارو زیرەك و وریابین، بزانین ڕۆژانە چی ئەکەین و لەخوا بترسین. (٨)

## چەند لایەنەکی گرنگی ئەم سورەتە:

١–ئەم سورەتە لە مەدینە دابەزیوە ، بەلاّم شێوازی بە سـورەتە مەککیـەکان دەچـێ ، لـە ریزبەندا ژمارە (٩٩)یە ، وە ژمارەی ئایەتەکانی (٨) ئایەتە.

٢–باسی بومەلەرزەی دونیا تێکچوون دەکـات و دارمـانی چـیاکان و شـەق بـوونی زەوی و هاتنـەدەرەوەی کانزاکـانی وەك زێـر زیـو ، وە زەوی دەنـگ وباسـی خـۆی دەگێرێتـەوە چاکەی لەسەر کرابێ یان خراپە بە ئینسـان دەلـێ ئـەم کـارەو ئـەم کـارەت کـردوە ، لـەم ڕۆژدا خەڵکی ئەبن بە دوو بەش ، سەرکەوتوو و دۆڕاو

## ١–هۆی ئایەتی ( ١–٨ ) سورەتی (الزلزله )

١-( عن عبـد اللهِ بن عمرٍو، قـال: نزلـتْ: (إِذَا زُلْزِلَـتِ الأَرْضُ زِلْزَالَهَـا) ، وأبـو بكـرٍ الصِّـدِّيقُ رضي الله عنه قاعدٌ، فبكى أبو بكرٍ رضي الله عنه، فقال له رسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم: (مَا يُبْكِيكَ يَا أَبَا بَكْرٍ؟ قال: أَبْكَتْني هذه السورةُ. فقال رسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم: (لَوْ أَنَّكُمْ لاَ تُخْطِئُونَ وَلاَ تُذْنِبُونَ لَخَلَقَ اللهُ مِنْ بَعْدِكُمْ أُمَّةً يُذْنِبُونَ وَيُخْطِئُونَ، فَيَغْفِرُ لَهُمْ) ذكره

الهيثمي في مجمع الزوائد (١٤١/٧) ، وقال: )رواه الطبراني، وفيه حيي بن عبد الله المعافري؛ وثقه ابن معين وغيره، وبقية رجاله رجال الصحيح

واتە: لە عەبدولاّی کوڕی عەمرەوە هاتووە دەڵێ: کاتێ سورەتی (الزلزلە) دابەزی ئەبوبەکری صیدیق خوا لێ رازی بێ دانیشتبوو گریا ، پێغەمبەر پێی فەرموو: بۆچی دەگری ؟ گوتی : ئەم سورەتە گریاندمی (چونکە باسی دیمەنی ڕۆژی قیامەت دەکات) پێغەمبەر فەرمووی: ئەگەر ئێوە هەڵە وگوناحان نەکەن ، ئەوە خوا لە پاش ئێوە گەلانێك دروست دەکات گوناح وهەڵان دەکەن و خواش لێیان خۆش دەبێ.

## زەوی هەواڵان دەگێڕێتەوە:

-( عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذِهِ الْآيَةَ: (يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا) (الزلزلة: ٤) قَالَ: (أَتَدْرُونَ مَا أَخْبَارُهَا؟) قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ: فَإِنَّ أَخْبَارَهَا أَنْ تَشْهَدَ عَلَى كُلِّ عَبْدٍ وَأَمَةٍ بِمَا عَمِلَ عَلَى ظَهْرِهَا، أَنْ تَقُولَ: عَمِلَ عَمَلَ كَذَا فِي يَوْمِ كَذَا، فَهَذِهِ أَخْبَارَهَا ) رواه الحاكم في المستدرك وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ ووافقه الذهبي .

واتە: لە ئەبو هوریرەوە هاتووە خوا لێی رازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ئەم ئایەتەی خوێندەوە (يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا)) فەرمووی : ئایا دەزانن چ هەواڵێکە ، گوتیان : خوا و پێغەمبەر چاکتر دەزانن ، فەرمووی : هەواڵی زەوی لەو ڕۆژدا بریتیە لەوەی شایەدی دەدات لەسەر هەموو مرۆڤێکی پیاو ئافرەت ئاخۆ چ کردەوەیەکیان لەسەر زەوی کردوە، زەوی دەڵێ: ئەو کردەوەی کردوە لەم ڕۆژدا ئەوە هەواڵی زەویە کە دەگێڕێتەوە.

## دیمەنێکی قیامەت لەم فەرموودەدا:

( عن ابي هُرَيْـرَةَ، يَقُولُ: قَـالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ: ( مَا مِنْ صَاحِبِ ذَهَـبٍ وَلَا فِضَّةٍ، لَا يُؤَدِّي مِنْهَا حَقَّهَا، إِلَّا إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ، صُفِّحَتْ لَهُ صَفَائِحُ مِنْ نَارٍ، فَأُحْمِيَ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ، فَيُكْوَى بِهَا جَنْبُهُ وَجَبِينُهُ وَظَهْرُهُ، كُلَّمَا بَـرَدَتْ أُعِيدَتْ لَهُ، فِي يَـوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ، فَيَرَى سَبِيلَهُ، إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِمَّا إِلَى النَّارِ) قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَالْإِبِلُ؟ قَـالَ: (وَلَا صَـاحِبُ إِبِلٍ لَا يُـؤَدِّي مِنْهَـا حَقَّهَـا، وَمِنْ حَقِّهَـا حَلَبُهَـا يَـوْمَ وِرْدِهَـا، إِلَّا إِذَا كَـانَ يَـوْمُ الْقِيَامَـةِ، بُطِـحَ لَهَـا بِقَـاعٍ قَرْقَـرٍ، أَوْفَـرَ مَـا كَانَـتْ، لَا يَفْقِـدُ مِنْهَـا فَصِـيلًا وَاحِدًا، تَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا وَتَعَضُّـهُ بِأَفْوَاهِهَا، كُلَّمَا مَرَّ عَلَيْـهِ أُولَاهَا رُدَّ عَلَيْـهِ أُخْرَاهَا، فِي يَـوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ، فَيَرَى سَبِيلَهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِمَّا إِلَى النَّارِ) قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَالْبَقَرُ وَالْغَنَمُ؟ قَالَ: (وَلَا صَاحِبُ بَقَرٍ، وَلَا غَنَمٍ، لَا يُؤَدِّي مِنْهَا حَقَّهَا، إِلَّا إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ بُطِحَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ، لَا يَفْقِدُ مِنْهَا شَيْئًا، لَيْسَ فِيهَا عَقْصَاءُ، وَلَا جَلْحَاءُ، وَلَا عَضْبَاءُ تَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا وَتَطَؤُهُ بِأَظْلَافِهَا، كُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ أُولَاهَا رُدَّ عَلَيْهِ أُخْرَاهَا، فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ، فَيَرَى سَبِيلَهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِمَّا إِلَى النَّارِ، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَالْخَيْلُ؟ قَالَ: الْخَيْلُ ثَلَاثَةٌ: هِيَ لِرَجُلٍ وِزْرٌ، وَهِيَ لِرَجُلٍ سِتْرٌ، وَهِيَ لِرَجُلٍ أَجْرٌ، فَأَمَّا الَّتِي هِيَ لَهُ وِزْرٌ، فَرَجُلٌ رَبَطَهَا رِيَاءً وَفَخْرًا وَنِوَاءً عَلَى أَهْلِ الْإِسْلَامِ، فَهِيَ لَهُ وِزْرٌ، وَأَمَّا الَّتِي هِيَ لَهُ سِتْرٌ، فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِي سَبِيلِ اللهِ، ثُمَّ لَمْ يَنْسَ حَقَّ اللهِ فِي ظُهُورِهَا وَلَا رِقَابِهَا، فَهِيَ لَهُ سِتْرٌ وَأَمَّا الَّتِي هِيَ لَهُ أَجْرٌ، فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِي سَبِيلِ اللهِ لِأَهْلِ الْإِسْلَامِ، فِي مَرْجٍ وَرَوْضَةٍ، فَمَا أَكَلَتْ مِنْ ذَلِكَ الْمَرْجِ، أَوِ الرَّوْضَةِ مِنْ شَيْءٍ، إِلَّا كُتِبَ لَهُ، عَدَدَ مَا أَكَلَتْ حَسَنَاتٌ، وَكُتِبَ لَهُ، عَدَدَ أَرْوَاثِهَا وَأَبْوَالِهَا، حَسَنَاتٌ، وَلَا تَقْطَعُ طِوَلَهَا فَاسْتَنَّتْ شَرَفًا، أَوْ شَرَفَيْنِ، إِلَّا كَتَبَ اللهُ لَهُ عَدَدَ آثَارِهَا وَأَرْوَاثِهَا حَسَنَاتٍ، وَلَا مَرَّ بِهَا صَاحِبُهَا عَلَى نَهْرٍ، فَشَرِبَتْ مِنْهُ وَلَا يُرِيدُ أَنْ يَسْقِيَهَا، إِلَّا كَتَبَ اللهُ لَهُ، عَدَدَ مَا شَرِبَتْ، حَسَنَاتٍ ، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَالْحُمُرُ؟ قَالَ: (مَا أُنْزِلَ عَلَيَّ فِي الْحُمُرِ شَيْءٌ، إِلَّا هَذِهِ الْآيَةَ الْفَاذَّةُ الْجَامِعَةُ) : (فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ، وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ) (الزلزلة ) رَوَاهُ مُسلم

## رووداوێك دەربارەی ئەم سورەتە :

کاتی خۆی کۆڤاری (التربیە الاسلامیە) دەردەچوو لە پێش نۆهەدەکان لە یەکی لە ژمارەکانی بابەتێکی خۆشی تێدابوو، کابرایەکی بەریتانی دەڵێ بە دوای ئاینی راستەقینە دەگەرام ، بۆیە چووم تەوراتم خوێندەوە ، بەلآم نەگەیشتمە ئەنجام ، ئەو جارە دەستم کرد بەخوێندەوەی ئینجیل ئەویش سوودی نەبوو، بۆیە ئەوە جارە هەستام قورئانم خوێندەوە ، یەکەم جار کە قورئانم لێك کردوە لەسەر سورەتی (الزلزلە)بوو، جوان ئەم سورەتەم خوێندەوە ، بۆیە یەکسەر بڕیارم دا بچم موسڵمان بوونی خۆم رابگەیەنم و ناوی خۆم لە (برایم) گۆڕی بۆ (ابراهیم)

## بەناخۆشی و نەخۆشی گوناح دەسرێنەوە:

وَأخرج ابْن مرْدَوَيْه عَن أبي أَيُّوب الْأَنْصَارِيّ رَضِي الله عَنهُ قَالَ: بَيْنَمَا رَسُول الله صلى الله عَلَيْهِ وَسلم وَأَبُو بكر الصّديق إِذْ نزلت عَلَيْهِ هَذِه الْآيَة (فَمن يعْمل مِثْقَال ذرة خيرا يره وَمن يعْمل مِثْقَال ذرة شرا يره) فَأمْسك رَسُول الله صلى الله عَلَيْهِ وَسلم يَده عَن الطَّعَام ثمَّ قَالَ: من عمل مِنْكُم خيرا فَجَزَاؤُهُ فِي الْآخِرَة وَمن عمل مِنْكُم شرا يرَاهُ فِي الدُّنْيَا مصيبات وأمراضاً وَمن يكن فِيهِ مِثْقَال ذرة من خير دخل الْجنَّة) الدر المنثور للسيوطي

********************

# وتاری ژماره (١٣٧) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سوڕەتی (قريش)

ئەم سوڕەتە لە ریزبەندا ژمارە (١٠٦)ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (٤) ئایەتە.

-ئەم سوڕەتە لە شاری (مەککە) دابەزیوە ، باسی نیعمەتی خوا دەکات بۆ خەڵکی مەککە کە بە زستان دەچنە یەمەن وبە هاوینان دەچنە شام بۆ بازرگانی بە ئەمن و ئاسایشەوە ، خوا دوو نیعمەتی زۆر گەورەی پێدابوون ١-نیعمەتی ئاسایش ٢-نیعمەتی خۆشگوزرانی وتێری وەك دەفەرموێ:

(لِإِيلَٰفِ قُرَيۡشٍ ١ إِۦلَٰفِهِمۡ رِحۡلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيۡفِ ٢ فَلۡيَعۡبُدُواْ رَبَّ هَٰذَا ٱلۡبَيۡتِ ٣ ٱلَّذِيٓ أَطۡعَمَهُم مِّن جُوعٖ وَءَامَنَهُم مِّنۡ خَوۡفِۭ ٤)

واتە: قورەیش هەقە خاوەنی کابە بپەرستن: بسم الله الرحمن الرحيم* لايلاف قريش لەبەر هۆگریی و یەکگرتنی قورەیش ([1]) (إيلافهم رحلة الشتاء والصيف) هۆگریان بەهاتوو چۆی زستانەو هاوێنەوە (زستان بۆ یەمەن، هاوینیش بۆ شام) ([2]) (فليعبدوا رب هذا البيت) جا لەبەر ئەو بەهرە گەورەیەی خوایە بەسەریانەوە دەبا هەر خاوەنی ئەم خانەیە (كعبه الله) بپەرستن و هەموو هەر بۆ ئەو سەردانوێنن چونکە لەژێر سێبەری ئەمن و ئاسایشی کابەدا ئەوان ئەو هات و چۆیە ئەنجام دەدەن، ([3])ئەو خوایەی بەو هۆیەوە قوتاری کردن لە برسێتی و هێوریشی کردنەوە لەترس، واتە: ترسیان لە هیچ دزو درۆزنێك نەما بێتە رێگەیان و رێیان پێ بگرێ، ئەویش بەهۆی حورمەت و رێزی کابەوە بوو، کە لەباوو باپیرانیانەوە بۆیان مابووەوە رێزنان لە کابە، جا ئایا لەبەرامبەر هەر بەهرەیەکی خواییەوە سوپاسێك پێویست ناکات..؟ ئای ئادەمیی چەند سپڵەیت). ([4])

خوا فەرموویەتی(إِنَّمَآ أُمِرۡتُ أَنۡ أَعۡبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلۡبَلۡدَةِ ٱلَّذِي حَرَّمَهَا وَلَهُۥ كُلُّ شَيۡءٖۖ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ٩١) النمل

واته: فەرمان بەپەرستنی خواو بانگەواز بە قورئان: لەم ئایەتانەشدا فەرمان دەدات کە تەنها پەروەردگاری کەعبە بپەرستیّ: واتە: پێیان بڵێ: بەڕاستی من تەنها فەرمانی ئەوەم پێکراوە کە هەر پەروەردگاری ئەم شارەیە (مەککە) بپەرستم، کە خوا ڕێزی لێناوەو، کوشتنی مرۆڤ و گیاندارانی تیا یاساغ کردووە، وەك دەفەرمویّ: **(فليعبدوا رب هذا البيت الذي أطعمهم)** ، **(وله كل شيء)** هەرچی لە بوونەوەردا هەیە هەر هی خوایە، واتە: هەرچی شتە پەیوەندی بەوەوە هەیەو، هەرئەویش دروستی کردووەو، هەر ئەویش خاوەنیەتی، بێ شەریك بێ و هاوەڵە وأمرت أن أكون من المسلمين فەرمانم پێکراوە کە لەموسڵمانان بم و تەنها بۆ ئەو ملمکەچ بکەم (ڕامان)

## ١- هۆی دابەزینی ئەم سوڕەتە (١-٤)

**﴿لِإِيلَٰفِ قُرَيۡشٍ ١ إِۦلَٰفِهِمۡ رِحۡلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيۡفِ ٢ فَلۡيَعۡبُدُواْ رَبَّ هَٰذَا ٱلۡبَيۡتِ ٣ ٱلَّذِيٓ أَطۡعَمَهُم مِّن جُوعٖ وَءَامَنَهُم مِّنۡ خَوۡفِۭ ٤﴾**

واتە: لەبەر ئەوەی قورەیش هۆگر بووەو. . . (١) خوی گرتووە بە کاروانی زستانەی (یەمەن)و کاروانی هاوینەی (شام) بۆ بازرگانی و (دابین کردنی بژێوی). (٢) کەواتە با پەروەردگارو خاوەنی ئەم ماڵە پیرۆزە (کەعبە) بپەرستن. (٣) ئەو زاتەی لەبرسێتی ڕزگاری کردن و خۆراکی پێبەخشین و لە ترس و بیمی (جەردە و ڕێگران) پاراستوونی و ئاسایشی بۆ دابین کردوون. (٤)(پوختەی تەفسیر)

## فەزل وگەورەی هۆزی قوریش:

(عن أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: فَضَّلَ اللهُ قُرَيْشاً بِسَبْعِ خِصَالٍ لَمْ يُعْطَهَا أَحَدٌ قَبْلَهُمْ وَلاَ يُعْطَاهَا أَحَدٌ بَعْدَهُمْ: فَضَّلَ اللهُ قُرَيْشاً أَنِّي مِنْهُمْ وَأَنَّ النُّبُوَّةَ فِيهِمْ وَأَنَّ الْحِجَابَةَ فِيهِمْ وَأَنَّ السِّقَايَةَ فِيهِمْ وَنَصَرَهُمْ على الفيل وعبدوا اللهَ عَشْرَ سِنِينَ لا يَعْبُدُهُ غَيْرُهُمْ وَأَنْزَلَ اللهُ فِيهِمْ سُورَةً مِنَ الْقُرْآنِ لَمْ يُذْكَرْ فِيهَا أَحَدٌ غَيْرُهُمْ (لإيلافِ قُرَيْشٍ) رواه الطبراني قال الالباني حسن

واتـه: لـه ئـوم هـانی کچـی ئـه‌بی تالیبـه‌وه هـاتووه خـوا لـیّ رازی بـیّ ده‌لّـیّ: پێغه‌مبـه‌ر فه‌رمووی : خوا فه‌زلی داوه به قوریش به حه‌وت خه‌سلّه‌ت ، پێش ئه‌وان نه‌یداوه به‌که‌س ، وه لـه‌دوای ئـه‌وان نایـدریّ به‌کـه‌س ، خـوا ڕێـزی لّینـاون چـونکه مـن لـه‌وانم ، و پێغه‌مبه‌رایه‌تی له‌وانه، وه حیجابـه‌ت له‌وانـه، وه ئـاودانی حاجیـان له‌وانـه، وه سـه‌رکه‌وتن به‌سـه‌ر سوپای فیلـی ئه‌بره‌هـه، وه ده سـالآن خواپه‌رسـتیان کـردوه کـه‌س خواپه‌رسـت نه‌بووه، وه خوا سوره‌تێکی به‌ناوی قوریش دابه‌زاندوه باسی که‌سی نه‌کردوه جگه له‌وان .

## نیعمه‌تی تێری و ئه‌من وئـاسایش دوو نیعمه‌تی زۆر گه‌وره‌ن :

به‌لآم ئه‌م دوو نیعمه‌تـه لـه نـاو ده‌چـن ئه‌گـه‌ر ده‌سـتیان پێـوه نـه‌گرێ وسوپاسـی خـوای له‌سه‌ر نه‌کرێ وه‌ك خوا فه‌رموویه‌تی :

(وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ١١٢) النحل

واتـه: خـوا نموونـه‌ی هێناوه‌تـه‌وه (بـه دانیشـتوانی) شـارێك کـه ژیانیـان بـه هـێمنی و ئاسووده‌یی ده‌برده سـه‌ر، لـه هـه‌موو لایه‌کـه‌وه ڕزق و ڕۆزی جـۆراو جۆریـان بـۆ ده‌هـات (به‌لّام له جیاتی سوپاسگوزاریی) ناشوکرو قه‌درنه‌زانی نازو نیعمه‌ته‌کانی خوا بوون، ئینجا خوای گه‌وره پۆشاکی برسێتی و ترسی کرده کالّای بالّایان و تالّاوی نه‌داریی و ترسـی پـێ چه‌شتن له سه‌ر ئه‌نجامی ئه‌و ئیش و کاره (ناپوخت و ناڕێکانه‌دا) کـه ده‌یـانکرده پیشـه‌ی خۆیان. (ته‌فسیری ئاسان )

# وتاری ژماره (١٣٨) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی ( الماعون )

چەند لایەنەکی گرنگی ئەم سورەتە:

١-ئەم سورەتە لە مەککە دابەزیوە ، لـە ریزبەنـدا ژمـارە (١٠٧)ە وە ژمـارەی ئایەتـەکانی (٧)ئایەتە.

٢-ئەم سورەتە باسی دوو چین دەکات یەکەم : ئەوەی ئـاینی خـوا بـە درۆ دەخاتـەوە ، ونیعمەتی خوای لەبەر چاو نیە ، دووەم : ئەوەی دوو ڕووە کردوە بۆ ڕیـایی دەکـات و بـێ ئاگایە لە نوێژ ، خوا هەڕەشەیان لێ دەکات .

**مانای ئەم سورەتە :**

**﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِي يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ١ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِي يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ٢ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ٣ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ٤ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ٥ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ٦ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ٧﴾**

واتە: ئاخۆ دیت ئەوکەسەی کە بڕوای بە ئاین نی یە؟ . (١) ئەوە کەسێکە کـە پـاڵ بـە هەتیوەوە دەنێ. (٢) وە هانی خەڵك نادات بۆ خواردەمـەنی دان بـە هـەژاران. (٣) ئینجا وای بۆ نوێژ کەران. (٤) ئەوانەی کە لە نوێژەکەیان بێ ئاگان. (٥) ئەوانەی کە ڕووپامایی دەکەن. ٥١١

(٦) وە یارمەتی خەڵك نادەن واتە هەموو چاکەیەك دەگرنەوە لە مـەردووم. (٧)(پوختـەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم سورەتە پیرۆزە چی بوو؟

(عَن ابْن مَسْعُود قَالَ: كَانَ الْمُسلمُونَ يستعيرون من الْمُنَافِقين الدَّلْو وَالْقدر والفأس وَشبهه فيمنعونهم فَأنْزل الله (وَيمْنَعُونَ الماعون) الدر المنثور

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە هاتووە دەڵێ: موسڵمانان کەلوپەلیان وەردەگرت لە مونافیقان بە ئەمانەت وەکو دۆلکەو مەنجەڵ و بیور و هاوشێوەکانی وەك تەورو خاکەناس، ئەوانیش قەدەغەیان دەکردن واتە پێیان نەدەدان ، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند.

## ئایا قەدەغەکردنی (الماعون) چی یە؟

١-(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ،(وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ) (الماعون: ٧) قَالَ: (هُوَ مَا تَعَاوَنَ النَّاسُ بَيْنَهُمُ الْفَأْسُ، وَالْقِدْرُ، وَالدَّلْوُ، وَأَشْبَاهُهُ) مصنف ابن ابي شيبة

٢-(عن ابْنِ عَبَّاسٍ: (وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ) يَعْنِي مَتَاعَ الْبَيْتِ ) ابن كثير

واتە: لە عەبدوڵاوە هاتووە دەڵێ: (وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ) دەڵێ : واتە: هاوکاری یەکدی کردنی خەڵکی لە نێوان خۆیان ، وەك بەیەك دانی (چەکوچ و مەنجەڵ و دۆلکەو هاوێنەکانی ..)

-( عَنْ عَائِشَةَ: الْمَاعُونُ: الْمَاءُ وَالنَّارُ وَالْمِلْحُ) نيل الاوطار

***************************

# وتاری ژماره (١٣٩) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (الکوثر)

ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژمارە (١٠٨)ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (٣) ئایەتە.

١-ئەم سورەتە لە شاری (مەککە) دابەزیوە ، باسی فەزل وگەورەیی پێغەمبەر دەکات ، کە خوا خێری دونیاوقیامەتی پیێ بەخشیوە ، بەتایبەتی (روبارەی کەوسەر)، وەفەرمان دەکات بە پێغەمبەر نوێژ بەرپابکاو قوربانی بکا وەك سوپاس بۆ خوا.

٢-لەکۆتایدا موژدە دەدا بە پێغەمبەر ، کە ناوت بەرز دەبێتەوە لە دونیاو قیامەت ، وە دوژمنانت ناویان دەبڕێتەوە وریسوا دەبن ، لە هەموو خێرێك بێ بەش دەبن.

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم سورەتە پیرۆزە چی بوو؟

(عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: بَيْنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ يَوْمٍ بَيْنَ أَظْهُرِنَا إِذْ أَغْفَى إِغْفَاءَةً ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ مُتَبَسِّمًا، فَقُلْنَا: مَا أَضْحَكَكَ يَا رَسُولَ اللهِ قَالَ: (أُنْزِلَتْ عَلَيَّ آنِفًا سُورَةٌ) فَقَرَأَ: بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ. فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ. إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ) (الكوثر: ٢) ثُمَّ قَالَ: (أَتَدْرُونَ مَا الْكَوْثَرُ؟) فَقُلْنَا اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: فَإِنَّهُ نَهْرٌ وَعَدَنِيهِ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ، عَلَيْهِ خَيْرٌ كَثِيرٌ، هُوَ حَوْضٌ تَرِدُ عَلَيْهِ أُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ، آنِيَتُهُ عَدَدُ النُّجُومِ، فَيُخْتَلَجُ الْعَبْدُ مِنْهُمْ، فَأَقُولُ: رَبِّ، إِنَّهُ مِنْ أُمَّتِي فَيَقُولُ: مَا تَدْرِي مَا أَحْدَثَتْ بَعْدَكَ)رواه مسلم

واتە: لە ئەنەسەوە هاتووە دەڵێ: لەلای پێغەمبەر بووین ڕۆژێك ، تۆزێك بۆرژا ، دوای سەری خۆی بەرزکردەوە و پێکەنی ، گوتمان : ئەی نێرراوی خوا چی تۆی پێکەناند، فەرمووی : ئێستا سورەتێکم بۆ دابەزی ، جا ئەمەی خوێندەوە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ. فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ. إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ) فەرمووی : ئایا دەزانن

کەوسەر چییە؟ ئێمەش گوتمان خوا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرمووی: رووبارێکە خوا بەڵێنی پێداوام ، زۆر خێری لەسەرە، ئەو حەوزێکە ئوممەتم رۆژی قیامەت دێتە سەری ، ژمارەی پەرداخەکانی بە قەدەر ژمارەی ئەستێرەکانە ، هەندێك لەبەندەکان دوور دەخرێنەوە لەوان، منیش دەڵێم : خودایە ئەوە لە ئوممەتی منە ، ئەویش دەفەرمووێ: تۆ نازانی لە پاش تۆ چی کردوە (واتە: وازی لە رێبازی تۆ هێناوە )

(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الكَوْثَرُ نَهْرٌ فِي الجَنَّةِ، حَافَّتَاهُ مِنْ ذَهَبٍ، وَمَجْرَاهُ عَلَى الدُّرِّ وَاليَاقُوتِ، تُرْبَتُهُ أَطْيَبُ مِنَ المِسْكِ، وَمَاؤُهُ أَحْلَى مِنَ العَسَلِ، وَأَبْيَضُ مِنَ الثَّلْجِ) رواه الترمذي قال الالباني صحيح

واتە: لە عەبدولاَی کوڕی عومەر هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی : کەوسەر رووبارێکە لە بەهەشت ، لێوارەکانی لە زێرن ، رێڕەوەکەی لە دووڕ و یاقوتە ، خۆڵەکەی بۆنی خۆشترە لە بۆنی میسك ، وە ئاوەکەی شیرینترە لە هەنگوین ، وە سپی ترە لە بەفر.

-( عَنْ حُذَيْفَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ( إِنَّ حَوْضِي لَأَبْعَدُ مِنْ أَيْلَةَ إِلَى عَدَنَ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَآنِيَتُهُ أَكْثَرُ مِنْ عَدَدِ النُّجُومِ، وَلَهُوَ أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ، وَأَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنِّي لَأَذُودُ عَنْهُ الرِّجَالَ، كَمَا يَذُودُ الرَّجُلُ الْإِبِلَ الْغَرِيبَةَ عَنْ حَوْضِهِ) ، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتَعْرِفُنَا؟ قَالَ: (نَعَمْ، تَرِدُونَ عَلَيَّ غُرًّا مُحَجَّلِينَ، مِنْ أَثَرِ الْوُضُوءِ لَيْسَتْ لِأَحَدٍ غَيْرِكُمْ) رواه ابن ماجة قال الالباني صحيح

کەوسەر جگە لە حەوزورووبارە مانای دیکەشی هەیە:

(عَنْ عِكْرِمَةَ رضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: الْكَوْثَرُ مَا أَعْطَاهُ اللَّهُ مِنَ النُّبُوَّةِ وَالْخَيْرِ وَالْقُرْآنِ) ابن ابي حاتم

واتە : لە عیکریمەوە هاتووە خوا لێی رازی بێ دەڵێ ( کەوسەر واتە: ئەوەی خوا بە پێغەمبەری بەخشیوە لە (پەیام و پاداشتی زۆر و قورئان)

## دەرسەکانی ئەم سوڕەتە :

١-ڕێزو حورەتی پێغەمبەر لە لای خوا

٢-گرنگی نوێژ لە ئیسلامدا

٣-گرنگی قوربانی کردن

٤-ئەوەی دوژمنایەتی پێغەمبەر بکات ، ئەو کەسە وەجاغ کوێرە.

*************************

# وتاری ژماره (١٤٠) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی ( النصر )

چەند لایەنەکی گرنگی ئەم سورەتە:

١-ئەم سورەتە لە (مەدینە) دابەزیوە ، لە ریزبەندا ژمارە (١١٠)ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (٣)ئایەتە

٢-باسی رزگارکردنی شاری (مەککە) ، و بلاوبونەوەی ئایینی خوا دەکات ، وباسی بەرزبونەوەی ئالای ئیسلام و تێکشکاندی بتەکات دەکات ، ئەوەش بەلگەیە لەسەر راستی ئەم پێغەمبەرە

### ١-هۆی دابەزینی (سورەتی النصر)

﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ٢ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ٣﴾ النصر

واتە: لە لووتکەی دەسەلاتدا تاریف و شوکری خوا بکە: ئادەمزاد هەرکە کەمێ بەرەو سەرکەوتن چوو، بە پێی سروشت قابیلە چەواشە ببێ و، خۆی لێبگۆرێ، جابۆ ئەوە شتیوا روونەدا، خوای گەورە دەفەرموێ: هەرکە کۆمەکی خواهات و، دەرگای سەرکەوتن و زالبوون کرایەوە، واتە: مەککەت لەبت و بتپەرستیی ئازاد کردو زالبوویت بەسەر دوژمنانی دین و گەل و ولاتدا (١)ودیتت خەلکی پۆل پۆل دێنە ناو دین و ئایینی خواوە، بەتایبەتی عەرەبەکان، پاش ئەو خۆگرتن و ململانێیە (٢)ئەوسا تۆیش زۆر بەدلنیاییەوە پەروەردگاری خۆت بەپاک و بێخەوش راگرە، واتە: لەسەر ئەو نازو نیعمەت و بەهرە

گەورەیە پێی بەخشیویت هەمیشە سوپاسی بکە و لەبەرامبەر هەندێ حاڵەت و بارودۆخ، کە بەسەر خۆت و هاوەڵانتدا دێت، داوای لێبوردنی لێبکە، وەیان نەوەك بەهۆی ئازاد کردنی شاری مەککەوە خۆبایی بوون سەر هەڵبدا، واتە: ئەگەرچی تۆ هەرگیز لەخۆبایی نابیت، چونکە تۆ پەروەردە کراوی دەستی خوایت، بەڵام با هاوەڵانیشت دەرس لەتۆوە وەرگرن إنه كان توابا بەڕاستی ئەو خوایە زۆر تەوبە وەرگرو چاوپۆشیکارە، بەڵێ مرۆڤ دەبێ رووی پەشیمانی هەر بۆدەرگای خوا بەرێ، بۆیە پەیامبەران پاش هیجرەت و جیهادێکی زۆرو بێ وچان، زیاتر سەری بەندایەتییان دانواندووە و داوای لێبوردنیان لەخوا کردووە . ئەوەتە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەسووژدەو رکووعی نوێژەکانیدا بەردەوام دەیگوت: (**سبحانك اللهم ربَنا وَبِحَمْدِكَ، اللهم اغفرلي**) سا خوای بەخشندە بە بەزەیی و میهرەبانی خۆی لەئێمەش خۆش ببێ و، کارە چاکەکانمان لێوەرگرێ و، قەڵەمی بەخشینیش بەسەر تاوانەکانماندا بێنێ. [٣] (ڕامان)

## چەند دەقێك دەربارەی سورەتی ( النصر ):

١-( عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ كَانَ عُمَرُ يُدْخِلُنِي مَعَ أَشْيَاخِ بَدْرٍ فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِمَ تُدْخِلُ هَذَا الْفَتَى مَعَنَا وَلَنَا أَبْنَاءٌ مِثْلُهُ فَقَالَ إِنَّهُ مِمَّنْ قَدْ عَلِمْتُمْ قَالَ فَدَعَاهُمْ ذَاتَ يَوْمٍ وَدَعَانِي مَعَهُمْ قَالَ وَمَا رُئِيتُهُ دَعَانِي يَوْمَئِذٍ إِلَّا لِيُرِيَهُمْ مِنِّي فَقَالَ مَا تَقُولُونَ فِي إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا حَتَّى خَتَمَ السُّورَةَ فَقَالَ بَعْضُهُمْ أُمِرْنَا أَنْ نَحْمَدَ اللَّهَ وَنَسْتَغْفِرَهُ إِذَا نُصِرْنَا وَفُتِحَ عَلَيْنَا وَقَالَ بَعْضُهُمْ لَا نَدْرِي أَوْ لَمْ يَقُلْ بَعْضُهُمْ شَيْئًا فَقَالَ لِي يَا ابْنَ عَبَّاسٍ أَكَذَاكَ تَقُولُ قُلْتُ لَا قَالَ فَمَا تَقُولُ قُلْتُ هُوَ أَجَلُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَعْلَمَهُ اللَّهُ لَهُ إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ فَتْحُ مَكَّةَ فَذَاكَ عَلَامَةُ أَجَلِكَ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا قَالَ عُمَرُ مَا أَعْلَمُ مِنْهَا إِلَّا مَا تَعْلَمُ ) رواه البخاري

واتە: لەئیبنو عەباسەوە هاتووە خوا لە خۆی وبابی رازی بێ دەڵێ: عومەر منی لەگەڵ بەتەمەنەکانی ئەهلی بەدر دانا ، گوتیان بۆچی ئەم گەنجە لەگەڵ ئێمە دانراوە؟ ئێمە کوڕمان لە عومری ئەوە ، عومەر گوتی : پێتان دەڵێم بۆچی لەگەڵ ئێوەم ناداوە، ڕۆژێك بانگی ئەوانی کردو بانگی منی کرد، بۆ ئەوەی من پیشانی ئەوان بدات ، گوتیە ئەوان ئایا ئێوە چی دەڵێن دەربارەی سورەتی (النصر) هەندێك گوتیان : فەرمانمان پێ کراوە سوپاسی خوا بکەین و داوای لێبوردنی لێ بکەین لە کاتی سەرکەوتنەکان ، هەندێك گوتیان : نازانین ، یان هیچیان نەگوت، عومەر گوتی: ئەی ئیبنو عەباس تۆش وەکو ئەوان دەڵێ ، گوتم نەخێر ، گوتی: ئەی تۆ چی دەڵێ: گوتم (اذا جاء نصرالله) ئەوە نزیك بونەوەی ئەجەلی پێغەمبەرە، خوای پێی راگەیاند، وە(الفتح) یش رزگاربونی مەککە یە. عومەر : گوتی منیش هەر وا لێی حاڵیم وەکو تۆ لێی حاڵی.

٢-( عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ دَعَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاطِمَةَ فَقَالَ قَدْ نُعِيَتْ إِلَيَّ نَفْسِي فَبَكَتْ فَقَالَ لَا تَبْكِي فَإِنَّكِ أَوَّلُ أَهْلِي لِحَاقًا بِي فَضَحِكَتْ فَرَآهَا بَعْضُ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْنَ يَا فَاطِمَةُ رَأَيْنَاكِ بَكَيْتِ ثُمَّ ضَحِكْتِ قَالَتْ إِنَّهُ أَخْبَرَنِي أَنَّهُ قَدْ نُعِيَتْ إِلَيْهِ نَفْسُهُ فَبَكَيْتُ فَقَالَ لِي لَا تَبْكِي فَإِنَّكِ أَوَّلُ أَهْلِي لَاحِقٌ بِي فَضَحِكْتُ وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ وَجَاءَ أَهْلُ الْيَمَنِ هُمْ أَرَقُّ أَفْئِدَةً وَالْإِيمَانُ يَمَانٍ وَالْحِكْمَةُ يَمَانِيَةٌ) رَوَاهُ الدَّارِمِيّ قال الالباني حسن في المشكاة

(النَّعيُ: اذاعة حبر الميت، بلغنا نعيٌ،النَّعيُ: الرجل الميت)(رجل نَعيتٌ: اي كريم جَيِّدٌ سبَّاق وهي نعيته )

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەڵێ: کاتێ سورەتی (النصر) دابەزی پێغەمبەر بانگی فایتمەی کرد ، فەرمووی : هەواڵی مردنی خۆم پێدراوە، فاتیمەش گریا، فەرمووی : مەگری تۆ لە کەس وکارم یەکەمین کەسی دەگەیتەوە من ، ئەوجا فاتیمە پێکەنی ، هەندێك لە خێزانەکانی پێغەمبەر گوتیان : ئەی فاتیمە تۆمان بینی گریای و دوایش

پێکەنی، ئەویش گوتی : کە گریام پێی فەرمووم مردنم نزیك بۆتەوە ، بەلأم کە پێکەنیم پێی فەرمووم تۆ لەناو کەس وکارم یەکەمین کەسی پێم دەگەی ، وە پێغەمبەر فەرمووی : (إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ) ئەگەر سەرکەوتنی خوا هات لەگەڵ رزگاربوون ، وەئەگەر ئەهلی یەمەن هاتن ئەوان دڵنەرمترین کەسن، وە ئیمان و حیکمەت لە یەمەنە.

٣-( عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ:كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُكْثِرُ . قَبْلَ موتِهِ. أَنْ يَقُولَ: (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ) قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنَّكَ لَتُكْثِرُ مِنْ دعاءٍ لَمْ تَكُنْ تَدْعُو بِهِ قَبْلَ ذَلِكَ؟ قَالَ: (إِنَّ رَبِّي . جَلَّ وَعَلَا . أَخْبَرَنِي أَنَّهُ سَيُرِينِي عَلَماً فِي أُمتي فَأَمَرَنِي . إِذَا رَأَيْتُ ذَلِكَ العَلَمَ . أَنْ أُسَبِّحَهُ وأَحْمَدَهُ وأَسْتَغْفِرَهُ وَإِنِّي قَدْ رأيتُهُ: (إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ) (النصر: ١) فتح مكة)رواه ابن حبان قال الالباني صحيح

واتە: لە عائیشەی دایکی ئیمانداران هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر پێش مردنی زۆر ئەم زیکری دەکرد (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ) منیش گوتم : ئەی پێغەمبەری خوا تۆ زۆر ئەو دوعایە دەکەی پێشتر نەدەکرد، فەرمووی : پەروەردگارم هەواڵێکی پێداوام ، لەداهاتوێکی نزیك خوا نیشانەیەکم نیشان دەدات دەربارەی ئوممەتەکەم، جا فەرمانی پێ کردوم ، ئەگەر ئەم نیشانەم بینی ، تەسبحات و حەمەدی بکەم و داوای ئیستغفاری لێ بکەم، وەمن بیگومان ئەم نیشانەم بینی کە برتییە لە (إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ)

## ئایا ئەم سورەتە لە کوێ دابەزی؟

٤-( عَن ابْنِ عُمَر قَالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ السُّورَةُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيه وَسَلَّم بِمِنًى، وهُو فِي أَوْسَطِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ (إذَا جاء نصر الله الفتح) فَعَرَفَ أَنَّهُ الْوَدَاعُ......) البزار

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە دەڵێ: ئەم سورەتە دابەزی بۆ سەر پێغەمبەر لە (مینا) لە ناوەراستی ڕۆژانی تەشریق لە حەجیماڵئاوایی (إذَا جاء نصر الله الفتح) جا پێغەمبەر زانی هاتن و دابەزینی ئەم سورەتە وەفاتی خۆیەتی .

ئاگاداری : ئیبنو عومەر دەڵێ ئەم سورەتە (**إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللهِ وَالْفَتْحُ**) لە مینا دابەزی لە حەجیماڵئاوایی ، دوای ئەویش ئەم ئایەتە دابەزی (الیوم اکملت....) لەپاش دابەزینی ئەم دووانە پێغەمبەر (٨٠) رۆژان ژیا) اسباب النزول (محمود المصری ) لە قورتوبی وەرگرتوە

وەك لەم دەقدا هاتووە

( (وقال ابن عمر: نزلت هذه السورة بمنى في حجة الوداع، ثم نزلت اليوم أكملت لكم دينكم وأتممت عليكم نعمتي ( آية ٣ سورة المائدة.) (المائدة: ٣) فعاش بعدهما النبي صلى الله عليه وسلم ثمانين يوما. ثم نزلت آية الكلالة ( آخر سورة النساء)، فعاش بعدها خمسين يوما. ثم نزل لقد جاءكم رسول من أنفسكم (التوبة: ١٢٨) فعاش بعدها خمسة وثلاثين يوما. ثم نزل واتقوا يوما ترجعون فيه ( آية ٢٨١ سورة البقرة.) إلى الله فعاش بعدها أحدا وعشرين يوما. وقال مقاتل سبعة أيام. وقيل غير هذا) تفسير القرطبي

بەکورتی : ئەوەی لەم دەقدا هاتووە بەم شێوەیە:

١–سورەتی (النصر) لە مینا دابەزی لە حەجی ماڵئاوایی ، لەپاش ئەو سورەتە ئایەتی (**اليوم أكملت لكم دينكم وأتممت عليكم نعمتي** (٣ المائده) دابەزی لە عەرەفە لەپاش ئەم دووانە پێغەمبەر (٨٠) رۆژان پێغەمبەر ژیا.

٢–دوای ئایەتەی (**لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ١٢٨** التوبه) پاش ئەوە ئایەتە (٥٣) رۆژان ژیا

٣–پاشان ئایەتی (الکلاله) لە کۆتایی سورەتی (النساء)دابەزی پاش ئەم ئایەتە (٥٠) رۆژان ژیا. ئەمەش دەقەکەیەتی (**يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ ۚ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ۚ وَهُوَ يَرِثُهَا إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوا إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَاءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ ۗ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا ۗ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ** ١٧٦)

٤-پاشان ئایەتی ﴿وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ٢٨١﴾ البقره (٢٨١) پاش ئەم ئایەتە پێغەمبەر (٢١) ڕۆژ ژیا، موقاتیل دەڵێ (٧) ڕۆژان ژیا.

## پاش دابەزینی سوڕەتی (النصر) پێغەمبەر چی کرد:

( عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَتْ (إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ) (النصر: ١) إِلَى آخِرِهَا مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى صَلَاةً إِلَّا قَالَ: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي) ابن خزيمة وبن حبان قال الالباني صحيح

واتە: لە عائیشەی دایکی ئیمانداران هاتووە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: کە (إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ) دابەزی پێغەمبەر هەر نوێژێکی کردبایە ئەم دوعایەیی دەکرد (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي) واتە: پاکی وبێ گەردی بۆ تۆ خودایە، سوپاست دەکەم ، خودایە لێم خۆشبە.

وفي رواية -( عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُنْذُ نَزَلَ عَلَيْهِ (إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللهِ وَالْفَتْحُ) (النصر: ١) يُصَلِّي صَلَاةً إِلَّا دَعَا. أَوْ قَالَ فِيهَا: ( سُبْحَانَكَ رَبِّي وَبِحَمْدِكَ، اللهُمَّ اغْفِرْ لِي ) رواه مسلم

## دەڵێن دوایین سوڕەت و ئایەت کە دابەزیوە:

(عَنِ الْبَرَاءِ، أَنَّ آخِرَ سُورَةٍ أُنْزِلَتْ تَامَّةً: سُورَةُ التَّوْبَةِ، وَأَنَّ آخِرَ آيَةٍ أُنْزِلَتْ: آيَةُ الْكَلَالَةِ) رواه مسلم

لەوانەیە ئاخیر ئایەتە بێ لە ئەحکام

ئەو فەرموودەی دەڵێ دوایین سوڕەت کە دابەزیوە (النصر) ئەلبانی دەڵێ زەعیفە

(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: (آخِرُ سُورَةٍ أُنْزِلَتِ الْمَائِدَةُ وَالْفَتْحُ). هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ. وَرُوِي عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّهُ قَالَ: (آخِرُ سُورَةٍ أُنْزِلَتْ إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ) رواه الترمذي قال الالباني ضعيف الاسناد

**ئايا ئەم ئايەتە** (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ) (٣)(المائده) **كەی دابەزی؟**

نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَكَانَ يَوْمَ عَرَفَةَ بَعْدَ الْعَصْرِ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ سَنَةَ عَشْرٍ، وَالنَّبِيُّ - صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - وَاقِفٌ بِعَرَفَاتٍ عَلَى نَاقَتِهِ الْعَضْبَاءِ.

عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ - رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ - فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ إِنَّكُمْ تَقْرَءُونَ آيَةً فِي كِتَابِكُمْ لَوْ عَلَيْنَا مَعْشَرَ الْيَهُودِ نَزَلَتْ لَاتَّخَذْنَا ذَلِكَ الْيَوْمَ عِيدًا، فَقَالَ: أَيُّ آيَةٍ هِيَ؟ قَالَ: (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي) فَقَالَ عُمَرُ: وَاللَّهِ إِنِّي لَأَعْلَمُ الْيَوْمَ الَّذِي نَزَلَتْ فِيهِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ، وَالسَّاعَةَ الَّتِي نَزَلَتْ فِيهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ عَشِيَّةَ يَوْمِ عَرَفَةَ فِي يَوْمِ جُمُعَةٍ) متفق عليه

وفي رواية-( وَقَالَ السدي: نزلت هذه الآية(الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي) يوم عرفة، ولم ينزل بعدها حلال ولا حرام. وقال ابن جرير: مَاتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ يوم عرفة بأحد وثمانين يوماً)

*************************************************

# وتاری ژماره (١٤١) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

## سورەتی (المسد)

ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژمارە (١١١)ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (٥) ئایەتە.

–ئەم سورەتە لە شاری (مەککە) دابەزیوە ، وە پێ دەگوترێ سورەتی (اللهب) وەپێشی دەگوترێ سورەتی (تبت یدا) ، باسی تیاچوونی دوژمنی خوا و پێغەمبەر دەکات ، وە ئاگری بۆ ئامادەکراوە و دەخرێتە ناوی ، لەگەڵ خێزانی چونکە ئەویش هاوبەشی بوو لە رێگری لەئیسلام ودوژمنایەتی کردنی پێغەمبەر .

### ١- هۆی دابەزینی سورەتی (المسد)

**دەقەی سورەتەکە:**

﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ١ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ٢ سَيَصۡلَىٰ نَارٗا ذَاتَ لَهَبٖ ٣ وَٱمۡرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ ٤ فِي جِيدِهَا حَبۡلٞ مِّن مَّسَدِۭ ٥﴾

واتە : لەناوچێ هەردوو دەستی ئەبولەهەب وە لە ناویش چوو. (١) سوودی پێ نەگەیاند دارایی یەکەیی و ئەوەی کە کردی لە دوژمنایەتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دا. (٢) بێگومان لەمەولا دەچێتە ناو ئاگری بلێسە دار. (٣) لەگەڵ ژنەکەیدا، کە هەڵگری دارو چاووگە (بۆ نانەوەی ئاژاوە)ە. (٤) هەمیشە گوریسێکی بادراو(لەپەلی خورمایی ئاگرین) وا لە گەردنیدا. (٥) (پوختەی تەفسیر)

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چی بوو؟

١-(عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ (الشعراء:٢١٤) صَعِدَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الصَّفَا فَجَعَلَ يُنَادِي يَا بَنِي فِهْرٍ يَا بَنِي عَدِيٍّ لِبُطُونِ قُرَيْشٍ حَتَّى اجْتَمَعُوا فَجَعَلَ الرَّجُلُ إِذَا لَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يَخْرُجَ أَرْسَلَ رَسُولًا لِيَنْظُرَ مَا هُوَ فَجَاءَ أَبُو لَهَبٍ وَقُرَيْشٌ فَقَالَ أَرَأَيْتَكُمْ لَوْ أَخْبَرْتُكُمْ أَنَّ خَيْلًا بِالْوَادِي تُرِيدُ أَنْ تُغِيرَ عَلَيْكُمْ أَكُنْتُمْ مُصَدِّقِيَّ قَالُوا نَعَمْ مَا جَرَّبْنَا عَلَيْكَ إِلَّا صِدْقًا قَالَ فَإِنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ فَقَالَ أَبُو لَهَبٍ تَبًّا لَكَ سَائِرَ الْيَوْمِ أَلِهَذَا جَمَعْتَنَا فَنَزَلَتْ تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ مَا أَغْنَى عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ ) رواه البخاري

واتە:لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە خوا لە خۆی وبابی رازی بێ دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی (وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ) پێغەمبەر چووە سەر کێوی صەفا ، بانگی کرد ئەی بەنی فەهر ، ئەی بەنی عەدی ، خەڵکی کۆبونەوە بۆی ئەگەر پیاوێك پێی نەکرابایە بچێتە ئەوێ ، نوێنەرێکی دەنارد بزانێ چی قەوماوە و چی دەڵێن ، ئەبو لەهەب و قوریش هاتن ، پێی فەرموون: ئایا ئەگەر هەواڵتان پێ بدەم سوپایەك لەو دۆڵەوە دێتە سەرەتان پێم باوەڕ دەکەن، گوتیان : بەڵێ باوەڕ دەکەین ، جگە لە راستی هیچی دیکەمان لە تۆ نەدیوە، فەرمووی : دەبزانن من بۆ ئێوە ئاگادارکرەوەم ، ئەوەی باوەڕم پێی نەکات توشی ئازارێکی توند دەبێ، ئەبو لەهەب گوتی: ئەمڕۆ لەناو بچی ، بۆ ئەمە ئێمەت کۆکردۆتەوە ، جا خوا لێی تورە بوو ئەم سورەتەی دابەزاند وفەرمووی (تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ مَا أَغْنَى عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ)

## دەرسەکانی ئەم سوڕەتە :

١–حەق ڕەت نەکەینەوە چونکە مایەیی تیا چوونە وەك (ابو لهب) وە مرۆڤی خۆبەزلزانە ناچێتە بەهەشت وەك پێغەمبەر فەرموویەتی :

(لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ) قَالَ رَجُلٌ: إِنَّ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ ثَوْبُهُ حَسَنًا وَنَعْلُهُ حَسَنَةً، قَالَ: (إِنَّ اللهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ، الْكِبْرُ بَطَرُ الْحَقِّ، وَغَمْطُ النَّاسِ) رواه مسلم

غريب الحديث : (الكِبْرُ بَطِرُ الحَقّ) : هو أَن يجعل ما جعله الله حقًّا من توحيده وعبادته باطلا ، وقيل : هو أَن يتحير عند الحق فلا يراه حقًّا ، وقيل : هو أَن يتكبر من الحق ولا يقبله ((غمط الناس) : احْتِقارُهم والإِزْراءُ بهم )

واتە: ناچێتە بەهەشت ئەوەی یەك تۆزقاڵ خۆبەزلزانینی لە دڵدابێ، پیاوێك گوتی :ئەی نێراوی خوا پیاو ئەگەر حەز بکات پێڵاو جل وبەرگی جوان بێ ئایا ئەوەش خۆبەزلزانینە ؟ پێغەمبەر فەرمووی : خوا جوانە شتی جوانی پێی خۆشە، بەڵکو خۆبەلزانین ئەوەیە حەق ڕەتبکەیتەوە و بەچاوی کەم سەیری خەڵکی بکەی.

٢–واجبە ئایینی خوا ڕابگەینین وەك پێغەمبەر چووە سەر صەفا ، وەك پێغەمبەر فەرموویەتی (بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً) رَوَاهُ البُخَارِيّ

واتە: ئەگەر یەك ئایەتیش بزانن دەبێ بەم ئایەتە خەڵکی پێ ئامۆژگاری بکەین.

زانایان دەڵێن : ئەم فەرموودە (٣) شتی تێدایە ١–تەشریفە واتە: ڕێزە بۆ ئەو کەسەی ئاییتی ڕادەگەیەنێ ٢–تەکلیفە : واتە : داوات لێ کراوە ئایین ڕابگەیەنی ٣–تەخفیفە: واتە: چەندی دەزانی تۆش ئەوندە ڕابگەیەنە، ئەوش بارسووکی یە.

*************************

## وتاری ژماره (١٤٢) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

### سورەتی (الاخلاص)

چەند لایەنەکی گرنگی ئەم سورەتە:

١-ئەم سورەتە لە (مەدینە) دابەزیوە ، لە ریزبەندا ژمارە (١١٢)ە وە ژمارەی ئایەتـەکانی (٤)ئایەتە.

٢-ئەو سورەتە باسی سیفاتی تاك و تەنیایی خوا دەكات ، كە خـوا یەكـە و بـێ هاوەڵـە، وە وەڵامێكە بۆ گاورەكان كە دەڵێن خوا سێ بەشە، وە وەڵامیشە بۆ هاوبەشـدانەران کـە دەڵێن خوا نەوەو منداڵی هەیە، پاكی بۆ خوا سبحانه وتعالى.

دەقەی ئەم سورەتە:

(قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ٢ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ٣ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ٤)

واتە: بڵێ: ئەوە خوای تاك و تەنیا. (١) ئەو خوایـەی بـێ نیـاز و جـێ ی نیـاز و ئومێـدە. (٢) كەسی لێ نەبووەو لەكەس نەبووە. (٣) وە هەرگیز هیچ كەس هاوشێوە و هاوتای نی یە. (٤) (پوختەی تەفسیر)

### ١-هۆی دابەزینی سورەتی (الاخلاص)

١-(عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ الْمُشْرِكِينَ، قَالُوا: يَا مُحَمَّدُ، انْسُبْ لَنَا رَبَّكَ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ اللَّهُ الصَّمَدُ) (الإخلاص: ٢) قال: الصمد: الذي لم يلد، (وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ) (الإخلاص: ٣) لِأَنَّهُ لَيْسَ شَيْءٌ يُولَدُ إِلَّا سَيَمُوتُ، وَلَيْسَ شَيْءٌ يَمُوتُ إِلَّا سَيُورَثُ، وَإِنَّ اللَّهَ لَا يَمُوتُ وَلَا يُورَثُ (وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ) (الإخلاص:

٤) قَالَ: لَمْ يَكُنْ لَهُ شَبِيهٌ، وَلَا عَدْلٌ وَلَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ) رواه الحاكم وقال هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ ووافقه الذهبي ، وقال الالبانى حسن دون قوله (الصمد الذي)

واته: ئوبەی کوڕی کەعبەوە هاتووە خوا لێی رازی بێ دەڵێ: هاوبەشدانەرەکان گوتیان: ئەی (محمد) باسی رەچەڵەکی خوای خۆتمان بۆ بکە؟ خواش ئەم سورەتەی دابەزاند وفەرمووی (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ اللَّهُ الصَّمَدُ) دەڵێ (الصمد) واتە : کەس لێ نەبووە، (وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ) چونکە هەرشتێك ببێ دەمرێ، وەهەر شتێکیش بمرێ میراتی لێ دەگیرێ، وە خواش نامرێ ومیراتی لێ ناگیرێ ، (وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ) دەڵێ : هاووێنە و هاوتای نیە، وەهیچ شتێك وەکو ئەو نیە.

## فەزل وگەورەیی سورەتی (الاخلاص) :

١-(عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: (أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَقْرَأَ فِي لَيْلَةٍ ثُلُثَ الْقُرْآنِ؟) قَالُوا: وَكَيْفَ يَقْرَأْ ثُلُثَ الْقُرْآنِ؟ قَالَ: (قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ) رواه مسلم

(تَعْدِلُ) اي يساوي

واتە: لە ئەبی دەرداوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی : ئایا هەر یەك لە ئێوە ناتوانێ شەوێ سێیەکی قورئان بخوێنێ؟ هاوەڵان گوتیان : چۆن دەتوانین سێیەکی قورئان بخوێنین، پێغەمبەر فەرمووی: (قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ) بخوێنن پاداشتی سێیەکی قورئانتان دەگاتێ، خێری بەرامبەر سێیەکی قورئانە.

٢-( عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ رَجُلًا عَلَى سَرِيَّةٍ وَكَانَ يَقْرَأُ لِأَصْحَابِهِ فِي صَلَاتِهِمْ فَيَخْتِمُ بِقُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ فَلَمَّا رَجَعُوا ذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ فَقَالَ سَلُوهُ لِأَيِّ شَيْءٍ يَصْنَعُ ذَلِكَ فَسَأَلُوهُ فَقَالَ لِأَنَّهَا صِفَةُ الرَّحْمَنِ وَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَقْرَأَ بِهَا فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخْبِرُوهُ أَنَّ اللَّهَ يُحِبُّهُ ) متفق عليه

واتــه: لــه عائيشــهى دايكــى ئيمانــداران هــاتووه دهڵــێ: پێغهمبــهر مهفرهزهيــهكى نــارد و پياوێكى كرده فهرماندهيان ، كه پێش نوێژى بۆ دهكردن كۆتايى دههێنا به خوێندنى (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) كاتێ گهڕانهوه ئهوهيان بۆ پێغهمبهر باس كرد، فهرمووى : پێى بڵێن بۆچــى وات كــردوه؟ ئــهوانيش پرســياريان لــێ كــرد بۆچــى لــه نوێــژهكان لــه كۆتايــدا ســوڕهتى (الاخلاص) ت دهخوێند، گوتى : چونكه باسى سيفاتى خواى بهبــهزهيى دهكــات و منــيش پێم خۆشه بيخوێنم، پێغهمبهر فهرمووى : ده ههواڵى بدهنێ خواش ئهوى خۆش دهوێ.

٣-( عن أَنَسٍ قَالَ قَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أُحِبُّ هَذِهِ السُّورَةَ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حُبُّكَ إِيَّاهَا أَدْخَلَكَ الْجَنَّةَ ) رواه الترمذي وقال الالباني حسن

واته: له ئهنهسهوه هاتووه دهڵێ: پياوێك گــوتى : ئــهى نێــرراوى خــوا مــن ئــهو ســوڕهتهم خۆش دهوێ، (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) پێغهمبــهر فــهرمووى : خۆشهويســتيت بــۆ ئــهم ســوڕهته دهتخاته بهههشتهوه.

٤-( مَنْ قَرَأَ: قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ فَقَدْ قَرَأَ ثُلُثَ الْقُرْآنِ) رواه الترمذي قال الالباني صحيح

واته: ئهوهى (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) بخوێنێ ، ئهوه بێگومان سێيهكى قورئانى خوێندوه.

٥-( قال رسول الله – صلى الله عليه وسلم – (من قرأ (قل هو الله أحد) عشر مرات بنى الله له بيتاً في الجنة) رواه أحمد قال الالباني صحيح

واتــه: پێغهمبــهر فهرموويــهتى : ههركهســێ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) ده جــاران بخــوێنێ ، خــوا خانوێكى له بهههشت بۆ دروست دهكات.

٦-( عَن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ أَقْبَلْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَمِعَ رَجُلًا يَقْرَأُ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ اللَّهُ الصَّمَدُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَجَبَتْ قُلْتُ وَمَا وَجَبَتْ قَالَ الْجَنَّةُ) رواه الترمذي قال الالباني صحيح

واته: له ئەبوهورێرەوە هاتووە دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر دەڕۆیشتین گوێی لە پیاوێك بوو (قل هو الله) دەخوێند ، فەرمووی بۆی پێوست بوو، گوتم چی بۆ پێویست بوو؟ فەرمووی بەهەشت.

٧-( عَن مِحْجَن بْنَ الأَدْرَعِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، حَدَّثَهُ قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَسْجِدَ فَإِذَا هُوَ بِرَجُلٍ قَدْ قَضَى صَلاَتَهُ، وَهُوَ يَتَشَهَّدُ، وَهُوَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ يَا اللهُ الأَحَدُ الصَّمَدُ، الَّذِي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ، أَنْ تَغْفِرَ لِي ذُنُوبِي، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ، قَالَ: فَقَالَ النَّبِيّ: (قَدْ غُفِرَ لَهُ قَدْ غُفِرَ لَهُ)، ثَلاَثًا) رَوَاهُ أَبُو دَاوُد قال الالباني صحيح

میحجەنی کوڕی ئەدرەع (کە یەکێکە لە هاوەڵان) خوا لێی ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە مزگەوت، لەو کاتە پیاوێك نوێژی تەواو کردو شایەتمانی دەهێناو دەیگوت: خوایە ! من داوات لێدەکەم ئەی خوای تاكو جێی نیازو ئومێد، ئەو خوایەی کەسی لێ نەبووەو لە کەسیش نەبووە، وە هەرگیز هیچ کەس هاوشێوەو هاوتای ئەو نیە، لە گوناهەکانم خۆشبی، چونکە بەڕاستی تۆ لێبوردەو بەبەزەیی، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە تەئکید بوردرا، بە تەئکید بوردرا (لە گوناهەکانی) وە سێ جاران ئەم وتەیەی دووبارە کردەوە.

٨-( وَعَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْمَغْرِبِ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ: (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ) (الكافرون: ١) ، وَ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) (الإخلاص: ١) ، رَوَاهُ فِي شَرْحِ السُّنَّةِ قال الالباني صحيح

واتە: لە جابیری کوڕی سەمورەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر لە نوێژی مەغریبی شەوی هەینی (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ) و(وَقُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ) دەخوێندن.

٩-(عَن ابْن عَبَّاس قَالَ: من صلى رَكْعَتَيْنِ فَقَرَأَ فيهمَا (قل هُوَ الله أحد) ثَلَاثِينَ مرّة بنى الله لَهُ ألف قصر من ذهب فِي الْجنَّة وَمن قَرَأَهَا فِي غير صَلَاة بنى الله لَهُ مائَة قصر فِي الْجنَّة وَمن

قَرَأَهَا فِي صَلَاة كَانَ أفضل من ذَلِك وَمن قَرَأَهَا إِذا دخل إِلَى أَهله أصَاب أَهله وجيرانه مِنْهَا خير) وَأخرج الْبَيْهَقِيّ فِي شعب الايمان والسيوطي في الدر المنثور

واته: له ئیبنو عه‌باسه‌وه هاتووه ده‌ڵێ: هه‌رکه‌سێك دوو رکعات نوێژ بکات ، و (٣٠) جاران له ناو نوێژدا (قل هُوَ الله أحد) بخوێنێ ، خوا (١٠٠٠) کۆشکی له به‌هه‌شت بۆ دروست ده‌کات، وه ئه‌وه‌ی له ده‌ره‌وه‌ی نوێژ (٣٠) جاران بیخوێنی ، خوا (١٠٠) کۆشکی بۆ دروست ده‌کات له به‌هه‌شت، وه ئه‌وه‌ی له ناو نوێژدا بیخوێنێ چاکتره، وه هه‌رکه‌سێ بیخوێنێ که گه‌رایه‌وه لای که‌س وکاری ، که‌س وکاروجیرانی تۆشی خۆش و خێر ده‌بن.

****************************

# وتاری ژماره (١٤٣) له هۆیەکانی دابەزینی قورئان

له وتاری ئەم جاره هۆکاری دوو سورەت باس دەکەین

## ١-سورەتی ( الفلق )

ئەم سورەتە لە ریزبەندا ژمارە (١١٣)ە وە ژمارەی ئایەتەکانی (٥) ئایەتە.

–ئەم سورەتە لە شاری (مەککە) دابەزیوە ، خەڵکی فێری ئەوە دەکات پەنا بەخوا بگرن ، لە شەڕی دروستکراوەکان و شەڕی حەسودان و ساحیران ، یەکێکە لەو دوو سورەتانەی پێغەمبەر دەیخوێندو پەنای پێ لە خوا دەگرت لەشەڕو شتی خراپ.

## دەقەی مانای ئەم سورەتە :

﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ١ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ٢ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ٣ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِي ٱلۡعُقَدِ ٤ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ٥﴾ الفلق

واتە : ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) بڵێ: پەنا دەگرم بە دروست کەری بوونەوەر واتە بەرەبەیان. (١) لە زیانی ئەوەی کە دروستی کردووە. (٢) وە لە زیانی تاریکی کاتێك کە دابێ. (٣) وە لە زیانی فووکەران(جادوو کەران) بە گرێ یاندا. (٤) وە لە زیانی بەخیل و حەسوود کاتێك کە حەسوودی ببات. (٥) (پوختەی تەفسیر)

## ٢-سوڕەتی (الناس)

چەند لایەنەکی گرنگی ئەم سوڕەتە:

١-ئـەم سـوڕەتە لـە (مەککـە) دابـەزیوە ، لـە ریزبەنـدا ژمـارە (١١٤)یـە، وە ژمـارەی ئایەتەکانی (٦)ئایەتە ، سوڕەتی دووەمـە کـە پـەنای پـێ لـە خـوا دەگـیرێ ، لـە دوژمـنی گەورە کە شیتانە، وە لە دۆستەکانی شەیتان لە مرۆڤ و جنۆکە کە وەسوسە دەخەنە دڵـی ئینسانەوە.

## دەقەی مانای ئەم سوڕەتە :

﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ١ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ٢ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ٣ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ٤ ٱلَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ ٱلنَّاسِ ٥ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ٦﴾ الناس

واتە: ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) بڵێ: پەنا دەگـرم بـە پـەروەردگاری خـەڵکی. (١) پادشای خەڵکی. (٢) پەرستراوی خەڵکی. (٣) لە زیانی وەسوەسـە پەیداکـەری خـۆ پـەنهان کـەر. (٤) ئـەوەی کـە وەسوەسـە ئەخاتـە دڵـی خـەڵکی. (٥) لـە جنۆکـە و لـە ئادەمیزاد. (٦) (پوختەی تەفسیر)

چەند جوانە قورئانی پیرۆز بە (بسم الله الرحمن الرحیم) دەست پـێ دەکـات و بـە دووپـەنا پێ گیراوەکە کۆتایی دێت ، تاکو ئینسان بزانێ لە سەرەتا و کۆتایی پێویستی بەخوایە .

## ئایا هۆی دابەزینی ئەم دوو سورەتە چی بوو؟

عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، قَالَ: سَحَرَ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ، قَالَ: فَاشْتَكَى فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ فَنَزَلَ عَلَيْهِ بِالْمُعَوِّذَتَيْنِ، وَقَالَ: إِنَّ رَجُلًا مِنَ الْيَهُودِ سَحَرَكَ، وَالسِّحْرُ فِي بِئْرِ فُلَانٍ، قَالَ: فَأَرْسَلَ عَلِيًّا فَجَاءَ بِهِ، قَالَ: فَأَمَرَهُ أَنْ يَحُلَّ الْعُقَدَ، وَتَقْرَأَ آيَةً، فَجَعَلَ يَقْرَأُ وَيَحُلُّ حَتَّى قَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَأَنَّمَا أُنْشِطَ مِنْ عِقَالٍ، قَالَ: فَمَا ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِذَلِكَ الْيَهُودِيِّ شَيْئًا مِمَّا صَنَعَ بِهِ، قَالَ: وَلَا أَرَاهُ فِي وَجْهِهِ) مسند عبد بن حميد والسيوطي في الدر المنثور

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەرقەوە هاتووە دەڵێ: پیاوێکی جوولەکە جادووسیحری لە پێغەمبەر کرد ، دەڵێ پێغەمبەر نەخۆش کەوت ، جوبریل هاتە لای دوو سورەتی پەناپێگیراوەکەی بۆ دابەزاند (الفلق والناس) جوبریل بە پێغەمبەری گوت: پیاوێکی جوولەکە سێحری لێ کردوی ، سیحرەکەش لە فولانە بیرە ، پێغەمبەریش ئیمامی عەلی نارد بۆ دۆزینەوەی ، دەڵێ: فەرمانی بە(علی) کرد گرێیەکانی بکاتەوە و ئایەتەکانی بەسەردا بخوێنێتەوە، جا ئایەتەکانی دەخوێندەوە و گرێیەکانی دەکردەوە ، جا پێغەمبەر چاك بویەوە ، چووست وچالاك بوو، وەك چۆن کەسێك بسترابێتەوە دوای ئازاد بکرێ ، دەڵێ: پێغەمبەر هیچی بەو جوولەکە نەگوت وە هیچی بەرامبەر ئەو جوولەکە بەدەم وچاوی دیار نەبوو.

## چەند فەرموودەیەك دەربارەی ئەم دوو سوڕەتە :

١-(عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَلَمْ تَرَ آيَاتٍ أُنْزِلَتِ اللَّيْلَةَ لَمْ يُرَ مِثْلُهُنَّ قَطُّ، قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) رواه مسلم

واتە: عوقبەی كوڕی عامیرەوە هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی : ئایا نەتزانیوە ئەم شەو چەند ئایەتێك بۆم دابەزیون وێنەیان هەرگیز نەبینراوە كە ئەمانن (الفلق والناس)

٢-(عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ سَحَرَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي زُرَيْقٍ يُقَالُ لَهُ لَبِيدُ بْنُ الْأَعْصَمِ حَتَّى كَانَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ كَانَ يَفْعَلُ الشَّيْءَ وَمَا فَعَلَهُ حَتَّى إِذَا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ أَوْ ذَاتَ لَيْلَةٍ وَهُوَ عِنْدِي لَكِنَّهُ دَعَا وَدَعَا ثُمَّ قَالَ يَا عَائِشَةُ أَشَعَرْتِ أَنَّ اللَّهَ أَفْتَانِي فِيمَا اسْتَفْتَيْتُهُ فِيهِ أَتَانِي رَجُلَانِ فَقَعَدَ أَحَدُهُمَا عِنْدَ رَأْسِي وَالْآخَرُ عِنْدَ رِجْلَيَّ فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ مَا وَجَعُ الرَّجُلِ فَقَالَ مَطْبُوبٌ قَالَ مَنْ طَبَّهُ قَالَ لَبِيدُ بْنُ الْأَعْصَمِ قَالَ فِي أَيِّ شَيْءٍ قَالَ فِي مُشْطٍ وَمُشَاطَةٍ وَجُفِّ طَلْعِ نَخْلَةٍ ذَكَرٍ قَالَ وَأَيْنَ هُوَ قَالَ فِي بِئْرِ ذَرْوَانَ فَأَتَاهَا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي نَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَجَاءَ فَقَالَ يَا عَائِشَةُ كَأَنَّ مَاءَهَا نُقَاعَةُ الْحِنَّاءِ أَوْ كَأَنَّ رُءُوسَ نَخْلِهَا رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ قُلْتُ يَا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَفَلَا اسْتَخْرَجْتَهُ قَالَ قَدْ عَافَانِي اللَّهُ فَكَرِهْتُ أَنْ أُثَوِّرَ عَلَى النَّاسِ فِيهِ شَرًّا فَأَمَرَ بِهَا فَدُفِنَتْ ) البخاري

واتە:لە عائیشەی دایكی ئیمانداران هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر جادوی لێكرا، لەلایەن پیاوێك لە لە بەنی زوریق پێیان دەگوت (لەبیدی كوڕی ئەعصم (هەندێ دەڵێن لەلایەن كچەكانی ئەو جوولەكە)) پێغەمبەر شتی لێتێكەڵ دەبوو (شتی دونیایی نەك لەبارەی ئایین) ،دەڵێ : ڕۆژێك یان شەوێك لەلای من بوو، زۆر دوعای كرد ، فەرمووی: ئەی عائیشە ئایا هەست ناكەی خوا بۆمی روونكردمەوە لەوەی داوام لێ كردبوو، دوو پیاو هاتنە لام یەكێك لە لای سەرم دانیشت و ئەوی دیكە لەلای پێیەكانم ، یەكیان بەوی دیكەی گوت: ئەو پیاوە(پێغەمبەر ) ئازارەكەی (نەخۆشیەكەی) چیە؟ ئەویش گوتی: سێحری لێكراوە،

گوتی: کێ سێحری لێ کردوه؟ گوتی: لەبیدی کوڕی ئەعصەم، گـوتـی : ئـەو سـێحرەی لـە چی کردوه؟ گوتی: لە شانەی و هەندێك موو، گوتی: ئـەم سـێحره لـە کوێیـە؟ گـوتی: لـە بیری (زەروان (لە هەندێ ریوایەت بیری ئەروان)) جا پێغەمبەر هەنـدێ لـە هـاوەڵانی نـارد هێنایانە دەرێ ، عائیشە گوتی: ئەی نێرراوی خوا ئایا نەت هێنایەدەرێ؟ فەرمووی : خـوا شیفای دام و پێم ناخۆش بوو، ئاشوب بەرپابێ لە ناو خەڵکی ، فەرمانی کـرد شـاردیانەوە لە ناو زەوی.

٣-(عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ قَالَ سَحَرَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلٌ مِنْ الْيَهُودِ فَاشْتَكَى لِذَلِكَ أَيَّامًا فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَام فَقَالَ إِنَّ رَجُلًا مِنْ الْيَهُودِ سَحَرَكَ عَقَدَ لَكَ عُقَدًا فِي بِئْرِ كَذَا وَكَذَا فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاسْتَخْرَجُوهَا فَجِيءَ بِهَا فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَأَنَّمَا نُشِطَ مِنْ عِقَالٍ فَمَا ذَكَرَ ذَلِكَ لِذَلِكَ الْيَهُودِيِّ وَلَا رَآهُ فِي وَجْهِهِ قَطُّ (رواه النسائي ) قال الالباني صحيح

## فەزڵ وگەورەیی سورەتی ( الفلق والناس )

١-(عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا أَسِيرُ مَعَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ الْجُحْفَةِ وَالْأَبْوَاءِ إِذَا غَشِيَتْنَا رِيحٌ وَظُلْمَةٌ شَدِيدَةٌ فَجَعَلَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَعَوَّذُ بِـ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ وَأَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ وَيَقُولُ: يَا عُقْبَةُ تَعَوَّذْ بِهِمَا، فَمَا تَعَوَّذَ مُتَعَوِّذٌ بِمِثْلِهِمَا قَالَ: وَسَمِعْتُهُ يَؤُمُّنَا بِهِمَا فِي الصَّلَاةِ) رواه النسائي وابو داود والبيهقي قال الالباني صحيح

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە هاتووە دەڵێ: من لەگەڵ پێغەمبەر دەرۆیشتم لە نێـوان جوحفە و ئەبوا ، باو تاریکی یەکی بەهێز داپیۆشین، پێغەمبەر پـەنای دەگـرت بـە (أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) و (قل أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) وە دەیفەرموو : ئەی عوقبە تۆش پەنایان پـێ بگـرە، هاووێنەیان نیە لە پەنا گرتن ، دەڵێ: گوێم لێ بوو لە پێش نوێژیش دەیخوێندن.

٢-(عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ كُنْتُ أَقُودُ بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَاقَتَهُ فِي السَّفَرِ فَقَالَ لِي يَا عُقْبَةُ أَلَا أُعَلِّمُكَ خَيْرَ سُورَتَيْنِ قُرِئَتَا فَعَلَّمَنِي قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ قَالَ فَلَمْ يَرَنِي سُرِرْتُ بِهِمَا جِدًّا فَلَمَّا نَزَلَ لِصَلَاةِ الصُّبْحِ صَلَّى بِهِمَا صَلَاةَ الصُّبْحِ لِلنَّاسِ فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ الصَّلَاةِ الْتَفَتَ إِلَيَّ فَقَالَ يَا عُقْبَةُ كَيْفَ رَأَيْتَ ) رواه الترمذي قال الالباني صحيح

واتـه: ....فـەرمووی : ئـەی عوقبـە باشـترین دوو سـوڕەتت فێـر نەکـەم، دەڵـێ ئـەم دوو سوڕەتی فێرکردم (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) دەڵێ پێغەمبەر نەیبینیم زۆر پێیان دڵخۆش بم...کاتێ لەسەر وشتر دابەزی بۆ نوێژی بەیانی کەبۆ خـەڵکی بکـات ، ئـەم دوو سوڕەتەی خوێندن لەناو نوێـژدا، کـە کـاتێ نوێـژی تـەواو کـرد ئـاوڕی لـە مـن دایـەوە فەرمووی : ئەی عوقبە چۆنت بینی؟.

٣-( عَنْ مُعَاذِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خُبَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: خَرَجْنَا فِي لَيْلَةٍ مَطِيرَةٍ وَظُلْمَةٍ شَدِيدَةٍ نَطْلُبُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي لَنَا، قَالَ: فَأَدْرَكْتُهُ، فَقَالَ: (قُلْ ) فَلَمْ أَقُلْ شَيْئًا، ثُمَّ قَالَ: (قُلْ)، فَلَمْ أَقُلْ شَيْئًا، قَالَ: (قُلْ)، فَقُلْتُ، مَا أَقُولُ؟ قَالَ: قُلْ: قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ، وَالمُعَوِّذَتَيْنِ حِينَ تُمْسِي وَتُصْبِحُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ تَكْفِيكَ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ) رواه الترمذي قال الالباني حسن

واتە: لـە موعـازی کـوڕی عەبـدولای کـوڕی خوبیـب، ئـەویش لەباوکیـەوە هـاتووە دەڵـێ: شـەوێکی زۆر تاریـك وبارانـاوی دەرچـوون ، ئێمـەش لـە پێغەمبـەر دەگـەراین بـۆ ئـەوەی بەرنوێژمان بۆ بکات، دەڵێ : دۆزیمەوە فەرمووی : بخوێنە ، منیش هیچم نەگوت، دووبارە فەرمووی : بخوێنە منیش هیچم نەگوت، سێەم فەرمووی: بخوێنە منیش گوتم چی بخوێنم ، فەرمووی : بڵێ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) و دوو پەنا پێ گیراوەکە (الفلق و الناس) کاتی ئێواران و بەیانیان سێ جاران بیان خوێنە بۆ هەموو شتێك بەستە.

٤-( عَنْ أَسْلَمَ بْنِ عِمْرَانَ، أَنَّهُ سَمِعَ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ، يَقُولُ: تَبِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ رَاكِبٌ، فَجَعَلْتُ يَدِي عَلَى قَدَمِهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَقْرِئْنِي إِمَّا مِنْ سُورَةِ هُودٍ، وَإِمَّا مِنْ سُورَةِ يُوسُفَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا عُقْبَةُ بْنَ عَامِرٍ، إِنَّكَ لَنْ تَقْرَأَ سُورَةً أَحَبَّ إِلَى اللَّهِ، وَلَا أَبْلَغَ عِنْدَهُ مِنْ أَنْ تَقْرَأَ: قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ لَا تَفُوتَكَ فِي صَلَاةٍ فَافْعَلْ ) رواه الحاكم وابن حبان قال الالباني صحيح

واته: پێغەمبەر فەرموویەتی : ئەی عوقبەی کوڕی عامیر تۆ هیچ سورەتێك نا خوێنی خۆشەویستر بێ لەلای خوا له سورەتی (الفلق) ئەگەر پێتکرا با له خوێندنی لەناو نوێژدا له دەستت نەڕوا. (واته: له ناو نوێژ بیخوێنه)

٥-( عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَعَوَّذُ مِنَ الجَانِّ وَعَيْنِ الإِنْسَانِ حَتَّى نَزَلَتِ المُعَوِّذَتَانِ فَلَمَّا نَزَلَتَا أَخَذَ بِهِمَا وَتَرَكَ مَا سِوَاهُمَا) رواه الترمذي قال الالباني صحيح

واته: له ئەبو سەعیدی خودریەوه هاتووه دەڵێ: پێغەمبەر پەنای بەخوا دەگرت له جنۆکه و چاوی پیسی ئینسان کاتێ ئەم دوو سورەتەی بۆ دابەزین ، وازی له خوێندنی شتەکانی دیکه هێنا ، تەنها ئەم دوو سورەتەی دەخوێند (الفلق والناس)

بۆ ئاگاداری : ئەم دوو سورەته بۆ ترس له جنۆکه و حەسوودی و چاوپیسی دەخوێندرێت.

٦-(عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ كُلَّ لَيْلَةٍ جَمَعَ كَفَّيْهِ ثُمَّ نَفَثَ فِيهِمَا فَقَرَأَ فيهمَا (قل هُوَ الله أحد)و (قل أعوذ بِرَبّ الفلق)و (قل أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) ثُمَّ يَمْسَحُ بِهِمَا مَا اسْتَطَاعَ مِنْ جَسَدِهِ يَبْدَأُ بِهِمَا عَلَى رَأْسِهِ وَوَجْهِهِ وَمَا أَقْبَلَ مِنْ جَسَدِهِ يَفْعَلُ ذَلِكَ ثَلَاث مَرَّات) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واته:عائیشەی دایکی ئیمانداران خوا لێی ڕازی بێ هاتووه دەڵێ: پێغەمبەر هەموو شەوێ که دەچوو سەر جێگا بۆ خەوتن ، دەستەکانی کۆدەکردنەوه، سورەتی (الاخلاص و الفلق

والناس) دەخوێندن ، دوای فوی بەدەستەکانیدا دەکرد، بەسەر لاشەیدا دەهێنـا ، ئـەوەی دەیتوانی ، لەسەر و دەم وچاوی دەستی پیٚ دەکرد ئنجا بەرەو لاشەی ، سـیٚ جـاران وای دەکرد.

## له كۆتاييدا له خواى ميهرەبان دەپاڕێمەوە بەم دوعايە قورئانيە

(رَبَّنَا تَقَبَّلۡ مِنَّآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ) ئامين ،

**(رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذۡنَآ إِن نَّسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَا)**

وەهەروەها بەم دوعايەى پێغەمبەر لێت دەپارێمەوە (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ وَمَا أَسْرَفْتُ وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ) رَوَاهُ مُسْلِمٌ

خودايە لێت دەپارێمەوە لە گوناهى خۆم و دايك وباوكم و خانەوادەم و سەرجەم ئيمانداران خۆشبە.

خودايە هەر بەيارەمەتى تۆ ئەم نووسينەم تەواوكرد، هەرتۆش لێم قەبول بفەرموو

دوا پێداچوونەوە بەروارى (٢٤ – ٢– ٢٠٢٠)

# سەرچاوەکان


١-اسباب النزول / الشيخ محمود المصري

٢-الجامع في اسباب النزول / الشيخ حسن عبدالمنعم شلبي

٣-اسباب النزول القران / الواحدي

٤-الصحيح المسند من اسباب النزول / الشيخ مُقْبِل الوادعي

٥-لباب المنقول للسيوطي

٦-تفسير ابن كثير

٧-تفسير الطبري (جامع البيان)

٨- كتب الاحاديث (البخاري ، مسلم ، ابن حبان، البيهقي ، ابن ماجه ، الترمذي، النسائي، احمد، حلية الالياء،مصنف عبدالرزق،. السنن الكبرى للبيهقي... ..................)

٩-صفوة التفاسير/ الشيخ محمد علي الصابوني

١٠-تطريز رياض الصالحين / فيصل بن عبدالعزيز

١١-فتح القدير للشوكاني

١٢- مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح

١٣-صفوة التفاسير الشيخ محمد علي الصابوني .

١٤-الطبري في جامع البيان

١٥- مختار الصحاح ، معاني)

١٦- معجم اللغة العربية المعاصرة

١٧- الآثار ، المؤلف: أبو يوسف الأنصاري

١٨- الفجر الساطع على الصحيح الجامع

١٩- سيرة ابن هشام

٢٠- صحيح السيرة النبوية

٢١- فضائل الصحابة لاحمد بن حنبل

٢٢- حلية الأولياء وطبقات الأصفياء ، ابو نعيم

٢٣- الزهد والرقائق لابن المبارك

٢٤- الزواجر عن اقتراف الكبائر

٢٥- اخبار مكة للفاكهي

٢٦-تفسير ابن ابي حاتم

٢٧- سيرة ابن هشام ، شيرة لابن كثير

٢٨- دلائل النبوة لابي نعيم الاصبهاني

٢٩- الفجر الساطع على الصحيح الجامع

٣٠- العاقبة في ذكر الموت

## سەرچاوە كورديەكان

١-تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز / م. علی باپیر

٢-پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەر / م . علی باپیر

٢-تەفسیری رامان / م احمد كاكە محمود

٣-تەفسیری گوڵشەن / م نیزام الدین

٤-پوختەی تەفسیر / م محمد بامۆكی

٥-تەفسیری ئاسان / م برهان

٦-پاداشتی کارەچاکەکان / م. سیروان کاکە احمد

٧- وتاری سەردەم / م . ئەحمەدی قامیشی.

٨-فەرهەنگی سەرچاوە ، فەرهەنگی دەریا.

اقرأ باسم ربك

ئەم پەرتووكە بە كورتی :

1-ئەم پەرتووكە لە دوو بەشی زۆر گرنگ پێك هاتووە: یەكەم هۆكاری دابەزینی (531) ئایەتی قورئان ، دووەم : (143) وتاری ئامادەكراوە.

2-وتارەكانی لە هۆكاری دابەزینی ئایەتەكان و فەرموودە صەحیحەكان پێك هاتووە، لەگەڵ تەفسیر و مانای فەرموودەكان بە كوردی.

3-وەسف و پێناسە و تەوەرەكانی هەموو سورەتەكان دەخاتە روو، لەگەڵ پاداشتی خوێندنی سورەتەكان.

4-وتاربێژ ئەتوانی سوودی لێ وەرگرێ بۆ وتاری هەینی، بەرنامەی رادیۆ و تەلەفزیۆن، نووسین ، بۆنەكان، شارەزابوون لە قورئان.

5-بۆ مانگی رەمەزان بەشی (4) ساڵ زیاتر دەكات وتاری لەسەر بدرێت.

6-زۆر پێویستە مامۆستا و قوتابی سەنتەرەكانی قورئان لەبەر كردن ئەم پەرتووكەیان هەبێ.

7-سەرچاوەیەكی زۆر بەسوودە بۆ قوتابی زانستە شەرعیەكان لە قۆناغی ( قوتابخانە و وحوجرە و كۆلێژەكان ، ماستەر ، دكتۆرا ).



بەرگ: محەمەد جەبار




■ 07504671394 - 07831734977
■ فەیس بووك : كتێبخانەی حاجی قادری كۆیی
■ هەولێر - پشت قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری ■ نرخ : ١٨٠٠٠